بەرگی
٣

دکـــتۆر
یعقوب حسین عبدالکریم الراوی

# زانستی نوێ



# و



# کۆتایی بوونەوەر

نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی
بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم

چاپی سێیەم




# زانستی نوێ
# و
# کۆتایی بوونەوەر

- نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی
- بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم

نووسینی

دکتۆر یعقوب حسین عبدالکریم الراوی

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤
فەیس بووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر-بەرامبەر دەرگای قەڵا- بازاڕی ڕۆشەنبیری




ناوی کتێب: زانستی نوێ و کۆتــایی بوونـەوەر
نووسەر: دکتۆر یعقوب حسین عبدالکریم الراوی
نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: زەردەشـت کاوانی
بابەت: زانســتی
چاپخانە: حاجـــی قـــادری کۆیـــی
چاپی: چاپی سێیەم/ ١٤٤٢ ـ ٢٠٢٠ .
تیراژ: ١٥٠٠
پێوانە : ( ١٧ x ٢٤ ) سم
لاپەڕە : ٦٩١

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن: (٥١٣) ساڵی (٢٠١٢) ی پێدراوە.

# هەمووومان چاوەڕێی هاتنی محەممەدی مەهدین!

• هەموومان ئەپرسین مەهدی کەی دێت؟

• دڵنیاییت ئەگەر محەممەدی مەهدی هات شوێنی ئەکەویت؟

• دڵنیای لە خۆت کە پێی ناڵێی ئەمە عەرەبەو دژی کوردە؟

• دڵنیای لە خۆت کە پێی ناڵێی دژی دیموکراسیە؟

• بەڵام مەهدی لە نێو چەوانی نەنوسراوە مەهدی!

• دڵنیابن ئەگەر بەم شێوەیە دیندار بکەین ئەوا میللەتی کورد سەدا نەوەدی دژی مەهدی ئەوەستێتەوە!

کاکی من!

پێش ئەوەی چاوەڕێی محەممەدی مەهدی بکەیت خۆت شارەزای شەریعەتی ئیسلام بکە!

ئاگاداربە / ئیسلام بە تەنها نوێژو ڕۆژوو نییە، بەڵکو ئەحکام و یاسا و دەوڵەت داریە..

# محەممەدی مەهدی

پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە، حەزم کرد فەرموودەیەکتان بیر بهێنمەوە کە پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە فەرموی: حەوت لە منداڵەکانی عەبدولموتەڵیب گەورەی ئەهلی بەهەشتن، (أنا وحمزه وعلى وجعفر والحسن والحسين والمهدى)[1].

واتە: من پێغەمبەر و (ﷺ) حەمزەو عەلی و جەعفەرو حەسەن و حوسەین و مەهدی.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (المهديُّ طاوس أهل الجنة)[2].

واتە: مەهدی تاوسی ئەهلی بەهەشتە.

فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕاستیە [3]دەسەلمێنن کە لە کۆتایی دونیادا لە کاتێکدا کە ئیسلام غەریب دەبێت و شەریعەتی خوا لەکار دەخرێت و موسڵمانان بێ شوان و ڕابەر دەبن و سەرتاپای زەوی ستەم دەیگرێتەوەو زۆرداران و ستەمکاران تیایدا خاوەن دەسەڵات دەبن تا وای لێدێت کەس هیوای خێرو چاکەی نامێنێت کە جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر زەوی، ئا لەو کاتەدا خوای پەروەردگار ڕووی ڕەحمەتی خۆی لە بەندە دڵسۆزەکانی دەکات و پێشەوایەکی خاوەن باوەڕو عەزیمەتیان بۆ دەرەخسێنێت، کە لەسەر دەستیدا دین زیندوو دەبێتەوەو ئیسلام و موسڵمانان سەر بەرز دەبن و قەڵای کوفرو ستەمکاران هەرەس دێنێت و سوننەت دەبوژێتەوەو بیدعەت دەمرێت و خێرو بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی بە جۆرێك بەسەر زەویدا دەڕژێت کە وێنەو نمونەی لە

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك، برقم: (٢٩٤٠). قال الحاكم: صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه.

(٢) أخرجه الديلمي في كتاب (الفردوس).

(٣) رحلة الي الدار الآخرة، جمع وترتيب: محمود المصري، لا ٢٥٤.

هیچ سەردەمێکدا نەبووە، هاتنی ئەم پێشەوایە ئیسلامیەش بە کوێرایی چاوی هەموو دوژمن و ناحەزێکی ئەم دینە ڕاستیەکە وەکو هەموو هەواڵە ڕاستەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) دێتە دی و قەدەری خواش هەر بە ئەنجام دەگات، ئەم پێشەوایەش (محەممەدی مەهدی)یە.

محەممەدی مەهدی ناوی (محەممەدی کوڕی عبدوڵلای حەسەنی)یە، لە نەوەی (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب)ە، هاتنی ئەو پێشەوایەش لە کۆتایی بونەوەر دەردەکەوێ ئەمەش لە بەزەیی و میهری خوداوەیە بۆ ئەم ئوممەتە، موحەممەدی مەهدی یەکێکە لەو جۆرەکەسانەی کە هەق و دادگەری بەرپا دەکاو ستەم قەدەغە دەکات، خوای گەورە بەهۆی (محەممەدی مەهدی) یەوە بەیداخی خێرو چاکە هەڵدەکاو بۆ ئوممەت دەبێتە هۆی دادەوەری‌و ڕێنمونی و پشتیوانی و ڕێبەری خەڵکی بۆ سەرکەوتن.

مەسەلەی (محەممەدی مەهدی) بڕوایەکی جیهانیە کە لە قورئان و سوننەت و تەواوی نامە ئاسمانیەکاندا باسکراوە، کە ئازادی بەخشی جیهانیە و لەسەر دەستی ئەو هەر حەوت کیشوەرەکان دەبن بە یەك خێزان و چینایەتی و هەژاری نامێنێ.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: لەسەردەمی محەممەدی مەهدی بەرەو بووم زۆر دەبێ و دانەوێڵە بە پیت دەبێ و ماڵ و سامان لەبن نایەن، وە دەسەڵات بە تەواوی حوکم دەکات، وە دینی ئیسلام جێبەجێ دەکرێت، وە دوژمنان سەر شۆڕ دەبن، وە خێرو خۆشی لەسەردەمی ئەودا بەردەوام دەبێت[١].

پێشەوا تاوس (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: حەز دەکەم نەمرم هەتا دەگەم بە سەردەمی محەممەدی مەهدی، بۆ ئەوەی چاکەکانم زیاد بکەم و تەوبە لەسەر خراپەکانم بکەم[٢].

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ٣١).

(٢) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١١٢.

# ئەو فەرموودانەی دەربارەی
# محەممەدی مەهدی هاتوون متەواتیرن

ئەو فەرموودانەی کە باس لە هاتنی مەهدی و نیشانەکانی و ڕووداوەکانی سەردەمی ئەو دەکەن هێندە زۆرن وەکو زۆربەی زاناکان دەفەرموون گەیشتۆتە پلەی (تەواتر) هەر مەسەلەیەکیش لە فەرموودەکاندا گەیشتە پلەی (تەواتر)، ئەوا باوەڕ نەبوون پێی بەرەو کوفرمان دەبات.

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

کەسانێك دەڵێن: فەرموودەکانی مەهدی ئەگەر ڕاستیش بێت بەڵام فەرموودەی (ئاحاد)ن نەك متەواتیر بێت؟

لە وەڵامی ئەو گومانە دەڵێم: ئەم قسەیەی کە دەگوترێت ئاحادەو متەواتیر نییە ئەوە ئەو پەڕی بێ ئینصافیە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرێت.

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ئەو فەرموودانەی کە لەبارەی (مەهدی) چاوەڕوان کراوەوە هاتوون و توانراوە لەسەری بوەستین، زیاتر لە (٥٠) پەنجا فەرموودەن کە تیایاندایە (صحیح)ەو تیایاندایەو (حسن)ەو تیاشیاندایە (ضعیف)ە، بۆیە بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێك گەیشتوونەتە پلەی (تواتر)، بەڵکو لە هەموو زاراوەکانی (أصول)دا بۆ زۆر لەوە کەمتر دەتوانرێت سیفەتی (تواتر)ی بۆ بچەسپێت، وە وتەی هاوەڵەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) دەربارەی (مەهدی) بەهەمان شێوە ئێجگار زۆرە، کە حوکمی بەرزکردنەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەیە، چونکە ئەمە مەسەلەیەك نیە کە کەس بتوانێت بە ئیجتیهادی خۆی قسەی لەسەر بکات[1].

---

(١) الإذاعة لما كان وما يكون بين يديّ الساعة ، السيد محمد صديق حسن القنوجي البخاري،

هەروەها دەڵێت: ئێمە لەم بابەتە ئەوانەمان بەسە کە سەنەدەکەی ڕاستە، جا بۆ خۆی صحیح بیٚ یان بەغەیری خۆی، یان بۆ خۆی حەسەن بیٚ یان بە غەیری خۆی، فەرمودەی زەعیفی پتەوکراویش هەر بەم شێوەیە، ئەگەر هەندێك هەندێکیان پتەو کرد، لەلای ئەهلی حەدیس دەبێتە حوججەت.. جەماوەرێکی زۆری زانایان ـ بەڵکو بە ڕادەی یەکدەنگی ـ کۆکن لەسەر سەلماندنی مەسەلەی مەهدی کە هەقەو لە کۆتایی بونەوەر دەردەکەویٚ[١].

شێخ (عبدالمحسن کوڕی حمد العباد)یش ئەو هاوەڵانەی بژاردووە کە فەرموودەکانی سەبارەت بە (مەهدی) یان گێڕاوەتەوە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٢٦) هاوەڵ، وە ژمارەی ئەو پەرتووکانەی فەرمووودەش کە ئەو فەرمودەیان گێڕاوەتەوە گەیشتۆتە (٣٦) پەرتووك، لەوانە هەر چوار پەرتووکەکەی (سنن) و موسنەدی پێشەوا (ئەحمەد)و (صحیح)ی ئیبنو حبان و (مستدرك)ی پێشەوا حاکم و... هتد[٢].

شێخ عبدالعزیز کوڕی باز (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) لەو بارەیەوە دەڵێت: مەسەلەی (مەهدی) زانراوو ئاشکرایەو فەرموودەکان لەسەری بە لێشاون، بەڵکو (متواتر)ن و پاڵپشتی یەکتر دەکەن، وە (تواتر)ەکەشی لەلایان زیاتر لە کەسێك لە ئەهلی عیلمەوە سەلمێنراوە، (تواتر)ەکەش تەواتورێکی مەعنەویە، لەبەر زۆری ڕێگاکانی و جیاوازی مەخرەجەکانی، هەروەها هاوەڵەکانی و ڕاویەکانی و دەربڕینەکانی، کە ئەمانە هەمووی بەڕاستی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم کەسە موژدە پێدراوە، مەسەلەکە چەسپاوەو هاتنی هەقە[٣].

---

ئەویش وەریگرتووە لە پەرتووکی (التوضيح في تواتر ما جاء في المهدي المنتظر والدجال والمسيح) ی پێشەوا (شەوکانی) وەریگرتووە.

(١) الرد على من كذب بالأحاديث الصحيحة الواردة في المهدي، عبدالمحسن بن حمد العباد، لا ١٥٧.

(٢) عقيدة أهل السنة والأثر في المهدي المنتظر، عبدالمحسن بن حمد العباد، لا ١٦٦-١٦٨، والقيامة الصغرى، د.محمد سليمان الأشقر، لا ٢٠٩.

(٣) القيامة الصغرى ، د.عمر سليمان الأشقر ، لا ٢٠٨ .

پێشەوا سەففارینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: زۆرترین فەرموودە سەبارەت بە دەرچوونی مەهدی هاتووە، هەتا پلەکەی گەیشتۆتە تەواتور.. هەتا زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننە بە بەشێك لە عەقیدەیان هەژمار کردووە.. وە بڕوا هێنان بە دەرچوونی محەممەدی مەهدی واجبە[1].

پێشەوا ئەبو حەسەن الآبري (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەبارەت بە محەممەدی مەهدی بە متەواتیری هاتوون، وە حەوت ساڵان دەسەڵات دەگرێتە دەست، زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری، وە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دێتە خوارەوە.. وە لە دوای مەهدی نوێژ دەکات[2].

زانای فەرموودەناس صدیق حەسەن خان القنوجي (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: گومان لەوەدا نییە کە لە کۆتایی بونەوەر مەهدی دەردەچێ، بەبێ دیاریکردنی مانگ و ساڵ، هەواڵەکانمان بە متەواتیری پێ گەیشتووە، وە جمهوری ئوممەت لە خەلەفەوە هەتا سەلەف لەسەر ئەوە کۆکن[3]..

شێخ محەممەدی کوری جەعفەری کەتتانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو فەرموودانەی سەبارەت بە محەممەدی مەهدی و دەجال و دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) هاتوون متەواتیرە[4]..

زانای فەرموودەناس ئەبو عەلائی عێراقی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەکانی محەممەدی مەهدی متەواتیرە[5]..



---

(١) مختصر لوامع الأنوار البهية (لا ٣٣٤).

(٢) تهذيب الكمال للمزي، (٣/ ١١٩٤).

(٣) الإذاعة، لا ١٤٥ .

(٤) نظم المتناثر من الحديث المتواتر، لا ١٤٧ .

(٥) المهدي المنتظربين حقائق اهل السنة وافتراءات الشيعة، لا ١١.

پێشەوا شەنقیتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەكانی محەممەدی مەهدی گەیشتۆتە پلەی متەواتیر[١]..

ئەبو عەبدوڵلا محەممەد جەسوس (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەو فەرموودانەی پێشەوا سەخخاوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) هێناویەتی سەبارەت بە محەممەدی مەهدی گەیشتۆتە پلەی متەواتیر[٢]..

پێشەوا شەمسەددینی ذەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم فەرموودانەی دەربارەی دەرچوونی محەممەدی مەهدی هاتوون صەحیح و ڕاست و دروستن[٣].

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو بەڵگانەی كە پشتی پێ دەبەسترێن سەبارەت بە دەرچوونی مەهدی فەرموودەی صەحیحن[٤].

پێشەوا بەیهەقی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو فەرموودانەی سەبارەت بە دەرچوونی مەهدی هاتوون سەنەدەكانیان صەحیحە[٥].

شێخ حسنین محەممەد مەخلوف (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) كە یەكێكە لە موفتیە گەورەكانی وڵاتی میسرِ دەڵێت: ئامۆژگاریم بۆ موسڵمانان ئەوەیە كە فەرموودەكانی مەهدی بە دڵێكی فرەوانەوە وەربگرن، وە باوەڕیان بە دەرچوونی محەممەدی مەهدی هەبێت لە كۆتایی بونەوەر، وە واز لەم وتانە بهێنن كە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕەتدەكەنەوە، لە كاتێكدا هیچ شتێك لە بارەی فەرموودەوە نازانن[٦].

بەرگی سێیەم

---

(١) فتح المنعم، (١/ ٣٣١).

(٢) المهدي المنتظر، للغماري، لا (٥ ـ ٦).

(٣) المنتقى من منهاج الاعتدال، لا ٥٣٤ .

(٤) منهاج السنة (٤/ ٢١١).

(٥) العلل المتناهية، (٢/ ٨٦٣).

(٦) سيد البشر يتحدث عن المهدي المنتظر، لا (٣ ـ ٤).

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەهدی یەکێکە لەوانەی لە کۆتایی بونەوەر دەردەچێت، وە یەکێکە لە خولەفای ڕاشدین پێشەوای مەهدییەکان[١].

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوە زانراوە کە فەرموودەکان باسی محەممەدی مەهدی دەکەن، وە دەرچوونی لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر، وە لە نەوەی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە (ﷺ).. وە پلەی فەرموودەکە گەیشتۆتە ئەندازەی تەواتری مەعنەوی، بۆیە هیچ واتایەکی نییە ئینکاری کردنی[٢].

پێشەوا موبارەکفوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێویستە لە کۆتایی بونەوەر پیاوێك سەرهەڵبدات لە ئال و بەیت دادپەروەری بچەسپێنێت، وە موسڵمانان شوێنی دەکەون کە پێی دەوترێت: مەهدی، لە دواییدا دەجال دەردەچێت لە پاشان سەرهەڵدانی نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەمجا عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوەو دەجال دەکوژێت، ئەوانەی فەرموودەکانی مەهدیان گێڕاوەتەوە کۆمەڵێك لەم پێشەوایانەن (ئەبوداود ترمذی ئیبنو ماجە بەززار حاکم تەبەڕانی ئەبو یەعلا) وە هەندێکیشیان پاڵ دراوەتە لای هاوەڵان لەوانە (عەلی و ئیبنو عەباس و ئیبنو عومەرو تەڵحەو عەبدوڵلای کوری مەسعودو ئەبو هوریرەو ئەنەس و ئەبی سەعیدی خودری و ئوم حەبیبەو ئوم سەلەمەو ثەوبان و قەڕڕەی کوری ئیاس و عەبدوڵلای کوری حاریس) وە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە هەندێکیان صەحیح و حەسەن و زەعیفن، تەنانەت عەبدوڕڕەحمانی کوری خەلدون هەموو فەرموودەکانی مەهدی بە زەعیف دادەنێت، نەیپ‌کا بەڵکو هەڵەی کرد[٣].

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (لا ١٧).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٧ .

(٣) تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي (٦/ ٤٨٤ ـ ٤٨٥).

پێشەوا ئەبو ئەعلای مەودودی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: فەرموودەکانی مەهدی زۆر بە ڕاشکاوانە هاتوون، وە فەرموودەکان ئەوە دەسەلمێنن کە پێشەوایەك لە کۆتایی بونەوەر سەرهەڵئەدات[1].

پێشەوا محەممەد متوەلی شەعراوی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: مەهدی ڕاستیەو لەداهاتوودا موسڵمانان بەیعەتی پیٚ ئەدەن، نەك بیفرۆشێتەوە بە خەڵکی[2].

شێخ محەممەد ناصرەددین ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: زانایانی تریش هەبوون کە فەرموودەکانی محەممەدی مەهدیان بەڕاست زانیوە، لەوانە:

- ئەبوداود لە (سوننەن).
- عوقەیلی.
- ئیبنولعەرەبی لە (عارضة الأحوذي).
- طهیبی لە (مرقاة المفاتیح).
- قورتوبی لە (أخبار المهدی).
- ئیبنو قەییمی جەوزی لە (المنار المنیف).
- ئیبنو حەجەر لە (فتح الباری).
- ئەبو حوسەینی ئابری لە (مناقب الشافعی).
- ملا علی قاری لە (مرقاة).
- سیوتی لە (العرف الوردی).
- موبارەکفوری لە (تحفة الأحوذي)[3].

---

(١) البيانات (١/ ٦١).

(٢) ثلاثة ينتظرهم العالم، لا ٤٩ .

(٣) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٤/ ٤١).

ئەمەو سەرباری دەیان پەرتوکی تر کە تایبەت بە(محەممەدی مەهدی) نووسراون لەلایان زانایانی باوەڕ پێکراوی ئیسلامەوە، کە ژماردنی هەموویان لە مەبەستی ئەم پەرتووکە دەردەچێت.

ئەمانەش هەموویان وایان کردووە باوەڕبوون بەم بابەتە ببێتە یەکێك لە بڕگەکانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەت.

بۆیە گوێ نادرێتە ئەو کەسانەی ئەم فەرمودانەیان بە بێهێز داناوە، یان باوەڕیان پێنەبوەو بەدرۆیان خستونەتەوە، لەوانەی کە سوارچاکی ئەو مەیدانە نین.

ئەوانەی بونی موحەممەدی مەهدی بە درۆ دەخەنەوە، ئەمانە چەند تاکێکن لەوانەی دەدرێنە پاڵ ئەهلی سوننە، بۆیە شارەزاییو ئەزمونێکی زۆریان نیە لە لێکۆڵینەوەی دەقەکان و دەرخستنی سەنەدەکان، جا گەلێك لە زانایان لە کتێبی سەربەخۆدا گومانەکانیان پوچ کردونەتەوە، دوا کتێبیش بەرچاوم کەوتبێت (الرد على من كذب بالأحاديث الصحيحة الواردة في المهدي) نوسینی: عەبدوالمحسین ئەلعبادە، هەروەها کتێبی (الإحتجاج بالأثر على من أنكر المهدي المنتظر) کە شێخ حەمودی کوری عەبدوڵلای کوری حەمەدی تویجەری نوسیویەتی.

ئەو زانایانەی کە فەرموودەکانی محەممەدی مەهدی بە متەواتیر داناوە، ئەمانەن:

- پێشەوا محەممەدی کوری حوسیەنی بەرزنجی لە کتێبی (الإشاعة).
- پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە هەردوو کتێبی (فتح الباري) و (تهذيب التهذيب).
- زانای فەرموودەناس محەممەدی کوری ئەحمەدی کوری ئەبی بەکری قورتوبی لە کتێبی (التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة).
- پێشەوا سەخخاوی لە کتێبی (فتح المغيث في شرح ألفية الحديث).
- پێشەوا سیوتی لە کتێبی (العرف الوردى فى أخبار المهدى).

بەرگی سێیەم

• پێشەوا ئەبو حەججاجی موززی لە کتێبی (تهذيب الكمال).

• پێشەوا مەرعی کوڕی یوسفی حەنبەلی لە کتێبی (فوائد الفكر في ظهور المهدي المنتظر).

• پێشەوا ئیبنو حەجەری هەیسەمی مەککی لە هەردوو کتێبی (الصواعق المحرقة) و (القول المختصر في علامات المهدي المنتظر).

• پێشەوا ئیبنو قەییم لە کتێبی (المنار المنيف).

• پێشەوا ملا علي قاری لە هەردوو کتێبی (رسالة المهدي ما آل الرسول) و (المشرب الوردي في مذهب المهدي).

• پێشەوا محەممەدی کوڕی جەعفەری کەتتانی لە کتێبی (نظم المتناثر من الحديث المتواتر).

• پێشەوا محەممەدی کوڕی عەبدولباقی زەڕقانی لە کتێبی (شرح المواهب).



**ئەوانەی فەرموودەکانی مەهدیان بە صەحیح و ڕاست و دروست داناوە:**

• پێشەوا سوفیانی سەوری.

• حافیزی سوهەیلی لە (الروض الأنف).

• ئەبو حەسەنی سەمهودی.

• شێخ عەبدورڕەئوف مەنناوی لە کتێبی (فيض القدير).

• محەممەد بەشیر سەهسوانی لە کتێبی (صيانة الانسان).

• شێخ محەممەد ئەنوەر کشمیری لە کتێبی (عقيدة الإسلام).

• شێخ ئەحمەد محەممەد شاکر لە تەخریجی موسنەدی ئیمامی ئەحمەد[١].

---

(١) المهدي المنتظر، لا ٤٧ .

نـــاوی ئەو هـاوەڵانەی کە لە پێغەمبەری خوداوە فـەرموودەکانی محەممەدی مەهدیان ریوایەت کردووە :

١ـ عوثمانی کوری عەفان.

٢ـ عەلی کوری ئەبی تاڵیب.

٣ـ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا.

٤ـ عەبدورڕەحمانی کوری عەوف.

٥ـ حوسەینی کوڕی عەلی.

٦ـ ئوم سەلەمە.

٧ـ ئوم حەبیبە.

٨ـ عەبدوڵلای کوری عەباس.

٩ـ عەبدوڵلای کوری مەسعود.

١٠ـ عەبدوڵلای کوری عومەری کوری خەتاب.

١١ـ عەبدوڵلای کوری عەمری کوری عاص.

١٢ـ ئەبو سەعیدی خدری.

١٣ـ جابری کوری عەبدوڵلای ئەنصاری.

١٤ ئەبو هورەیرە.

١٥ـ ئەنەسی کوری مالیك.

١٦ـ عەممماری کوری یاسر.

١٧ـ عەوفی کوری مالیك

١٨ـ ثەوبان.

١٩ـ قرەی کوری ئیاس.

٢٠ـ عەلی هیلالی.

٢١ـ حوذەیفەی کوری یەممان

٢٢ـ عەبدوڵلای کوری حارث.

٢٣ـ عیمرانی کوری حوصەین.

٢٤ـ ئەو توفەیل.

٢٥ـ جابری کوری ماجد.

٢٦ـ ئەبو ئەیوبی ئەنصاری.

٢٧ـ ئەبو ئومامەی باهیلی.

٢٨ـ عەباسی کوری عەبدولموتەڵیب

٢٩ـ تەمیمی داری.

٣٠ـ عائیشەی کچی ئەبی بەکر.

٣١ـ عەمری کوری مورڕە[١].

(ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێت)

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٦٧.

### ئەوانەی فەرموودەی مەهدیان تەخریج کردووە

• پێشەوا بوخاری لە کتێبی (صحيح البخاری) کە تێیدا جێگیر بووە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای نوێژ دەکات، هەر چەندە بە ڕاشکاوانە باسی مەهدی نەکراوە.

• پێشەوا موسلیم لە کتێبی (صحيح مسلم) کە تێیدا جێگیر بووە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای نوێژ دەکات، هەر چەندە بە ڕاشکاوانە باسی مەهدی نەکراوە.

• پێشەوا ئەبو داود لە (سونەنەکەی).

• پێشەوا ترمذی لە (جامیعەکەی).

• پێشەوا ئیبنو ماجە لە (سونەنەکەی).

• پێشەوا نیسائی لە (سونەنی کوبرا).

• پێشەوا ئەحمەد لە (موسنەدەکەی).

• پێشەوا ئیبنو حیبان لە (صەحیحەکەی).

• پێشەوا حاکم لە (موستەدرەك).

• پێشەوا ئەبوبەکر کوڕی ئەبی شەیبە لە (موصەننەف).

• پێشەوا ئەبوبەکر ئیسماعیلی لە (معجم شیوخه).

• پێشەوا عەبدوڕڕەزاقی کوڕی هەمام صەنعانی لە (موصەننەفەکەی).

• پێشەوا نوعەیمی کوری حەمادد لە کە کتێبی (الفتن).

• پێشەوا ئەبو نوعەیم لە کتێبی (المهدی).

• پێشەوا تەبەڕانی لە هەر (سێ موعجەمەکەی) و (موسنەدی شامیین).

• پێشەوا داره قوتنی لە (الأفراد).

• پێشەوا بارودی لە (معرفة الصحابة)(١).

• پێشەوا ئەبو یەعلای موصلی لە (موسنەدەکەی).

• پێشەوا بەززار لە (موسنەدەکەی).

• پێشەوا حاریسی کوری ئەبی شەیبە لە (موسنەدەکەی).

• پێشەوا خەتیبی بەغدادی لە هەردوو کتێبی (المتفق والمفترق) و (تلخیص المتشابه).

• پێشەوا ئیبنو عەساکیر لە (تاریخەکەی).

• پێشەوا ئیبنو مەندە لە (تاریخ أصبهان).

• پێشەوا معمری کوری راشید لە (جامیعەکەی).

• پێشەوا هەیسەمی کوری کولەیبی شاشی لە (موسنەدەکەی).

• پێشەوا ئەبو حەسەنی حەربی لە (الحربیات).

• پێشەوا ئیبنو جەریر لە (تهذیب الآثار).

• پێشەوا ئەبوبەکری مەقری لە (موعجەمەکەی).

• پێشەوا ئەبو عەمری دانی لە (سونەنەکەی).

• پێشەوا ئەبو غەنەمی کوففی لە کتێبی (الفتن).

• پێشەوا دەیلەمی لە (موسنەدی فیردەوس).

• پێشەوا ئیبنو جەوزی لە (تاریخەکەی).

• پێشەوا ئەبو حەسەنی موری مونادی لە کتێبی (الملاحم).

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٦٨.

- پێشەوا بەیهەقی لە کتێبی (دلائل النبوة).
- پێشەوا یەحیای کوڕی عەبدولحەمید لە (موسنەدەکەی).
- پێشەوا ڕەویانی لە (موسنەدەکەی).
- پێشەوا ئیبنو سەعد لە (الطبقات).
- پێشەوا ئیبنو خوزەیمە[1].
- پێشەوا حەسەنی کوڕی سوفیان.
- پێشەوا عومەری کوڕی شبە.
- پێشەوا ئەبو عوانە لە (موسنەدەکەی) کە تێیدا جێگیر بووە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای نوێژ دەکات، هەر چەندە بە ڕاشکاوانە باسی مەهدی نەکراوە[2].

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٦٩.

(٢) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٦٩.

## ئەو زانایانەی کە فەرموودەکانی محەممەدی مەهدیان کردۆتە بەڵگە

• پێشەوا سوفیانی کوری سەعیدی ثهوری لە ساڵی (١٦١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو داود خاوەنی پەرتوکی (السنن) لە ساڵی (٢٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو عیسای ترمذی خاوەنی پەرتوکی (الجامع) لە ساڵی (٢٧٩) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو جەعفەری عوقەیلی خاوەنی پەرتوکی (الضعفاء) لە ساڵی (٣٢٣) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا حەسەنی کوری عەلی کوری خەلەفی بەربەهاری خاوەنی پەرتوکی (شرح السنة) لە ساڵی (٣٢٩) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حوسەین ئەحمەدی کوری جەعفەر لە ساڵی (٣٣٦) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حیبانی بەستەوی خاوەنی پەرتوکی (الصحیح) لە ساڵی (٣٥٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حەسەنی محەممەدی کوری حوسەینی سەجزی خاوەنی پەرتوکی (مناقب الشافعی) لە ساڵی (٣٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو سولەیمانی خەتابی خاوەنی پەرتوکی (معالم السنن) لە ساڵی (٣٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا بەیهەقی خاوەنی پەرتوکی (السنن الکبری) لە ساڵی ٤٥٨ کۆچی دوایی کردووە[1].

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعیل المقدم، لا ٧٠.

بەرگی سێیەم

• پێشەوا قازی ئەبوبەکری عەرەبی خاوەنی پەرتوکی (عارضة الأحوذي) لە ساڵی (٥٤٣) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا قازی عیاض خاوەنی پەرتوکی (الشفا) لە ساڵی (٥٤٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا سوهەیلی خاوەنی پەرتوکی (الروض الأنف) لە ساڵی (٥٨١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو فەرەجی جەوزی خاوەنی پەرتوکی (کشف المشکل) لە ساڵی (٥٩٧) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئیبنو ئەسیر خاوەنی پەرتوکی (جامع الأصول) لە ساڵی (٦٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا زەکیەددین عەبدوالعظیمی کوری عەبدولقەوی مونذیری، لە ساڵی (٦٦٥٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا قورتوبی خاوەنی پەرتوکی (التذکرة) لە ساڵی (٦٧١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری ئەحمەدی قەستەڵانی لە ساڵی (٦٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەحمەدی کوری تەیمیە خاوەنی پەرتوکی (منهاج السنة النبوية) لە ساڵی (٧٢٨) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حەججاجی موززی خاوەنی پەرتوکی (تهذيب الکمال) لە ساڵی (٧٤٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا حافیزی زەهەبی خاوەنی پەرتوکی (المنتقى من منهاج الاعتدال) لە ساڵی (٧٤٨) کۆچی دوایی کردووە[1].

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٧١.

• پێشەوا ئیبنو قەییمی جەوزی خاوەنی پەرتوکی (المنار المنيف في الصحيح والضعيف) لە ساڵی (٧٥١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا عیمادەددینی کوری کەسیری قورەشی دیمەشقی خاوەنی پەرتوکی (نهاية البداية والنهاية) لە ساڵی (٧٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوری موسای شاتبی خاوەنی پەرتوکی (الاعتصام) لە ساڵی (٧٩٠) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا نورەددینی هەیسەمی خاوەنی پەرتوکی (مجمع الزوائد) لە ساڵی (٨٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا شەهابەددینی ئەحمەدی کینانی بوصەیری خاوەنی پەرتوکی (مصباح الزجاجة في زوائد ابن ماجة) لە ساڵی (٨٤٠) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی خاوەنی پەرتوکی (فتح الباري) لە ساڵی (٨٥٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا سەخخاوی خاوەنی پەرتوکی (فتح المغيث) لە ساڵی (٩٠٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا سیوطی خاوەنی پەرتوکی (العرف الوردي في أخبار المهدي) لە ساڵی (٩١١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حەسەنی سەمهودی لە ساڵی (٩١١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئیبنو حەجەری هەیتەمی خاوەنی پەرتوکی (القول المختصر في علامات المهدي المنتظر) لە ساڵی (٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا عەلی موتتەقی هیندی خاوەنی پەرتوکی (الرد على من حكم وقضى أن المهدي الموعود جاء ومضى) لە ساڵی (٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە[1].

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٧٢.

• پێشەوا مەلا عەلی قاری خاوەنی پەرتوکی (مرقاة المفاتیح) لە ساڵی (١٠١٤) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا عەبدورڕەئوف موناوی خاوەنی پەرتوکی (فیض القدیر) لە ساڵی (١٠٣١) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا مەرعی کوری یوسفی حەنبەلی لە ساڵی (١٠٣٣) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا بەرزنجی خاوەنی پەرتوکی (الإشاعة لأشراط الساعة) لە ساڵی (١١٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری عەبدولباقی زورقانی لە ساڵی (١١٢٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا ئەبو حەسەن محەممەدی کوری عەبدولهادی سندی لە ساڵی (١١٣٨) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری ئیسماعیلی صەنعانی لە ساڵی (١١٨٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری ئەحمەدی سەففارینی خاوەنی پەرتوکی (لوامع الأنوار البهیة) لە ساڵی (١١٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری عەبدولوەهاب خاوەنی پەرتوکی (الرد علی الرافضة) لە ساڵی (١٢٠٦) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری عەلی شەوکانی خاوەنی پەرتوکی (التوضیح) لە ساڵی (١٢٥٠) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەد صدیق حسن خان خاوەنی پەرتوکی (الإذاعة) لە ساڵی (١٣٠٧) کۆچی دوایی کردووە[1].

بەرگی سێیەم

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعیل المقدم، لا (٧٢ ـ ٧٣).

• پێشەوا محەممەد بەشیر سەهسەوانی هیندی خاوەنی پەرتوکی (صیانة الإمسان) لەساڵی (١٣٢٦) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا شەمس الحەق ئابادی خاوەنی پەرتوکی (عون المعبود) لە ساڵی (١٣٢٩) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەدی کوری جەعفەری کەتتانی لە ساڵی (١٣٤٥) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا محەممەد ئەنوەر شاە کشمیری ساڵی (١٣٥٢) کۆچی دوایی کردووە.

• پێشەوا عەبدوڕڕەحمان موبارەکفوری لە ساڵی (١٣٥٣) کۆچی دوایی کردووە.

لە زانایانی سەردەم:

• پێشەوا عەبدی کوری حەمید.

• پێشەوا عەبدوڕڕەزاقی کوری هەمامی سەنعانی خاوەنی (المصنف).

• پێشەوا ئەبو سعود ئیدریسی عێراقی.

• پێشەوا محەممەدی شەهرەزوری.

• پێشەوا محەممەد عەرەبی فاسی.

• پێشەوا ئەبو زەید عەبدوڕڕەحمان فاسی.

• پێشەوا ئەبو عەبدوڵلا محەممەد جەسوس.

• پێشەوا عەبدولغەففار فارسی.

• پێشەوا عەبدولقادری کوری محەممەد سالمی شەنقیتی.

• پێشەوا محەممەد حەبیب الله شەنقیتی.

• پێشەوا ئەبو سعود ئیدریسی عێراقی.

بەرگی سێیەم

- پێشەوا مەنصور عەلی ناصف[١].
- پێشەوا محەممەد خەضیر حوسەین.
- پێشەوا محەممەد ئەمین شەنقیتی.
- پێشەوا جەلالەددین یوسف دیمەشقی.
- پێشەوا ئەحمەد محەممەد شاکر.
- پێشەوا محەممەد ناصر الدین ئەلبانی.
- پێشەوا عەبدولعەزیزی کوری عەبدوڵڵای کوری باز.
- پێشەوا محەممەد محەممەد ئەو شەهبە.
- حەممودی کوری عەبدوڵڵای تویجەری.
- عەبدولموحسینی کوری حەمد عوبباد[٢].



---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٧٣.

(٢) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ٧٤.

## ئەو زانایانەی کە پەرتوکی سەربەخۆ یان بەشێکی پەرتوکەکانیان تایبەت کردووە بە هاتنی محەممەدی مەهدی :

جگە لەوەی کە هاتووە لە پەرتوکە بەناوبانگەکان وەکو چوار سوننەنەکان و موسنەدی ئەحمەدو بەزارو ئەبی یەعلاو موسنەدی حاریسی کوڕی ئوسامەو موستەدرەك و موصەننەفی ئیبنو ئەبی شەیبەو صەحیحی ئیبنو خوزەیمەو چەندین پەرتووکی فەرموودەی تر کە باسی مەهدیان کردووەو فەرموودەیان دەربارەی ئەم پیاوچاکە هێناوە.

هەندێك لە زانایانیش ئەم فەرمودانەیان لە کتێبی تایبەتیدا کۆکردۆتەوەو ڕێگەکانیان ڕوون کردۆتەوەو دەربارەی سەنەدەکان قسەیان کردوە..

سوپاس بۆ خوای گەورە زانایانی ئیسلام هەمیشە پێشەنگ بوونە لە وردو درشتی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تەنانەت ئەگەر بە بەشێکیش بێت، لەوانە:

• پێشەوا نوعەیمی کوڕی حەمماد مامۆستای پێشەوا بوخاری، کە لە ساڵی (٢٣١) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الفتن)، کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[١].

• پێشەوا ئەبو داودی سەجستانی، کە لە ساڵی (٢٧٥) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (المهدی) کە بەشێکی تەواوی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی [٢].

• پێشەوا ئەبوبەکری کوری ئەبی خەیثەمە، کە لە ساڵی (٢٧٩) کۆچی دوایی کردووە، کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی [٣].

---

(١) عقد الدرر، لا ٤٦٠ .

(٢) سنن أبي داود (٤/ ١٠٦ ـ ١٠٩).

(٣) الروض الأنف (١/ ٢٨٠).

• پێشەوا ئەبو حوسەین ئەحمەدی كوڕی جەعفەری كوری منادی، كە لە ساڵی (٣٣٦) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە، كە بەشێكی تایبەت كردووە بە هاتنی مەهدی[١].

• پێشەوا ئەبو نوعەیمی ئەحمەدی كوری عەبدوڵلای ئەصبەهانی، لە ساڵی (٤٣٠) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە لەوانە: (صفه المهدی)، كە چل فەرموودەی ئامادە كردووە سەبارەت بە هاتنی مەهدی[٢].

• پێشەوا جەلالەددین یوسفی كوری یەحیای كوری عەلی مەقدیسی شافعی، كە لە ساڵی (٦٨٥) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە، لەوانە: (عقد الدرر في أخبار المنتظر)، كە بەشێكی تایبەت كردووە بە هاتنی مەهدی[٣].

• پێشەوا عیمادەددین ئیبنو كەثیر، كە لە ساڵی (٧٧٤) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە، لەوانە (الفتن والملاحم) كە بەشێكی تایبەت كردووە بە هاتنی مەهدی[٤].

• پێشەوا وەلیەددین ئەبو زەرعەی عێراقی، كە لە ساڵی (٨٢٦) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە، كە بەشێكی تایبەت كردووە بە هاتنی مەهدی[٥].

• پێشەوا شەمسەددین محەممەدی كوری عەبدورڕەحمانی سەخاوی، كە لە ساڵی (٩٠٢) كۆچی دوایی كردووە، خاوەنی پەرتوكێكی زۆرە، لەوانە: (ارتقاء الغرف) كە بەشێكی تایبەت كردووە بە هاتنی مەهدی[٦].

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٢١٣).

(٢) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، لا ٧٤ .

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، بتحقيق الدكتور عبدالفتاح محمد حلو لا ٥.

(٤) نهاية البداية والنهاية (١/ ٤٣).

(٥) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، لا ٧٥ .

(٦) فيض القدير (١/ ٣٦٣).

• پێشەوا ئیبنو بورەیدە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (العواصم عن الفتن القواصم) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[١].

• پێشەوا جەلالەددین عەدوڕڕەحمانی کوری ئەبی بەکری سیوطی، کە لە ساڵی (٩١١) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (العرف الوردي كتاب المهدي)[٢].

• پێشەوا ئیبنو حەجەری هەیتەمی مەککی، کە لە ساڵی (٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (القول المختصر في علامات المهدي المنتظر)[٣].

• پێشەوا ملا عەلی حسام الدینی هیندی، کە لە ساڵی (٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (البرهان في علامات مهدي آخر الزمان)[٤].

• پێشەوا ملا عەلی کوڕی سوڵتانی قاری، کە لە ساڵی (١٠١٤) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (المشرب الوردي في مذهب المهدي)[٥].

• پێشەوا مەرعی کوری یوسفی حەنبەلی، کە لە ساڵی (١٠٣٣) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (فوائد الفكر في الإمام المهدي المنتظر)[٦].

• پێشەوا محەممەد رەسول بەرزنجی، کە لە ساڵی (١١٠٣) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الإشاعة لأشراط الساعة) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٧].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، لا ٧٦ .

(٣) فيض القدير (١/ ٣٦٣).

(٤) الإذاعة، لا ١٦٣.

(٥) الإشاعة، لا ١٦٣.

(٦) فيض القدير (١/ ٣٦٣).

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

• پێشەوای فەرموودەناس ئەبو عەلا و سەید ئیدریسی کوری محەممەدی عێراقی حوسەینی، کە لە ساڵی (١١٨٩) کۆچی دوایی کردووە[١].

• پێشەوا محەممەد ئەحمەد سەففارینی، کە لە ساڵی (١١٨٩) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (البحور الزاخرة من علوم الآخرة) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٢].

• پێشەوا محەممەدی کوری ئیسماعیلی صەنعانی، کە لە ساڵی (١١٨٢) کۆچی دوایی کردووە، چەندین فەرموودەی کۆکردۆتەوە سەبارەت بە دەرچوونی مەهدی[٣].

• پێشەوا محەممەدی کوری عەلی شەوکانی، کە لە ساڵی (١٢٥٠) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (التوضيح في تواتر ما جاء في المهدي المنتظر والدجال والمسيح) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٤].

• پێشەوا محەممەد صدیق حەسەن خان، کە لە ساڵی (١٣٨٠) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الإذاعة لما كان وما يكون بين يدي الساعة) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٥].

• پێشەوا محەممەد حەبیب الله شنەقیطی، کە لە ساڵی (١٣٦٣) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الجواب المقنع المحرر في أخبار عيسى والمهدي المنتظر)[٦].

• پێشەوا مەنصور عەلی ناصف، کە لە ساڵی (١٣٧١) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (التاج) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٧].

---

(١) المهدي المنتظر، للغماري، لا ٥.
(٢) الإذاعة، لا ١٦٣ .
(٣) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، لا ٧٦ .
(٤) الإذاعة، لا ١٦٣ .
(٥) الإذاعة، لا ١٦٣ .
(٦) زاد المسلم (١/ ٣٣١).
(٧) الإذاعة، لا ١٦٣ .

• پێشەوا ئەحمەدی کوری محەممەدی کورِی صدیق، کە لە ساڵی (١٣٨٠) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (المرشد المبدي لفساد طعن ابن خلدون في أحاديث المهدي) [١].

• پێشەوا محەممەدی کوری عەبدولعەزیزی کوری مانع، کە لە ساڵی (١٣٨٥) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (تحديق النظر في أخبار الإمام المنتظر)[٢].

• پێشەوا عەبدولموحسین عوبباد، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الرد على من كذب بالأحاديث الصحيحة الواردة في المهدي)[٣].

• پێشەوا حەمودی کوری عەبدوڵڵای توەیجەری، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الإحتجاج بالأثر على من أنكر المهدي المنتظر) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی[٤].

• پێشەوا عەبدولعەلیمی کوری عەبدولعەظیم، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (الأحاديث الواردة في شأن المهدي في ميزان الجرح والتعديل)[٥].

• پێشەوا ئەبو فەضل عەبدوڵڵای کوری صدیق، کە لە ساڵی (١٤١٣) کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (المهدي المنتظر).

• پێشەوا حامد مەحمود لیمود، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (سيد البشر يتحدث عن المهدي المنتظر).

---

(١) الإذاعة، لا ١٦٣ .

(٢) المهدي، لا ٧٧ .

(٣) المهدي، لا ٧٨.

(٤) المهدي، لا ٧٨.

(٥) الإذاعة، لا ١٦٣ .

- پەرتوکی (البرهان في علامات مهدي آخر الزمان) لە نوسینی: علی حسام الدین..
- پەرتوکی (المهدي المنتظر بين حقائق أهل السنة وافتراءات الشيعة) لە نوسینی: ابراهیم ئەبو شادی.
- پەرتوکی (المهدی قادم رجل ینتظره العالم) لە نوسینی: ئەبو فیداء محەممەد عیززەت عارف.
- پەرتوکی (المهدی) لە نوسینی: محەممەد ئەحمەد ئیسماعیل المقدم.
- پەرتوکی (المهدی) لە نوسینی: عادل زکی.
- پێشەوا عەلی ئەحمد عەبدولعال تەهتەواوی، خاوەنی پەرتوکێکی زۆرە، لەوانە: (التقاء المسيحين في آخر الزمان) کە بەشێکی تایبەت کردووە بە هاتنی مەهدی.
- پەرتوکی (حقيقة الخبر عن المهدي المنتظر) لە نوسینی: صەلاحەددین هادی.

# بەڵگەی قورئانی لەسەر هاتنی محەممەدی مەهدی

هەندێك لە زانایانی ڕاڤەکارانی قورئان ئیشارەت دەدەن بە هاتنی مەهدی و ڕووداوەکانی، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

[وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾][1].

واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە قەدەغەی مزگەوتانی ماڵی خوا دەکات لەوەی کە ناوی خودایان تێدا ببرێ وە هەوڵ دەدات بۆ وێرانکردنیان ئەوانەی (قەدەغەی خوا پەرستی دەکەن لە مزگەوتەکاندا) بۆیان نییە بچنە مزگەوتەکانەوە مەگەر بە ترسەوە، هەیە بۆ ئەوان لە دونیادا ریسوایی وە لە ڕۆژی دوایی سزای گەورە.

ئەگەر سەیری ئەم دەستەواژە قورئانیە بکەین، خوای گەورە فەرموویەتی: [لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾].

پێشەوا تەبەرانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرو ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەڵێت: هەیە بۆ ئەوان لە دونیادا ریسوایی، ئەوە لە کاتێکدایە کە محەممەدی مەهدی ئەستەمبۆڵ ئازاد دەکات، ئەمە خەجاڵەتی و ریسواییە، ئەمجا لە ڕۆژی دوایی سزای گەورەیان بەسەردا دەسەپێنرێت[2].

پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەیە بۆ ئەوان لە دونیادا ریسوایی، ئەوە لە کاتێکدایە کە محەممەدی مەهدی دێت، دواتر عەمووریەو ڕۆمیەو ئەستەمبۆڵ ئازاد دەکات[3].

---

(١) سورة البقرة، الآية: (١١٤).

(٢) جامع البيان، (٢/ ٥٢٥). بتحقيق: الشيخ أحمد شاكر.

(٣) الجامع لأحكام القرآن (١/ ٣٨٥).

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەیە بۆ ئەوان لە دونیادا ریسوایی، ئەوەش لە کاتێکدایە کە محەممەدی مەهدی دەردەچێت، زۆر ڕاستە ئەمەش خەجاڵەتیە بۆیان لە دونیادا[1].

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەیە بۆ ئەوان لە دونیادا ریسوایی، ئەوە لە کاتێکدایە کە محەممەدی مەهدی هەڵدەستێت بە ئازادکردنی قوستەنتنیەو ئەستەمبۆڵ[2].

لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: [ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ ][3].

واتە: ئەی محەممەد (ﷺ) ئەگەر دەبینی کاتێ (بێ باوەڕان) زۆر دەترسن، ئینجا بە هیچ جۆرێك ڕزگاربوونیان نییە وە لە شوێنێکی نزیك (دۆزەخەوە) دەبرێن بۆ ناوی.

پێشەوا ثەعالیبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرو ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) باسی فیتنەیەکی کرد کە ڕوودەدات لە نێوان ئەهلی ڕۆژهەڵات و ئەهلی ڕۆژئاوا ئەمجا سوفیانی دەردەچێت و لە دیمەشق دادەبەزێت، دوو جەیش دەنێرێت یەکیان بۆ ڕۆژهەڵات و ئەوی تر بۆ مەدینە، هەتا دەگەنە خاکێك پێی دەڵێن: بابل لە عێڕاق زیاتر لە سێ هەزار کەس دەکوژن، زیاتر لە سکی سەد ئافرەت هەڵدەدڕن..ئەوە ڕوونە کە سوفیانی و محەممەدی مەهدی لە یەك کاتدا دەردەچن..

لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: [وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ ][4].

---

(١) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، (١/ ٢٨٥).

(٢) فتح القدير (١/ ٣٢١).

(٣) سورة سبأ، الآية: (٥١).

(٤) سورة الزخرف، الآية: (٦١).

پێشەوا موقاتیلی کوری سولەیمان دەڵێت: ئەوە مەهدیە لە کۆتایی بونەوەر، لە پاش دەرچوونی دەبێتە نیشانەیەکی هاتنی ڕۆژی دوایی.

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی :

کەسانێك دەڵێن: محەممەدی مەهدی لە هیچ ئایەتێکی قورئانی بە ڕاشکاوانە نەهاتووە، کەواتە ئێمە هیچ شتێك وەرناگرین جگە لە قورئان ؟

لە وەڵامدانەوەی ئەو گومانە دەڵێین: ئەو بانگەشەیەی کە دەکرێت جگە لە قورئان هیچ شتێکی تر وەرناگرین، ئەمە بانگەشەی موسڵمانان نییە، بەڵکو بانگەشەی مولحیدو منافیق و زەندەقیەکانە، کە هەدەفیان ئەوەیە لە ئیسلام بدەن و گاڵتە بە عەقڵی مرۆڤی بڕدوادار بکەن.

بۆیە وەرگرتنی فەرموودەو سوننە لە ئیسلام زۆر پێویست و گرنگە، تەنانەت ئەمە شتێکی زانراوە بۆ تایبەتی و گشتی، زانا و نەزان، ئەوانەی بانگەشەی ڕەتکردنەوەی سوننەت و فەرموودە دەکەن ئەوانە دژ بە قورئان وەستاونەتەوە، وە دەیانەوێت بە هەموو شێوەیەك فەرموودەو قورئان لە یەکتری جودا بکەنەوە، تەنانەت پێشەوا سیوطی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وەڵامی دوژمنەکانی سوننەتی داوەتەوە بەناوی (مفتاح الجنة في الإحتجاج بالسنة) و دەڵێت: هەر کەسێك ئینکاری فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بکات بە وتەو کردەوە، وە زانیاریشی لەسەر ئوسوڵیەتی فەرموودە هەبێت ئەوە کوفرە، وە دەردەچێت لە بازنەی ئیسلام، لەگەڵ جولەکەو گاورەکان حەشر دەکرێت.

وە پێویستە کار لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەموو شێوەیەك بکەین، ئەمەش دەتوانین بە چەند بەڵگەیەکەوە بیسەلمێنین:

**یەکەم:** پێغەمبەر(ﷺ) مەعصوم بووە لە هەموو تاوانێك، بە تایبەتی لە گەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی.

بەرگی سێیەم

دووەم: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دەستگربوون بە سوننەتەوە، تەنانەت لە هەموو کاروبارەکانی ژیانیان.

سێیەم: دەیان ئایەتی قورئانیمان هەیە کە سوننەت بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیەو شیکردنەوەی قورئان دەکات.

چوارەم: دەیان فەرموودەمان هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکردووین دەست بە سوننەتەوە بگرین ئەو کات گومڕا نابین.

پێنجەم: بە هیچ شێوەیەك ناتوانین بە تەنیا دەست بە قورئانەوە بگرین، بەڵکو دەبێت فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەبێت بۆ ئەوەی شیکاری ئایەتەکان بکات، بە نمونە: خوای پەروەردگار لە قورئان فەرموویەتی: نوێژ بکەن، بەڵام ئەگەر فەرمووده ڕوونی نەکاتەوە ئەو کات نازانین چەند ڕکات بکەین و چۆن ئەنجامی بدەین.

شەشەم: بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەوە ئەوە سەلمێنراوە کە سوننەت وەحیە وەکو قورئان.

حەوتەم: ئیجماع لەسەر ئەوە کۆکە کەوا فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بە وەحی وەرگیراوە جگە لە قورئان.

# محەممەدی مەهدی لە پەرتوکی جولەکەو گاورەکان

گومانی تێدا نییە کە دەستکاری زۆر کراوە لە تەورات و ئینجیل بەپێی سەردەم، تەنانەت ئەو پەرتوکانە لەلای جولەکەو گاورەکان زۆر پیرۆزن، پاش ئەوەی گۆڕانگاریەگی زۆریان کرد لە پەرتوکەکانیان، حیکمەتی خوای گەورە وابوو کە دەستیان نەچووە کۆمەڵێك لە گۆڕانکاری کە پەیوەستە بە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر، بۆیە لە تەورات و ئینجیل بە تەلمیح ئەوە بەدی دەکرێت کە کۆمەڵێك گۆڕانکاری و ململانێ ڕوودەدات لە کۆتایی بوونەوەر.. لەو تەلمیحاتانەش ئاماژە بە شەخسیەتی محەممەدی مەهدی دەدات کە لە کۆتایی بونەوەر دەردەکەوێت.

بە نمونە: لە سەفری روئیا دەڵێت: (وإذا بحصان يسمى راكبه (الأمين الصادق) الذي يقضي ويحارب بالعدل)[١]. واتە: بە دڵنیایی ئەو کەسەی سواری ئەسپێك بووە پێی دەڵێن: (دەستپاکی ڕاستگۆ) کە دادوەری دەکات و شەڕ بۆ دادپەروەری دەکات.

هەروەها دەڵێت: (ثم رأيت رجلاً واقفاً على جبل صهيون ومعه مئة وأربعون ألف كتاب على جباههم اسمه واسمه ابيه)[٢].

واتە: لە پاشان پیاوێکم بینی ڕاوەستا بوو لەسەر چیای سەهیۆن سەدو چل هەزار کەسی لەگەڵ بوو، لەسەر نێوچەوانیان نوسرابوو ناوی وەکو منەو وە ناوی باوکیشی.

ئەگەر سەیری ئەم دوو دەستەواژەیە بکەین ئەوە بەدی دەکەین کە مەبەست بە (الأمين الصادق) محەممەدی مەهدیە کە سواری ئەسپێکی سپی بووەو حوکم بە

---

(١) الرؤيا (١٢/ ٩).

(٢) الرؤيا (١٤/ ٢).

قورئان دەکات و ئەو پیاوانەی کە لەگەڵیانن شوێنەواری سوجدەی بە نێوچەوانیانەوە دیارە.

لە سەفری تەثنیەی ئیصحاحی چوارەم هاتووە کە دەڵێت: (إذا كثرت ذريتكم.. إنكم لن تعيشوا طويلاً بل سوف تهلكون وبيد الفتى المنتظر).

واتە: هەر کاتێك نەوەتان زۆر بوو ئەی نەوەی ئیسرائیل.. ئا ئێوە زۆر ناژین، بەڵکو لەناودەچن وە بە دەستی گەنجێکی چاوەڕوانکراو.

نوسەری ئەمریکی جین داکسۆن سەبارەت بە محەممەدی مەهدی دەڵێت:

ئەو سیفاتانەی سەبارەت بە محەممەدی مەهدی هاتوون لە کتێبی پیرۆز ئەوەیە: کە ئەم پیاوە پایتەختەکەی قودس دەبێت، ئەمجا گەنجان و ئافرەتان لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن، نزیکە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەسەڵات بگرێتە دەست، تەنانەت ویلایەتی موتەحیدەی ئەمریکا ناتوانێت هیچ بڵێت، مەهدی دەسەڵاتێکی زۆری زانست و تەکنەلۆژیا دەگرێتە دەست، بەڵکو لە هەموو گەورەکان گەورەتر ئەو موعجیزانە نییە کە لە ئاسمانەوە فەرمان بکرێت بۆی، بەڵکو موعجیزەکان زانستیەو زۆر پێشکەوتوشە تەنانەت مرۆڤ پێی سەرسوڕمان دەبێت و کاتەکان زۆر بە خێرایی دەڕوات.

ئەمە شایەتی نوسەرێکی ئەمریکیە کە پێشبینی هاتنی مەهدی دەکات و هەموو دەسەڵاتەکان دەکەونە ژێر دەستی، تا زانست دەگاتە ئەندازەیەك کە هاوشێوەی موعجیزەی زانستی پێشکەوتووە کە هەموو جیهان و زانایان سەریان سوڕ دەمێنێ[1].

---

(١) المسيح الدجال، سعيد ايوب، لا ٤٣.

# بیر و باوەڕی تاقمە ئیسلامیەکان لەبارەی محەممەدی مەهدی

سەبارەت بە هاتنی محەممەدی مەهدی چەند بیروباوەڕو تاقمێکی ئیسلامی دروست بوون، وە قسەیان کردووە لەسەر هاتنی محەممەدی مەهدی، کە ئەمانەن:

## یەکەم: بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە..

لەگەڵ ئەو فەرمودە صەحیحانەدا کۆکە کە لە دواییدا باسیان دەکەین، کە مەهدی فەرمانڕەوایەکی چاکو رێنمایە، خودا بۆ نوێکردنەوەی ئەم دینە ڕەوانی دەکات و لەسەر دەستی ئەو ئەم دینە بەرز دەکاتەوە.. ریوایەتەکانیش زۆربەیان بە سەنەدێکی ڕاست و دروست و چەسپاو گەیشتۆتە دەستمان، بەبێ ئەوەی هیچ تێك گیرانێکیش لەگەڵ عەقڵ دروست ببێت.. ئەوانەی کە لەسەر ئەم بیروباوەڕە ڕاستەقینەن، پێشەوایان ئەحمەدی کوری حەنبەل و ئیبنو کەثیر و ئیبنو تەیمیەو سیوطيء ئیبنو حەجەری هەیتەمی (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) جگە لەوانیش..

## دووەم: بیروباوەڕی شیعەی ئیمامی..

کە بیروباوەڕیان وایە مەهدی دوا ئیمامی ئەوانەو بریتیە لە ئیمامی دوانزەهەمین و ناوی (محەممەدی کوری حەسەنی عەسکەری)یە، بە بۆچونی ئەوان لە نەوەی (حوسەینی کوری عەلی)یە، نەك لە نەوەی حەسەن، بیروباوەڕیان وایە کە زیاتر لە هەزارو سەد ساڵ بەر لە ئێستا لە تەمەنی پێنج ساڵیدا چۆتە نێو ژێر زەمینی سامەڕڕا، بڕوایان وایە کە ئامادەیە لە شاران و ونە لە چاوان، ئەمەش بریتیە لەو مەهدیەی کە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکەن، بەڵام ئەم قسەی ئەوانە چ بەڵگەیەکی عەقڵی یان نەقلی لەسەر نیەو پێچەوانەی سوننەتی خوایە لە نێو مرۆڤداو لەگەڵ ژیری عاقڵاندا ناگونجێ.

سێیەم: ئەو تاقمەی بە (کیسانی) ناودەبرێن..

ئەوانە دەڵێن مەهدی (موحەممەدی کوڕی حەنەفی)یەو ئێستا زیندووەو لە کێوی (رضوی) نیشتەجێیەو لە نێوان دوو شێران دایە کە دەیپارێزن، دوو کانیاوی هەن کە ئاو و هەنگوینیان لێ هەڵدەقوڵێ، وە دەڵێن: گوایە کاتی خۆی لەگەڵ چل کەس لە هاوەڵانی بۆ ئەوێ چون و چیتر هەواڵیان نەبوە، وە دەڵێن: تا ئێستا ماون و زیندون، پاش ئەو پەنهان بونەش دەگەڕێتەوەو زەوی پڕ داد دەکا هەروەك پڕ ستەم بوە، دەڵێن: بۆیە بەم زیندانە سزا دراوە، چونکە لەبەر فەرمانی عبدولمەلیکی کوری مەروان، یان یەزیدی کوری معاویە دەرچوە.

(کوثە یری عەززە)ش ئاماژەی بۆ ئەو بیروباوەڕ کردوە کە دەڵێ:

وسبط لا يذوق الموت حتىيقود الخيل يقدمها اللواء

تغيب لا يرى فيهم زمانابرضـــوى عنده عســـل وماء

واتە: ئەو نەوەیەی تامی مردن ناچێژێ تاکو پێشڕەوایەتی کۆمەلە سوارێك دەکات و بەیداخێکیان لە پێشە، ئەمەش پەنهان بوەو ماوەیەك تێیاندا نابینرێ لە (رضوی)یەو هەنگوین و ئاوی لەلایە.

هەروەها سەییدی (حیمەری)یش لەسەر ئەم ڕاڕاوە بوە، ئەویش دەڵێ:

ألا قل للإمام فدتك نفسيأطلت بذلك الجبل المقاما

واتە: ئەرێ بە پێشەوا بڵێ، گیانم فیداتەلە مێژە ئەو کێوە جێگەو ڕێگاتە

چوارەم: مەزهەبی ئەهلی تەحلیلی و فیکر..

ئەوانەن کە توێژینەوە لەسەر عەقڵ دەکەن و بەس، هەر دەقێکی شەرعی ڕاست و دروست هاتبێت ئەو جۆرە کەسانە ڕەتی دەکەنەوە، بەڕاستی خەڵکانێکی زۆر پێی گومڕا بوونەو هەڵخەڵەتاون یەکێك لەوانەش ڕەتکردنەوەی محەممەدی

مەهدیە.. بەداخەوە کەسانێك هەن ڕەتی دەکەنەوەو بە درۆی دەزانن، لەوانە: ئەحمەد ئەمین لە کتێبی ضحى الإسلام)، هەروەها سەعد محەممەد حەسەن لە کتێبی (المهدية في الإسلام) جگە لەوانەش، بۆیە ئەو مەزهەبە مەزهەبی باتیڵە، کە ئیش لەسەر عەقڵ بکات و دەقە شەرعیەکان ڕەت بکاتەوە[1].

## دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

دەوترێت مادام سێ تاقم هەن کە هەر یەکەیان بانگەشەی مەهدیەتی خۆی بکات، ئایا ئەوە تێکەڵبوونەك دروست نابێت؟ یان دروستبوونی مەهدیەت نابێتە خوراڤیات لەگەڵ شیعەکان؟

وەڵامی ئەو پرسیارە بە چەند خاڵێك دەدەینەوە:

یەکەم: ئەم فەرموودانەی دەربارەی مەهدیەت کە هاتوون لای ئەهلی سوننەو جەماعە هەموو لە پەرتووکەکانی سوننەنەوە هاتوون، کە سەنەدەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەش لە ڕێگای هاوەڵانی دڵسۆزەوە، بەڵام هەر چەندە شیعەیە سەنەدەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمامەکانی خۆیان، هەروەکو بانگەشەی بۆ دەکەن.. کەواتە فەرموو ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ پەیوەندیەکیان بە شیعەکانەوە نییە.. وە لە شیعەوە وەرنەگیراوە.. لە پاشان مەهدی لای شیعە محەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریە خاوەنی سەرداب، بەڵام مەهدی لای ئەهلی سوننە محەممەدی کوری عەبدوڵلایە.. بۆیە بیروباڕی ئەهلی سوونە لە دۆڵێکەو بیروباوەڕی شیعەکان لە دۆڵێکی ترە.. پشت بەخوا دواتر بە درێژی باسی ئەم بابەتە دەکەم[2].

دووەم: دروست نییە بانگەشەی هەق بە باتیڵ بکەین، چونکە ڕافیزیەکان بانگەشەی مەهدیەت دەکەن لە ڕێگەی ئیمامەکانیانەوە، کە ئەمەش هیچ ڕاستیەکی نییە، چونکە بەڵگەی ڕاشکاوانەی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە.

---

(١) المهدي قادم، لا ٢٩.

(٢) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، لا ١٧٩.

سێیەم: بیروباوەڕی شیعە وایە کە کۆتا ئیمامی دوانزەهەمینیانە، کە لە تەمەنی منداڵی چووەتە سەردابەوە زیاتر لە ٥٠٠ ساڵە.. بەڕاستی هەموو عەقڵێك گاڵتەی بەم وتە سەیرو سەمەرانە دێت.. بەڵام ئەهلی سوننە وانین، بەڵکو دەڵێن: خوای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێت[١].

بەداخەوە کەسانێکیش هەن دەڵێن: هاتنی مەهدی ڕاست و دروستە بەڵام هەڵدەستن بە تەئویلکردنی، وەکو دەڵێن: مەهدی: ڕەمزە بۆ خەیر یان هیدایەتە یان چاکسازییە.. کە بەڕاستی ئەمەش بوختانێکی فاسیدە لەسەر ئەو جۆرە وێنانەی کە ئەیکێشن لە ڕێگای تەئویل کردنەوە[٢].

---

(١) رحلة الى الدار الآخرة، لا ٢٦٩ ـ ٢٧٠ .

(٢) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، لا ١٧٦.

## ئەو کەسانەی بانگەشەی مەهدیاتیان کرد

زۆر سەیرە ئەم بانگەشەی مەهدی زەمانە بەدرێژایی سەردەمە زۆرەکانی مێژوو جێگەی گرنگی خەڵك بووەو زۆر کەس بیری لەوە کردۆتەوەو کە خۆی لە خەڵکی بکاتە مەهدی و لافی ئەوە لێبدات کە خوا کردوییەتیە مەهدی و وەزیفەو کاری چاککردن و پاککردنەوەی ئەم دینەی پێ سپاردووە، تەنانەت هەندێك لە فەرمانڕەواکانی پێشوو بەخۆیان یان قەومەکانیان بۆیان هەڵبەستاوە کە مەهدین، هەندێکیشیان هەن پیاوی چاك بون و ناسناویان بۆتە مەهدی، نەك بە مەبەستی ئەو مەهدیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە فەرمووە، بەڵکو وەك گەشبینیەك بەوەی کە لە ڕیزی پێشەوا مەهدیەکاندا بێ، کە واتای ڕێناکراو دەگەیەنێ و ئەوانەن کە هەق دەڵێن و حوکمی پێ دەکەن.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین ئەویش باسی لە فیتنەکان کردو درێژەی بە باسەکەدا هەتا باسی فیتنەی ئەحلاسی[1] کرد، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فیتنەی ئەحلاس چیە؟ فەرموی: (هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ، ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ، دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي، وَلَيْسَ مِنِّي، وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِي الْمُتَّقُونَ، ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ، ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ، لَا تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا لَطَمَتْهُ لَطْمَةً، فَإِذَا قِيلَ: انْقَضَتْ، تَمَادَتْ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، حَتَّى يَصِيرَ

---

(١) (ئەحلاس) کۆی (حلس)ە کە بە واتای ئەو جلە دێ کە دەخرێتە سەر پشتی حوشتر، بۆیەش فیتنەکەی وێ چێنراوە، چونکە ئەو جلە بە حوشترەوە دەنوسێ، فیتنەکەش ئاوا بە خەڵکەوە دەنوسێ. سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٤).

پێشەوا (خەتابی) دەڵێت: واتە: ڕەنگە ئەو فیتنە لەبەر ڕەشی و تاریکی بە جلی حوشتر شوبهێنرابێ. سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٤).

پێشەوا (حەرب)یش دەڵێت: واتە: لە دەست چوونی ماڵ و کەس و کار . سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٥).

النَّاسُ إِلَى فُسْطَاطَيْنِ، فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لَا نِفَاقَ فِيهِ وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لَا إِيمَانَ فِيهِ، فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ، مِنْ يَوْمِهِ، أَوْ مِنْ غَدِهِ)[1].

واتە: ڕاکردن و ئاوارەیی و سەرو ماڵ تیاچوونە، پاشان فیتنەی خۆش گوزەرانی[2] دێت کە هەڵگیرسانی دووکەڵەکەی لە ژێر پێی پیاوێکەوە دەبێت لە ئال و بەیتی من، لافی ئەوە لێ دەدات کە لە منە بەڵام لە من نیە، بەڵکو تەنها کەسانی لە خوا ترس و پارێزگار دۆستی منن، پاشان خەڵکی ئاشت دەبنەوەو ڕێك دەکەون لەسەر پیاوێك کە باری لارەو وەك پەراسوو خوارە، پاشان فیتنەی کارەساتە ڕەشەکان دێت کە کەس نامێنێت لەم ئومەتە کە لێدانی ئەو فیتنەیەی بەرنەکەوێت، هەر کە گوترا تەواو بوو درێژ دەبێتەوە، پیاو بە باوەڕداری ڕۆژ دەکاتەوەو بە بێباوەڕی خۆری لێ ئاوا دەبێت، هەتا وای لێدێت خەڵك دەبن بە دوو بەشەوە بەشێکی باوەڕدار کە هیچ نیفاقێکی تێدا نیە، وە بەشێکی مونافیق کە باوەڕداری تێدا نیە، هەر کاتێکیش ئەوە ڕوویدا ئیتر ئەمڕۆ سبەی چاوەڕێی دەجال بکەن.

ئەو کەسانەی لە مێژوودا ویستوویانە ئەم عەقیدەی مەهدی زەمانەو سروش بۆ هاتنی بقۆزنەوەو بەکاری بهێنن وەك زانایان باسی دەکەن چەند جۆرێك بوون:

یەکەم: جۆرێکیان مەبەستیان بووە بەو بانگەشەو لافلێدانە دەست بخەنە ناو ئایین و بیشێوێنن و ماڵ و ناموسی خەڵکی داگیر بکەن.

دووەم: جۆرێکیان مەبەستیان ئەوەبوو پێی بگەنە موڵك و سەروەت و سامان و پلەی دونیایی.

سێیەم: هەندێکیان خۆیان مەبەستیان نەبووە بەڵکو خەڵکی تر بەکاریان هێناون و گاڵتەیان بە عەقڵیان کردووە، هەندێکیش لێی تێکچووەو لە ئەنجامی چلە

---

(١) صحيح: سنن أبي داود (٦/ ٢٩٤) باب: ذكر الفتن (٤٢٤٢). وقال شعيب الأرناؤوط: صحيح.

(٢) (السراء) بریتیە لەو نیعمەتەی خەڵکی تێدا شاد و ئاسوودە دەبن لەبەر زۆربوونی ماڵ و سامان و کەوتنە خۆشی، بۆیەش بەو فیتنەو ئاشوبە دانراوە، چونکە خەڵك بە هۆی ئەو خۆشیەی تێیدان تووشی گوناه و تاوان دەبن. سەرچاوە: القیامە الصغری (لا ٢٠٥).

كێشان و زوهدو عیبادەتی زۆری خۆیەوە شەیتان فریوی داوەو بیرۆكەی لەو شێوەیەی خستۆتە دڵ و مێشكی و ئەوەندەش خەڵكی دەستكەوتووە بڕوای پێ بكەن و شوێنی بكەون.

چوارەم: هەندێكیش خۆی ئاگای لە هیچ نەبووەو بەو لەقەب و ناوەش رازی نەبووە، كەچی خەڵكی هەوادارو دۆستانی ئەو بانگەشەیان بۆ كردووە.

**جا ئەوانەی بانگەشەی مەهدیاتیان دەكرد، ئەمانەن:**

یەكەم: یەكێكی تر لەوانەی لافی مەهدی لێ دەدا بریتی بوو لە عەبدوڵلای مەهدی عویەیدی) دامەزرێنەری دەوڵەتی فاتیمیەكان لە مەغریبدا كە یەكێكە لە شیعە توندڕەوەكان.

دووەم: (عوبەیدوڵلای كوڕی مەیمونی قەداح)[1] كە كابرایەكی بێدین بوو لە ساڵی (٢٥٩)ی كۆچی لە دایك بوەو لە ساڵی (٣٢٢)ی كۆچی مردوە، یەكێ بوو لەو كەسانەی كە بانگەشەی مەهدیاتی دەكرد، باپیری جولەكەیەك بوو سەر بە بنەماڵەیەكی ئاگر پەرست، بە درۆو بوختان هەڵی بەستابوو كە لە خانەوادەی پێغەمبەرە(ﷺ)، بانگەوازی دەكرد گوایە ئەو مەهدیە كە پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی راگەیاندوە، جا بوە پاشاو زاڵ بوو، كارەكەی دەستی ستاندو فرەوان بوو، نەوەكانی دەستیان بەسەر وڵاتانی مەغریب و میسرو حیجازو شام داگرت، بەهۆی ئەوانەوە كارەسات و نامۆیی موسڵمانان زۆر پەرەی سەندو تەنانەت بانگەوازی خوایەتی دەكردو دەیگوت: شەریعەت دیارو پەنهانی هەیە، ئەوانەش بریتی بوون لە پاشاكانی قەرامیط، كە دوژمنی سەرسەختی دین بون خۆیان بە عەبای رافیزە داپۆشی بوو، وایان هەڵدەبەستا گوایە لە ئالی بەیتی پێغەمبەرن(ﷺ)[2]، بێدینی و بێ بڕواییان ڕەواج پێ دەدا هەتا خودای گەورە

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٢١٣ .

(٢) المنار المنيف في الصحيح الضعيف، لإبن القيم: لا١٥٣.

ئومەتی ئیسلامی بە سەلاحەدینی ئەیوبی ڕزگار کرد، وە دەیگوت: من ئەو ئایەتەم کە دەڵێ: (خۆر لە خۆرئاوا هەڵدێ)[1].

سێیەم: (محەممەدی کوری عەبدوڵلای بەربەری تومەرت) کە مەهدی مەغریبیان بوو، لەساڵی (٤٨٥)ی کۆچی لە دایك بوو، لە ساڵی (٥٢٤)ی کۆچی مرد، پیاوێکی درۆزنی ستەمکاری دەست ڕۆیشتوو بوو، بانگەشەی دەکرد کە مەهدیەو کۆمەڵێکی لە هاوەڵانی خۆی لە نێو گۆڕی گۆڕستان داناو فەرمانی دەدانێ کە بە خەڵکی بڵێن ئەوە مەهدیە، پاشانیش بە شەو گۆڕەکانی بەسەردا دەڕوخاندن تا کارەکەی ئاشکرا نەبێ[2].

چوارەم: حوسەینی کوڕی زەکرەوەیی کە یەکێکی ترە لە پێشەوایانی قەرمەتییەکان ئەمیش بانگەشەی مەهدی بۆ خۆی لێدا.

پێنجەم: ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی کابرایەکی تر دەکات بەناوی (بلیا) کە ئەستێرە ناس بووەو ڕایگەیاندووە کە بووەتە مەهدی[3].

نۆزدەهەم: کابرایەکی تر بەناوی ئەحمەدی کوڕی عبدوڵلای کوڕی هاشم کە پێیان دەگوت (دەم هەڵبەستراو) ئەمەش بانگەشەی مەهدی ڕاگەیاند بۆ خۆی، کتێبێکی گەورەی نوسی بۆ باسکردنی حاڵ و ئەحواڵی ڕۆحی خۆی و بەیاناتێکی زۆرو زەوەندەی خۆی تێدا نوسیوەو زۆربەیان خەوو ئیلهاماتەو سوێندیش لەسەر هەموویان دەخوات (کە ڕاستن و لەخواوە بۆی هاتوون).

شەشەم: لەناو نوسەیریەکانیشدا کابرایەك بەناوی موحەممەدی کوڕی حەسەنی مەهدی (القائم بأمر الله) هەڵدەکەوێت و جارێ دەڵێ من (مەهدی)م و جارێ دەڵێ: (من عەلی کوڕی ئەبو تالیب)م[4].

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، (لا ٩٦) .

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٢١٣) .

(٣) البداية والنهاية (١٢/ ١٣٦).

(٤) البداية والنهاية (١٤/٨٣).

بەرگی سێیەم

حەوتەم: پیاوێکی ئایینی لە دووری (١٢٤)کم لە باکووری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی و لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری ڕانیەو لە ناحیەی سەنگەسەری ناوچەی پشدەرەوە بە ناوی (سەید مصطفی عەلی بەرزنجی) وەکو مەهدی خۆی ناساندو بانگەوازی مەهدیەتی ئاشکرا کرد لە ڕانیە، وە بارەگایەکی کردەوە بە ناوی (بارەگای مەهدی ڕزگارکەری جیهان)، وە نارەزایەتیەکی زۆری لە لایان خەڵك و پیاوە ئایینیەکان دروست کرد، وە ئەوەی نارەزاییەکەشی توندتر کرد، بڵاوکردنەوەی لە چاپدانی کتێبێك بوو بە ناوی (کلمات الله) کە گوایە لە لایان خواوە بە ئیلهام بۆی هاتووە، وە خەڵکێك پەیرەوی ئەو بەناو مەهدیە بوون، وە خواپەرستی ئەم کابرایە شەو نوێژو قورئان خوێندن بوو، وە هەندێ جار نزیکەی (١٠-١٥-٢٠) ڕۆژ لە ژوورێکی تاریك دەمایەوەو نەدەهاتە دەرەوە، خێزانەکەی دەڵێت: من چەند نیشانەیەکی سەیرم پێی بینیووە وەکو بوونی مۆرێك لەسەر جەستەی کە لەسەر گۆشتی سەر پشتی هەڵکەندراوەو مێردەکەی گوتویەتی: پێغەمبەرو عەلی کوڕی ئەبو تالیب و دوو فریشتە هاتوونەتە لام و ئەم مۆرەیان لە پشتم داوە، بۆیە خەڵکی دەیانگوت: ئێمە هەرگیز بڕوامان بەوە نیە کە مەهدی بێت، ئەوەشی کە لە (کلمات الله) نووسیویەتی لە لایەن جنۆکە پێی گوتراوە، تا سەرەنجام خۆی و چوار هاوڕێی تری کوژران لە ڕووداوێکی لێڵ و نادیار لە شەوی (١٩٩٢/١٠/١).

هەشتەم: یەکێکی تر پەیدابوو دەیگوت: من لەلای خواوە وەحیم بۆ دێت، وە کتێبێکیشی بڵاوکردەوە کە گوایە لە لایان خواوە بۆی هاتووە بە ناوی (کلام الله آخر ما أنزل بعد القرآن) کە لەسەر شێوەی قورئان سورەت سورەتی کردبوو وە بە(بسم الله الرحمن الرحیم) سورەتەکانی دەستی پێ دەکرد ، بەڵام دواتر خۆی و چەند هاوەڵێکی لە شاری هەولێر کوژران.

نۆیەم: پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باسی (نەمرتاشی کوڕی نوێنی جوبانی) دەکات و دەڵێ: لە ساڵی (٧٢٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە، کابرایەکی تا بڵێی ئازاو لێدەر بوو، بەڵام عەقڵ سووکیەك ڕووی تێکردبوو رایگەیاند

که بووەته (مەهدی) باوکی سەفەرێکی کرد بۆ لای و هەندێ ئامۆژگاری کردو پەشیمان بوویەوە وازی لەو بیروباوەڕە هێنا[١].

**دەیەم:** پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕووداوەکانی ساڵی (٧٢٩) دا باسی کابرایەکی تر دەکات بەناوی (أوصی) ڕۆژی جومعەی شەشی زولحیجەی ئەو ساڵەدەچێتە سەر مینبەرو هەندێ پەخشانی عاتیفی دەخوێنێتەوەو ڕایدەگەیەنێ کە بووەتە مەهدی و خەڵکی زۆر بە خراپ دایئەگرنە خوارەوەو تێری لێ دەدەن[٢].

**یانزەهەم:** کابرایەکی تر بەناو (حەسنی کوڕی عەبدوڵلا) کە کیمیازان و دەرمانسازێکی شارەزابووەو وەك پاشا ژیاوەو نەهاتووەتە ناو خەڵك و باسی دەکرێت کە شیعە بووە، چونکە نوێژی جومعەی نەکردووە، ئەوانەی هەوادارو شوێنکەوتەی بوون بەمەهدی سەردەمیان زانیوە[٣].

**دوانزەهەم:** کابرایەکی تر بەناوی (تومیزەری) کە بچووککراوەی (تەورێز)ە لەسەردەمی (ئیبنو خەلدون) بانگەشەی (مەهدی) لێ دەدات و خەڵکێکی زۆر شوێنی دەکەون.

**سێنزەهەم:** ئیبنو عیماد لە ڕووداوەکانی ساڵی (٨٤٨)ی کۆچی باسی کابرایەکی تر دەکات بەناوی (شەمسەدین موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی فورمیانی) کە بانگەشەی مەهیدبوونی کردوەو خەڵکێکی زۆریش شوێنی کەوتوون.

**چواردەهەم:** ئەبولعەباس ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلای سەجلماسی لە مەغریبدا کە ساڵی (١٠٢٢)ی کۆچی کوژراوە خۆی بە مەهدی زانیوە.

---

(١) الدرر الكامنة (٢/١٤٤).

(٢) البداية والنهاية (١٤/ ١٤٤).

(٣) شذرات الذهب، ابن العماد (٦/ ٣٥٦).

بەرگی سێیەم

بیست: موستەفا عەلی ئیدریسی یەکێك بوو لەوانەی بانگەشەی مەهدیەتی دەکرد، هەتا لە ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد[١].

**پانزەهەم:** ئیبنو خەلدون باسی کابرایەکی تر دەکات لە مەغریب کە ناوی خۆی دەنێ مەهدی و خەڵکێکی زۆریش لە کەربەلاوە دەچن بۆ پشتیوانی لێ کردنی، بەڵام کە دەنگو باسی یوسفی کوڕی تاشەفین دەبیستێ کە نزیك بووەتەوە لە تەلمەسان بەخەڵکەکە دەڵێ: هەڵەیەکی خراپمان کردو بڕۆنەوە جارێ کاتی ئەوە نیە[٢].

**شانزەهەم:** یەکێکی تر لەو کەسانە کە لە هیندیستانەوە لافی (مەهدیەتی لێدا بریتی بوو لە محەممەدی کوڕی یوسفی جونبوری کە ساڵی (٩١٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

**حەڤدەهەم:** لە شاخەکانی شارەزوورەوە کابرایەك لە دێی (ئەزمك) پەیدا بوو ناوی محەممەد بوو، ڕایگەیاند کە بووەتە محەممەدی مەهدی خەڵکێکی زۆریش شوێنی کەوتن.. دواتر ئەمیری شار (ئەحمەد خان کوردی) بڕیاری گرتنی بۆ دەرکرد، ئەویش هەڵات، ئەمجا براکەی گرت و گوندەکەی تێکدا، ئەوانەی شوێنی کەوتن داوای تەوبەیانی لێکرد، دواتر تەوبەیان نەکردو کوژران، دواتر زانایانی کوردستان کۆبوونەوەو بڕیاری فەتوای کافربوونیان دا، داوای دووبارە بڕوا نوێبوونەوەیان لێکرد، داوای عەقدی هاوسەرگیریان لێکرد سەر لە نوێوە، ئەمجا تەوبەی کردو گەڕایەوە[٣].

**هەژدەهەم:** هەندێك کەس لە خۆشەویستیدا بۆ پێشەوای موجاهید (موحەممەد ئیسماعیلی کوڕی عبدالغنی دهلەوی) کە لەشەڕی سیخیەکاندا لە ساڵی ١٢٤٦ کۆچی بەشەهیدی سەری نایەوە دەڵێن: ئەو پیاوە مەهدی زەمانە بوو.

---

(١) المهدي، عادل زكي، لا ٣٠٦.

(٢) المقدمة، لا ٢٦٠.

(٣) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٧.

نۆزدەهەم: لە شاخەکانی (عەقرە) یان لە (عیمادیە)ی ناوچە کوردییەکاندا کابرایەك هەبوو بەناوی (عەبدوڵلا) بانگەشەی ئەوەی کرد کە شەریفی حوسەینەو منداڵێکی دوانزەساڵانی هەیەو ناوی ناوە (محەممەد) و بەمەهدی بانگی ئەکات[1].

بیست: یەکێکی تر لەو کەسانەی کە لافی (مەهدیەت)ی لێداوە بریتیە لە (محەممەدی ئەحمدی سودانی) کە لەساڵی (١٨٨٥) کۆچی دوایی کردووە[2].

بیستویەك: یەکێکی تر لەوانەی بانگەوازی بە مەهدی بوونی راگەیاند (میرزا عەلی موحەممەد رەزای شیرازی بوو) کە سەرۆکی تاقمی (بەهائیەکان) و لە ئێرانەوە سەریان هەڵدا.

بیست و دوو: پاشان میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی کە لە ساڵی ١٢٥٢ی کۆچی لە دایك بووە ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەو (مجدده)و ئیلهامی بۆ دێت پاشان دەڵێت: مەهدی زەمانەم، پاشان لیستی ڕەشی خۆیی بەوە مۆرکردو کۆتایی پێهێنا کە گوتی من پێغەمبەرم[3].

بیست و سێ: موحەممەدی کوری عەبدوڵلای قەحتانی لە ساڵی (١٩٨٠) لە یەکەم ڕۆژی مانگی محەڕڕەم ڕایگەیاندو دەیگوت: من محەممەدی مەهدیم[4].

بیست و چوار: کابرایەکی تر لە کوێت بەناوی حوسێنی کوری موسای کوری حوسینی لحێدی لافی مەهدیەتی لێداو سەرەتا دەیگوت: من باپیری مەهدی زەمانەمی پاش ماوەیەك گوتی: من خودی مەهدیم.

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، (لا ٩٧).

(٢) المهدي، عادل زكي، لا ٣٠٦.

(٣) التصريح، (لا ٣٨) .

(٤) المهدي، محمد اسماعيل المقدم، (لا ٤٣٣).

بیست و پێنج: محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای حەسەن (مەهدی سۆماڵی) لە ساڵی ١٨٩٩ بانگەشەی مەهدی بوونی کرد، هەتا لە ئەسیوبیا کۆچی دوایی کرد[١].

بیست و شەش: پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەواڵم زانی کە شێخێکی گەورە هەیە لەناو موریدو مەنسوبەکانیدا دەڵێ: من ئەو مەهدی زەمانەم کە پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی هاتنی داوە، پیاوێکیش هەڵدەستێ کچێکی خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەوەی مارەی ببڕێ لێی، وە دوارۆژو ناوچەوانی هەموو پاشاو ئەولیاکان بەدەستی ئەوەو هەر کەسێك بیەوێ ئەو دادەمەزرێنێ و بیەوێ ئەو عەزل دەکات و خوای گەورە بەردەوام موناجاتی لەگەڵدا دەکات[٢].

بیست و حەوت: مەهدی توهامە: لە ساڵی ١١٥٩ ع لە یەمەن سەری هەڵدا، دەشتەکیەکی زۆر شوێنی کەوتن[٣].

چل و یەك: لەم ماوەیەدا یەکێك پەیدابوو لە یەکێك لە وڵاتان دەیگوت: من(موحەممەدی مەهدی)م، وە نامەی بۆ (جۆرج بۆش) ناردووە کە سوێند دەخوات و دەڵێت: من (موحەممەدی مەهدی)م.

بیست و هەشت: یەکێکی تر پەیدابووە لە گەڕەکی برایەتی لە شاری هەولێر دەڵێت: من (موحەممەدی مەهدی)م، ئەم بانگەشە کەرەیە جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو کەسانەی داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن، لەناو خەڵکدا خۆی بە موحەممەد ناساندبوو، لە ساڵی (١٩٩٦)ع هاتۆتە کوردستان و پێنج ژنی هێناوەو زۆربەیانی تەڵاق داوە، تەنها یەکێکیانی لەلا ماوە کە بەم نزیکانە هێناویەتی، وە ئەم کابرایە خەڵکی (کیب تاون)ە لە ئەفەریقیا .

---

(١) المهدي، عادل زكي، لا ٣٠٦.

(٢) الرد على البكري: (٤٢٧٩/١).

(٣) المهدي، عادل زكي، لا ٣٠٥.

بەرگی سێیەم

ئەو کابرایە کار ناکات و لە سەر حیسابی خەڵکی دەژی، لەگەڵ ئەوەشدا کە کار ناکات بەردەوامیش بە خواردنی گران بەها دەخواتن دەبێتە بارگرانی بەسەر شوێنەکەوتوانی.

چەندین فەتوای جۆراو جۆری داوە کە لەگەڵ دەقی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) یەك ناگرێتەوەو دژ بە یەکن بۆ نمونە :

لە بارەی نوێژەوە دەیگوت: دروستە نوێژ بکرێ بەبێ دەست نوێژ بە مەرجێ ئەوەی دەست نوێژ بشوات و دە ڕکاتی یەکەمی بکات، ئەگەر نوێژی سونەت بێت یان لە نێوان هەر پێنج نوێژە فەرزەکان بێت، لە بارەی کارەبا و تەلەفزیۆنەوە دەڵێت : تەلەفزیۆن دەجالەو کارەباش حەرامە بە بەڵگەی ئەوەی کە کارەبا شەوی کردۆتە ڕۆژ ئەوا بە پێچەوانەی ئایەتی خودایە، بەڵگەشی هەندێ شاری ئەوروپایە کە شەوەکانیان وەکو ڕۆژ وایە، وە دروست نیە گوێ لە قورئان بگری لە تەلەفزیۆندا، وە دروست نیە سەیری بەرنامە ئایینیەکان بکرێ، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە بانگەشە کردنی (محەممەدی مەهدی)یاتی بۆی نەچۆوە سەر، وە زانرا ئەو کەسە کێیەو مەبەستی چیەو بە دوای چیە؟ ئەم کەسە وەك خۆی دانی پێداناوە کە زانیاری زۆری لە کتێبی (شمس المعارف الکبری) هەیە و وە زانیاریشی زۆری لە بارەی پاڕاسایکلۆژی هەیە، کە بەم ڕێگایانە دەتوانێ کاری سیحر بەکار بهێنرێت و کاری لەسەر بکرێت .

بیست و نۆ: پیاوێکی کورد لە ئاکرێ ناوی عەبدوڵلا بوو، بانگەشەی ئەوەی دەکردو دەیگوت: من حوسەینیم، منداڵێکی تەمەن دوانزە ساڵانی هەبوو ناوی نابوو محەممەد لەقەبەکەی مەهدی بوو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کوڕەکەی مەهدیە، خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن.. هەتا چوونە ئەستەمبۆڵ و لەوێش هەموویان کۆچی دواییان کرد[1].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٢١٥.

سی: محەممەد جۆنفۆری: پیاوێکی هیندی بوو کە بانگەشەی مەحەممەدی مەهدیاتی دەکرد، خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن، لە کۆتایی پاش ماوەیەك لە بانگەشەکەیدا مرد[١].

تەنانەت ئێستا جۆرە بیروباوەڕێك لە هیندستان هەیە کە ناسراون بە (مەهدەوی) یان (قیتالی)، هەر کەسێك پێیان بڵێت: ئێوە بیروباوەڕەکەتان هەڵەیە یەکسەر دەیکوژن[٢].

سی و یەك: تیمیرتاشی کوری نوینی جوبان کە لە ساڵی ٧٢٨ کۆچی کوژرا، یەکێك بوو لەوانەی کە بانگەشەی مەهدی بوونی دەکرد، تەنانەت ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پیاوێکی ئازاو بە جەرگ بوو، بەڵام عەقڵی خەفیف بوو، وە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە کۆتایی بونەوەر دەردەچێت، ئەو وتەیەی گەیشتەوە باوکی، باوکیشی ڕەتی بیروباوەڕەکەی دەکردەوە[٣].

سی و دوو: ئەحمەدی کوری عەبدوڵلای کوری هاشم کە ناسراوە بە (مەلثەم)، لە ساڵی ٦٥٨ی کۆچی لە دایك بووە: زۆر جار دەیگوت: خوای گەورەم بینیوە یان بەرزکراومەتەوە بۆ ئاسمانەکان لەوێوە بەرەو سیدرەت و لمونتەها ڕۆیشتووم، هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە گوتی: مەهدی لە ساڵی ٧٣٤ ی کۆچی دەردەچێت، بە وتەی خۆی دەیگوت: لە خەودا پێم دەڵێن: ئەتوو مەهدی، بۆیە لە ساڵی ٧٤٠ کۆچی دوایی کرد[٤].

سی و سێ: محەممەدی کوری یوسفی حوسەینی جونبوری: لە ساڵی ٨٤٧ ی کۆچی لە شاری جونبوری ڕۆژهەڵاتی هیندستان لە دایك بووە، بە دوای هەندێك زانست کەوت لەلای مامۆستایەکانی دواتر دەچووە چیاکان و بیابانەکان

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٦.

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٦.

(٣) الدرر الكامنة (٢/ ٥٣).

(٤) الدرر الكامنة (١/ ١٩٧).

لەوێ دەژیا، کە گەڕایەوە بانگەشەی مەهدی بوونی دەکرد، خەڵکێکی زۆر پێی گومڕا بوون، لە ساڵی ٩٠١ ی کۆچی چووە حەج و لە خاکی مەککە بانگەشەی مەهدی بوونی خۆی دەکرد، وە لە ساڵی ٩١٠ کۆچی دوایی کرد[١].

سی و چوار: محەممەدی کوڕی ئەمجەد کە ناسراوە بە (ئەبو بەغلە) لە ساڵی ١٢٦٧ی کۆچی بانگەشەی مەهدیەت بوونی خۆی دەکرد و دەیگوت: خوای گەورە منی ناردووە بۆ ناو مەغریب (جەزائیر) بۆ ئەوەی پاکسی بکەمەوە لە گاورەکان، وە هۆزێکی زۆر باوەڕیان پێی کرد[٢].

سی و پێنج: لە ساڵی ١٢١٣ی کۆچی ئەو کاتەی فەڕەنسا میسڕی داگیر کرد، پیاوێك سەری هەڵدا لە تەڕابوڵس کە بانگەشەی مەهدیەت بوونی دەکرد، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی فەڕەنسا کوژرا[٣].

سی و شەش: لە ساڵی ١٨٢٨ پیاوێك لە سەنغال بانگەشەی مەهدیەت بوونی دەکرد، هەتا ڕاپەڕینێکی دروست کرد، دواتر تێکشکان و پاشماوەیان نەما[٤].



---

(١) نزهة الخواطر وبهجة المسامع والنواظر (٧/ ٣٢٤).

(٢) أعلام المغرب العربي (١/ ٢٩٢).

(٣) المهدي، عادل زكي، لا ٣٠٦.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# ئەوانەی بانگەشەی مەهدیەتیان بۆ هەڵبەستبرابوو

هەندێك کەس خۆیان ئاگایان لە هیچ نەبووەو بەو لەقەب و ناوەش رازی نەبوونە بە هیچ شێوەیەك، کەچی خەڵکی هەوادارو دۆستانی ئەو بانگەشەیان بۆ کردووە.

ئەمەش چەند نمونەیەکە لەوانە:

یەکەم: یەکەم کەس کە ناوی (مەهدی) لێنرا بریتی بوو لە موحەممەدی کوری عەلی کوڕی ئەبوتالیب کە بە موحەممەد بن حەنەفیە ناو دەبرا.

دووەم: هەندێکی تر (موسای کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلای تەمیمی قورەیشیان بە بە (مەهدی) دەزانی[١].

سێیەم: شیعە موحەممەدی باقریان بە (مەهدی) دەدایە قەڵەم، بەڵام بەڕەحمەت بێت خۆی نکوڵی لەوە دەکردو نەیئەسەلماند.

چوارەم: هەندێك عومەری کوری عەبدولعەزیزیان بە (مەهدی) دەزانی و ئەو دادو خۆشگوزەرانیەی کە لەسەردەمی ئەودا دەیانبینی قەناعەتی بۆ دروست کردبوون کە گوایە عومەر پێدەچێ کە مەهدی بێت، هەرچەندە خۆشی ئاگای لەم شتە نەبوو[٢].

ئیبراهیمی کوری مەیسرە دەڵێت: بە تاوسم گوت: ئەی تاوس ئایا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز مەهدیە؟ گوتی: نەخێر[٣].

---

(١) سير أعلام النبلاء، (٤/ ٣٦٦).

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ١٠١.

(٣) اخرجه ابن ابي شيبة في (المصنف) (١٤/ ١٨٢) برقم: (٣٨٦٤٨).

بەرگی سێیەم

**پێنجەم:** صاڵحی کوری تەریفی بەرغواتیش لافی مەهدییەت و پێغەمبەراتیشی لێدا.

**شەشەم:** محەممەدی کوری عەبدوڵلا ناسراو بوو بە (النفس الزکیة)، ئەویش یەکێك بوو لەوانەی کە چەندین کەس ناوی (مەهدی)یان لێ ناو پشتیوانیشیان کردو شۆڕشی دژ بە ئەبوجەعفەری مەنصور راگەیاندو ئەوەبوو لە کۆتاییدا کوژرا[1].

**حەوتەم:** یەکێکی تر لەوانەی ناوی (مەهدی)یان لێنا بوو لە (جەعفەری صادق) کوڕی موحەممەدی باقر بوو، هەندێك لە شیعەکان بڕوایان وایە کە ئەو نەمردووەو جارێکی تر دێتەوە ناو خەڵك و ئەو (مەهدیە)[2].

**هەشتەم:** هەندێك موسای کوڕی بە (مەهدی) دەزانن و بڕوایان وایە ئەو (مەهدیە).

**نۆیەم:** کوڕێکی تری جەعفەری صادق بەناوی (محەممەد) لافی مەهدی بوونی لێدا.

**دەیەم:** هەندێکی تر موعاویەی کوڕی عەبدوڵلای کوری جەعفەری کوری ئەبو تاڵیب بەمەهدی دەزانن و قەناعەتیان وایە لە یەکێك لە شاخەکانی ئەصفەهاندایەو ئێستاش زیندووە.

**یانزەهەم:** هەندێکی تر موحەممەدی کوری ئیسماعیلی کوری جەعفەری صادق بە مەهدی ئەزانن.

**دوانزەهەم:** هەندێکی تر موحەممەدی مەهدی کوڕی ئەبو جەعفەر بە مەهدی دەزانن.

**سێنزەهەم:** محەممەدی کوری حەسەنی عەسکەری، کە لە نەوەی حوسەینی کوڕی عەلیە، ڕافیزیەکانی ئیمامی دەڵێن: مەهدی چاوەڕوانکراوە، چووەتە ناو سەردابی سامەڕا، لە هەموو وڵاتان ئامادەیەو لەبەرچاوی خەڵکی زۆر نادیارە، ئەو کاتەی چووەتە سەردابیش تەمەنی لە پێنج ساڵی تێپەڕی نەدەکرد[3]. پشت بەخودا دواتر بە درێژی باسی ئەو بابەتە دەکەین.

---

(١) البداية والنهاية (١٠/ ٨٤).

(٢) منهاج السنة، ابن تيمية، (٣/٤٨٠).

(٣) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٩.

بەرگی سێیەم

**چواردەهەم:** محەممەدی کوڕی حەنەفییە: کیسانیەکان[١] بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا محەممەدی مەهدی بێت، وە ئێستا کەسێکی زیندووەو لە چیای (رضوى)[٢] یە، وە دوو شێر پارێزگاری لێدەکەن، وە ڕۆژێك دێت دەگەڕێتەوەو زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری، تەنانەت موختاری کوڕی ئەبی عوبەیدی ثەقەفی بانگەشەی ئیمامەتی محەممەدی کوڕی حەنەفییەی دەکرد، دەیگوت: محەممەدی مەهدی موژدە پێدراوە.. بەڵام محەممەد ڕووبەڕووی ئەو وتەیە دەوەستایەوەو دەیگوت: من بێ بەریم لەو قسەیە[٣].

**پانزەهەم:** ئەحمەدی کوڕی عیرفانی بەریلوی پێشەوای شەهید: خەڵکێکی زۆرو هەندێك لە کەسە تایبەتمەندیەکانی دەیانگوت: ئەوە مەهدیە کە لە فەرموودەکاندا موژدەی ئەوەی پێدراوە، بۆ خۆشی هەمووی ڕەت دەکردەوە ئەو دەنگۆیانە، بۆیە لە ساڵی ١٢٤٦ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد[٤].

**شانزەهەم:** هەندێك دەیانگوت: مەهدی کوڕی مەنصور سێیەم خەلیفەی بەنی عەباس، وە بەڵگەیان چەندین بابەتی داهێنراو بوو، وە دەیانگوت: ئەو مەهدیەی لە کۆتایی بونەوەر دەردەچێت ئەوە مەهدی مەنصورە[٥].

**حەڤدەهەم:** محەممەدی کوڕی عەبدوڵلای سەحیمی: کۆمەڵەی ئەرقامیەکان دەیانگوت: بە دڵنیایی ئەوە محەممەدی مەهدیە لە جاوا لە دایکبووە لە ساڵی ١٩٢٤، وە تەمەنیشی تەنها شەست ساڵ بووە، وە لە کۆتایی بونەوەر زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری، وە لای ئەوان بیروباوەڕیان وایە نەمردووە[٦].

---

(١) کیسانیە نیسبەت دەدرێ بۆ لای کیسان قوتابی گەورەمان عەلی کوری ئەبو تالیب (رەزای خوای لێ بێ)، بۆیە ئەوانەی کیسانین یەکێکن لە کۆمەڵە گومڕاکان. أهوال القیامە، لا ٣١.

(٢) چیای جوهەینەیە، لە شاری مەدینەیە بە حەوت قۆناغ. أهوال القيامة، لا ٣١.

(٣) أهوال القيامة، (لا ٣١).

(٤) الإذاعة (لا ١٢٣) .

(٥) المهدي حقيقة، (لا ١٥٩) .

(٦) التقاء المسيحين في آخر الزمان، (لا ١٠١).

هەژدەهەم: پێشەوا موعاویەی کوری ئەبو سوفیان (ﷺ) بانگەشەی مەهدیەتی بۆ هەڵبەسترا.

پێشەوا موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر موعاویەتان دەدیت دەتانگوت: ئەوە مەهدیە[1].

پێشەوا قەتادە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر ئەو کردەوانەی معاویەتان دەبینی بە چاوانی خۆتان ئەوە زۆرینەتان دەتانگوت: ئەوە مەهدیە[2].

پێشەوا سوبەیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر بەسەردەمی موعاویە بگەیشتبان دەتانگوت: ئەوە مەهدیە[3].

نۆزدەهەم: سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی خەلیفەی ئومەوی بانگەشەی مەهدیەتی بۆ هەڵبەسترا[4].



بیست: پێشەوا عەلی کوری ئەبو تاڵیب (ﷺ) بانگەشەی مەهدیەتی بۆ هەڵبەسترا لەلایەن عەبدوڵلای کوری سەبەئی جولەکە، دەیگوت: عەلی مەهدی چاوەڕوانکراوە، پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر دەگەڕێتەوە، بۆیە هەتا ئەو کاتەی کە عەلی شەهید کرا عەبدوڵلای کوڕی سەبەئی جولەکە دەیگوت: ئەوە عەلی نییە، عەلی بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمان هەروەکو چۆن عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) بەرزبووەتەوە بۆ ئاسمان[5].

بیست و یەك: حاریسی کوری سورەیج بانگەشەی مەهدیەتی بۆ هەڵبەسترا[6].

---

(١) أخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) (١٩/ ٣٠٨).

(٢) منهاج السنة (٦/ ٢٣٣).

(٣) العواصم من القواصم (لا ٢١١).

(٤) اخرجه ابن ابي شيبة في (المصنف) (١٤/ ١٨٢) برقم: (٣٨٦٤٧).

(٥) الملل والنحل (١/ ١٧٤).

(٦) الكامل، لابن الأثير (٥/ ١٧).

# ئایا باسکردنی محەممەدی مەهدی دەبێتە مایەی فیتنە بۆ خەڵکی؟

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

کەسانێك هەن دەڵێن: باسکردنی محەممەدی مەهدی دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی فیتنەو ناخۆشی بۆ خەڵکی، بۆیە باس نەکردنی باشترە بۆ ئەوەی هیچ کەسێك دوو دڵ نەبێت؟

**وەڵامی ئەو پرسیارە بە چەند خاڵێك وەڵام دەدەم:**

**یەکەم:** هەر شتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کردبێت لەلایەن خوای گەورەیە، جا ڕابردوو بێت یان داهاتوو، ئێستا ڕووی دابێت یان لە داهاتوو ڕوویدات.

**دووەم:** ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەر ئەوە کۆکن کە بە هاتنی مەهدی سەر زەوی پڕ دەبێت لە دادپەروەری، وە ستەم و فیتنەو ناخۆشی لەسەر زەوی نامێنێ.

**سێیەم:** هەر کەسێك بڵێت بە باسکردن و هاتنی مەهدی فیتنە ڕوودەدات ئەوە ئەو پەڕی نەزانی و جەهالەتیەتی، چونکە ناکرێت فەرموودەیەك پێغەمبەر (ﷺ) پێی هاتبێ تۆ ڕەتی بکەیتەوە یان لە ترسان باسی نەکەیت.

**چوارەم:** باس نەکردنی مەهدی دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵێك درۆزن کە بانگەشەی مەهدیەت بکەن.

ئەوانەی بانگەشە بوونی ئەم فیتنەیە بڵاودەکەنەوە کەسانێکی تێنگەیشتوون و فەرموودەکان بە گشتی ڕەت دەکەنەوە، دەڵێن: جوهەیمان یەکێك بوو لەوانەی کە بانگەشەی مەهدیەتی کرد لە کاتێکدا گەورەترین فیتنەی دروست کرد لە حەرەمی مەککی.

جوهەیمانی عوتەیبی :

لە ١٦ ی سێبتەمبەری ساڵی ١٩٣٦ لە دایك بوو، یەکێك بوو لە سەرکردە دیارەکان کە دەستی گرت بەسەر حەرەمی مەککە لە ساڵی ١٩٧٩[1].

جوهەیمان: پاسەوانی چاودێری نیشتیمانی سعودیە بوو بۆ ماوەی هەژدە مانگ پاشان خانەنشین بوو، بۆیە لە زانکۆی مەدینە ئاشنایەتی دروستکرد لەگەڵ محەممەدی کوری عەبدوڵلای قەحتانی کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی ئیبنو باز، جوهەیمان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ خوشکی محەممەدی قەحتانی بۆ ئەوەی دوای هاوسەرگیریەکە لە مانگی محەررەم ڕووداوێکی مەزن دروست بکات، وە وایان دانا لە هەر سەد ساڵێك کەسێکی نوێکاری دێتە ئاراوە، وە محەممەدی قەحتانی بەیعەتی پێداو کردیانە خەلیفەی موسڵمانان و محەممەدی مەهدی.

خەڵکانێك بڕوایان بە جوهەیمان کرد، لە کاتێکدا بانگەشەی ئەوەی کرد کە لە ئال و بەیتی پێغەمبەرە(ﷺ) ناوی محەممەدەو باوکیشی ناوی عەبدوڵلایە.

لە دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی: من محەممەدی مەهدیم، وە داوای لە خەڵکی کرد بەیعەتی پێ بدەن، وە نوێژخوێنانی مزگەوتی حەرام هەموویان گەمارۆدرابوون.

بۆیە هێزی حەرەمی مەککی چوونە ناو مزگەوتی حەرەمەوە بە مودەرەعات هەتا دەستگیریان کرد، دواتر خۆی و ٦١ کەس لەوانەی شوێنی کەوتبوون لە ساڵی ١٩٨٠ لە سێدارەدران[2].

---

(١) حول السّياقات التّاريخيّة لعمليّة اقتحام الحرم المكّيّ سنة ١٩٧٩ جون فرانسوا ماير ترجمة: محمّد الحاج سالم». جمعية الأوان. ٢٠٠٨-١٠-٣١.

(٢) أسرار احتلال الحرم المكي يكشفها رفيق جهيمان - ساسة بوست». ساسة بوست. ٢٠١٥-٠٤-٢٦. مؤرشف من الأصل في ١٤ يوليو ٢٠١٨. اطلع عليه بتاريخ ٠٧ أبريل ٢٠١٨.

جوهەیمان سێ جاران هاوسەرگیری پێك هێناوە، ئەمەش منداڵەکانیەتی:

- هەژالی کوڕی جوهەیمان کە زابتی پاسەوانی شارە.
- عەبدوڵلای کوڕی جوهەیمان.
- محەممەدی کوڕی جوهەیمان.
- وە دوو کچی تری هەیە[1].



(١) رفيق «جهيمان» يروي تفاصيل مثيرة عنه وعن حادثة الحرم - موقع وكالة نبأ الإخبارية المستقلةنسخة محفوظة ٠٥ مارس ٢٠١٦ على موقع واي باك مشين.

## چۆن مەهدی ڕاستگۆو درۆیین لە یەکتری جیا بکەینەوە؟

لە پێشتردا ئەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە کە لە زۆربەی وڵاتان خەڵکی بانگەشەی محەممەدی مەهدی بوون دەکات، بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەن..

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، چۆن بزانرێت ئەو کەسەی بانگەشەی محەممەدی مەهدی بوون دەکات ڕاستگۆیە یان نا ؟

**لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم:**

بانگەشەکردن و بەیعەت دانی محەممەدی مەهدی شتێکی ئەوەندە سانا نییە، بەڵکو کۆمەڵێك ڕێکاری یاسایی شەرعی دەگیرێتە بەر، کە ئەمانەن:

یەکەم: کۆمەڵێك سیفاتی لاشەیی تێدا بەدی دەکرێت کە پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەکانی ئاماژەی پێکردووە، ئەم سیفاتانە محەممەدی مەهدی یەکلایی دەکاتەوە کە ئایا ڕاستە یان نا.

دووەم: دەبیٛ هەموو نیشانەکانی پێش هاتنی مەهدی هاتبێتە دی، کە پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆر ڕاشکاوانە لە فەرموودەکان ئاماژەی پیٛ فەرمووە، لەوانە: گیرانەوەی ڕووباری فوراتی و دەرکەوتنی چیایەکی زێڕین تیایدا.

سێیەم: محەممەدی مەهدی کەسێکی نوێکاری سەردەم دەبێت کە ڕێبازو ڕێچکەی پێغەمبەرانی گرتۆتە بەر، دوورە لە هەموو بیدعەو شیرك و خوڕافیاتێك.

چوارەم: لە هیچ فەرموویەك نەهاتووە کە مەهدی بانگەشەی ئەوە بکات بۆ کە مەهدی چاوەڕوانکراوە.. وەکو ئەوانەی بانگەشەی بۆ خۆیان دەکرد، وەکو ئیبنو تومرت و سودانی و جونبوری.. هتد.. بانگەشەیان دەکرد بۆ خۆیان.

پێشەوا حەمود تویجەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە دڵنیایی مەهدی داوای بانگەشە بوون ناکات بۆ مەهدیەت، هەروەکو ئەوانەی بانگەشەی مەهدیەتیان دەکرد بە درۆ، بەڵکو خەڵکی مەککە دێن دەریدەهێنن بە زۆری و بەیعەتی پێ دەدەن، پاشان خەڵکی ناوی دەنێن بە مەهدی، هۆکاری ناونانیشی دەگەڕێتەوە بۆ چاکسازی و دادپەروەری و نەهێشتنی ستەم[1].

پێنجەم: کۆمەڵێك نیشانەی تر هەن کە لەگەڵ محەممەدی مەهدی دێن، ئەوانەی بانگەشەبوونی مەهدیەت دەکەن لەوان نییە، وەکو دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێ) وە پێش نوێژی کردن لە دوای مەهدی و پاشان کوشتنی دەجال.

پێشەوا حەمود تویجەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر کەسێك بانگەشەی محەممەدی مەهدی کرد وە لەو سەردەمی دەجال دەرنەچوو، ئەوە بزانن ئەو کەسە دەجال و درۆزنە، وە هەر کەسێك بانگەشەی عیسا بوونی کرد وە لە پێشیدا دەجال دەرنەچووبوو ئەوە دەجال و درۆزنە، چونکە عیسای کوری مەریەم دوو نیشانەی هەیە لە هیچ کەسێکی تر نییە:

١- دەجال دەکوژێت، کە لە فەرموودە ڕاست و دروستەکان ئاماژەی پێکراوە.

٢- هیچ کافرێك نییە بۆنی بکات ئیلا دەمرێت.

شەشەم: محەممەدی مەهدی کەسێکی گومڕاو سەر لێشێواو نییە بەڵکو کەسێکی تێگەیشتو و لە خوا ترسە گەنجێکی نوێ سازە، زۆربەی جار کەسایەتیە چاکەکان لە سەردەمی سەلەف ناونراون بە (مەهدی) ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، ئەو کەسە کەسێکی لە خوا ترس و چاکەکار بووە.



---

(١) الإحتجاج بالأثر على من أنكر المهدي المنتظر (لا ٣٠٢).

## محەممەدی مەهدی لای (شیعە)

شیعەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مەهدییەکیان هەیە چاوەڕوانی دەکەن، دوا پێشەوایشە لە دوانزە پێشەواکانیان و لەلای ئەوان ناوی (محەممەدی کوری حەسەنی عەسکەری)یە، بەلای ئەوانیشەوە لە نەوەی (حوسەینی کوری عەلی) یە، نەك لە نەوەی حەسەنی کوڕی عەلی (ﷺ)[1].

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە زانایان دەڵێن: منداڵێکی چوار پێنج ساڵان کە نەگەیشتووەتە تەمەنی ڕوشدو عەقڵی نەگرتووە ناوبنرێت بە مەهدی کە ئیبنو تەیمیە دەفەرموێ: ئەگەر ڕاستە ئەو مەهدیە ببوایە دەبوو (حیجر) بخرێتە سەر ماڵەکەی و کەسێکی بۆ دابنرایە کە لەباوەشی بگرتایەو بەخێوی بکردایە، ئەو کەسەش بریتیە لە (محەممەدی کوری حەسەنی عەسکەری) کە شیعەی دوانزە ئیمامی تا ئەمڕۆش بڕوایان وایە کە ئەو (محەممەدە) مەهدیەو لە تەمەنی چوار ساڵاندا خۆی کردووە بە کونێکدا لە سامەڕڕاو زیندووەو خواردن و خواردنەوەی بەهەشتی بۆ دێت و جارێکی تر دێتەوە ناو خەڵکی و دونیا پڕ دەکات لە دادپەروەری[2].

شیعە تا ئەمڕۆش بەیانیان و ئێواران هەر هاواریانە بۆی و داوای لێدەکەن لە کونەکەی بێتە دەرەوەو پێشیان بکەوێت بەرەو سەرکەوتن.

سەیرم لە هیچ شتێك نایەت ئەوەندەی ئەوەی کە سەیرم لە شیعە دێت لە مەسەلەی مەهدیدا، شتێك کە بەهەموو پێوەرێکی ژیری و لۆژیکی و مێژوویی ئەفسانەیی و بێبنەما و چنراوی خەیاڵ بێت کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو زاناو ڕۆشنبیرە شیعانە باوەڕیان پێی هەبێت.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٦٢).

(٢) الغيبة، لا ١١٥.

سەرەڕای ئەوەی کە شیعە ژیری (عەقڵ) بە یەکێك لە سەرچاوەکانی هەڵێنجانی حوکمە شەرعیەکان دەزانن کەچی لە مەسەلە گەورەکانی ئایندا کە بیروباوەڕە زۆرێك لە شتەکانیان لەسەر ئەفسانەو شتی نالۆژیکی بنیات ناوە، نمونەی بەرجەستەش مەسەلەی ئیمامی مەهدیە کە باوەڕیان وایە لە دایك بووەو لە دوو یان لە پێنج ساڵیدا لە سامەڕا دیار نەماوەو غەیب بووە! هەر کەسێك بێلایەنانە چیرۆکی لە دایکبوونی بخوێنێتەوە دەزانێ کە چنراوی خەیاڵە، هەر لەبەر ئەوەشە شیعە چیرۆکی لە دایکبوونی باس ناکەن بە دەگمەن نەبێت، ئەویش لەگەڵ پێشەکییەکی زۆردا بۆ ئەوەی مێشکی خوێنەر یان بیسەر ئامادە بکەن بۆ باوەڕ پێکردنی[1].

هەروەها خوێندنەوەی ئەو ناکۆکی و جیاوازییەی کەوتە نێوان شیعەکانەوە دەریدەخات کە لە دایکبوونی کەسێك بەناوی موحەممەدی مەهدی بوونی نیە، ئەوەتا نۆبەختی کە مێژوو نووسێکی شیعەیە لە کتێبی (فرق الشیعه) داو سەعدی کوری عەبدوڵلای ئەشعەری قومی لە کتێبی (المقالات والرفق) و هەردوو هاوچەرخی حسن العسکری بوون و ئیبنو ئەبی زەینەبی یەمانی لە کتێبی (الغیبة) و ئیبنو بابویە قومی لە (اکمال الدین) و الشیخ مفید لە کتێبی (الارشاد) و طوسی لە کتێبی (الغیبە)دا دەڵێن: دوای مردنی حەسەنی عەسکەری شیعە بوون بە چواردە بەشەوە یەکێك لەوان دەیانگوت حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبووە لە پێنج ساڵیدا دیار نەماوەو ئەویش ئیمامی مەهدیە، ئەوانی تریش هەر یەکەو بەلایەکدا چوون، هەندێکیان گوتیان: جەعفەری برای حەسەن ئیمام بووەو ئێمە بەهەڵە حەسەنمان بە ئیمام زانیبوو، هەندێکیش گوتیان: ئەم سەردەمە بێ ئیمامەو وەکو ئەو سەردەمانەیە کە پێغەمبەری تێدا نەبووە، هەندێکیتر گوتیان حەسەنی عەسکەری ئیمامی مەهدیەو پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە، هەندێکی تر گوتیان ئیمام محەممەدی برای حەسەنی عەسکەریە کە باوکی هەواڵی دابوو ئیمامە لە دوای خۆی بەڵام لە ژیانی باوکیدا مرد کەواتە ئەو نەمردووە بەڵکو باوکی شاردوویەتیەوە،

---

(١) الغیبة، لا ١١٦.

هەروەکو چۆن جەعفەری صادق پێشتر ئیسماعیلی کوڕی شاردەوەو هەر دەبێ ئەو ئیمام بێت، چونکە باوکی ئەوی دەست نیشان کردبوو ئیمامیش کەسێك دەست نیشان ناکات بە ئیمام نەبێت، هەندێکی تر گوتیان یەکێك لە کەنیزەکانی حەسەنی عەسکەری دوو گیانەو ئیمام بریتیە لەو کوڕەی کە لە سکی دایەو ئیمامەت لە وەچەکاندا بەردەوام[1] دەبێت.

شایەنی باسە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری ناکۆکی کەوتە نێوان بنەماڵەکەی لەسەر میراتەکەی، ئەوە بوو سەرەنجام ئەو میراتە لە نێوان دایکی و جەعفەری برایدا کە شیعە پێی دەڵێن: (جعفر الكذاب) دابەشکراو قازی نەرجس (صەیقەل)ی کە نزیکەکەی کە دەیگوت دوو گیانم لە ژێر چاودێریدا هێشتەوە بۆ ئەوەی بزانن ڕاست دەکات یان نا بۆ ئەوەی میراتی حەسەنی بەرکەوێت بەڵام دوایی کە دەرکەوت دوو گیان نیە میراتەکە لە نێوان دایکی حەسەن کە لە مەدینەوە هاتبوو بۆ سامەڕڕا دوای بیستنی مەرگی کوڕەکەی و جەعفەری برای دابەشکرا.

کەواتە حیکایەتە ئەفسانەییەکەی چۆنیەتی لە دایکبوونی موحەممەدی مهدی و سەرگەردانبوون و پەرتەوازە بوونی شیعە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری و دابەشکردنی سامانەکەی لە نێوان دایکی و براکەیدا و شایەتی دادگاو مێژوونووسان لەسەر وجاغ کوێری حەسەنی عەسکەری (نەکچی هەبووە نەکوڕ) بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کەسێك بەناوی موحەممەدی مەهدیەوە لە دایك نەبووە[2].

لەوانەیە پرسیارێکت بۆ دروست ببێت و بڵێیت ئەگەر شتی وانەبووە چۆن شیعە ئەو شتەیان داهێنا؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش زۆر ئاسانە ئەگەر ئەوە بزانیت کە بیرۆکەی ئیمامی مەهدی لە مێشکی شیعەدا بەردەوام ئامادە بووەو هەر لەسەردەمی ئیمامی

---

(١) الغيبة، لا ١١٦.

(٢) بحار الأنوار، للمجلسي (٥١/ ٢٥).

عەلیەوە تا حەسەنی عەسکەری هەر ئیمامێکیان مردبێت کۆمەڵێکیان وایانزانیوە ئەوە ئیمامی مەهدیەو دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو کە ئەو شتە دابهێنن و لافی ئەوە لێ بدەن کە حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبووە بەناوی موحەممەدو لە ژیانی باوکیدا بزربووە، چونکە ئەگەر ئەوەیان نەکردایە مەزهەبەکەیان ئەم جارەیان بەڕاستی دەکەوتە بەر مەترسی لەناوچوون چونکە لەنەوەی عەلی هادی تەنها جەعفەر مابوویەوەو ئەویش بە درۆزن و فاسق ناسرابوو لەناو شیعەدا و نەدەکرا هەڵبژێردرێت بە ئیمام و پێچەوانەی ئەو بنەمایانەش بوو کە شیعە دایاننابوو بۆ ئیمامەت ئەویش ئەوەیە کە جگە لە حەسەن و حوسەین چیتر ئیمامەت لە براوە ناگوێزرێتەوە بۆ برا و ئیمام نابێ وەجاغ کوێر بێت ئەگینا ئەو کەسە ئیمام نیە، واتە: ئەگەر بیانگوتایە جەعفەر ئیمامە دەبوایە بۆ جاری سێهەم بیانگوتایە خوا هەڵەی کردووەو ئەو وایزانیوە حەسەن ئیمامە چونکە ئیمام نابێت وەچەی نێرین نەخاتەوە، وە لەوانەیە ئەگەر جەعفەر بە فاسق و درۆزن ناوبانگی دەرنەکردایەو جێی ڕەزامەندی پێشڕەوانی شیعە بوایە، ئەم کارەیان بکردایەو جارێکی تر بەدائیان دەدایەتە پاڵ خوا چونکە هەر چۆنێك بوایە ئاسانتر بوو لە داهێنانی چیرۆکێکی لەو بابەتەی کە باوەڕ پێکردنی ئەستەم بوو[1].

بیرۆکەی دەرکەوتنی کەسێك لە نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کە زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری بیرۆکەیەکی جوانەو پڕە لە هیواو ئاواتی باش بەڵام زانایانی شیعە دوو باڵیان لکاند بە ئیمامی مەهدیەوە، وە باری شانیان پێ قورس کردووە لە هەموو شوێن و کاتێکدا، ئەم دوو باڵەش بریتین لە بیدعەی پێنج یەك و دووەمیان بەندایەتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ.

شیعە باوەڕیان وایە کە ئیمامی حەسەنی عەسکەری کە دەکاتە ئیمامی یازدەهەمی شیعە کاتێك کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ٢٦٠ی کۆچیدا کوڕێکی هەبوو ناوی موحەممەد بوو تەمەنی ٥ ساڵ بوو، ئەو کوڕە مەهدی چاوەڕوان کراوە.

---

(١) تطور الفكر السياسي الشيعي، أحمد الكاتب، لا ٥٦.

ڕیوایەت گەلێکی تر هەن دەڵێن: مەهدی دوای کۆچی دوایی باوکی لە دایك بووە، بەهەرحاڵ مەهدی پلەی ئیمامەتی لە باوکیەوە بۆ مایەوەو بەنادیاری (بزری) بۆ ماوەی شەست و پێنج ساڵ، شیعەکانیش لەو ماوەیەدا پەیوەندیان پێوەدەکرد لە ڕێگەی چەند نوێنەرێکەوە کە ئەمانەن: (عوسمانی کوڕی سەعیدی عومەری، محەممەدی کوری عوسمانی کوڕی سەعید، حوسەینی کوڕی روح و عەلی کوری محەممەدی سممەری)[1].

ئەو چوار نوێنەرە ناونران بە نوێنەرە تایبەتەکان و ئەو ماوەیە واتە لە ساڵی ٢٦٠ تا ٣٢٩ ك پێی دەگوترێ سەردەمی دیار نەمانی بچوك (الغیبە الصغری)[2].

لە ساڵی ٣٢٩ ی کۆچی و پێش کۆچی دوایی عەلی کوڕی موحەممەدی سممەری بە چەند مانگێك پارچە نوسراوێکی پێگەیشت تێیدا نوسرابوو: ئەوە دیار نەمانی تەواو ڕوویداو تا خوا مۆڵەت نەدات دەرکەوتن نیە، هەر کەسێك لافی بینینی من لێبدات ئەوە درۆزنەو هەڵبەستەی خۆیەتی[3].

ئەم ساڵەش سەرەتای دیار نەمانی گەورەیە (الغیبة الكبرى) و لەو کاتەوە پەیوەندی شیعە بە ئیمامەوە پچڕاوە چ ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ و هەر کەسێکیش لافی ئەوە لێبدات شیعە بەو دەقەی بۆیان هاتووە لە ئیمامی مەهدییەوە بەدرۆی دەخەنەوە.

ئەمە کورتەی بیروباوەڕی شیعەی ئیمامیە دەربارەی مەهدی چاوەڕوانکراو، تاکو ئێستاش ساڵانە شیعە لە ڕۆژی پانزەی شەعباندا لە یادی لە دایکبوونی مەهدیدا ئاهەنگی گەورە دەگێڕن، ئەویش تاقە ئیمامێکە شیعە تەنها بۆ یادی لە دایکبوونی ئاهەنگ دەگێڕن لە کاتێکدا کە بۆ ئیمامەکانی تر لەیادی لە دایکبوون و مردنیشدا پرسە دەگێڕن.

---

(١) أصول الكافي (١/ ٣٤٠).

(٢) الغيبة (لا ١٢٥).

(٣) بحار الأنوار (٥٢/ ١٥٣).

بیرۆکەی مەهدی و دەرکەوتنی پێشەوایەك لە کۆتایی دونیادا زەوی پڕ بکات لە دادوەری پاش ئەوەی پڕکرا بوو لە ستەم لە زۆربەی ئاینەکاندا هەیە، کۆمەڵێك فەرموودەش هەیە کتێبەکانی فەرموودە ڕاستەکان لە پەیامبەریان گێڕاوەتەوە دەربارەی دەرکەوتنی کەسێك لە نەوەی خۆی لە کۆتایی دونیادا بەڵام ئەو کەسە دیاری نەکراوە کێیە[1].

بیرۆکەی مەهدی خۆی لە خۆیدا بیرۆکەیەکی جوانە، چونکە ئاماژەیە بۆ چاکەی بێ خەوش و ڕوانینە بۆ دونیایەکی پڕ لە چاکەو خۆی و جوانی، دونیایەکی نمونەیی کە زۆر جار ئەفلاتۆن لە کۆمارەکەیدا و فەیلەسوفی ئیسلامی فارابی لە (شارە نمونەییەکەیدا) بانگەشەیان بۆ دەکرد، جگە لەوەی کە ئەو بیردۆزە نمونەییە بەها ئیسلامیە بەرزەکان بەدی دەهێنێت[2].

ئەگەر بهاتبایە بیروباوەڕی بوونی مەهدی قۆرخ بوایە بە باوەڕبوون بە بوونی پێشەوایەکی نادیار لە نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەردەکەوێت و زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری موسڵمانان کێشەیەکیان نەدەبوو بەڵام بەداخەوە زانایانی شیعە دوو باڵیان لکاند بە مەهدییەوە بەو دووباڵە وێنەی مەهدییان ناشیرین کرد، ئەم دوو باڵەش دوو بیدعەی گەورەن لە کاتی سەرهەڵدانی ململانێی نێوان شیعەو تەشەییوع لکێنران بە مەزهەبی شیعەوەو ناکۆییەکی ڕوون و ئاشکرایان هەیە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و ژیانی پێغەمبەر (ﷺ).

بە گوێرەی عەقیدەی شیعە (محەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری) کە پێی دەڵێن محەممەدی مەهدی لە ساڵی ٢٦٠ ی کۆچی لە تەمەنی ٥ ساڵیدا لەبەرچاو ونبووە، لە ساڵی ٢٦٠ تا ٣٢٩ ی کۆچی پێی دەگوترێت سەردەمی دیارنەمانی بچوك (الغیبە الصغری) کە گوایە تێیدا مەهدی پەیوەندی هەبووە بە نوێنەرەکانییەوە کە چوار نەفەر بوون بە دوای یەکدا هاتوون:

---

(١) أصول الكافي (١/ ٣٢٨).

(٢) شرح الكافي (٦/ ٢٠٨).

(١) عثمان بن سعید العمری.

(٢) محمد بن عثمان بن سعید العمری.

(٣) حسین بن روح.

(٤) علی بن محمد السمری[1].

شیعە قەناعەتیان وایە کە موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکری لە ساڵی ٢٦٠ کۆچی لە تەمەنی پێنج ساڵیدا لە سامەڕا لە ترسی عەباسییەکان خۆی شاردۆتەوەو دیارنەماوە.

لە پێشدا تا ساڵی ٣٢٩ ی کۆچی توانراوە پەیوەندی پێوە بکرێت، ئەویش تەنها لەلایەن چوار کەسەوە کە یەك لە دوای یەك هاتوون و پێیان دەگوترێت (نواب المهدی) یان (أبواب المهدی) بەم غەیبەتەی مەهدیش دەڵێن: دیارنەمانی بچووك (الغیبة الصغری)، پاش ساڵی ٣٢٩ ی کۆچی کە دوا نوسەر مردووە ئیتر کەس چاوی بەمەهدی نەکەوتووەو دیارنەمانی گەورە (الغیبة الکبری) ڕوویداوە کە ئاشکرا نیە تاکو کەی بەردەوام دەبێت[2].

شیعەکان دەڵێن: غەیب بوونی محەممەدی مەهدی و گەڕانەوەی بۆ دونیا ئیمامەکانی پێش خۆی خەبەریان لێداوەو لە فکری شیعیدا شتێکی زانراو بووە بەڵام لەبەر ئەوەی هەرچی زانای فەرموودەو ریجالیان هەیە لە پاش مردنی موحەممەدی مەهدیەوە هاتوون ئێمە یەقینمان هەیە کە هەرچی لەو بارەیەوە هاتووە هەروەکو شتەکانی تر بەسەر زمانی ئیمامەکانیانەوە هەڵیان بەستبێت و لەوەبەر شتێکی وا نەزانرابێت ئەگیانا چۆن کاتێك ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق مرد زۆرێك لە شیعەکان گوتیان نەمردووە بەڵکو غەیب بووەو دەگەڕێتەوەو لە ئەنجامدا فیرقەی ئیسماعیلی پەیدابوون، ئەگەر مەسەلەی دوانزە (١٢) ئیمامی بزانرایەو ئەو ئیمامانە خەبەریان بدایە کە ئیمامی دوانزەهەم ئیمامی

---

(١) بحث حول المهدي، محمد باقر الصدر، لا ٦٧ .

(٢) تفسير العياشي (٢/ ٥٦).

مەهدیەو غەیب دەبێت و پاشان دەگەڕێتەوە چۆن هەر لە کۆنەوە ئەم ناوە لە دەیان کەس لە (أهل البيت) دەنرا کە یەکەم کەسیان (محەممەدی حەنەفی)بووەو وە دواهەمینیان موحەممەدی عەسکەری بوو!

کەواتە هەرچی ڕیوایەت هاتووە دەربارەی موحەممەدی مەهدی هەمووی هەڵبەستراوی زاناکانی شیعەیەو ئیمامەکان لێیان بێئاگان.

ئێستا ڕەنگە بپرسی ئەی عەقیدەی غەیب بوونی موحەممەدی مەهدی و گەڕانەوەی لە چییەوە سەری هەڵداوەو چ پەیوەندییەکی بە ئیمامەتەوە هەیە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: یەکێك لەو بنەمایانەی شیعە دایانناوە بۆ ئیمامەت ئەوەیە کە ئیمامەت دەبێ لەو باوکەوە بۆ کوڕی گەورە بگوێزرێتەوە تەنها حەسەن و حوسین نەبێت کە برابوون و لە حەسەنەوە گوێزراوەتەوە بۆ حوسەین، پاشان لەنەوەکانی حوسەیندا بەو شێوەیەی باسمان کرد مایەوە واتە لە باوکەوە بۆ کوڕی بوو.

زۆربەی مێژوونوسان ڕایان وایە کە حەسەنی عەسکری منداڵی نەبووە، بۆیە پاش مردنی سەروەت و سامانەکەی بۆ جەعفەری برای ماوەتەوە، وە لەبەر ئەوەیە شیعە ڕایان لە جەعفەر نیەو بە درۆزن و پیاو خراپ لەقەڵەمی دەدەن چونکە پاش حەسەنی عەسکری لافی ئیمامەتی لێداو میراتەکەی لە نێوان ئەوو دایکیدا دابەشکرا[1].

هەروەها ئیمامەت لە پاش حوسەین لە براوە بۆ برا ناگوێزرێتەوە لەبەر ئەوەیە شیعە جارێکی تر کەوتنە هەڵوێستێکی سەختەوەو کەوتنە تەنگەژەیەك و کێشەیەکی گەورەوە، ئەویش ئەوەیە کە حەسەنی عەسکری منداڵی نیە، وە

---

(١) هەڵبەتە فیکرەی مەهدی و دیارنەمانی و گەڕانەوە هەموو لە ئیسلام و ئاینەکانی تردا ئەصلێکیان هەیە، بەڵام بەم شێوەیەی کە شیعە دایانهێنا لە ترسی هەڵوەشاندنەوەی قەواعیدی ئیمامەت بوو کە دەبێ پاش هەموو ئیمامێك کوڕی گەورەی ببێتە ئیمام، ئەی ئەگەر نە کوڕی گەورەی هەبوو نە بچووك ئەو کاتە چی بکەن؟ لێرەوە فکرەی مەهدی و غەیب بوونیان بەو شێوەیە داهێنا کە ئێستا زانراوە.

ئیمامەتیش لە براوە بۆ برا ناگوێزرێتەوە! چی بکەن و چۆن خۆیان لەم تەنگژەو کێشەیە ڕزگار بکەن؟

لێرەوە زاناکانیان چیرۆکی لە دایکبوونی موحەممەدو غەیب بوونیان داهێناو بەو شێوەیە قفڵیان لە ئیمامەت داو خۆیان لەو زۆرانبازی و مل ملانێیەی کە لەسەر ئیمامەت ڕوویدەدا ڕزگار کردو کۆتاییان بەو کێشەیە هێنا.. بۆیە محەممەدی مەهدی لە نەوەکانی پێشەوا حەسەنە، وە گومانیش لەوە نییە کە عەسکەری لە منداڵەکانی حوسەینە[1].

بەرگی سێیەم

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة ، لا ١٦٣.

# چەند بنەمایەک بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ بانگخوازانی مەهدییەت

بەربەرچدانەوەمان بۆ ئەوانەی کە خۆیان بە مەهدی دەژمێرن، بە واتای ئەوە نییە ئێمە باوەڕمان نییە بەو فەرموودانەی لەو بارەوە هاتوون، نەخێر، بەڵام پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان باوەڕکردن بە فەرموودەکانی مەهدی کە هەواڵگەلێکی ڕاستن لەلایەن پێغەمبەر (ﷺ) و لە نێوان بڕیاردانمان کە فڵانە کەس مەهدیە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم مەسەلەی بەخۆڕایی نەهێشتۆتەوە، بەڵکو هەندیٰ نیشانەو بنەمای پێداوین کە بێگومان مەهدی پیٰ بناسنەوە، لەوانە:

١- مەهدی بانگەواز بۆ خۆی ناکات، خەڵکیش بۆ بەیعەتی خۆی بانگ ناکات، بەڵکو خەڵکی بە زۆر بەیعەتی پیٰ بدەن.

٢- جووت بوونی ناوی مەهدی لەگەڵ ناوی پێغەمبەر (ﷺ).

٣- ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ حەسەنی کوڕی عەلی (رضي الله عنه).

٤- ئەو سیفاتە جەستەییانەی تیا بێتە دی کە لەفەرموودەکەدا هاتووە.

٥- ئەو هەلو مەرجەی تێیدا دەردەکەوێت:

- ناکۆکیەك دروست دەبێت لە پاش مردنی خەلیفەیەك.
- پڕبوونی سەر زەوی لە ستەم.
- مەهدی پیاوێکی لە خوا ترس و خواناسە، زانستی شەرعی هەیە.
- لە مانگی محەڕڕەم دەردەچێت.
- پێشەوا سەففارینی دەڵێت: لە مەککە دەردەکەوێت و لە نێوان ڕوکن و مەقامدا بەیعەتی پیٰ دەدرێت، لە شەوی عاشورا[١].

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٨٧.

# ئەوانەی فەرموودەکانی محەممەدی مەهدی ڕەت دەکەنەوە و ڕەت دانەوەیان

بەر لە ئێستا هەندێك فەرموودەی صەحیحمان هێناوە کەوا بەڵگەی قسە بڕ دەدەن لەسەر هاتنی موحەممەدی مەهدی لە کۆتایی بوونەوەر کە دەبێتە پێشەوایەکی دادپەروەرو چاکساز، وە قسەی کۆمەڵێك لە زانایانم باس کرد کە دەفەرموون فەرمووده دەربارەی مەهدی گەیشتۆتە پلەی متواتیری مەعنەوی، وەهەندێك لەو کیتابانەشمان باس کرد کە دەربارەی موحەممەدی مەهدی دانراون و نوسراون.

ئەوەی جێگەی داخە کە کۆمەڵێك نوسەر لەم سەردەمەدا پەیدا بوینە کە ڕەتی ئەم هەموو فەرموودانە دەکەنەوە[1]، کە باسی هاتنی محەممەدی مەهدی دەکەن، وە وەسفی ئەم فەرموودانە دەکەن بە قسەی پێچەوانەو بێ واتا، وە دەڵێن: محەممەدی مەهدی تەنها چیرۆکێکە کە شیعە دروستیان کردووەو پاشان پەڕیوەتەوە نێو پەرتوکەکانی ئەهلی سوننە.

پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من كذَّب بالدجال فقد كَفَرَ، ومَنْ كذَّب بالمهديِّ فقد كَفَرَ)[2].

---

(١) بەرچاوترینیان ئەمانەن: شێخ محمد رشيد رضا لە تەفسیری رضا (٩/ ٤٩٩ ـ ٥٠٠) ومحمد فريد وجدی لە کیتابی دائرة معارف القرن العشرين (١٠/ ٤٨٠) وە کیتابی ئەحمەد ئەمین لە کیتابی (ضحى الإسلام) (٣/ ٢٣٧ ـ ٢٤١) وعبدالرحمن محمد عثمان لە تەعلیقەکەی لەسەر کیتابی تحفة الأحوذي (٦/ ٤٧٤) ومحمد فهيم لە تعليقەكەی لەسەر کیتابی (النهايه فى الفتن والملاحم) ی ئیبنو کەثیر (١/ ٣٧) وعبدالكريم الخطيب لە کیتابەکەی (المسيح في القرآن والتوراة والإنجيل) لا ٥٣٩.

(٢) أخرجه الإمام أبوبكر الإسكاف، في (فوائد الأخبار)، كذا رواه أبو القاسم السهيلي في (شرح السيرة) له..

واتە: هەر کەسێك دەجال بە درۆ بزانێت، ئەوە کوفری کردووە، وە هەرکەسێکیش مەهدی بە درۆ بزانێت ئەوە کوفری کردووە.

بێگومان هەندێك لەو نوسەرانە نکوڵیان کردووە لە مەهدی، لەوانە:

**یەکەم:** پێشەوا ئیبنو خەلدون دەڵێت: فەرموودەکانی دەربارەی مەهدی لاوازن، لەگەڵ ئەوەی کە ئیبنو خەلدون سواری ئەم مەیدانە نیە، واتە: مەیدانی علوم الجرح والتعديل وعلوم الحديث، تاکو قسەی وەربگیرێ لە (تەصحیح و تضعيف) واتە: فەرموودە بەڕاست دانان و بێهێزکردن، وە لەگەڵ ئەمەشدا لە دوای ئەوەی کەوا ئەو فەرموودانە دێنێتەوە دەربارەی مەهدی و لاوازیان دەکات دەڵێ: ئەمە کۆمەڵێك بوو لەم فەرموودانەی کە زانایانی فەرموودە گێڕاویانەتەوە دەربارەی مەهدی و هاتنی لە کۆتایی بونەوەردا کە ئەمانەش هەروەك دەبینی کەمێکیان نەبێ لە ڕەخنە دەرناچن واتە: لە ڕووی ڕاستیەوە[1].

جا قسەکەی پێشەوا ئیبنو خەلدون ئەوە دەگەیەنێت کەوا هەندێك لە فەرموودەکان سەلامەت دەردەچن لەو ڕەخنانە بەڵام گەر یەك فەرموودە ڕاست بێت، ئەوا بەسە بۆ بەڵگەیی لەسەر هاتنی محەممەدی مەهدی، کە لە کاتێکدا چەندین فەرموودەی صحیح کە دەگاتە پلەی متەواتیر دەربارەی هاتووە؟!

بۆیە زۆرێك لە زانایانی ئیسلام وەڵامی پێشەوا ئیبنو خەلدونیان داوەتەوەو ڕوونیان کردۆتەوە کە بۆچوونەکەی هەڵەیە، لەوانە:

لە پەرتوکی (عون المعبود) فەرموویەتی: ئیبنو خەلدون لە مێژووەکەیدا هەموو فەرموودەکانی مەهدی بە بێهێز دادەنێت، بەڵام نەیپێکا[2].

شێخ صديق حسن خان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئیبنو خەلدون لە مەسەلەی مەهدی هەڵخلیسکاوەو نەیپێکاوە[3].

---

(١) مقدمة تاريخ ابن خلدون (١/ ٥٧٤).

(٢) عون المعبود، (١١/ ٣٦٢).

(٣) الإذاعة لما كان وما يكون بين يدي الساعة، لا ١١٩ .

شێخ محەممەد عەبدوڵلا شەنقیتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پەرتوکێکی سەربەخۆم دانا لە ژێر ناونیشانی (الجواب المقنع المحرر في أخبار عيسى والمهدي المنتظر) وە لەو کتێبەدا وەڵامی ئیبنو خەلدونم داوەتەوە، هەر کەسێك حەز دەکات وەڵامەکەی بزانێت با بۆ کتێبەکەم بگەڕێتەوە[١].

شێخ محەممەد مەغریبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر زانستێك لەو زانستانە دەگەڕێتەوە لای زانایانی ئەهلی پسپۆڕ، بۆیە پێویست ناکات بەوەی کە پەلە بکەی لە ئینکارکردنی وتەیەك هی هەر کەسێك بێت ئیلا دەبێت بەڵگەی ڕوون هەبێت، چ جای فەرموودە؟ بۆیە ئەو ڕەئیەی ئیبنو خەلدون دەستی پێگرتووە خنکاندنە و دەستی بە خنکاندن گرتووە[٢].

شێخ ئەحمەد الغماری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پەرتوکێکی نوسی لە ژێر ناونیشانی (إبراز الوهم المكنون من كلام ابن خلدون) لەم پەرتوکە وەڵامێکی زانستیانەی جوانی داوەتەوە[٣].

شێخ ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئیبنو خەلدون هەڵەیەکی زۆر ئاشکرای کرد، لە کاتێکدا فەرموودەکانی مەهدی بە بێهێز دانا، ئەوەش شتێکی غەریب نییە چونکە فەرموودە ئیشی ئەو نییە[٤].

زانای فەرموودەناس شێخ ئەحمەد شاکر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئیبنو خەلدون هەڵوەستەی کردووە سەبارەت بە مەهدی بەبێ ئەوەی زانیاری هەبێت، وە گومانی ئەوەی بردووە کە شیعە لە عەقیدەی شیعەیە.. وە بۆیەش بە بێهێزی داناوە چونکە لەو سەردەم ڕەئی سیاسی بەسەردا زاڵ بووە[٥].

---

(١) فتح المنعم (١/ ٣٣١).

(٢) سيد البشر يتحدث عن المهدي المنتظر، لا ٥٩ .

(٣) المهدي المنتظر بين حقائق اهل السنة وافتراءات الشيعة، لا ١٤ .

(٤) تخريج أحاديث فضائل الشام ودمشق، لا ٤٥ .

(٥) مسند الإمام أحمد، تعليق على حديث برقم: (٣٥٧١).

بەشی سێیەم

دووەم: عەبدوڵلای کوری زەیدی ئال مەحمود دەڵێت: مەسەلەی مەهدی لە سەرەتایەوە تاکو کۆتایی لەسەر درۆی ڕاشکاوو بیروباوەڕی خراپ دامەزراوە، لە بنچینەشدا ئەفسانەیەکە دەست بە دەست پێمان گەیشتووە، فەرموودەی دروستکراویشی بۆ هەڵبەستراوە بۆ ترساندن و تۆقاندن[١].

سێیەم: محەممەد ڕەشید ڕەزا دەڵێت: دژایەتی لە فەرموودەکانی مەهدی بەهێزترو دیارترە، کۆکردنەوەش لە نێوان ڕیوایەتەکاندا گرانترە، ڕەتکەرەوانیشی زیاترن، گومانیش تێیدا ئاشکراترە، هەر بۆیە بوخاری و موسلیم متمانەیان نەکردووە بە هێنانەوەی فەرموودەکانی مەهدی لە صەحیحەکەیاندا، زۆرێکیش لە پێشەوایانی ئیسلام ئەو فەرموودانەیان بەلاواز زانیووە[٢].

چوارەم: ئەحمەد ئەمین دەڵێت: مەسەلەی مەهدی ئەفسانەیەو دەرەنجامی ترسناکیشی لێ کەوتووەتەوە لە ژیانی موسڵماناندا[٣].

پێنجەم: محەممەد فەرید وجدی دەڵێت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی مەهدی هاتوون، هەر کەسێك تەماشای بکات لە هۆشمەندو خاوەن بیرەکان، هیچ گرفتێك نابینن لە پاراوگرتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو جۆرە قسانە، چونکە ئەو دەمارگیری و تێکەڵکردنی مێژوو ڕۆچوون لە زیندەڕەوی و نەفامی و دوورکەوتنەوە لە یاساکانی خوای گەورەو هەموو ئەوانە وا لەو کەسە دەکات کە یەکەم تەماشایان بکرێت، بزانێت کە ئەو فەرموودانە درۆو هەڵبەستراون لەلایەن کەسانێکەوە کە نگرۆی گومرایی بوونە کە بانگەواز دەکەن بۆ ئەوانەی بە دوای خیلافەتدا هەڵپە دەکەن لە وڵاتانی عەرەبی و ڕۆژئاوا[٤].

بۆیە لای ئەهلی سوننەو جەماعە وتەی ئەو پێنج کەسایەتیە ڕەد دەکرێتەوە بە تەواوی چونکە پێچەوانەی هەمووی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

---

(١) لا مهدي ينتظر بعد الرسول خير البشر، (٥٨).

(٢) تفسير المنار (٩/ ٤١٦).

(٣) ضحى الإسلام (٣/ ٢٤٣).

(٤) دائرة المعارف القرن العشرين (١٠/ ٤٨١).

**بەڵگەکانیان:**

قورئان باسی مەهدی نەکردووە، ئەگەر مەسەلەیەکی چەسپاو بوایە قورئان باسی دەکرد.

**وەڵام:** قورئان هەموو نیشانەکانی کۆتایی بونەوەری باس نەکردووە، وەکو دەججال و ڕۆچوونی کۆتایی بونەوەرو نیشانەی تر، مەسەلەی مەهدیش لە سوننەتدا باسکراوە.

**دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:**

ئەوانەی ئینکاری بوونی مەهدیەت دەکەن و دەڵێن: فەرموودەکان دەربارەی مەهدی لە بوخاری و موسلیمدا باس نەکراون؟

**وەڵام:** صەحیحی بوخاری و موسلیم هەموو فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) باس نەکردووە، گێڕەرەوانی فەرموودەش جگە لە بوخاری و موسلیم، پێشەواو گەورەو لێکۆڵەرەوەن، ئێمەش ڕێگەمان هەیە بۆ جیاکردنەوەی فەرموودەی صەحیح لە لاواز، ئەگەریش دەرکەوت فەرموودەیەك صەحیحە پێویستە لەسەرمان وەریبگرین لە بوخاری و موسلیمدا بێت یان لە کتێبەکانی تر، سەرەڕای ئەوەیش بوخاری و موسلیم فەرموودەکانی مەهدیان گێڕاوەتەوە کە باسی سیفەتەکانی دەکات بەبێ ناوبردنی.. بێگومان دوو فەرموودەش لە بوخاری و موسلیم هاتوون کە دواتر باسیان دەکەم پشت بەخوای گەورە.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێشەوایان بوخاری و موسلیم مولزەم نەبوونە بە دەرهێنانی هەموو فەرموودە دروستەکان، زۆر جاری وا هەیە فەرموودەی دروست جگە لە بوخاری و موسلیم هاتوون، هەروەك لە پەرتووکی سوننەکان و موسنەدەکاندا هاتوون[١].

---

(١) الباعث الحثيث، ابن كثير، لا ٢٥ .

بەرگی سێیەم

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

کەسانێك دەڵێن: ئێمە نامانەوێت دەرگا واڵا بکەین بۆ بانگەشەکارانی مەهدی:

لە وەڵامدا دەڵێم: ئێمە ئەگەر مەسەلەکە ڕێکبخەین بە بنەما شەرعیەکان، ئەو دەرگایە ناکرێتەوە، چونکە مەهدی هەندێ سیفەتی ڕووالەتی هەیەو سەردەمیشی هەلومەرجی دیاریکراوی هەیە، ئەوەش لەسەر هەموو کەسێك جێبەجێ نابێت، بەڵکو تەنها لەسەر مەهدی جێ بەجێ دەبێت.

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

ئەوانەی فەرموودەکانی پێشەوا مەهدی ڕەدد دەکەنەوە دەڵێن: بڕوابوون بە مەهدی چ سوودێکی بۆ باوەڕم دەبێت ئەگەر باوەڕم پێی هەبێت، وە چ زیانێکی بۆ باوەڕم هەیە ئەگەر بڕوام پێی نەبێت؟

وەڵامی ئەم گومانە لە چەند خاڵێکی کورت دەدەمەوە:

**یەکەم:** دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو هەواڵانەی هاتوون سەبارەت بە محەممەدی مەهدی لە ڕێگای وەحیەوەیە، وەحیش ئەسڵی دینەو کانگای یەکتاپەرستیە.

**دووەم:** بڕوابوون بە محەممەدی مەهدی داننانە بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوی خوای گەورەیە.

**سێیەم:** بڕوابوون بە محەممەدی مەهدی بڕوابوونە بە ڕۆژی دوایی، چونکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی دەرچوونی مەهدیە..

**چوارەم:** بڕوا هێنان بە دەرچوونی مەهدی لە نێو بڕوابوونە بە قەدەری خوای گەورە.

**پێنجەم:** بڕوابوون بە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی بڕوابوونە بە پەنهانییەکان، وە هاتنی مەهدیش یەکێکە لە پەنهاییەکان کە لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر دەردەچێت[1]..

---

(١) رحلة الى الدار الآخرة، ٢٦٧ .

# ئایا فەرموودە هاتووە لای ئیمامی بوخاری و موسلیم سەبارەت بەمحەممەدی مەهدی ؟

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

کەسانێك پرسیار دەکەن و دەڵێن: ئەگەر محەممەدی مەهدی ڕاست بێت، باشە بۆچی ئیمامی بوخاری و موسلیم لە کتێبە صەحیحەکانی خۆیان باسیان نەکردووە؟

لە کاتێکدا هەندێك هەن ئینکاری هاتنی محەممەدی مەهدی دەکەن، لەوانە: شێخ محەممەد ڕەشید رضا دەڵێت: بوخاری و موسلیم هیچ فەرموودەیەکیان ریوایەت نەکردووە سەبارەت بە محەممەدی مەهدی[١].

وە لەوانە ئەحمەد ئەمین کە دەیگوت: بوخاری و موسلیم هیچ فەرموودەیەکی مەهدیان ریوایەت نەکردووە[٢].

هەروەها سەعد محەممەد حەسەن[٣]، وە عەبدوڵلای کوری زەیدی کوری مەحمود سەرۆکی مەحکەمەی قەتەر کە دەیگوت: بوخاری و موسلیم ئەم فەرموودانەیان وەرنەگرتووەو نەیانخستۆتە نێو صەحیحەکانیان، لەگەڵ ئەوەدا لەم سەردەمە بانگەشەی بۆ دەکرێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم فەرموودانە جێگیر نین[٤].

---

(١) تفسير المنار (٩/ ٤١٦).

(٢) ضحى الإسلام (٣/ ٢٣٧).

(٣) المهدية في الإسلام (لا ٧٠).

(٤) لا مهدي ينتظر، بعد الرسول خير البشر، لا ٣١ .

دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە لە چەند ڕوویەکەوە بدەینەوە:

یەکەم: ئەوەی بانگەشەی ئەوەی بکات کە محەممەدی مەهدی لە هەردوو صەحیحەکان نەهاتووە ئەمە ڕاست نییە، بەڵکو لە هەردووکیان ئیشارەت بە هاتنی مەهدی دەکەن بەڵام بەبێ ناوهێنان، ئەو زانایانەی کە دەفەرموون: ئیشارەتیان پێدراوە ئەوانەن: ئەبو حەسەنی ئوبریی، ئیبنو حەجەر، سەخخاوی، سیوطی، زەرقانی و جگە لەوانیش.. ئەوانەی دانیان ناوە ئەوانەن: طەیبی و ئەبو داودو ئیبنو کەثیرو ئیبنو قەییم و ئیبنو حەجەری هەیتەمی و کشمیری و محەممەدی صدیق خان و محەممەدی کوری جەعفەری کەتتانی[1].

لێرەشدا ئاماژە بە دوو فەرموودەی مەهدی دەدەم بەبێ ناوهێنانی وشەی (مەهدی):

پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، قَالَ : فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ : تَعَالَ صَلِّ بِنَا ، فَيَقُولُ: لاَ ، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أَمِيرٌ ، لِيُكْرِمَ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ)[2].

واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من لەسەر هەق شەڕ دەکەن و سەردەکەون هەتا ڕۆژی دوایی، فەرموی: پاشان عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکان پێی دەڵێت: فەرموو پێش نوێژیمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێت: نەخێر ئێوە پێشەواکانتان لە خۆتان دەبێت، ڕێزێکە خوا لەم ئوممەتەی ناوە.

بێگومان ئەم پێشەوایەش مەهدیە کە پێش نوێژی بۆ پێغەمبەر عیساو موسڵمانان دەکات (سەلامی خوای لێ بێ).

بەرگی سێیەم

---

(١) المهدي، د. اسماعيل المقدم، لا ١٤٢ .

(٢) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٧/٤) برقم: (١٥٦).

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي خَلِيفَةٌ يَحْثِي الْمَالَ حَثْيًا، لَا يَعُدُّهُ عَدَدًا)[1].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا خەلیفەیەك دەبێت، پارە بەهەڵڕشتن هەڵ دەڕێژێت و بە ژماردن نایژمێرێت.

ئەوەش بەڵگەیەکی ڕۆشنە کە ئازادکردنی وڵاتان پەرە دەسەنێت لەسەر دەستی مەهدی.

**دووەم:** هیچ زانایەك نەیفەرمووە ئەگەر فەرموودەیەك لە بوخاری و موسلیم نەبێت بێ هێزو زەعیفە.

زانایان فەرموودەی صەحیحیان کردووە بە حەوت مەرتەبەی سەرەکی بە پێی هێزی فەرموودە:

- صحيح اتفق على إخراجه البخاري ومسلم.
- صحيح انفرد بإخراجه البخاري ومسلم.
- صحيح اتفق على بإخراجه مسلم عن البخاري.
- صحيح على شرطهما معاً، ولم يخرجاه.
- صحيح اتفق على شرط البخاري، ولم يخرجه.
- صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجه[2].
- صحيح لم يخرجاه، ولم يكن على شرطهما معاً، ولا على شرط واحد منهما.

ئەوەی لە فەرموودەکانی بوخاری موسلیم هاتوون، تەنها سێ مەرجی یەکەمە، ئەگینا چوار مەرجەکەی تر هەمووی لە کتێبەکانی فەرموودەکانی تر دەست دەکەوێت.. کەواتە مەرج نییە ئەوەی لە بوخاری موسلیم نەهاتبێ بە واتای بێ هێزی بێت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٤) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، برقم: (٢٩١٣).

(٢) قواعد التحديث، لا ٨٢ .

بەرگی سێیەم

## ئایا باوەڕبوون بە مەهدی
## واتای وازهێنانە لە بانگەوازو کردەوە؟

هاوکات لەگەڵ ململانێی چاکەو خراپەو سەرهەڵدانی گەندەڵی و بڵاوبوونەوەی لاوازی بانگەوازکردن بۆ خێرو چاکە لە زۆرێك لە وڵاتاندا، تا ئومێدی لە دڵی زۆرێك لە موسڵمانانندا دروست بوو، واشیان لێهات چاوەڕوانی مەهدی بکەن بۆ ئەوەی سەرکردایەتیان بکات بۆ سەرکەوتن.. بە واتایەکی تریش وازیان لە کردەوەو بانگەواز هێناو بێدەنگ بوون لە فەرمانکردن بە چاکەو قەدەغەکردنی خراپەو سستبونەوە لە فێربوونی زانست و بڵاوکردنەوەی، بەڵکو سست بوون لە بازرگانی و ئیش کردن و ئاوەدانکردنەوەی زەویش، تەنانەت بەخۆیان دەڵێن: مەسەلەکە لەوە پەلەترەو سەردەمی دەرکەوتنی مەهدی نزیك بووەتەوە.. وەرێبازی شەرعیش لە مامەڵەکردن لەگەڵ فەرموودەکاندا کە هاتوون لە مەڕ مژدەپێدان لە نێو نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر وەکو:

• فەرموودەکانی مەهدی و سەرخستنی خوای گەورە بۆ ئایینەکەی.
• فەرموودەکانی جەنگی موسڵمانان لە دژ جولەکەکان و سەرکەوتنیان بەسەریاندا.
• فەرموودەکانی جەنگکردنی موسڵمانان لە دژ ڕۆمە گاورەکان و سەرکەوتنیان بەسەریاندا... و موژدەی تر.

مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو نیشانانە بەوە دەبێت کە بزانین:

ئەو نیشانەو نیشانەکانی تر، لەوە زیاتر نین کە دڵخۆشکارن بۆ باوەڕداران و ئارامیان پێ دەبەخشن و موژدەیان پێ دەدەن کە ئایین پارێزراوو سەرخراوە.

بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئێمە فەرمانەکانی شەرع ئەنجام دەدەین وەکو سەرخستنی ئایین و بەرگریکردن لە وڵاتی موسڵمانان و بەرپاکردنی جیهاد لە پێناوی خواو شەڕکردن لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام..

بۆیە هەرگیز بە سستی و تەمەڵی دانانیشین تاکو سەرکەوتن لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە، یان لە زەوی بڕوێت بۆمان، بەبێ هەوڵدانی خۆمان.

پێشەوا ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دروست نییە موسڵمانانی ئەمڕۆ واز لە کردەوە کردن بە ئیسلام بهێنن و چاوەڕێی دەرچوونی مەهدی و دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بکەن، چونکە ئەو چاوەڕوانکردنە مرۆڤ بێ ئومێد دەکات، بۆیە مرۆڤەکان دەبێت دەست بە هۆکارەکانەوە بگرن.. بۆیە ئەم بیکردنەوەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە خەڵکانێك ئینکاری دەرچوونی دەجال و دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بکەن[1].

بۆیە هەرگیزا و هەرگیز مرۆڤ نابێت دابنیشێت و چاوەڕوانی هاتنی محەممەدی مەهدی بێت بۆ ئەوەی سەرتاپای زەوی بۆ بکات لە دادپەروەری هەروەکو چۆن پڕ ببوو لە زوڵم و ستەم.. کوردەواری دەڵێت: وەکو ئاغایان دابنیشن.. ئەمە هەڵەیە بەڵکو دەبێت کار بکەیت.

کەسانێکی زۆر پرسیار دەکەن و دەڵێن: ئایا ئەو سەردەمەی ئێمەی تیایدا دەژین سەردەمی هاتنی محەممەدی مەهدیە؟ یان لەسەردەمی ئێمە محەممەدی مەهدی دێت؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێم: هیچ پێویست ناکات خۆمان مەشغوڵ بکەین بەوەی کە ئایا محەممەدی مەهدی ئەو ساڵ دێت یان ساڵێکی تر، بەڵکو ئەوەی لەسەرمان پێویستە ئەنجامی بدەین خواپەرستی و عیبادەتە، گەیاندنی پەیامی خودایە، فەرمانکردن بە چاکەو دوورکەوتنەوە لە خراپەیە، ئارامگرتنە لەسەر ناخۆشیەکانی ژیان[2].

ئەوانە واجبی سەرشانی ئێمەیە، هەندێك تەمبەڵ وا گومان دەبەن کە لەگەڵ دەرکەوتنی محەممەدی مەهدی ئیسراحەت بکەن و وەکو هەندێك ئاغا لێی پاڵ بدەنەوە.. کە ئەمەش خەیاڵ خاویە.

---

(١) قصة المسيح الدجال، (لا ٣٦ ـ ٣٧).

(٢) المهدي وفقه أشراط الساعة، (لا ٧٢٣) .

## ڕوونکردنەوەیەک :

## (مەهدی نیە تەنیا عیسای کوری مەریەم نەبێ)

**دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:**

هەندێك لەوانەی کە باوەڕ بە فەرموودەکانی مەهدی ناکەن، دەڵێن: پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(لَا يَزْدَادُ الْأَمْرُ إِلَّا شِدَّةً، وَلَا الدُّنْيَا إِلَّا إِدْبَارًا، وَلَا النَّاسُ إِلَّا شُحًّا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ النَّاسِ، وَلَا الْمَهْدِيُّ إِلَّا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ)[1].

واتە: ڕەوش و کاروبار هەر بەرەو خراپتر دەچێ، وە دونیاش بەرەو نەمان، وە خەڵکیش بەرەو ڕەزیلی، وە ڕۆژی دوایی نایەت تەنیا بەسەر خەڵکی خراپەکار نەبێت، وە مەهدی نیە تەنیا عیسای کوڕی مەریەم نەبێ.

کەواتە بە پێی ئەم فەرموودەیە محەممەدی مەهدی نییە، جگە لە عیسای کوری مەریەم نەبێ (سەلامی خوای لێ بێ).

لە وەڵامدا دەڵێم:

مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە:

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

واتای (وَلَا الْمَهْدِيُّ إِلَّا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ) ئەوەیە کە هیچ مەهدی ڕێنمایی دەری تەواو و مەعصوم نەبێ تەنیا عیسا نەبێ[2].

---

(١) سنن ابن ماجة (٢/ ٤٩٥).

(٢) التذكرة، لا ٦١٧.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

واتای ئەم فەرموودەی مەهدی نییە ئیلا عیسای کوری مەریەم نەبێت، ئەگەر بیری لێ بکەینەوە بە واتای ئەوە نییە مەهدی نەبێت جگە لە عیسای کوری مەریەم، بەڵکو مەبەست لەوەیە بە دڵنیایی هەقی مەهدی عیسایە، بۆیە ئەم وتەیە هیچ پەیوەندی بەوە نییە کە مەهدی نەبێت جگە لە عیسای کوری مەریەم[١].

وە ئەم فەرموودە بە تەنها پێشەوا ئیبنو ماجەو حاکم ریوایەتیان کردووە.. هەر چەندە بەشێکی زۆر لە زانایانی فەرمووده‌ناس ئەم فەرمووده‌یان بەبێهێز داناوە، چونکە لە فەرمووده‌کە محەممەدی کوڕی خالیدی جوندی تێدایە.

پێشەوا بەیهەقی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بێ هێزە، چونکە مەجهولە[٢].

پێشەوا زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەم فەرموودە هەواڵەکەی مونکەرە، وە باوکی عەبدوڵلای حاکم دەڵێت: مەجهولە[٣].

پێشەوا ئیبنو تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بێهێزە[٤].

پێشەوا صەنعانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دروستکراوە[٥].

---

(١) نهاية البداية والنهاية (١/ ٤٥).

(٢) تهذيب الكمال، (٦/ ٥٩٧).

(٣) ميزان الإعتدال، (٣/ ٥٣٥).

(٤) منهاج السنة النبوية (٤/ ٢١١).

(٥) الفوائد المجموعة (لا ٥١٠).

# هۆکاری ناونانی محەممەدی مەهدی به (مەهدی) و کونیەکەی!

(مەهدی) لە زمانەوانی ئیسم مەفعولە لە (هُدِيَ) وەرگیراوە کە بەواتای ڕێنمایی و ژیری و ڕوشدی دێت[١].

لە پەرتوکی (لسان العرب) هاتووە کە (هدى) دژی گومڕاییە، هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين)[٢]. واتە: پەیوەست بن و دەست بگرن بە سوننەتی جێنشینە هیدایەتدراوەکانی دوای خۆمەوە.. کەواتە مەهدی: ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆ هەق و ڕاستی[٣].

پێشەوا ئیبنو ئەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەهدی: ئەو کەسەیە کە ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆ هەق و ڕاستی[٤].

وە کۆمەڵێك ڕاوبۆچوونی تریش هەیە کە ئەمانەن:

لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕێنمایی دەکات بۆ چیایەك لە چیاکانی شام[٥].

لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕێنمایی دەکات بۆ کارێکی نهێنی، ئەویش دەرهێنانی تابوتێکە لە ئەشکەوتێکی ئەنتاکیە[٦].

---

(١) الصحاح، للجوهري، (٦/ ٢٥٣٣).

(٢) حسن: رواه الإمام أحمد في مسنده (٤/ ١٢٦) وابو داود في سننه (٤/ ٢٠٠) والترمذي (٥/ ٤٤) برقم: (٢٦٧٦). وقال الترمذي: حسن صحيح.

(٣) لسان العرب (١٥/ ٣٥٣).

(٤) النهاية في غريب الحديث والأثر (٥/ ٢٥٤).

(٥) الحاوي، للسيوطي (٢/ ٢٤١).

(٦) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ٤٠).

چونکە لەسەر دەستی تابوتی سەکینەت لە دەریاچەی تەبەرِیە دەردەهێنرێت و لە قودس دایدەنێت[١].

لەبەر ئەوەی ئینجیلی گەورەی بەرنابا لە شاری ڕۆما دەردەهێنێت.. تا بیکاتە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا و بیخاتە بەردەم جولەکەکان[٢].

لەبەر ئەوەی خەڵکی ڕێنمایی دەکات بۆ چیایەك لە چیاکانی شام، ئەویش دەرهێنانی تەوراتە کە دەبێتە هۆی موسڵمانبوونی هەزارەها جولەکە لەسەر دەستی[٣].

## کونیەی چیە ؟

کونیەی ئەبو قاسم[٤] یان ئەبا عەبدوڵلایە[٥].

لەقەبەکەی جابرە ؟

چونکە دڵی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕادەکێشێ و ستەمکارانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە[٦].

---

(١) الحاوي (٢/ ٢٤٤).

(٢) المسيح الدجال، سعيد ايوب، (لا ٣١٣) .

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ٤٠).

(٤) الإذاعة ( لا ١٥٤).

(٥) أخرجه أبو داود في سننه، كتاب: المهدي، برقم: (٤٢٨٢).

(٦) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٦٣).

## محەممەدی مەهدی لە چ شارێک لە دایک دەبێت و لە کوێ دەردەچێت؟

بەپێی ئەو زانیاریەی کە هەمە هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە نییە کە محەممەدی مەهدی لە کوێ دەردەچێت و لە کوێ لە دایك دەبێت، بەڵام وتەی چەندین پیاوچاکم خستووەتە ڕوو:

سەبارەت بە لە دایکبوونی کۆمەڵێك ڕاوبۆچوون هەیە، کە ئەمانەن:

لە شاری مەدینە لە دایك دەبێت، پێشەوا عەلی کوری ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: (المهدي مولده بالمدينة من أهل بيت النبي (ﷺ))[١] .

واتە: مەهدی لە شاری مەدینە لە دایك دەبێت و لە کەسە نزیکەکانی پێغەمبەرە (ﷺ).

لە شاری مەغریبی ئەقسا لە وڵاتی مەغریب دواتر کۆچ دەکات بەرەو قودس، پێشەوا عەبدوڵڵای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (يخرج في آخر الزمان من المغرب الأقصى)[٢].

لە شاری کەڕعەی وڵاتی یەمەن[٣]..

---

(١) نور الأبصار، لا ١١٢.

(٢) التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة، (لا ٧٢٣ ـ ٧٢٤) .

(٣) الحاوي، للسيوطي (٢/ ٢٢٤).

سەبارەت بە دەرچوونی:

ئەبوبەکری کوری مەقەری (ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵیَت: (يخرج المهدي من قرية يقال لها الكوعة )[1].

واتە: مەهدی لە گوندیَك دەردەچیَت پیَی دەڵیَن: کوعە.

پیَشەوا ئیبنو حەنەفیە (ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵیَت: لە نیَوان چیای ئەبی قوبەیس و قەعیقعان دەردەچیَت[2].

یەکەمجار لە هەردوو حەڕەمەکان دەردەچیَت، پاشان دەچیَتە بەیتولمەقدیس، لە پاشان دەجال دیَت، ئەمجا عیسای کوری مەریەم دادەبەزیَت لەلای منارەی ڕۆژهەڵاتی دیمەشق، وە دەچیَت بۆ کوشتنی دەجال[3].



---

(١) البرهان في علامات مهدي آخر الزمان، لا ١٠١ .

(٢) المهدي، عادل زكي، (لا ٨٣).

(٣) شرح الفقه الأكبر، (لا ١١٢).

## ئایا محەممەدی مەهدی لە دایک بووە ؟

زۆر جاران گوێم لێ دەبێت لە هەندێك دۆست و خەڵکی چاك، كە خەونیان بینیوە كە مانگ هاتۆتە ماڵیان، یان شارەكەیان، یان سەرتاپای جیهانی داگیر كردووە، یان كەسێكی لە خوا ترس و چاكەكارو جوان ڕووی لە ماڵەكەیان كردووەو بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی تیشك و ڕووناكایی و پێیان گوتوە: محەممەدی مەهدی لە دایك بووە!

ئەم خەونانەی كە دەگێڕدرێتەوە گومانم لە باش و چاكی وتەكانیان و خەونەكانیان نییە، بەڵام ناشبێ ئەوە لە بیر بكەین كە هیچ كەسێك غەیب نازانێت تەنها (الله) نەبێت، وە لە حیكمەتەكانی خوای گەورەیە كە هیچ كەسێك نازانێت لە چ كاتێك و بەروارێك محەممەدی مەهدی لە دایك دەبێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئوممەت پشتی خۆی نەبەستێت و بڵێت: چاوەڕوانی هاتنی محەممەدی مەهدیم، بۆیە ئەوانەی كات دیاری دەكەن و چاوەڕوانی محەممەدی مەهدین شیعەكانن.

لە ساڵی (٢٠٠٩)ع سەفەرێكی وڵاتی ئێرانم كرد، چوومە مزگەوێك ناوی (جەمكەران) بوو، كە پێنج كیلۆمەتر لە قوم دوورە.. ئەوەندە گەورەو جوان بوو دەتگوت: لە مزگەوتی مەدینەی.. پرسیارم لە یەكێك لە زانای شیعەكان كردو پێمگوت: ئەو مزگەوتە بۆ ئاوا گەورەتان دروست كردووە.. لە وەڵامدا گوتی: ساڵی ٢٠١٥ع محەممەدی مەهدی دێت و ڕاستەوخۆ دێتە ئەو مزگەوتە، هاوپەیمانی لەگەڵ ئێمە دەبەستێت و ڕاستەوخۆ بەسەر ئەمریكا دەدەین.. ئەوە پێنج ساڵە بەسەر ئەو بەروارە تێپەڕیوە هەتا ئێستاش محەممەدی مەهدی نەهاتووە.. بۆیە كات دیاری كردن گەورەترین هەڵەیە و دەبێتە هۆی ساردكردنەوەی خەڵكی لە هاتنی مەهدی.

كەسانێك هەبوون كە كاتیان دیاری كرد، بەڵام محەممەدی مەهدی نەهات و وتەكانیان پێچەوانە بوویەوە: لەوانە: وتەی ئەبی قوبەیل كە گوتی: خەڵكی لە دەوروبەری مەهدی كۆدەبنەوە لە ساڵی ٢٠٤ ی كۆچی بەڵام هەر نەهات[1].

---

(١) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (٩٦٢) بسند ضعيف فيه.

## (محەممەدی مەهدی) لە نەوەی كێیە ؟

فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ناوو شۆرەتی (محەممەدی مەهدی) گەلێك زۆرن، بۆیە ئێمە تەنها بە كورتیان دەخەینە ڕوو و نموونەیان لێ دێنین:

پێشەوا ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو كە دەیفەرموو: (الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي، مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ)[1].

واتە: مەهدی لە خانەوادەی منە لە نەوەی فاتیمەیە.

زۆربەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕاستیە دووپات دەكەنەوە كە (مەهدی) لە ئال و بەیتی پێغەمبەرە (ﷺ)، وە لە نەوەی فاتیمەی كچی پێغەمبەرە (ﷺ).

لە فەرموودەی دایكمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (المهدي رجل من عترتي، يقاتل على سنتي كما قاتلت أنا على الوحي)[2].

واتە: مەهدی لە خانەوادەی منە، جەنگ دەكات لەسەر سوننەتی من هەروەكو چۆن من دەجەنگم لە پێناوی وەحی.

پێشەوا عەبدوڵلای كوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي)[3].

---

(١) حسن: سنن أبو داود (٣٤١/٦) كتاب: المهدي، برقم: (٤٢٨٥). وقال العزيزي في (السراج المنير شرح الجامع الصغير) (٤/ ٥٣٠): إسناده حسن.

(٢) أخرج اللإمام ابو نعيم بن حماد في (الفتن).

(٣) صحيح: سنن الترمذي (٨/ ٤٤٩) كتاب: المهدي، باب: ما جاء في المهدي، برقم: (٢٣٩٤). وقال

بەرگی سێیەم

واتە: دونیا بەسەر ناچێ تاکو پیاوێك لە خانەوەدای من دەبێتە شای عارەبان، ناوی لەگەڵ ناوی مندا کۆکە.

لەم فەرمووودانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە (مەهدی) وەکو پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (موحەممەد) یان (ئەحمەد)[١] و باوکیشی ناوی (عەبدوڵلا)یەو ماوەی دەسەڵاتداری حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ دەخایەنێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَمْتَلِئَ الْأَرْضُ ظُلْمًا وَعُدْوَانًا ثُمَّ يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ عِتْرَتِي ـ أَوْ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي ـ مَنْ يَمْلَؤُهَا قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ ظُلْمًا وَعُدْوَانًا)[٢].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا زەوی پڕ دەبێت لە ستەم و دوژمنکاری، پاشان پیاوێك دەردەچێت لە ئال و بەیتی من، ئەم زەویە پڕ دەکات لە دادگەری، هەروەکو چۆن پڕ بوو لە ستەم و دوژمنایەتی.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَبْعَثَ اللهُ فِيهِ رَجُلًا مِنِّي، أَوْ مِنْ أَهْلِي أَهْلِ بَيْتِي، يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي، وَاسْمُ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي)[٣].

واتە: ئەگەر دونیا هەر تەنیا ڕۆژێکی مابێ، خودا ئەو ڕۆژەی درێژ دەکاتەوە، تاکو پیاوێکی لەمن یان لە خانەوادەی من دەنێرێ کە ناوی وەك ناوی منەو ناوی باوکی وەکو ناوی باوکی منە.

---

الترمذي: حديث حسن صحيح.

(١) صحيح: رواه ابو داود (٤٢٨٢) والترمذي (٢٢٣٠) وقال: حسن صحيح.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٧/ ٤١٦) برقم: (١١٣١). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط شيخين.. ووافقه الذهبي.

(٣) صحيح: سنن أبو داود (٣٣٧/٦) كتاب: المهدي، باب: كتب المهدي، برقم: (٤٢٨١). قال شعيب الأرناؤوط: حديث حسن.. وصححه ابن تيمية في منهاج النبوة (٨/ ٢٥٤).

ئەوەش بەرپەرچدانەوەیە بۆ شیعەکان کە دەڵێن: ناوی موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریە.

(يَبْعَثُ) واتە: دەردەکەوێت.

پێشەوایان ئیبنو کەثیرو ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو پیاوە محەممەدی کوڕی عەبدوڵلای عەلەوی فاتیمی حەسەنیە[1].

پێشەوا محەممەد شەمس ولحەق ئابادی دەڵێت: فەرموودەکان زۆر ڕاشکاوانەن کە محەممەدی مەهدی لە نەوەی منداڵەکانی حەسەنە[2].

هەر چەندە ئەوەی پشتی پێ بەسترایە زانایان دەفەرموون: فەرموودەکە بێ هێزە، لەگەڵ ئەوەشدا جمهوری ئەهلی سوننە دەفەرموون: لە نەوەی حەسەنە..

تەنانەت لە فەرموودەیەك هاتووە کە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە فاتیمەی فەرموو: (والذي بعثني بالحق نبيا، إن منهما مهدي هذه الأمة)[3].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە هەق ناردووە حەسەن و حوسەین مەهدی ئەم ئوممەتەن.

شێخ محەممەدی کوری عبدالوهاب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە دڵنیایی محەممەدی مەهدی لە نەوەی ئیمامی حەسەنە[4].

هەندێکیش دەڵێن: لە نەوەی حوسەینە، بە بەڵگەی پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمری کوری عاص (ﷺ) دەڵێت:

بەرگی سێیەم

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ٢٩) ومنهاج السنة (٤/ ٢١١).

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان، (لا ٦٨).

(٣) رواه الطبراني في (الكبير) وأبو نعيم عن علي الهلالي.

(٤) رسالة في الرد على الرافضة، (لا ٢٩) .

(يخرج المهدى من ولد الحسين..)[١]. واتە: مەهدی لە منداڵی حوسەین دەردەچێت.

هەندێکیش دەڵێن: لە نەوەی عەباسە، بە بەڵگەی پێشەوا عوسمانی کوری عەفان (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە فەرموویەتی: (المهدی من ولد العباس عمی). واتە: مەهدی لە کوری عەباسی ماممە[٢].

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە عەباسی فەرموو: (يا عم ألا أخبرك أن الله افتتح هذا الأمر بي، ويختتمه بولدك)[٣].

واتە: ئەی مامە ئایا هەواڵت بدەمێ کە بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو فەرمانەی کە پێم دراوە ئازادی دەکات، وە کۆتاییەکەی بە کورەکەتە.

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای سەرکەوتنی بۆ عەباسی مامی کرد، لە پاشان فەرمووی: (يا عم أما علمت أن المهدي من ولدك)[٤].

واتە: ئەی مامە! ئایا نازانیت کە مەهدی لە منداڵی تۆیە.

ئەم هەواڵانەی کە دەفەرموون: لە نەوەی عەباسە دژ بەوە نییە کە لە نەوەی پێغەمبەرە (ﷺ) یان لە منداڵی فاتیمەیە، بەڵام بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە محەممەدی مەهدی لە نەوەی فاتیمەیە نەك عەباس.

---

(١) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ١٥٧).

(٢) رواه الدار قطني في (الأفراد) وابن عساكر في (تاريخه)، وقال الدار قطني: هذا حديث غريب تفرد به محمد بن الوليد مولى بني هاشم.

(٣) رواه الخطيب وابن عساكر في (تاريخه).

(٤) رواه هيثم بن كليب، وابن عساكر عن ابن عباس، ورجاله ثقات.

حیکمەت چیە کە (موحەممەدی مەهدی) لە ڕەچەڵەکی پێشەوا (حەسەن)ە؟

ئەو فەرموودانەی لە پێشوودا باسمان کرد ئەوە دەگەیەنێت کە محەممەدی مەهدی لە نەوەی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە(ﷺ)، وە هیچ بەڵگەیەکی دروست نییە کە بفەرموێت: لە نەوەی حەسەنە یان حوسەین (ڕەزای خوایان لێ بێ).

بەڵام ئەوانەی کە دەفەرموون: لە نەوەی حەسەنە، پشتیان بە فەرموودەیەك بەستووە کە جارێکیان پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) سەیری حەسەنی کوڕی کردو فەرمووی: (إِنِ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ كما سماه النبي(ﷺ) وسيخرج من صلبه رجل يسمى باسم نبيكم يشبهه في الخلق، ولا يشبهه في الخَلق.. يملأ الأرض...)[1].

واتە: ئەم کوڕەی من سەرکردەو ڕێزدارو گەورەیە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی ناوە، وە لە پشت ئەو کوڕەی من پیاوێك دەردەچێت ناو دەبرێت بەناوی پێغەمبەرەکەتان لە ڕووی ڕەوشتەوە بە پێغەمبەر دەچێت، بەڵام لە ڕووی وێناوە بەو ناچێت.. زەوی پڕ دەکات.

چونکە پێشەوا حەسەن بوو بە خەلیفە لە پاش شەهیدبوونی باوکی (عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب) ئیتر موسڵمانان دوو فەرمانڕەواییان هەبوو.

- پێشەوا حەسەن (ﷺ) لە عێراق و حیجازو شوێنەکانی تر.
- پێشەوا موعاویە (ﷺ) لە شام و دەوروبەری.

پاش ئەوەی پێشەوا حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) شەش مانگ فەرمانڕەوایی کردو دواتر دەستی لێ هەڵگرت بۆ موعاویە بەبێ هیچ بەرامبەرێکی دونیایی، بەڵکو لە پێناو خوای گەورەو بۆ ئەوەی موسڵمانان پەرتەوازە نەبن و لەسەر یەك فەرمانڕەوا کۆببنەوەو خوێن ڕشتن ڕابوەستێت، هەر کەسیش واز لە شتێك بهێنێت بۆ خوای گەورە، خوای گەورە زیاتری پێ دەبەخشێت، یان بەنەوەکەی زیاتر دەبەخشێت[2].

---

(١) ضعيف: رواه ابو داود برقم: (٤٢٩٠). وضعفه الألباني في ضعيف أبي داود (٤٩٩٠).

(٢) المنار المنيف، لإبن القيم، (لا ١٥١).

# خودای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێ !

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتِ، يُصْلِحُهُ اللَّهُ فِي لَيْلَةٍ)[1].

واتە: مەهدی لە ئال و بەیتی ئێمەیە، خوای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێ بۆ ئەو کارە.. یان بە واتای ئەوە بێت: کاروباری ڕێکدەخات و پلەو پایەی بەرز دەکاتەوە لەیەك شەودا، یان لە یەك ساتی شەوێکدا، چونکە پیاو ماقوڵ و خاوەن بڕیارەکان پێکدێن لەسەر دانانی ئەو وەکو خەلیفە[2].

(يُصْلِحُهُ اللَّهُ فِي لَيْلَةٍ) بە واتای ئەوە نییە کە گومڕاو یاخی بووەو خوا ڕێنموونی کردبێت و بوویێتە سەرکردەی خەڵکی، نەخێر، چونکە مەهدی خەڵکی بەڕێوە دەبات، فتوایان بۆ دەدات و ناکۆکییەکانیان چارەسەر دەکات و سەرکردایەتی جەنگیان دەکات، ئەم زانستەیش لە شەوێکدا کۆنابێتەوە مەگەر لە ڕێگەی وەحیەوە بێت، وەحییش تەنها بۆ پێغەمبەرانەو مەهدیش پێغەمبەر نییە.. بۆیە (يُصْلِحُهُ اللَّهُ فِي لَيْلَةٍ) واتە: قایلی دەکات بەوەی مەهدییەو بەرجەستەکاری فەرموودەکانەو سیفەتەکانی سەرکردایەتی پێ دەبەخشێت.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە واتای ئەوە دێت کە هەندێك نەقصی هەیە، خوای پەروەردگار دەیسازێنێ و تەوبەکەی لێ قەبوڵ دەکات[3].

پێشەوا عەلی قاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێ و پلەی بەرز دەکاتەوە لە کاتژمێرێکی شەودا[4].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٧٤) برقم: (٦٤٥) وقال الشيخ أحمد شاكر في تخريجه للمسند برقم: (٦٤٥) إسناده صحيح، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٦٧٣٥).

(٢) المرقاة، ملا علي القاري (٥/ ١٨٠).

(٣) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ٤٣).

(٤) مرقاة المفاتيح (٥/ ١٨٠) والرد على من كذب بالأحاديث الصحيحة الواردة في المهدي، الشيخ

# كردارەكانی محەممەدی مەهدی!

خوای پەروەردگار كە محەممەدی مەهدی دەنێرێت بۆ سێ كرداری سەرەكی دەینێرێت:

## یەكەم: دادپەروەری لەسەر زەوی دەچەسپێنێت:

• پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَمْلِكُ سَبْعَ سِنِينَ)[١].

واتە: زەوی پڕ دەكات لە دادوەری پاش ئەوەی كە پڕی بوو لە تاوان و ستەم، وە موڵكەكەی حەوت ساڵ دەخایەنێت.

• پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى .. يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ عِتْرَتِي ـ أَوْ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي ـ مَنْ يَمْلَؤُهَا قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ ظُلْمًا وَعُدْوَانًا)[٢].

واتە: كۆتایی بونەوەر نایەت هەتا .. پیاوێك دەردەچێت لە ئال و بەیتی من، ئەم زەویە پڕ دەكات لە دادگەری، هەروەكو چۆن پڕ بوو لە ستەم و دوژمنایەتی.

• پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا..)[٣].

---

عبدالمحسن العباد، لا ٧٩ .

(١) حسن: سنن أبو داود (٤/ ١٠٧) كتاب: المهدي، برقم: (٤٢٨٥). وحسن الألباني إسناده في تخريج المشكاة (٣/ ١٥٠١). وصحيح الجامع (٦٦١٢).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٧/ ٤١٦) برقم: (١١٣١). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط شيخين.. ووافقه الذهبي.

(٣) ضعيف: مسند الإمام أحمد (٤٢٦/١٧) برقم: (١١٣٢٥). قال الإمام شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

واتە: موژدەتان دەدەمێ بە مەهدی، پیاوێکە لە قورەیش لە ئال و بەیتی من، لە کاتی ناکۆکی نێوان خەڵك و زۆربوونی بومەلەرزەدا خودا دەینێرێت، زەوی پڕ دەکات لە ڕاستی و دادوەری، وەك چۆن پڕ ببوو لە ستەم..

• پێشەوا موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کردم و گوتی: (انَّ الْمَهْدِيَّ لَا يَخْرُجُ حَتَّى تُقْتَلَ النَّفْسُ الزَّكِيَّةُ، فَإِذَا قُتِلَتِ النَّفْسُ الزَّكِيَّةُ غَضِبَ عَلَيْهِمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ فَأَتَى النَّاسَ الْمَهْدِيُّ فَزَفُّوهُ كَمَا تُزَفُّ الْعَرُوسُ إِلَى زَوْجِهَا لَيْلَةَ عُرْسِهَا وَهُوَ يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطاً وَعَدْلاً ..)[١].

واتە: بە دڵنیایی مەهدی دەرناچێت هەتا نەفسی زەکییە دەکوژرێت، کە کوژرا خەڵکی ئاسمان و ئەوانەی لە زەوین لێیان تورە دەبن، ئەمجا خەڵکی مەهدی دەهێنن و دەیرازێننەوە هەروەکو چۆن بووك بۆ پیاوەکەی دەرازێننەوە لە شەوی بوکێنیدا، زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری.

لەم فەرموودانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە محەممەدی مەهدی دادپەروەری بەربڵاودەکاتەوە بە هەموو جۆرەکانیەوە، وەکو دادپەروەری کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی و دادوەری و.. هتد. ئەمەش لە کاتێکدایە سەرتاپای زەوی پڕببوو لە ستەمکردن.

**پرسیارێك: ئایا ئەو دادپەروەریە سەرتاپای زەوی دەگرێتەوە ؟**

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم: فەرموودەکان زۆر ڕاشکاوانە باس لە دادپەروەری سەرتاسەری جیهان دەکات، وە زۆر ئاساییە کە وشەی (الْأَرْضَ) ئەو خاکانە بگرێتەوە کە محەممەدی مەهدی دەسەڵاتی بەسەردا هەیە، واتە: بەشێك لەو خاکانەی کە حوکمی تێدا بکات، چونکە وشەی (الْأَرْضَ) گشتیە بەڵام مەبەست پێی بەشێکە، تەنانەت لە قورئان ئەم دەستەواژانە زیاتر لە جارێك بەکار هاتووە:

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة، لأبي بكر بن أبي شيبة، (٥١٤/٧) برقم: (٣٧٦٥٣). قال الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة: متنه منكر، وإسناده نظيف. سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة: (٥/ ١٧٦)، برقم (٢١٥٥).

خوای پەروەردگار دەربارەی فیرعەون فەرموویەتی: [إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ][1].

واتە: بەڕاستی فیرعەون بەرزو زاڵ بوو لە زەوی (میصر)دا، وە خەڵکەکەی میصری کرد بە چەند بەش و کۆمەڵێك.

مەبەست لە وشەی (ٱلْأَرْضِ ) لێرەدا خاکی میصرە نەك هەموو خاکی دونیا بێت.

خوای پەروەردگار دەربارەی بەنی ئیسرائیل فەرموویەتی: [وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ][2].

واتە: ئیتر (لە جێگای گەلی فیرعەون) ئەو گەلەمان نیشتەجێ کرد کە هەمیشە دەچەوسێنرانەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەو وڵاتەدا.

بە هەمان شێوە مەبەست لە وشەی (ٱلْأَرْضِ ) لێرەدا خاکی میصرە نەك هەموو خاکی دونیا بێت.

لێرەدا تەنها ئاماژەمان بە دوو ئایەتی قورئان کرد، ئەگینا دیەان ئایەتی قورئانیمان هەیە کە بە گشتی هاتوون و مەبەست لێی بەشێکە.. کەواتە وشەی دادپەروەریش لەسەر زەوی دەگونجێت لێی بەشێك بێت نەك هەموو سەر زەوی.

## دووەم: ماڵ و سەروەت و سامان زۆر دەبەخشێت:

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا صِحَاحًا؟ قَالَ: بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَ النَّاسِ)[3].

---

(١) سورة القصص، الآية: (٤).

(٢) سورة الأعراف، الآية: (١٣٧).

(٣) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١٧/ ٤٢٦) برقم: (١١٣٢٥). قال الإمام شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

واتە: پارە بەرێکی بەش دەکات، پیاوێك گوتی: چۆن بەرێکی؟ فەرموی: بە یەکسانی لە نێوان خەڵکدا.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (يكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي خَلِيفَةٌ يَحْثِي الْمَالَ حَثْيًا، لَا يَعُدُّهُ عَدَدًا)[1].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا خەلیفەیەك دەبێت، پارە بەهەڵڕشتن هەڵ دەرێژێت و بە ژماردن نایژمێرێت.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: وشەی (حثيا) واتە: بە هەردوو دەستی ئەمەش لەبەر سەخاوەتی ئیمامی مەهدی[2].

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (يكُونُ فِي آخِرِ الزمان خَلِيفَةٌ يقسم المال ولَا يَعُدُّهُ)[3].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا خەلیفەیەك دەبێت، ماڵ بە یەکسانی دابەش دەکات و نایژمێرێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يخرج فِي آخِرِ الزمان خليفة يعطي الحق بغير عدد)[4].

واتە: لە کۆتایی ئومەتەکەمدا خەلیفەیەك دەردەچێت، هەق دەبەخشێت بەبێ ژماردن.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٤) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، برقم: (٢٩١٣).

(٢) شرح النووي على صحيح مسلم (١٨/ ٤٠).

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٥) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، برقم: (٢٩١٤).

(٤) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٤) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، برقم: (٢٩١٣).

بەرگی سێیەم

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ يَسْقِيهِ اللَّهُ الْغَيْثَ، وَتُخْرِجُ الْأَرْضُ نَبَاتَهَا، وَيُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا، وَتَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ وَتَعْظُمُ الْأُمَّةُ، يَعِيشُ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا)(١).

واتە: مەهدی لە ئومەتی من هەڵدەكەوێت، خودا بارانی بۆ دەبارێنێ و زەوی ڕووەكی خۆی دەردەخاو ماڵ دەبەخشێ و ڕەشە وڵاخ زۆر دەبێ و ئومەت مەزن دەبێ، حەوت یان هەشت ساڵانیش دەژی.

ئەم فەرموودانەش هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە لە سەردەمی محەممەدی مەهدی ماڵ و سەروەت و سامان زۆر زۆر دەبێت و زۆریش سەخی و دەستكراوە دەبێت، تەنانەت كەسێك پێویستی بە یارمەتی هەر نابێت..

پێشەوا طاوس (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (علامة المهدي جواداً بالمال، رحيماً بالمساكين)(٢).

واتە: لە نیشانەی مەهدی سەخیە بە ماڵ و بە بەزەییە بەرامبەر بە هەژاران.

## سێیەم: كار لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەكات:

لە فەرموودەی ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو فەرمووی: (يخرج رجل من أمتي يقول بسنتي)(٣).

واتە: پیاوێك لەم ئومەتە دەردەچێت بە سوننەتی من دەدوێت، واتە: ڕەفتار بە سوننەت دەكات.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٦٠١) برقم: (٨٦٧٣). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وصححه الشيخ مصطفى العدوي في الصحيح المسند في الفتن، لا ٣٥٢.

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٨٩ .

(٣) أخرجه الطبراني في (الأوسط).

لە فەرموودەی دایکمان ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لیَ بیَ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(ويعمل في الناس بسنة نبيهم سنين)[1]. واتە: لە نێو خەڵکی کار بە سوننەتی من دەکات چەندین ساڵ.

لە فەرموودەی دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لیَ بیَ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (المهدي رجل من عترتي، يقاتل على سنتي كما قاتلت أنا على الوحي)[2].

واتە: مەهدی لە خانەوادەی منە، جەنگ دەکات لەسەر سوننەتی من هەروەکو چۆن من دەجەنگم لە پێناوی وەحی.



(١) أخرجه الطبراني في (الأوسط).

(٢) أخرج الإمام ابو نعيم بن حماد في (الفتن).

## بەرەکەت لەو سەردەمی زۆر دەبێت

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ يَسْقِيهِ اللَّهُ الْغَيْثَ، وَتُخْرِجُ الْأَرْضُ نَبَاتَهَا، وَيُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا، وَتَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ وَتَعْظُمُ الْأُمَّةُ، يَعِيشُ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا) [١].

واتە: مەهدی لە ئومەتی من هەڵدەکەوێت، خودا بارانی بۆ دەبارێنێو زەوی ڕووەکی خۆی دەردەخات و ماڵ دەبەخشێ و ڕەشە وڵاخ و مەڕوماڵات زۆر دەبێ و ئومەت مەزن دەبێ، حەوت یان هەشت ساڵانیش دەژی.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

(لَتُمْلَأَنَّ الأَرْضُ جَوْرًا وَظُلْمًا، فَإِذَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا بَعَثَ اللَّهُ رَجُلًا مِنِّي اسْمُهُ اسْمِي أَوِ اسْمُهُ اسْمُ أَبِي، يَمْلَؤُهَا عَدْلًا وَقِسْطًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، فَلا تَمْنَعُ السَّمَاءَ شَيْئًا مِنْ قَطْرِهَا وَلاَ الأَرْضَ شَيْئًا مِنْ نَبَاتِهَا، يَلْبَثُ فِيكُمْ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا أَوْ تِسْعًا) [٢].

واتە: زەوی پڕ دەبێت لە ستەم، وە کە پڕ بوو لە ستەم خوای گەورە پیاوێك دەنێرێت لە نەوەی من ، ناوی ناوی منەو ناوی باوکیشی ناوی باوکی منە، زەوی پڕ دەکات لە ڕێك و دادپەروەری، هەروەك چۆن پڕ ببوو لە ستەم، لە سەردەمی ئەودا ئاسمان هیچ لەبارانی ناگرێتەوەو زەویش هیچ لە ڕووەکی گڵ ناداتەوە، حەوت یان هەشت ساڵتان لەناودا دەبێت، ئەگەر زۆری خایاند ئەوا نۆ ساڵە.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٦٠١) برقم: (٨٦٧٣). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وصححه الشيخ مصطفى العدوي في الصحيح المسند في الفتن، لا ٣٥٢.

(٢) مسند البزار (٨/ ٢١٤) برقم: (٢٨٢٤).

ئەوەی وەردەگیرێت لەم دوو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمانەن:

١- (يَسْقِيهِ اللَّهُ الْغَيْثَ)

واتە: خودای گەورە بارانی بۆ دەبارێنێ.. بارانێکی زۆر دەبارێت ڕووبارەکان پڕ دەبنەوە لە ئاوی جوان، کانیاوەکان هەمیشە هەڵدەقوڵێن.

٢- (تُخْرِجُ الْأَرْضُ نَبَاتَهَا).

واتە: زەوی ڕووەکی خۆی دەردەخات، تەنانەت ئەو خاکانەی کە گژوگیای لێ شین نەدەبوون هەموو ڕووەکی تیایدا دەڕوێت.. بەبێ ئەوەی کەس ڕواندبێتی تەنانەت بەبێ کێڵان هەمووی دەهێتە بەرهەم، تەنانەت خاك هەیە لە بیابانەکانی سودان کە ئەستەم بوو هیچ ڕووەکێکی تێیدا شین ببێت، بەڵام لەو سەردەم هەمووی دەبێت بە گژوگیا بەبێ ئەوەی دەستی هیچ کەسێکی تێدا بێت.

٣- (تَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ) .

واتە: ڕەشە وڵاخ و مەڕو ماڵات زۆر دەبێ.. تەنانەت محەممەدی مەهدی گرنگیەکی زۆر ئەدات بە زیندووکردنەوەو بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و ڕەشە وڵاخ.

٤- (يُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا).

واتە: ماڵ زۆر بەدادپەروەری دەبەخشێ.. ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت لە ژماردن نایەت، لەگەڵ زۆربوونی ماڵ کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ داری پەرە دەسەنێت، ئەمەش هەموو بە هۆی دادپەروەری و حوکمکردنە بە قورئان.

٥- (تَعْظُمُ الْأُمَّة).

واتە: ئەم ئوممەتە مەزن دەبێت.. ژمارەی موسڵمانان زۆر دەبێت، تەنانەت بەهێزبوون دەکەوێتە نێویان.

# ماوەی دەسەڵاتی محەممەدی مەهدی لەسەر زەوی

ماوەی مانەوەی محەممەدی مەهدی لەسەر زەوی پێنج یان حەوت یان هەشت یان نۆ ساڵ دەبێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لَتُمْلأَنَّ الأَرْضُ جَوْرًا وَظُلْمًا، فَإِذَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا بَعَثَ اللَّهُ رَجُلًا مِنِّي اسْمُهُ اسْمِي أَوِ اسْمُهُ اسْمُ أَبِي، يَمْلَؤُهَا عَدْلًا وَقِسْطًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، فَلا تَمْنَعُ السَّمَاءَ شَيْئًا مِنْ قَطْرِهَا وَلاَ الأَرْضَ شَيْئًا مِنْ نَبَاتِهَا، يَلْبَثُ فِيكُمْ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا أَوْ تِسْعًا)[١].

واتە: زەوی پڕ دەبێت لە ستەم، وە کە پڕ بوو لە ستەم خوای گەورە پیاوێك دەنێرێت لە نەوەی من ، ناوەکەی ناوی منەو ناوی باوکیشی ناوی باوکی منە، زەوی پڕ دەکات لە ڕێك و دادپەروەری، هەروەك چۆن پڕ ببوو لە ستەم، لە سەردەمی ئەودا ئاسمان هیچ لەبارانی ناگرێتەوەو زەویش هیچ لە ڕووەکی گڵ ناداتەوە، حەوت یان هەشت ساڵتان لەناودا دەبێت، ئەگەر زۆری خایاند ئەوا نۆ ساڵە.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (إنّ فی أمتی المهدی یخرج، یعیش خمساً أو سبعاً أو تسعاً..)[٢].

واتە: بە دڵنیایی لە ئوممەتی من مەهدی هەیە دەردەچێ، پێنج یان حەوت یان نۆ ساڵ لەناوتاندا دەژیت..

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (الْمَهْدِيُّ مِنِّي، أَجْلَى الْجَبْهَةِ، أَقْنَى الْأَنْفِ، يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَمْلِكُ سَبْعَ سِنِينَ)[٣].

---

(١) مسند البزار (٨/ ٢١٤) برقم: (٢٨٢٤).

(٢) رواه الترمذي، كتاب: الفتن، برقم: (٢٢٣٣). وحسنه الألباني في صحيح الترمذي (١٨٢٠).

(٣) حسن: سنن أبو داود (٤/ ١٠٧) كتاب: المهدي، برقم: (٤٢٨٥). وحسن الألباني إسناده في تخريج

واتە: مەهدی لە منەو ناوچەوانی (أجلی) یە، لوتی (أقنی) یە، زەوی پڕ دەکات لە دادوەری پاش ئەوەی کە پڕی بوو لە تاوان و ستەم، وە موڵکەکەی حەوت ساڵ دەخایەنێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ يَسْقِيهِ اللَّهُ الْغَيْثَ، وَتُخْرِجُ الْأَرْضُ نَبَاتَهَا، وَيُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا، وَتَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ وَتَعْظُمُ الْأُمَّةُ، يَعِيشُ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا)[١].

واتە: مەهدی لە ئومەتی من هەڵدەکەوێت، خودا بارانی بۆ دەبارێنێو زەوی ڕوەکی خۆی دەردەخاو ماڵ دەبەخشێ و ڕەشە وڵاخ زۆر دەبێ و ئومەت مەزن دەبێ، حەوت یان هەشت ساڵانیش دەژی.

پێشەوا نوعەیمی کوری حەمماد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەهدی چل ساڵان دەمێنێتەوە[٢].

پێشەوا زەمرەی کوڕی حەبیب(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ژیانی مەهدی سی ساڵە[٣].

پێشەوا دیناری کوری دینار دەڵێت: مانەوەی مەهدی چل ساڵە[٤].

پێشەوا زوهری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەهدی چواردە ساڵان دەژیەت، لە پاشان کۆچی دوایی دەکات[٥].

---

المشكاة (٣/ ١٥٠١). وصحيح الجامع (٦٦١٢).

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٦٠١) برقم: (٨٦٧٣). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وصححه الشيخ مصطفى العدوي في الصحيح المسند في الفتن، لا ٣٥٢.

(٢) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١١٢٠).

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٦٧.

(٤) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١١٣٢).

(٥) ضعيف: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١١٣٣). بسند ضعيف جداً.

ڕای پەسند دوای توێژینەوەیەکی زۆر بەندە گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە مەهدی (حەوت ساڵ هەتا نۆ) ساڵ دەمێنێتەوە.. چونکە فەرمووده ڕاست و دروستەکان هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە مانەوەی ئەم پیاوە مەزنە لە نێوان حەوت هەتا نۆ ساڵە.. کەواتە ماوەکە لە نێوان حەوت هەتا نۆ ساڵە، ئەمەش شتێکی نامۆ نییە، چونکە خوای پەروەردگار لە قورئان باسی زاڵبوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بەسەر فارسەکانمان بۆ دەکات، هەروەکو فەرموویەتی: [الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ ][1].

واتە: (ئەلیف لام میم) ئەم پیتانە هێماو ئاماژەن بۆ دەستەوسانی عەرەبەکان بەرامبەر بە قورئان و دەرەنجامیش پەککەوتنیان و هیچ لێ نەهاتنیان، خوا خۆی دەیزانێ مەبەستی لەم وشەیە چیە، ڕۆمیەکان شکان، لە بەشێکی زۆر نزیك بە وڵاتی عەرەبەکانەوە کە دەکەوێتە نێوان (ئوردن و فەلەستین)، پاش ئەمە زاڵ دەبنەوە بەسەر ئەوانەدا کە شکاندبویان کە فارسەکانن، لە ماوەی چەند ساڵێکدا سەرەنجامی کار لەمەوپێش بۆ خوا بوەو لەمەوپاشیش هەر بۆ ئەوە، واتە: فارس زاڵ بێ یا ڕۆم زاڵ بێ سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا خۆیەتی، جا ئەو ڕۆژە کە ڕۆمیەکان زاڵ دەبن بەسەر فارسەکان، وە موسڵمانان شاد دەبن[2].

سەبارەت بە [فِي بِضۡعِ سِنِينَ] چەند ڕاوبۆچونێك هەیە؟

١ـ لە نێوان (٢ ـ ١٠) یان (١٢ ـ ٢٠) ساڵە.

٢ـ (٧) ساڵە.

٣ـ (٣ ـ ٩) ساڵە.

٤ـ (١ ـ ٤) ساڵە.

٥ـ (٥ ـ ٧) ساڵە[3].

---

(١) سورة الروم، الآية: (١ ـ ٤) .

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی، مەلا عبدالكريمی مدرس، لا ٤٠٤.

(٣) أحكام القرآن، أبي بكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، (٣، ٣٨٦).

ئەوەندەی بەندە بۆی بچێت لە نێوان (٣ ـ ٩) ساڵە، خوای گەورە لە هەموو کەس شارەزاترە.

لە کۆتایی:

محەممەدی مەهدی لە تەمەنی چل ساڵی خوای پەروەردگار دەیسازێنێت.

لە ماوەی حەوت تا نۆ ساڵ دادپەروەری دەهێنێتە کایەوە.

وە دەشگونجیٚ کە ماوەی مانەوەی حەوت یان نۆ ساڵ لەسەردەمی پێغەمبەر عیسا بێت (سەلامی خوای لیٚ بیٚ). واتە: لە پێش هاتنی عیسا چەندین ساڵ حوکم دەکات.

**دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:**

کەسانێك پرسیار دەکەن و دەڵێن: چۆن محەممەدی مەهدی سەرتاپای زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری لە ماوەی حەوت ساڵان، لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) بیست و سیٚ ساڵان لە مەککە مایەوەو لە خوا دەپاڕایەوە ئەوجا هەموو سەر زەوی پڕ نەبوو لە دادپەروەری؟

وەڵامی ئەو پرسیارە بە چەند خاڵێك دەدەینەوە:

**یەکەم:** هەر شتێك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێدابین ئەرکی سەرشانمانە بە ڕاستی بزانین..

**دووەم:** خوای پەروەردگار کۆمەڵێك لە کاروبارەکانی بۆ ئاسان دەکات، بە نمونە پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) لە ماوەی دە ساڵان سەرتاپای زەوی پڕ کرد لە دادپەروەری هەروەکو چۆن پڕ بوو لە ستەم، پێشەوا عومەری کوری عەبدوالعەزیز (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) لە ماوەی دوو ساڵ و پێنج مانگ سەرتاپای زەوی پڕ کرد لە دادپەروەری، وە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کە محەممەدی مەهدی لە ماوەی حەوت ساڵان زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری..

سێیەم: محەممەدی مەهدی خوای گەورە کاروبارەکانی بۆ ئامادە دەکات بۆ نوێکردنەوەی ئایینی ئیسلام، وە خوای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێ، لە دوای ئەوەدا خوای گەورە کەراماتێکی پێ دەبەخشێت ئەویش ڕۆچوونی جەیشێکە کاتێك دەیانەوێت پەلەماری کەعبە بدەن.

چوارەم: هەر شتێك بە ئێمە ڕابگەیەنرێت ئەوا یەکێکە لە نیشانەی پێغەمبەرایەتی[1].

---

(١) المهدي، محمد بن اسماعيل المقدم، (لا ١٧٣ ـ ١٧٥).

## ئایا محەممەدی مەهدی گەورەترە یان ئەبوبەکرو عومەر؟

پێشەوا عەوفی کوڕی محەممەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

باسی ئەوەمان دەکرد کە لەم ئوممەتە پێشەوایەك هەیە، پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەر پێی ناگەن لە گەورەیی[١].

بە پێشەوا محەممەدی کوڕی سیرینیان گوت:

ئایا مەهدی باشترە، یان ئەبوبەکرو عومەر؟

فەرمووی: محەممەدی مەهدی لە هەردووکیان باشترە، دادپەروەری دەکات وەکو پێغەمبەر(ﷺ)، تەنانەت ئیمامەتی بۆ پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریم دەکات (سەلامی خوای لێ بێ)[٢].

جا مەبەست لەم گەورەییە ئەوەیە لەو سەردەم پاداشتی پەنجا لە هاوەڵانی پێغەمبەریان (ﷺ) هەیە، وە لەو سەردەم دەجال گەمارۆیان دەدات، نەك لە ڕووی پلەی بەرزو گەورەیی و پاداشت لای خوای گەورە مەهدی گەورەتر بێت لە ئەبوبەکرو عومەر!

چونکە فەرموودە دروستەکان و ئیجماعی زانایان ئەوەمان پێدەڵێن: کە ئەبوبەکرو عومەر لە دوای پێغەمبەران گەورەترینی خەڵکین..

---

(١) صحيح: رواه ابن ابي شيبة في المصنف (٧/ ٥١٣).

(٢) أخرجه نعيم بن حماد في كتاب (الفتن) (٢/ ٢٣).

# گەڕانەوەی حوکمی ئیسلام
# پێش دەرچوونی محەممەدی مەهدی

لای هەمووممان ئەوە زانراوە کە پێش دەرچوونی محەممەدی مەهدی بە ماوەیەکی کەم خیلافەی ڕاشیدە دەگەڕێتەوە، نەك هەروەکو هەندێك وا گومان دەبەن کە مەبەستی پێ کۆمەڵ و جەماعاتی ئیسلامی بێت.. نەخێر.. بۆیە هیچ دەلیلێك نییە کە ئەوانە بن.. وە خیلافەی ڕاشیدە دەگەڕێتەوە پێش دەرچوونی محەممەدی مەهدی، چونکە لەو کات موسڵمانان دەگەڕێنەوە بەیتو لمەقدیس و قودس دەگەڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان.. هەروەکو:

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا، فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ نُبُوَّةٍ ثُمَّ سَكَتَ)[1].

واتە: پێغەمبەرایەتی لەناوتاندا دەبێت تا ئەو کاتەی کە خوا دەیەوێت، پاشان هەر کات ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتە خیلافەت لەسەر ڕێو شوێنی پێغەمبەرایەتی دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی خوا دەیەوێت، پاشان دەبێتە پادشایەتیەکی میراتگری تا ئەوەندەی خوا دەیەوێت، پاشان کە ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتە دەسەڵاتێکی زۆرداری، ئەویش دەمێنێتەوە تا ئەوەندەی کە خوا دەیەوێت، پاشان کەی ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتەوە خیلافەت لەسە ڕێو شوێنی پێغەمبەرایەتی، پاشان بێ دەنگ بوو.

---

(١) رواه أحمد في (المسند) (٣٠/ ٣٥٦) برقم: (١٨٤٠٦). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

بەرگی سێیەم

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قۆناغەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی کردووە بە پێنج قۆناغەوە:

١- پێغەمبەرایەتی.

٢- خەلیفەکانی ڕاشیدین.

٣- پاشایەتی و پشتاو پشت کردنی دەسەڵات (بە ئاشتی).

٤- پاشایەتی و پشتاو پشت گرتن (بە زەبرو زەنگ و دیکتاتۆری و کودەتا)، ئەوە ئەم سەردەمەی ئێستایە کە تیایدا دەژین، تەنها هاتنەوەی خیلافەی ڕاشدین ماوە کە لە خاڵی پێنجەم ئاماژەم پێکردووە.

٥- خیلافەتی ڕاشیدی لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی.

دەی خۆ نکۆڵی لەوە ناکرێ سەردەمی پێغەمبەرایەتی و خەلیفەکانی ڕاشیدین و پاشایەتی بە ئاشتی تەواو بووەو سەردەمی دیکتاتۆریەتیش وا خەریکە تەواو دەبێت.

دکتۆر محەممەد محەممەد حوسەین سەبارەت بە دەستەواژەی (پاشان دەبێتە پادشایەتیەکی میراتگری تا ئەوەندەی خوا دەیەوێت) دەڵێت: لە ساڵی ١٩٢٤ پەڕلەمانی تورکیا ئەم تەرتیبەی کە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرموو بوو خنکێنرا، بۆیە کۆتاییان بە دەوڵەتی عوسمانی هێناو ئوممەتی ئیسلامیشماڵئاوایی کرد، بۆیە پادشایەتی میراتگری کۆتایی پێهات و دەسەڵاتی زۆرداری پەرەی سەند، کە خۆمان لەم سەردەمە ئەم دیاردەیە بەدی دەکەین، جوانترین نمونەش ئینقیلاباتی عەسکەریە[1].

ئێمە ئێستا لەوسەردەمەین هیچ گەلێکی موسڵمان نییە لەسەر زەوی ئیلا ملکەچی سوڵتەی حاکمیەت کراوە، ئەمەش هاتنە دی فەرموودەو فەرمایشتەکانی پێغەمبەرە (ﷺ).

---

(١) الاتجاهات الوطنية في الأدب المعاصر (٢/ ٣٧).

سەیر ئەوەیە لە ڕاپۆرتێکی مەجلیسی قەومی بۆ دیراسات و توێژینەوەی ستراتیژی کە سەر بە (CIA)وە لەلایەن هەزار کارشناسی ئەمریکیەوە ئامادە کراوە، پێشبینی ئەوە دەکات کە ساڵی (٢٠٢٠)ع ئیسلامێکی تازە دێتە کایەوە، سەیرتر ئەوەیە ترسی ئەوەیان نیە کە لە جەنگدا دەدۆڕێن، بەڵکو ترسیان لەوەیە کە فیکری ئیسلامی فیکری سەرمایەداری دەڕوخێنێت و ئابڕوی دەبات و شۆڕشێك دروست دەبێت خەڵکی بە لێشاو بەرەو ئیسلام دەڕۆن، ئەو پسپۆڕانە دەڵێن: ئەو دیموکراتیەتەی کە گەیشتووەتە ئەوەی ببێتە نموونە لە جیهانداو چاوی لێبکرێ، ئابڕوی چووە بەهۆی هەڵسوکەوتی ئەمریکاو بەریتانیاوە لە جیهان، ئەو دیکتاتۆرانە لە مێژوودا ناویان دەرکردووە ئەمانیش خراپتر لەوان ناو دەردەکەن! ئەوەی موسڵمانان نەیانتوانی لە پەنجا ساڵدا بیکەن بۆ ڕیسواکردنی دیموکراتیەت، ئەمریکا لە ماوەیەکی کەمدا دوای (١١/ی سێبتەمبەری ٢٠٠١ع) کردی.

بە پێی توێژینەوەو ڕاپرسە جیهانیەکان موژدەو خوێندنەوەیەکی نوێیان هەیە بۆ گەڕانەوەی حوکمی ئیسلام لە جیهانی ئێستادا!!

یەکێك لەو توێژینەوانەی دامەزراوەی (فورد)ی ئەمریکی کردویەتی لەسەر جیهانی ئیسلامی کە دەورو حەرەکەو دەعوەو صەحوەی ئیسلامی بە شێوەیەکی بەرفرەوان هەیە.

پەیمانگایەکی تری بەناوی (معهد (بوفر) للدراسات الإستراتيجية في أمريكا) باس لە کۆتایی سەدەی بیستەم دەکات و دەڵێت: جیهان پێش کۆتایی ئەم سەدەیە تووشی دارمانی حوکمی مارکسیەت و شوعیەت و نقابیەت و نازی و دیموکراتیەت دەبێت!! ئەمانە کۆتایی پێ دێت، لەگەڵ ئەوەی مارکسیەت و شوعیەت بەڵام بە شێوەی جیا ناوی هێناوە، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەم نیزامانە لە کۆتایی سەدەی بیستەم لەناوچوون! دواتر دەڵێت هەر لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا جیهان بە گشتی بۆ دین دەگەڕێتەوە!! ڕاپۆرتەکە دەڵێت: زۆر ئاگاداری موسڵمانە ڕەش پێستەکان بن چونکە کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تایبەتی موسڵمانان کە کاریگەری ترسناکیان هەیە لەسەر یەکێتی سۆڤیەت لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا.

بەرگی سێیەم

لە ڕووی ژمارەوە ئیسلام ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوون دایەو واقیعییش لە ڕووی ئابوریو سیاسی و کۆمەڵایەتی و هەتا لایەنی ڕوحی و دەرونیش سەلماندویەتی کە جیهان پێویستی بە ئیسلامە بەڵام نەبوونی سەرکردەی تەواو لێهاتوو لە جیهانی ئیسلامی یەکێکە لە هۆکارەکانی نەگەڕانەوەی حوکمی ئیسلام، ئەگەر چاو بە نێو میللەتی عەرەبدا بخشێنین موسڵمان زۆرن بەڵام عومەری تێدا نیە، لە نێو فارسان موسڵمان زۆرە بەڵام سەلمانی تێدا نیە، لە نێو کوردان موسڵمانان زۆرە بەڵام صەلاحەدینی تێدا نیە، لە نێو تورکان موسڵمان زۆرە بەڵام موحەممەد فاتحی تێدا نیە، ئەوەمان لەبیر نەچێ موژدەی هاتنەوەی حوکمی ئیسلام لە تورکیا ئەو تورکیایەی بۆ ماوەی پێنج سەد ساڵ حوکمی ئیسلامی بەڕێوە بردو گەیاندیە ئەوروپاو نەمساو مەجەر، هەروەها دەسەڵاتی بەسەر یۆنان و سربیاو ئەلبانیاو بلغاریاو باکوری بەحری ڕەش و جۆرجیاو داغستان و قەوقازو ئازربایینجان نێوانی بەحری ڕەش و بەحری ناوەڕاست کە ئەم وڵاتانە دەگرێتەوە عێراق، شام، تورکیا، جەزیرەی عەرەب، هەر لەسەر ئەم دەسەڵاتە ئۆردۆگان بە توندی هێرشی کردە سەر وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل و لەناو پەرلەمان گوتی: من وەکو سەرۆکی تورکیا کە میراتگری خیلافەتی ئیسلامی و عوسمانیە قسە دەکەم! ئەم هەڵوێستەش ئەمریکاو ئەوروپای تورەکردو بەبیر جیهانی هێنایەوە کە خیلافەتی عوسمانی درێژە پێدەری خیلافەتی راشیدیو ئەمەویو عەباسیە.

بیریارو گەورە پیاوانی ڕۆژئاوا باس لە هۆشیاربوونەوەی موسوڵمانان دەکەن و دەترسن کە موسوڵمانان دەسەڵات پەیدابکەنەوە.

بن گۆریۆنی جوولەکە دەڵێت: ئەوەی کە زۆر لێی دەترسین ئەوەیە کە (محەممەد) یێکی تازە بێتەوە.

یەکێکی تریان دەڵێت: بەڕاستی ئەو موسوڵمانانەی کە بۆ سەدان ساڵ خەوتبوون، وا وریا بۆتەوەو هاواردەکاو دەڵێت: من نەمردووم، من وا گەڕامەوە بۆ ژیان و نامەوێ لە پایتەختی وڵاتە گەورەکانەوە هەڵمسوڕێنن.

بلازەری پورتوگالی دەڵێت: بەڕاستی ترسی ڕاستەقینە لەسەر ژیارەکەمان لەو کاتەدایە کە موسوڵمانان دەیانەوێ دونیا بگۆڕن، پێیان گوت: جارێ سەرقاڵی جیاوازی نێوان خۆیانن، گوتی: ئاخر دەترسین کەسێك بێت ئاراستەی هەموو جیاوازیەکانیان ڕوو بکاتە ئێمە..

ڕۆژهەڵاتناس (جب)یش دەڵێت: موسوڵمانان هەرئەوەیان کەمە کە سەڵاحەدینێکی نوێیان تیا دەرکەوێت[1].

ئەمەش ڕاستی ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: خەلافەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە پاش ئەو هەموو لادانانەی کە ڕوودەدات، کە ئەوەش وەعدی خوایە بۆ ئەم ئوممەتە [وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾][2].

دوژمنان کاتێك دەبینن سێ ملیۆن کەس دەچێ بۆ حەج و لەڕەمەزانیشدا سێ ملیۆن ئەچن بۆ عومرەو ئەگەر ڕێ بدرێت چەند قاتی ئەوە دەچێت، لە کوەیتیش تەنها لە مزگەوتە گەورەکەیدا (٢٥٠) هەزار کەس بە کۆمەڵ تەراویح دەکەن، باش دەزانن ئەم ئوممەتە ڕووەو هەستانەوە دەچێت و کاتی بۆ دیاری دەکەن، باشە ئەوەی بڕوا ناکاتساڵی (٢٠٢٠)ع بێت یا (٢٠٤٠)ع بێت، گرنگ ئەوەیە دێت یان نا؟ ئەمەش وەعدی خوایەو کەسیش لە خوا بە تواناتر نیە لەسەر هێنانەدی وەعدەکانی [۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾].

---

(١) المختار الاسلامی، وتاری لا تیأس، فالنصر قادم، محمد المنجد.

(٢) سورة النور، الآیة: (٥٥).

ڕۆژنامەی (نیویورك تایمز)ی ئەمریکی لە وتارێکیدا دەڵێت: بەڕاستی ئیسلام خێراترین ئاینە لە بڵاوبوونەوەدا لە ئەفریقیا.

ڕۆژنامەنووس (مارك لاسی) لە وتارێکیدا کە لەو ڕۆژنامەیە بڵاوکراوەتەوە دەڵێت: بەڕاستی ڕەفتاری خراپی هەندێ لە قەشەکان و ڕۆڵی خراپیان لە قەتڵ و عامەکەی ساڵانی نەوەدەکاندا کە هەشت سەد هەزار کەسی تیادابوون بە قوربانی، وای کرد هەزاران ڕواندی گاور ڕوویکەنە ئیسلام و بەردەوام هات و چۆی مزگەوت بکەن.

ئەو ڕۆژنامەنووسە چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ هەندێ لەوانەدا کە موسوڵمان بوون، وەکو( یعقوب جومعە نیزیما )ی بیست و یەك ساڵ کە لە ساڵی (١٩٩٦) ع موسوڵمان بووە دەڵێت: ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی داماو کوژران لە کەنیسەکەمانداو، بەداخەوە قەشەکەمان هاوکاری بکوژانیان کرد، بۆیە منیش دڵم گۆڕدراو گەڕام بەدوای بەدیلدا ).

ڕۆژنامەی (معاریف)ی عیبری لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێت: بە هۆی ئەو هەموو فشارەی کە توندڕەوە جوولەکەکان دەیکەنە سەر موسوڵمانان لە فەڕەنسا ٨٠٪ ی ئەوانەی موسوڵمان دەبن لە فەڕەنسا جوولەکەن.. چونکە ئەو فشارە وادەکات زۆر جوولەکە بپرسێت ئەم فشارە لەبەرچی دەکرێت و ئەمەش وای لێدەکات دیراسەی ئیسلام بکات، کە دیراسەشی کرد زۆریان موسوڵمان دەبن، ڕۆژنامەکە داوا لە بەرپرسان دەکات کە بە هەر جۆرێك بێت ڕێبگرن لە موسوڵمانبوونی جوولەکەکانی فەڕەنسا [١].

سەرۆکی مەجلیسی شیوخی ئیتاڵی (مارشیلو بیرا) داوای کرد کە ڕێگری بکرێت لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ئەوروپاداو ئاماژەی بە وتەیەکی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی کرد کە لە ڕۆژنامەی (کوریری دیلا سیرا)ی ئیتاڵیدا بڵاوکراوەتەوە دەڵێت: سەد ساڵی تر ئەوروپا موسوڵمان دەبێت.

---

(١) گۆڤاری المجتمع، (٢٠٠٦/١/٧).

بەرگی سێیەم

دکتۆر عەبدوڵلا پێشەوای سەرۆکی لیژنەی موسوڵمانبوون لە ئەزهەر دەڵێت: لە (دە) ساڵی ڕابردوودا یەك ملیۆن و دووسەد هەزارکەس موسوڵمانبوون لە بەردەم ئەو لیژنەیەدا، کە زۆربەیان خەڵکی ئەوروپا و ئەمریکا و وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات و ئەفریقیا بوون، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە هێرشێکی ڕاگەیاندنی نارەوای زۆر دەکرێتە سەر ئیسلام، ئەو هێرشە بۆ ماوەیەك دوای (١١)ی سێپتەمبەر کاریگەری هەبوو، بەڵام وردە وردە کاریگەریەکەی کەم بویەوەو ئێستا خەڵکی زۆر زیاتر لە جاران ڕوودەکەنە ئیسلام[1].

ئەم دەنگوباسانەش هۆشیاربوونەوەی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایەو گەڕانەوەیە بۆ فیترەت و موژدەبەخشە بۆ داهاتوویەکی گەش بەگەڕانەوە بەرەو ئیسلام کە فیترەتە، ئیتر خەڵك بەشەوارە ناکەوێت بە بریق و باقی ئەوان و ئیتر زوڕنا ژەنەکانی نەفامی دەبێت بێدەنگ بن و سەریان داخەن لە شەرمان.

لە ساڵی ٢٠٠٧ع ڕۆژنامەی (حورییەت)ی تورکی کە لەئەستەنبۆڵ دەردەچێت هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە وەك بۆمبێك وابوو لە تورکیادا تەقیەوە، ئەو هەواڵەش پەیوەندی هەیە بە وەسیەتەکەی (ئەتاتورك)ەوە کە ماوەیەکی پێش مردنی نوسیویەتی و تا ئێستاش بە نهێنی پارێزراوە.

هەواڵەکە دەڵێت: ئەتاتورك لە ٦ی سیبتەمبەری ساڵی ١٩٣٨ع واتە: پێش دوو مانگ لە مردنی، (ئیسماعیل کۆنتەر)ی بانگ کرد بۆ کۆشکی (دولمە باغجە) کە ئەو کاتە کاتب عەدلی شەش بوو لە شەقامی (بك ئۆغلۆ)...

ئەتاتورك نەخۆش بوو، (ڕەزا صویاك)و پرۆفیسۆر (نەشئەت عومەر ئیردلب) ئامادەبوون.. ئەتاتورك وەسیەتەکەی خۆی - کە لە زەرفێکدا لۆك کرابوو بە مۆری سوور لە سێ لاوە مۆرکرابوو - دایە دەست (ئیسماعیل کۆنتەر) و پێی گوت: لەم زەرفە مۆرکراوەدا وەسیەتەکەم هەیە، کە کاتی خۆی هات ئەوەی پێویستە بیکەن.

---

(١) سایتی التوابون، (٢٠٠٦/١/٢٣).

لە ٢٨ی نۆڤەمبەری ١٩٣٩ع دادگای سوڵحی سێ لە ئەنقەرە زەرفێکی گەورەی کردەوە لەبەردەم دەستەیەکی فەرمیدا.

لەناو ئەو زەرفە گەورەیەدا زەرفێکی تر هەبوو کە سەرۆکی دادگای سێ (عثمان سلجوق) لە ٥ی سیبتەمبەری ١٩٣٩ع لەبەردەم دەستەیەکی فەرمیدا لە سندوقێکی نهێنیدا دای بە مەرکەزی سەرەکی بانقی کشتوکاڵی حکومی.

هاوڵاتیەکی تورکی بەناوی (مریج تومل‌و آر) چەند ساڵێکە گرنگی ئەدات بەو وەسیەتەو هەوڵی ئاشکراکردنی دەدات، سایتێکیشی بۆ ئەو مەبەستە داناوە بەناوی (وەسیەتە نهێنیەکەی ئەتاتورك)..

هاوڵاتیەکە دەڵێت: سەردانی بەرپرسە حکومیەکانم کردووەو هیچیان نەداوە بەدەستمەوەو نکۆڵی لێ دەکەن، لە کاتێکدا ئەو زەرفە کە پەنجا ساڵی بۆ دانراوە لەناو سندوقێکدا کە لەحیم کراوەو هەڵگیراوە دەبوایە لە هەشتاکاندا ئاشکرا بکرایە، کەچی سەرۆك کۆماری ئەو کاتە (کەنعان ئورن) هیچی نەدرکاندو گەلی لێ ئاگادار نەکردەوە.

دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی مەسیحی لە بەریتانیا دەڵێت: ژمارەی ئەوانەی دەچن بۆ مزگەوت لەساڵی (٢٠٤٠)ع دەبنە دوو هێندەی ئەوانەی کە دەچن بۆ کەنیسەکان، ژمارەی ئەوانەی دەچن بۆ کەنیسەکان لە سی ساڵی داهاتودا کەم دەبێتەوە بۆ یەك لەسەر سێ و لە ئەنجامی ئەوەوە هەژدە هەزار کەنیسە دەرگاکانی دادەخات [١].

لە ساڵی ٢٠٠٥ع ئەم هاوڵاتیە لە دادگای سوڵحی دوانزە لە ئەنقەرە داوای یاسای تۆمارکرد کە وەك مافی هاوڵاتیان دەبێت ئەو وەسیەتە ئاشکرا بکرێت، کە چەند شایەت هەن شایەتی دەدەن کە ئەو وەسیەتە هەیە، وەك سەرۆك کۆماری پێشوو (کنعان ئورن) کە لە ژیاندا ماوەو (ئەمین شیرین) ئەندام پەرلەمانی پێشوو لە ئەستەمبۆڵ، نوسەرو لێکۆڵەری تورکی ناودار (ئاتیۆج ئاڵتون دال)..

---

(١) ڕۆژنامەی تلیگراف أون صندە، بەریتانی، گۆڤاری المجتمع (٢٠٠٥/٩/١٧).

کاتێك مەحکەمە هیچی نەکردوە نەچوو بەدەم مەسەلەکەوە، ئەو هاوڵاتیە لە ١٩ی ئیبریلی ٢٠٠٧ع لە دادگای مافی ئەوروپی داوای یاسایی تۆمار کردو عەریزەیەکی چل لاپەڕەیی پێشکەش کرد کە بە درێژی مەسەلەکەی باس کردبوو، لە ٣١ ی مایۆی ٢٠٠٧ع وەڵامی مەحکەمەکە هاتەوە کە داواکەی وەرگیراوەو دواتر بڕیاری دادگا ئاگاداری دەکەن.

نوسەرو لێکۆڵەری تورکی (ئاتیۆج ئاڵتون دال) دەڵێ: سەرۆك کۆمار (کنعان ئۆرن) و سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتە (تورکۆت ئۆزال) کە دوایی بووە سەرۆك کۆمار وەسیەتەکەیان خوێندۆتەوەو بە بیانووی ئەوەی کە بارو زروفەکە لەبار نیە بۆ ئاشکراکردنی، لە ساڵی ١٩٨٨ع بۆ (دە) ساڵی تر ئاشکرا کردنەکەی دواخرا..

لەم وەسیەتەدا ئەتاتورك پێی باشە بگەڕێنەوە بۆ خەلافەتی ئیسلامی، بەڵام نەك بەشێوەی تاکەکەسی و پشتاو پشت، بەڵکو هەموو جیهانی ئیسلامی بەشداربن لە دەزگای خەلافەت، (مەنصب)ەکەی بە شێوەی هەڵبژاردن و بەشێوەی دەوری بێت، لە ساڵی ١٩٥٨ع سەرۆك وەزیران (عەدنان مەندەریس) ئەو وەسیەتەی خوێندەوەو ئەمەش وای لێکرد کە جارێك بە ئەندامانی پەرلەمان بڵێت: (ئەگەر بتانەوێ دەتوانن هەموو شتێك بکەن، تەنانەت گێڕانەوەی خەلافەتیش).

لەمەوبەر کەس نەیوێراوە خۆی بدات لەو وەسیەتە، بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێت بە ڕەجعیەت و گێڕانەوەی ئیسلام.

پێشەوا موعازی کوری جەبەل (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (عِمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ، وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ، وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ)[1].

---

(١) صحيح: المستدرك على الصحيحين(٤/٥٨٣) برقم:(٨٣٦٦).قال الحاكم: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَىَ شَرْطِ الرِّجَالِ.

واتە: ئاوەدانکردنەوەی (بيت المقدس) کاول بوون و وێرانبوونی مەدینەی بەدوادا دێت، دەرچونی جەنگە گەورەکەش ئازادکردنی (قوسطنطنية) ی بەدوادا دێت، ئازادکردنی (قوسطنطنية)یەش دەرچونی دەجالی بەدوادا دێت.

بەپێی ئەم فەرمودەیە دیارە (بيت المقدس) دەڕوخێنرێت دواتر ئاوەدان دەکرێتەوە، وە بەدوای سەر لە نویٚ دروست کردنەوەشیدا وێرانبوونی شاری مەدینە دێتە دی، ئەمەش لە سەردەمی موحەممەدی مەهدی ڕوودەدات.

دکتۆر محمد ئیسماعیل المقدم دەڵێت: ئازادکردی ئەستەمبۆڵ بۆ دووەمین جار لەسەردەمی محەممەدی مەهدی دەبێت، ئەمجا دواتر بەیت و المەقدیس ئازاد دەکریٚ [1].

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموویٚت: (أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ، يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا صِحَاحًا؟ قَالَ: بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَ النَّاسِ قَالَ: وَيَمْلَأُ اللَّهُ قُلُوبَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) غِنًى، وَيَسَعُهُمْ عَدْلُهُ، حَتَّى يَأْمُرَ مُنَادِيًا فَيُنَادِي فَيَقُولُ: مَنْ لَهُ فِي مَالٍ حَاجَةٌ؟ فَمَا يَقُومُ مِنَ النَّاسِ إِلَّا رَجُلٌ فَيَقُولُ أنا، فيقول: ائْتِ السَّدَّانَ - يَعْنِي الْخَازِنَ - فَقُلْ لَهُ: إِنَّ الْمَهْدِيَّ يَأْمُرُكَ أَنْ تُعْطِيَنِي مَالًا، فَيَقُولُ لَهُ: احْثِ حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ فِي حِجْرِهِ وَأَبْرَزَهُ نَدِمَ، فَيَقُولُ: كُنْتُ أَجْشَعَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ نَفْسًا، أَوَعَجَزَ عَنِّي مَا وَسِعَهُمْ؟ قَالَ: فَيَرُدُّهُ فَلَا يَقْبَلُ مِنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: إِنَّا لَا نَأْخُذُ شَيْئًا أَعْطَيْنَاهُ، فَيَكُونُ كَذَلِكَ سَبْعَ سِنِينَ - أَوْ ثَمَانِ سِنِينَ، أَوْ تِسْعَ سِنِينَ - ثُمَّ لَا خَيْرَ فِي الْعَيْشِ بَعْدَهُ) [2].

واتە: موژدەتان دەدەمیٚ بە مەهدی، پیاوێکە لە قوڕەیش لە ئال و بەیتی من، لە کاتی ناکۆکی نێوان خەڵك و زۆربوونی بومەلەرزەدا خودا دەینێرێت، زەوی پڕ

---

(١) المهدي وفقه أشراط الساعة، (لا ٧٣٠).

(٢) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١٧/ ٤٢٦) برقم: (١١٣٢٥). قال الإمام شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

دەکات لە ڕاستی و دادوەری، وەك چۆن پڕ ببوو لە ستەم، دانیشتوی ئاسمان و دانیشتوی زەوی لێی ڕازی دەبن، پارە بەڕێکی بەش دەکات، پیاوێك گوتی: چۆن بەڕێکی؟ فەرمووی: بە یەکسانی لە نێوان خەڵکدا، وە خوای گەورە دڵی ئوممەتی محەممەد (ﷺ) پڕ دەکات لە دەوڵەمەندی، وە دادوەریەکەی هەموویان دەگرێتەوە، هەتا بانگ دەرێك بانگ دەکات و دەڵێت: کێ پێویستی بە پارە هەیە؟ هیچ کەس لەو خەڵکە هەڵناسێت تەنها پیاوێك نەبێت، دەڵێت: من، ئەویش پێی دەڵێت: بچۆ بۆ لای خەزنەدارو پێی بڵێ: مەهدی فەرمانی داوە پارەم بدەیتێ، ئەویش پێی دەڵێت: هەڵی ڕێژە، هەتا کاتێك کە دەیکاتە کۆشیەوە پەشیمان دەبێتەوە، دەڵێت: من خراپترین کەسی محەممەد (ﷺ) بووم، پارەکە دەگێڕێتەوە، ئەوانیش پێی دەڵێن: ئێمە شتێك کە بەخشیبێتمان وەری ناگرینەوە، بەو شێوەیە حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ دەمێنێتەوە، لە پاش ئەوە خێر لە ژیاندا نامێنێت.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ فِتْنَةٌ، يُحَصَّلُ النَّاسُ كَمَا يُحَصَّلُ الذَّهَبُ فِي الْمَعْدِنِ، فَلَا تَسُبُّوا أَهْلَ الشَّامِ، وَلَكِنْ سُبُّوا شِرَارَهُمْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْأَبْدَالَ، يُوشِكُ أَنْ يُرْسَلَ عَلَى أَهْلِ الشَّامِ سَبَبٌ مِنَ السَّمَاءِ، فَيُفَرِّقَ جَمَاعَتَهُمْ، حَتَّى لَوْ قَاتَلَهُمُ الثَّعَالِبُ غَلَبَتْهُمْ، فَعِنْدَ ذَلِكَ يَخْرُجُ خَارِجٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فِي ثَلَاثِ رَايَاتٍ، الْمُكْثِرُ يَقُولُ: هُمْ خَمْسَةَ عَشَرَ أَلْفًا، وَالْمُقِلُّ يَقُولُ: هُمُ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا، أَمَارَتُهُمْ أَمِتْ أَمِتْ، يَلْقُونَ سَبْعَ رَايَاتٍ، تَحْتَ كُلِّ رَايَةٍ مِنْهَا رَجُلٌ يَطْلُبُ الْمُلْكَ، فَيَقْتُلُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا، وَيَرُدُّ اللَّهُ إِلَى الْمُسْلِمِينَ أُلْفَتَهُمْ، وَنِعْمَتَهُمْ، وَقَاصِيَهُمْ وَدَانِيَهُمْ) [1].

واتە: لە کۆتایی بونەوەر ئاشوبێك دەبێت، خەڵکی تیایدا دەپاڵێورێت هەروەکو چۆن ئاڵتون لە کانزای تر دەپاڵێورێت، بۆیە جوێن مەدەن بە خەڵکی شام، بەڵکو جوێن بدەن بە خراپەکارانیان، چونکە پیاوی زۆر چاکیان تێدایە، هێندەی نەماوە خەڵکی شام خوا لێشاوێکیان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێت کۆمەڵی و یەك ریزیەکەیان نغرۆ بکات، بە جۆرێك ئەگەر ڕێویش شەڕیان لەگەڵ بکات، لێیان بەرێتەوە

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك (٤/ ٥٩٦) برقم: (٨٦٥٨). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

بەرگی سێیەم

زاڵبێ بەسەریاندا، ئا لەو كاتەش پیاوێك لە ئال و بەیتی من دەردەچێت بەسێ ئاڵاوە، ئەوەی بە زۆریان بزانێت دەڵێت: پانزە هەزار كەسن، ئەوەی بەكەمیشیان بزانێت دەڵێت: دوانزە هەزار كەسن، بەوە دەناسرێنەوە كە دروشمەكەیان بكوژ بكوژە، ڕووبەڕووی حەوت ئاڵا (واتە: حەوت لەشكر) دەبنەوە كە لە ژێر هەر ئاڵایەكیاندا پیاوێكی تێدایە داوای دەسەڵات و پاشایەتی بۆ خۆی دەكات، خوای گەورە هەموویان لەسەر دەستیدا دەكوژێت و لەناویان دەبات، وە خوای گەورە خۆشی و تەبایی بۆ موسڵمانان دەگێڕێتەوە لە دوورو نزیكیان.

(ئەبدال) كێن ؟

خاوەنی پەرتوكی (مختار الصحاح) دەڵێت: ئەبدال قەومێكی زۆر چاكن، دونیا ژیانی لێ تاڵ نەكردوون، ئەگەر یەكێك لەوانە بمرێت خوای گەورە كەسێكی تر دەهێنێتە جێگای[1].

خاوەنی پەرتوكی (القاموس) دەڵێت: ئەبدال قەومێكن خوای گەورە لەسەر زەوی دایناون، ئەوان (حەفت)ان، (چل)یان لە شامە، (سی)یان لە جێگەكانی ترن، هیچ یەكێك نییە لەوانە بمرێت ئیلا خوای گەورە كەسێكی تری لە جێگا دادەنێت [2].

پێشەوا كەعبی ئەحبار (رضي الله عنه) دەڵێت: من ناوی مەهدیم لە كتێبی پێغەمبەران بینی كە نوسرابوو ستەم ناكات [3].

پێشەوا عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَلِي رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي .. لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللَّهُ ذَلِكَ اليَوْمَ حَتَّى يَلِيَ)[4].

---

(١) مختار الصحاح، (لا ٤٤) .

(٢) القاموس المحيط (٣/ ٣٤٤).

(٣) الفتن، نعيم بن حماد، برقم: (١٠٣٤).

(٤) صحيح: سنن الترمذي (٤/ ٧٥) باب: ما جاء في المهدي، برقم:(٢٢٣١).قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

واتە: پیاوێك لە ئال و بەیتی من دەسەڵات دەگرێتە دەست، ناوی وەکو ناوی من وایە، ئەگەر تەنها ڕۆژێك لە تەمەنی دونیا مابێت، خوا ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە هەتا ئەو پیاوە دەسەڵات دەگرێتە دەست.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يلي رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا پیاوێك لە ئال و بەیتی من دەسەڵات دەگرێتە دەست، ناوی وەکو ناوی من وایە.

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو دەیفەرموو: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتِي ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ ثُمَّ مُوتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِئَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا ثُمَّ فِتْنَةٌ لاَ يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ الْعَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْهُ ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا)[2].

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: مردنی من واتە: پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان ئازادکردنی بەیت ولمەقدیس، پاشان دەردێکتان تێ دەکەوێ وەکو ئەو دەردەی تووشی مەڕ دەبێ و ئاوی لەبەر لووتی دەڕوا کە زۆرتانی پێ دەمرن، پاشان ماڵ ئەوەندە زۆر دەبێت کەوا سەد دینار دەدەیت بە یەکێك کەچی تورە دەبێت و بە کەمی دەزانێ، پاشان فیتنەیەك پەیدا دەبێت هیچ ماڵێك لە عەرەب نامێنێ نەچێتە ناویەوە، پاشان ڕێککەوتنامەیەك لە نێوان ئێوەو بەنی ئەسفەر واتە: (وڵاتانی ڕۆژئاوا) دەبێ ئەنجا بەنی ئەسفەر غەدر دەکەن و پەیمانەکە دەشکێنن، بە لەشکرێکی هەشتا ئاڵاییەوە دێنە سەرتان، وە هەر ئاڵایەك دوانزە هەزار کەسی لەگەڵ دایە.

---

(١) صحيح: رواه أحمد في (المسند) (١/ ٣٦٧) والحديث صححه الشيخ أحمد شاكر في (تحقيق المسند) (٥/ ١٩٦) برقم: (٣٥٧١).

(٢) صحيح البخاري (١١/ ٣٠٦) كتاب: الفتن، باب: ما يحذ من الغدر، برقم: (٧١٢٠).

ئەگەر سەیر وشەی (بەنی ئەسفەر) بکەین بە واتای ڕۆمە.. ئەمەش بە دوو واتا دێت:

یەکەم: کۆمەڵێك لەم سوپایە کە سەردەکەون هاوسەرگیری دەکەن لەگەڵ ڕۆمەکان و منالّی زەردیان لێیان دەبێت.

دووەم: (ئەصفەر) پاڵ دەدرێت بۆ لای ئەصفەری کوڕی ڕۆمی کوڕی عیصوی کوڕی ئیسحاقی کوری ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێ بێ).

وە بەنی (ئەصفەر) لەقەبە بە ڕۆمەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دەگوترێت، چونکە باوکیان ڕەنگیان زەرد بوو.

پێشەوا کەرمانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: چونکە باپیریان ڕۆمی کوڕی عیصۆ هاوسەرگیری لەگەڵ کچی مەلیکی حەبەشەدا کرد، وە ئەو منداڵانەی کە لە دایك دەبن لە نێوان سپی و ڕەشیدان [1].

وە ئەم شەڕەش لە خاکی شام دەبێت لە کۆتایی دونیا ئەمەش لە پێش دەرچوونی دەجال، وە موسڵمانەکان سەردەکەون بەسەر ڕۆمەکان کە ئەمەش دەستپێشخەریەکە بۆ ئازادکردنی تورکیا و ئەستەمبۆڵ.

بەرگی سێیەم

---

(١) المهدي، عادل زكي، (لا ١٣٢).

# شێوە و ڕووخسار و سیفات و ئاکاری (محەممەدی مەهدی)

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الْمَهْدِيُّ مِنِّي، أَجْلَى الْجَبْهَةِ، أَقْنَى الْأَنْفِ، يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَمْلِكُ سَبْعَ سِنِينَ)[١].

واتە: مەهدی لە منەو ناوچەوانی (أجلی) یە، لوتی (أقنی) یە، زەوی پڕ دەکات لە دادوەری پاش ئەوەی کە پڕی بوو لە تاوان و ستەم، وە موڵکەکەی حەوت ساڵ دەخایەنێت.

(أجلی) بە کەسێك دەگوترێت کە ناوچەوانی پان بێت و کەمێك قژی لە ئاستی ناوچەوانیدا بەرەو دواوە تەنك بوویێت یان ڕوتابێتەوە[٢].

(أقنی) بە لوتێك دەگوترێت کە باریك و ڕێك بێت، لە ناوەڕاستیدا کەمێك بۆ ناوەوە چەمابێتەوە، کۆتاییەکەشی بۆ سەرەوە بەرز بوو بێتەوە، کە ئەمە جوانترین جۆری لووتە[٣].

بە کورتی و کوردی:

- دەم و چاوی وەکو گەوهەر دەدرەوشێتەوە[٤].

---

(١) حسن: سنن أبو داود (٤/ ١٠٧) كتاب: المهدي، برقم: (٤٢٨٥). وحسن الألباني إسناده في تخريج المشكاة (٣/ ١٥٠١). وصحيح الجامع (٦٦١٢).

(٢) النهاية في غريب الحديث (٤/ ١١٦).

(٣) النهاية في غريب الحديث (٤/ ١٥٩).

(٤) الحاوي (٢/ ٢٢٣).

-لە ڕوومەتی لای ڕاستیەوە خاڵێکی ڕەش هەیە[١].

-ڕیشی پڕە [٢].

-قژی سەرو ریشی ڕەشە[٣].

-ددانەکانی پێشەوەی کەمیٚ لە یەکتری دوورن [٤]..

-لە سپیەتیدا دەدرەوشێتەوە[٥].

-نە کورتە باڵایەو نە درێژە[٦].

-پیاوێکی چوار شانەیە[٧].

-سەرووی برۆکانی وەکو قەوسێکە[٨].

-ناوچەوانی پانە و کەمێك قژی لە ئاستی ناوچەوانیدا بەرەو دواوە تەنك بووەتەوە[٩].

-لووتی باریك و ڕێکە [١٠].



---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الحاوي (٢/ ٢٤٢).

(٣) المهدي قادم، لا ٣٦.

(٤) الحاوي (٢/ ٢٢٠).

(٥) الإشاعة لأشراط الساعة ، لا ١٦٥.

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٧) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ٤٠ .

(٨) الحاوي (٢/ ٢٤٢).

(٩) سنن أبو داود (٤/ ١٠٧) برقم: (٤٢٨٥).

(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

- ڕەنگی وەکو ڕەنگی عەرەبەکانە[١]..

- کەمێك ئەسمەرەو لایەنی ئەسمەری زیاترە، یان ڕەنگەکەی ڕەنگی زەوی دەدات[٢].

- هەردوو چاوی ڕەشە وەکو ئەوەی کلی لە چاوی کردبێت[٣].

- وە چاوەکانیشی فرەوانە[٤].

لە کاتی دەرچوونی ڕوو لە شام دەکات، وە جبریل لە پێشی دەڕوات و خەڵکی ئاسمان و زەوی خۆشیان دەوێت، تەنانەت ژیانلەبەرەکان و حوتی ناو دەریاکانیش[٥].

- تەمەنی لە نێوان ([٦]١٨ یان [٧]٣٠ یان [٨]٤٠ یان [٩]٤٣ یان [١٠]٦٠ ) ساڵی دەبێت.

-لە سەرشانی نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر محەممەد (ﷺ) هەیە.. هەر چەندە محەممەدی مەهدی پێغەمبەر نییە.. بەڵکو پیاو چاکێکی ئەم ئوممەتەیە[١١].



---

(١) الحاوي (٢/ ٢٢٤).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة ، لا ١٦٥.

(٣) الحاوي (٢/ ٢٣٢).

(٤) رواه الطبراني في (الكبير ٨/ ١٢٠) .

(٥) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٠٨ .

(٦) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١٠٧٢).

(٧) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١٠٧٣) بسند فيه ضعف.

(٨) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١٠٦٧) بإسناد ضعيف.

(٩) رواه ابن ماجة (٤٠٨٥).

(١٠) البرهان في علامات مهدي آخر الزمان، لا ٤٢ .

(١١) الدار الأخرة، محمد متولي الشعراوي، ٢٧٩.

- لە ڕووی ڕەوشتەوە زۆر بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەچێت[١].

- خوای گەورە ٣٠٠٠ فریشتەی لەگەڵ ڕەوانە دەکات، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی دەیانەوێت ڕووبەڕوویان ببنەوە[٢].

- لەسەر مینبەری دیمەشق ڕادەوەستێ و وتار دەخوێنێتەوە لە تەمەنی شانزە ساڵی[٣].

- کاریگەرە بەسەر کرێکاران و بە بەزەییە لەگەڵ هەژاران[٤].

- لە کاتی دەرچوونی پەلە هەور لەسەریەتی.. بانگ دەرێك بانگ دەکات و دەڵێت: ئەوە مەهدیە[٥].

- خودای گەورە ئیسلام لەسەر دەستی دەگەڕێنێتەوە، وڵاتانێکی زۆر ئازاد دەکات[٦].



---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الحاوي (٢/ ٢٢٣).

(٣) ضعيف: موسوعة الأحاديث الفتن، برقم: (٦٧٥). قال الدكتور عبدالعليم في (الموسوعة، لا ٢٠٦): إسناده ضعيف.

(٤) الفتن، برقم: (١٠٤٥).

(٥) رواه الديلمي في (مسند الفردوس) برقم: (٨٩٢٠). وهو متروك وعد الذهبي هذا الحديث من أوابده وبلاياه. ميزان الإعتدال (٤/ ٤٣٢ ـ ٤٣٣).

(٦) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ٣٣ .

# ئەو ڕووداوانەی کە لە پێش هاتنی (محەممەدی مەهدی) ڕوودەدەن

هەندێك ڕووداو و نیشانە هەن کە لە پێش هاتنی (محەممەدی مەهدی) بە ماوەیەکی کەم ڕوودەدەن، هەر کات ئەو ڕووداوانە سەریان هەڵدا، بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بوترێت کە (محەممەدی مەهدی) لە ژیاندایەو لە ماوەیەکی کەمدا ئاشکرا دەبێت..

پێشەوا حەفصی کوری غیاث (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: گوتمە سوفیانی سەوری: ئەی باوکی عەبدوڵلا خەڵکێکی زۆر لەسەر مەهدی قسە دەکەن، تۆ چی دەڵێی؟ گوتی: ئەگەر بە بەردەرگاکەت دا ڕۆیشت لەوان نەبیت بە هیچ شێوەیەك هەتا خەڵکی لە دەوری کۆدەبنەوە[1].

پێشەوا محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەو نیشانانەی کە مەهدی پێی دەناسرێتەوە ئەوەیە کە لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم کۆدەبێتەوەو عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی لە دواوە دەکات[2].

**گرنگترین ڕووداوەکانی دەرچوونی محەممەدی مەهدی ئەمانەن:**

## یەکەم: دەرکەوتنی کێوێکی زێڕین لە ڕووباری فورات:

یەکێك لەو نیشانانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئومەتەکەی لە بارەوە ئاگادار کردۆتەوەو بە نیشانەیەکی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی داناوە، ئەویش دەرکەوتنی شاخێکی ئاڵتونیە لە ڕوباری فوراتدا.

---

(١) حلية الأولياء (٧/ ٣١).١ش

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٩١) .

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:
(لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ، تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ: لَعَلِّي أَكُونُ أَنَا الَّذِي أَنْجُو)(١).

واتە: کۆتایی بوونەوەر نایەت هەتا ئاوی فورات دەگیرێتەوەو چیایەکی ئاڵتوونی تێدا دەردەکەوێت، خەڵکی کوشتارێکی زۆری لەسەر دەکەن، هەتا وای لێدێت کە لە هەموو سەد کەسێك نەوەدو نۆی دەکوژرێت، وە هەر پیاوێك دەڵێت: بەڵکو من ئەو کەسە بم کە ڕزگارم دەبێت.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: مەبەست لە (انحسار: دەرخستن) ئەوەیە کە ئاوەکەی نامێنێ و دەردەکەوێ (٢).

ڕەنگە ئەمەش بەهۆی گۆڕانی ڕێڕەوەکەی بێ، چونکە ئەو گەنجینەیە یان ئەو چیایە لە ژێر زەوی بزرەو نەدۆزراوەتەوە، جا ئەگەر بە هەر هۆیەك ڕێڕەوی ئاوەکە گۆڕاو بەلای ئەو چیایەدا تێپەڕی دەری دەخات، خوای گەورەش لە هەمووومان زاناترە.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

مەبەست لەو گەنجینەیە ئاڵتونییە کە باسکرا گەنجینەی کەعبەی پیرۆزە، کە شەڕێکی گەورە لەسەریدا دەکرێ لەلایەن سێ لە کوڕە خەلیفەکاندا، تا ئەو کاتەی کە کۆتایی بونەوەر دێت و پێشەوا مەهدی دەردەچێت لەلای ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ نێو خەڵك، نەك لە سەردابی سامەڕا، هەروەك نەزانەکانی شیعە وا گومان دەبەن کە تا ئێستا لەناو سەرداب دایە، هەروەها چاوەڕوانی دەرچوونی دەکەن لە کۆتایی بونەوەردا (٣).

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٩) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات، برقم: (٢٨٩٤).

(٢) شرح النووي على مسلم: (٩/١٨).

(٣) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ٥٢٩ ـ ٥٣٠).

بەرگی سێیەم

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرموودەیە ئاماژە بەوە دەکات لە پاش شەڕکردنی سێ کوڕە پاشاکە لەسەر کەنزو ئاڵتونەکەی ئاوی فورات کە دواتر بۆ هیچیان نابێت.

پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بەم بێژەیە لە ئوبەی کوری کەعب(ﷺ) دەگێڕتەوە: (يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَإِذَا سَمِعَ بِهِ النَّاسُ سَارُوا إِلَيْهِ، فَيَقُولُ مَنْ عِنْدَهُ: وَاللَّهِ لَئِنْ تَرَكْنَا النَّاسَ يَأْخُذُونَ فِيهِ لَيَذْهَبَنَّ ، فَيَقْتَتِلُ النَّاسُ، حَتَّى يُقْتَلَ مِنْ كُلِّ مِئَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ)[1].

واتە: نزیك بووە فوڕات کێوێك لە ئاڵتون دەربخات، جا ئەگەر خەڵکی بیستیان، بۆ ئەوێ دەچن، ئەوانی لەلای کێوەکەشن، دەڵێن: ئەگەر واز لە خەڵکی بێنین، ئەوا هەمووی دەبەن، فەرمووی: جا لەسەری بەشەڕ دێن، لە هەر سەد کەس نەوەدو نۆیان دەکوژرێن.

لەم فەرموودانەوە بۆمان بە دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی (موحەممەدی مەهدی)، ئاوی فوڕات دەگیرێتەوەو ئاڵتونێکی زۆری تێدا دەردەکەوێت، وە لەسەر ئەو ئاڵتونە سێ کۆمەڵ یان سێ دەوڵەت یان سێ سوپا بەسەرکردایەتی سێ کەس کە هەرسێکیان باوکیان پادشاو دەسەڵات داربوونە[2] ئینجا لێیان دەبێتە شەڕو کوشتار بە جۆرێك کە لە سەد کەس تەنها یەك کەس ڕزگاری دەبێت، هەر بۆیە (لفظ)ێکی تر لە فەرموودەکەی پێشەوا موسلیم هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلَا يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا) [3].

واتە: نزیك بووە فوڕات کێوێك لە ئاڵتون دەربخات، هەر کەسێك ئامادەی بوو با هیچ لەو ئاڵتوونە نەبات.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٠) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل، برقم: (٢٢٩٥).

(٢) (خەلیفە) لەم فەرموودەیە مەبەست پێی خەلیفەی ئیسلام نیە، ئەمەش هۆیەکەی ئەوەیە ناگونجێت لە یەك کاتدا سێ خەلیفە هەبن.

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٩) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات، برقم: (٢٨٩٤).

ئەو شوێنەی کە ئاڵتونەکەی تیایدا دەردەکەوێت هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری نەهاتووە.

هەر چەندە هەندێك ڕیوایەت باس لەوە دەکەن کە ئاڵتوونەکە لە شوێنێکدا دەردەکەوێت کە پێی دەگوترێت (قرقیسیا)، بەڵام ناتوانین پشتیان پێ ببەستین.

هەندێك لە خەڵکی واتای ئەم فەرموودەیە بە نەوت لێك دەدەنەوەو دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی پێ نەوت بووە، بەڵام زانایان دەفەرموون: ئەمە لێکدانەوەیەکی لاوازە، چونکە فەرموودەکە بە ئاشکرا دەفەرموێ: (جَبَلٍ مِنْ ذَهَب) واتە: چیایەك لە ئاڵتوون، بەڵام نەوت لە قووڵایی زەوی دەردەهێنرێت، وەك هەموومان دەزانین هەرگیز لە شێوەی چیادا نەبووەو ئەویش لە زۆربەی شوێنەکانی جیهاندا هەیەو دەردەهێنرێت و کەسیش بەو شێوەیە یەکتریان لەسەر نەکوشتووە[1].

جا مەبەست لەم شاخە زێڕە پترۆڵی ڕەش نیە، هەروەك موحەممەد ئەبو عبیە وای بۆ دەچێت لە تەعلیقەکەی لەسەر پەرتوکەکەی (النهایە فی الفتن والملاحم) لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: دەقەکە هاتووە کە دەڵێ: (شاخێك لە زێڕ) جا پترۆڵ لە ڕاستیدا زێڕ نیە لەبەر ئەوەی زێڕ مەعدەن و توخمێکی ناسراوە.

دووەم: پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە کە ڕووباری فورات دەگیرێتەوە لەبەر شاخێکی زێڕین و خەڵکی دەیبینن، بەڵام پترۆڵ لە نێو سکی زەوی دەردەهێنرێ بە چەندین ئامێری وورد.

سێیەم: پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ڕووباری فوراتی تایبەت کردووە بەم کارە لە نێو ئەم هەموو دەریاو ڕووبارانەدا، بەڵام پترۆڵ لەناو وشکایی و دەریاییکانیشدا دەردەهێنرێ.

---

(١) فتح المنعم (١٠/ ١٥٢).

بەرگی سێیەم

**چوارەم:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە کە خەڵکی یەکتر دەکوژن لەلای ئەم خەزێنەیەدا، وە هیچ هەواڵ نەهاتووە کە بڵێ ئەم خەڵکە یەکتر دەکوژن لە کاتی دەرهێنانی پترۆڵ لە رووباری فورات یان ڕووبارێکی تر.

جا هەر کەسێك گوتی: مەبەست بە شاخی زێڕین پترۆڵە، ئەوا ئەو کات دەبێ بڵێین کە ئەم قەدەغە کردنە واتە: کەس لەم پترۆڵە نەبات، کە ئەمەش هیچ زانایەك وای نەگوتوە[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم بۆچوونەی بەهێز داناوە کەوا هۆی ئەوەی کە قەدەغەی کردووە کە هیچ لەم زێڕە ببرِدرێ ئەوەیە کە هۆیەکە زێڕ بردنە کە کوشتارێکی گەورە سەر هەڵدەدات[2].

لای هەمووومان ئاشکرایە ئەمڕۆ دەوڵەتی تورکیا چەندین بەربەستی لەسەر ڕووباری فورات دروست کردووەو هەر تاوە ناتاوێك هەرەشە لە سوریاو عێراق دەکات بە گرتنەوەی ئاوی ڕووبارەکە ، ئەو بەربەستانەش هێندە گەورەن کە تورکیا ناتوانێت لەرێگەیانەوە بە تەواوی ئاوی فورات بگرێتەوە، دڵنیاشین لە کاتی گرتنەوەیدا ڕاستی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دێتە دی و دەبێتە یەکێك لە موعجیزیەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە زانایان دەڵێن: هێندەی نەماوە ئەم ڕووداوە بێتە دی.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی حارسی کوری نەوفەل (ﷺ) دەڵێت: لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعب وەستا بووم، گوتی: هێشتا خەڵکی لەسەر داواکردنی دونیا جیاوازن؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: نزیکە لە فورات کێوێکی ئاڵتون دەربکەوێت، کاتێك مرۆڤەکان بیستیان بۆی دەچن، هەر کەس لەلای خۆیەوە دەڵێت: ئەگەر وازبهێنین خەڵك لێی دەبەن، ئینجا فەرمووی: کوشتاری لەسەر دەکەن، لە هەموو سەد کەسێك نەوەدو نۆی دەکوژرێت.

---

(١) إتحاف الجماعة (١/ ٤٨٩ ـ ٤٩٠).

(٢) فتح الباري (١٣/ ٨١).

ئاشکرایە ئەم فەرمودانەی پێغەمبەر(ﷺ) موعجیزەیەکی گەورەیە، هەواڵدانە بە ڕوداوێکی گەورە سەبارەت بەداهاتووی بوونەوەر، کە ئێستا وردە وردە سەرە داوەکان دەردەکەوێت.

ئەمڕۆ ئاو بووەتە کێشەی سەرەکی ئەم سەردەمە، ئاشکرایە کە دیجلەو فورات لە شاخەکانی تورکیاوە هەڵدەقوڵێن، تورکیاش بۆ سود وەرگرتن لە ئاوی ئەم دوو ڕووبارە پرۆژەی (گاپ)ی خستە بواری جێبەجێ کردنەوە، کە ساڵی دوو ملیار دۆلار بودجەکەیەتی.

سلێمان دیمیرل سەرۆکی پێشوی تورکیا لە کاتی کردنەوەی بەنداوی ئەتاتورك گوتی: ئاوی دیجلەو فورات سەرچاوەیەکی تورکین و هی تورکیان، هەروەك چۆن عێراق و سوریا بیرە نەوتەکانیان هی خۆیانە، ئێمە پێیان ناڵێین بمانکەن بە هاوبەشی خۆتان، بەهەمان شێوەش عێراق و سوریا هەقیان نیە شەریکمان بن لەو سەرچاوە ئاویەدا، چیمان بوێ ئاوای لێدەکەین.

پرۆژەی (گاپ) لە (٢٢) بەنداو پێك دێت کە (١٩) وێستگەی کارەبای لەسەرە، ئەمە بێجگە لە چەندەها پرۆژەی پیشەسازی و کشتوکاڵی و ئاودان و گەیاندن..

(گاپ) لە ڕووی ڕووبەرەوە گەورەترین پرۆژەیە لە جیهان، هەشت شاری تورکیا دەگرێتەوە، کە تەواو بوو دەتوانێ (٨,٥) ملیۆن هێکتار ئاو بدات.. هەروەها ئەم پرۆژەیە (١٠٦) ملیۆن فرسەتی کاری تازە دێنێتە کایەوە کە بێکاری ناهێڵێ.

لە ساڵی (١٩٩٢) دەست کرا بە پرۆژەی بەنداوی ئەتاتورك، کە قەبارەی بنکەکەی (٨٤,٥) مەتر سێ جاو بەرزیەکەی (١٩٠)مەترە، ئەو ئاوەی کە خەزنی دەکات (٤٨,٧) ملیۆن مەتر سێ جایە، نیاز وایە کە ساڵی (٢٠١٤) پرۆژەکە تەواو ببێ کە بەتەواوی ئابوری تورکیا دەبوژێنێتەوە، چەند وڵاتێك هاوکاریان بۆ ئەو پرۆژەیە پێشکەش کرد وەك ئەمریکاو ئیسرائیل و فەرەنسا.

هەروەها یەكێكی تر لە بەنداوەكان بەنداوی ئورفەیە كە ئەمەش بە یارمەتی ئیسرائیل دروست دەكرێت، ئەگەر تەواو ببێت بۆ ماوەی (٦٠٠) ڕۆژ ناهێڵێ ئاو بە دیجلەو فوراتدا بڕوات بۆ عێراق و سوریا.

ئەمە بێجگە لەوەی كە لەسەر ڕووباری فوڕات بەنداوی (بیرەجل) و (قرقامیش) بینادەكرێت كە بەتەواوی دەست دەگرن بەسەر دیجلەو فوڕاتدا.

لێكۆڵەران دەڵێن: جەنگی داهاتووی جیهان لەسەر ئاو دەبێت، بەڕاستی ئەمانە سەرەتان بۆ هاتنە دی فەرمایشتەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كە ئاو لە فوڕات نامێنێ و شاخێكی ئاڵتون دەردەكەوێت كە لەسەد كەس نەوەدو نۆی دەكوژرێت، بەڕاستی ئەگەر سەیری حاڵی خەڵكی عێراق و سوریا بكەین، دەبینین ناوچەیەكی پڕ لە ئاژاوەیەو هەر لە كۆنەوە كوشتن و بڕینی زۆر هەبووە، كەم وڵات هەبووە ئاوای لێ بەسەرهاتبێ، هەر لە سەردەمی حەجاجەوە تا سەردەمی هاتنی تەتەرو مەغۆلەكان، پاشان شەڕی كوردو عەرەب و سەردەمی بەعس و دواتر شەڕی براكوژی كە بەبلۆك سەری یەكتریان پان دەكردەوە لەسەر گومرگ و دەسەڵات كە چەند ساڵێك درێژەی كێشا بەناهەق، پاشان شەڕی بێ مانای سوننەو شیعە كە شەڕی وڵاتانی دراوسێیەو تەسفیەی حیسابیان لەگەڵ عێراقدا دەكەن، میللەتێك دەستیان چۆتە خوێنی یەكترەوەو لەسەر مەزهەب یەكتر دەكوژن.

پێش هاتنی ڕۆژی دوایی كوشتن و بڕین زۆر دەبێ و كەس نازانێ لەسەرچی یەكتری دەكوژن! ئاخۆ شاخێكی ئاڵتونی دەربكەوێ دەبێ چی بكەن، دیارە قەتل و عام دەست پێدەكات، ئەگەر حیزبەكان بمێنن كوشتار ئاسانەو پیشەیانە، ئەگەر نەشمان دیت ئەو خەڵكە قەتل و عامی یەكتر دەكەن بۆ چیایەك لە ئاڵتون.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەو بە درێژایی سەدەی بیست، نەوت ئەو ماددە كاریگەرەی جیهان بوو كە نەخشەی سیاسی هەموو جیهانی گۆڕی، بەدەیان و سەدان شەڕو داگیركاری هێنا كایەوە، هەندێك وڵاتی لەسەر نەخشەی سیاسی سڕیەوە، هەندێ وڵاتی بچووكیشی كردە خاوەن هێزو پێشەنگی جیهان،

لەو ڕۆژگارەدا نەوت هەموو هزرو عەقڵی سەرکردە سیاسیەکانی جیهانی داگیر کردبوو، نەوت تاکە شاسواری سەرمێزو گفتوگۆکانی ژوورە تایبەتیەکانی سیاسی و سەرمایەدارەکانی جیهان بوو، زێڕی ڕەش تاکە کارتی فشاری بەهێزی دەست دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان بوو، لەو سەردەمەدا ئەوەی پترۆڵی هەبوایە هەموو شتی هەبوو، ئەوەی نەیبوایە زۆر شتی کەم بوو، بەڵام ئەمڕۆ حاڵەتەکە گۆڕاوە، ڕاستە هێشتا نەوت دەتوانێت پێگەو بەهای خۆی بپارێزێت، بەڵام چیتر نەوت ئەو تاقانە بەنازە نیە کە تەنها خۆی هەموو هزرو هەڵسوکەوتی جیهان داگیر بکات.

دوای شەڕی دووەمی جیهانی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی لە دوو ملیارو نیو کەس تێپەڕی نەدەکرد، بەڵام دوای تێپەڕبوونی زیاد لە (٦٠) ساڵ، ئێستا دانیشتوانی سەر زەوی خۆی لە (٧) ملیار کەس نزیك دەکاتەوە، بەم پێیەش ساڵانە بڕی (٩٠) ملیۆن کەس لەسەر گۆی زەوی زیاد دەکات، ئەم تەقینەوەی دانیشتوانەش لە ئاسیا بە گشتی و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتیدایە، ئەم ناوچەیەش لە هەموو جیهان زیاتر بەر شەپۆلی قەیرانی کەم ئاوی بووەتەوە، پێویستە سەر گۆی زەوی ساڵانە ئاوی پێداویستیەکانی (٩٠) ملیۆن کەس زیاتر دابین بکات، بەمەش ڕێژەی ئاوی پێویستی هەر تاکێك ساڵانە لە دابەزیندایە، لەبەرامبەریشدا بەهۆی گەرمبوونی گۆی زەوی و پیس بوونی ژینگەوە ڕێژەی باران بارین کەم دەبێتەوە، ئەمەش وا دەکات ساڵانە قەیرانی کەم ئاوی زیاتر ببێت، ئەگەر باس لە هەموو کێشە ئاوییەکانی جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکەین، ئەوا قەیرانی کەم ئاوی زیاتر دەبێت، بۆیە تەنها قەیرانی ئاو لە نێوان تورکیاو عیراق بە نموونە وەردەگرین.

تورکیا وڵاتێکی خاوەن ئابووریەکی لاوازە، بەڵام خاوەن پێگەیەکی جوگرافی بەهێزە، خاوەن سامانی گەورەی ئاوە، کە دەتوانێت تورکیا لە داهاتوودا بگەڕێنێتەوە سەردەمی سوڵتانەکان، عەرەب دەڵێت: (مصائب قوم عند قوم فوائد) واتە: ناڕەحەتی و بەڵای گەلێك لای گەلێکی تر سوود بەخشە.

جا گۆڕانی کەش و هەوای جیهان و گەرمبوونی گۆی زەوی و کەمبوونەوەی ڕێژەی باران بارین و زیادبوونی قەیرانی کەم ئاوی بۆ تورکیا سوودێکی گەورەی هەیە، ئەمرۆ چۆن دەوڵەتانی ئۆپیك کارتی پترۆڵ بەکاردەهێنن، بەهەمان شێوە تورکیا کارتی بەهێزی ئاو بەکار دەهێنێت.

دیارە تورکیا هەر زوو گرنگی جیۆپۆلەتیکی وڵاتەکەی و گرنگی ئاوی بۆ دەرکەوتووە، بۆیە پڕۆژەی (گاپ)ی لەسەر ڕووباری فورات بنیات ناوە، کە خۆی لە (٢١) بەنداو و (١٩) پڕۆژەی کەهرۆ ئاویدا دەبینێتەوە، ئەم پڕۆژە ئاوییە ڕێژەی ئاوی هاتوو بۆ عێراق ساڵانە لە (١٨) ملیار م٣ ەوە بۆ (٩) ملیار م٣ دادەبەزێنێت، لە کاتێکدا عێراق ساڵانە پێویستی بە (١٣) ملیار م٣ ئاوی فورات هەیەو بەمەش یەك ملیۆن و (٣٠٠) هەزار هێکتار زەوی کشتوکاڵی عێراق زیانی پێدەگات و دەبێتە بیابان.

لەسەر ڕووباری دیجلەش تورکیا خەریکی بنیاتنانی هەشت بەنداوی ترە، کە بڕی ئاوی هاتوو بۆ عیراق بۆ ٥٠٪ دادەبەزێت، لەهەمان کاتدا وڵاتی ئێرانیش خەریکی ئامادە سازییە بۆ دروست کردنی بەنداوو گۆڕینی ڕێڕەوی ئاوی زێی بچووك و سیروان و ئەلوەندە، کە ئەمەش بڕی ئاوی هاتوو بۆ عێراق لە دیجلەدا بۆ (٦٠ - ٧٠ ٪) کەم دەکاتەوە.

لەم ئامارانەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کە چ کارەساتێك ڕووی لە عێراق کردووەو ئاویش چ کارتێکی بەهێزە بەدەست تورکیاوە، بە تەواوبوونی ئەم پڕۆژانە بەشێکی گەورەی وڵاتی (میزۆپۆتامیا) دەبێتە بیابان.

شارەزایانی جیۆلۆجی دەزانن کە جوڵەی ئاو لە زەوییە دەشتایی و بیابانەکاندا لە ڕۆژێکدا (٢-٣) سم، بەم پێیەش ئەو ئاوەی کە لە ژێر زەویدا کۆبووەتەوە سامانێکی نیشتمانییەو هەزاران ساڵی ویستووە تا ئەو ئاوە کۆبووەتەوە، بۆیە تاوانێکی زۆر گەورەیە تا ئاوی سەر زەوی وەستا بێت دەست بۆ ئاوی ژێر زەوی ببرێت.

ئاوی فورات بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە، بە شێوەیەك کە بڕی ئەو ئاوەی کە دابەزیوە گەیشتۆتە بڕی (٢١٣م٣) لە چرکەیەك، لە کاتێکدا لە ساڵی

(٢٠٠٨) دوو هێندە بووە بۆیە وەزیری سەرچاوە ئاوییەکان داوا لە عێراق دەکا ئاوی بۆ زیاد بکات، بۆ دەستە بەرکردنی خۆراك، ئەمەش بە هۆی وشکە ساڵیەوە، بۆیە ئەمە دوو ساڵە عێراق دەناڵێنێت لەبەر بێ ئاوی، چونکە ئاوی ڕوباری فوراتو و دیجلە زۆر بەرەو کەمی چووە.

ئەم ئاوانەی بۆ عێراق دێن لە وڵاتانی سوریاو تورکیاو ئێرانن بۆیە لە تواناییندا هەیە ئەم ئاوە بگرنەوە ، چونکە ئەم سێ وڵاتە زۆر فشاریان خسۆتە سەر ئەم وڵاتانە.

تورکیا بەڵێنیدا کە (٥٠٠)مەتر سێجا لە چرکەیەکدا ئاو لە ڕووباری فورات بۆ سوریاو عێراق بەربداتەوەو لەمیانی کۆبونەوە سێقۆڵییەکەی ئەنقەرەشدا، وەزیرانی ژینگەی تورکیاو ئاودێری سوریاو سەرچاوە ئاوییەکانی عێراق یاداشتنامەیەکی لە یەککگەیشتنیان ئیمزا کرد، هەروەها کەناڵی (جەزیرە) بڵاویکردەوە»لەمیانی کۆبونەوە سێقۆڵییەکەی هەر سێ وڵات کە تایبەت بوو بە گفتوگۆکردن لەسەر بەشە ئاوی سوریاو عێراق لە هەردوو ڕووباری فورات و دیجلەوە کە لەناو تورکیاوە هەڵدەقوڵێن، بۆیە تورکیا پابەندبوونی خۆی بەبەردانەوەی (٥٠٠) مەتر سێجا لە چرکەیەکی ئاوی فورات دووپاتکردۆتەوە.

بەرپرسێکی عێراقی ڕایگەیاند کە بەردەوامبوونی کەمبوونەوەی ئاوی فورات مەترسیەکی گەورەی هەیە بۆ سەر عێراق، ڕێژەی هاتنی ئاوی فورات بۆ عێراق ٧٥٪ کەمبۆتەوە، چەند ساڵێك پێش ئێستا ناوەندی ئاوی فورات لە سنوری نێوان عێراق و سوریا (٩٥٠) مەتر موکەعەب بوو لە یەك چرکەدا، بەڵام ئێستا (٢٣٠) یە، بۆیە حکومەتی عێراق داوای لە تورکیا کردووە ئەو ڕێژەیە زیاد بکات.

سەبارەت بەهۆی کەمبوونەوەی ئاوی فورات ئەوەیە کە تورکیا پێنج بەنداوی لەسەر ئەو ڕووبارە دروست کردووە، هەروەها سوریاش دوو بەنداوی دروست کردووە، بۆیە ئەمە هۆکاری سەرەکی کەمبوونەوەی ئاوەکەیە.

جا شارەکانی تورکیا لە ساڵی (٢٠٠٩) تووشی لافاوو باران بارینی زۆر بووەتەوە، بەڵام عێراق دوچاری قەیرانی گەورەی کەمبونەوەی ڕێژەی ئاو هات، بەتایبەتی لە هەردوو ڕووباری دیجلەو فوڕات، بۆیە باران بارین بەڕێژەی ٤٠٪ کەمیکردووە.

کێشەی ئاو لە عێراقدا بابەتێکی تازە نیە، بەڵکو ماوەی (٣) ساڵە ئەم قەیرانە لە عێراقدا سەری هەڵداوە، بۆیە دوو هۆکاری سەرەکی لەپشت ئەم قەیرانەی عێراقەوەیە:

• بەدرێژایی چەند دەیەی ڕابردوو عێراق پەیوەندی ئەوتۆی لەگەل وڵاتانی دراوسێدا نەبووە، بۆیە ئەوانیش عێراق بێبەش دەکەن لە ئاو.

• پەیوەندی بە کەش و هەواو سروشتەوە هەیە.

ئەو پرۆژانەی ئەم وڵاتانە کە پێی هەستاون بە تایبەت تورکیا کە لەگەڵ بەنداوی ئەتاتورکدا (٢٢) بەنداوی تر لەسەر ڕووباری دیجلەو فوڕات دروست کردووە، بۆیە ڕێژەی ئاوی فوڕات گەیشتووەتە ٤٢٪ و دیجلەش ٥٥٪ .

ئەگەر تورکیاو سوریا پابەند نەبون بە پەیمانامە نێو دەوڵەتیەکانەوە، ئەوا ئاسایشی خۆراکی عێراق دەکەوێتە مەترسیەوەو ڕوبەڕوی کارەساتی ژینگەیی گەورە دەبێتەوە.

دواترین ڕێککەوتنامەی تایبەت بە ئاو کە لەگەڵ تورکیادا ئیمزا کراوە لە ساڵی ١٩٨٠ دا بوو، دواتر لە ساڵی ١٩٨٣ سوریاش هاتە نێو ئەو ڕێککەوتنامەیە، بۆیە عێراق و سوریا، تورکیا بەوە تۆمەتبار دەکەن کە ئاوی ڕووبارەکانی گرتۆتەوەو ناهێڵێت بچێتە وڵاتەکانیانەوە.

دواتر تورکیا ڕەزامەندی لەسەر زیادکردنی ئاوی روباری فورات بۆ (٥٥٠) مەتر چوارگۆشە لە چرکەیەکدا زیاد کرد، بەڵام بە شێوەیەکی کاتیەو تەنها بۆ ماوەی یەك مانگە، تاکو ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٩)یە، ئەمەش لە پێناو یارمەتیدانی عێراق بۆ رزگاربوون لەو وشکایی بویەی تێی کەوتووە.

تورکیا دەیەوێت پارە بخاتە سەر ئاو بەرامبەر بە نەوتی عێراق بەکاریبهێنێت لە داهاتوودا.

دواهەمین ڕێککەوتنامە سوریا کە لەگەڵ عێراقی ئیمزا کردبێت، لەساڵی (١٩٨٩) دا بوو کە هەردوو لا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی ٥٨٪ ی ئاوی فورات بۆ عێراق بێت و ٤٢٪ ی بۆ سوریا، بەو پێیە ڕوباری فوڕات لە تورکیاوە سەرچاوە دەگرێت و دەچێتە خاکی سوریاو دواتر دێتە ناو عێراق، بەڵام بەهەمان شێوەی تورکیا عێراق ئاماژە بەوە دەدات کە سوریا پابەند نەبووە بەو ڕێککەوتنامەیە.

وەزیری ژینگەو دارستانی تورکیا ڕای گەیاند بەهۆی گەرمبوونی کەشی گۆی زەویەوە ئاوی هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات لە وەرزی (٢٠٠٧ - ٢٠٠٨) کەمی کردووە، گوتی: بۆ ئەوەی عێراق و سوریا بێ ئاو نەبن، تورکیا لە حیسابی وزەی خۆی زیاتر قوربانی داوە، چونکە کەمبوونی ئاوی دیجلەو فوڕات پەیوەندی بە گەرمبوونی کەشی گۆی زەویەوە هەیە، بەهۆی وشکە ساڵیەوە ئاوی فوڕات بە ڕێژەی ١٤٪ و ئاوی دیجلە بە ڕێژەی ٣٣٪ دابەزیوە.

وەکو زانراوە سەرچاوەی ئاوی ڕووبارەکان لەناوچە شاخاویەکان و شوێنە بەرزەکاندایە، تورکیا ساڵانە دوو ملیار دۆلار بۆ تەواوکردنی پڕۆژەی گاپ دابین دەکات کە لەسەرەوەی فورات و لەناوچە شاخاویەکاندایە.

(سلیمان دیمیریل) سەرۆکی پێشووی تورکیا دەڵێت: ئاوی دیجلەو فورات تورکین، چونکە سەرچاوەکەیان تورکیەو بەرهەمی تورکیایە، وەك چۆن خاوەندارێتی بیرە نەوتەکانی عێراق و سوریا دەگەڕێتەوە بۆ حکومەتەکانیان، هیچ کات ئێمە داوایان لێناکەین لەسەرچاوە نەوتیەکانیان بەشدارمان بکەن، ئەوانیش مافی ئەوەیان نیە کە خۆیان بکەنە هاوبەش لەسەرچاوە ئاویەکانمان چونکە ئەمە مەسەلەی خاوەندارێتیەو زەویەکەش موڵکی خۆمانەو مافی ئەوەمان هەیە ئەوەی دەمانەوێت بیکەین.

بۆیە دەبێت ڕاشکاوانە ئەوە بڵێین کە وتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت وەك خۆی بێتە دی، چونکە ئەو زانیاریانە لەلایەن خوای گەورەوە پێ ڕاگەیانراوە،

بەرگی سێیەم

ئەویش ئومەتەکەی لەو ڕوداوە ئاگادار کردووە، لەبەر ئەوە هەتا ئەم نیشانەیە کە یەکێکە لە نیشانەکان نەیەتە دی ئەوا ئەستەمە سیستەمی گەردونی توشی تێکچوون و لەناوچوون بچێت.

ئێستا تورکیا سەرقاڵی جێبەجێ کردنی پرۆژەیەکی ستراتیجیە بەناوی (پرۆژەی گاپ) لەسەر هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات، لەبەر ئەوەی هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات لە تورکیا بە گرنگترین سەرچاوەی ئاو دادەنرێن، پاشان هەردوکیان بەناوچەی پرۆژەی گاپ دا تێپەڕ دەبن لە باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە بەشادەماری ژیان دادەنرێت بەلای تورکیاوە.

ناوچەی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بەتەواوی لەباشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا جیاوازە (ناوچەی پرۆژەی گاپ) ئەمەش بەهۆی کەمی باران و سەرچاوەیەکی ئاو لەو ناوچەیەدا، لەمەوە گرنگی پرۆژەی گاپ دەردەکەوێت بەو پێوانەیەی کە بەسەرچاوەی سەرەکی ئاوی تورکیا دادەنرێت.

پرۆژەی گاپ لە بیست و دوو بەنداو و نۆزدە وێستگەی کارەبا پێکدێت، ئەمە جگە لە بونی چەند پرۆژەیەکی تری تایبەت بە کەرتەکانی گەیاندنی ئاودێری و پەیوەندییەکان.

گاپ لە لایەنی ڕووبەرەوە بە گەورەترین پرۆژە دادەنرێت لە جیهاندا، کە هەشت پارێزگا لە خۆ دەگرێت، لە کاتی تەواوبوونیدا ئاوی ئاودێری ڕوبەری ٨،٥ ملۆن هێکتار زەوی دابین دەکات، واتە: نزیکەی لە ١٩٪ زەویە بەراوەکانی تورکیا، ئەمەش دەبێتە هۆی دابینکردنی ١٠٦ ملیۆن دەرفەتی کار لەو ناوچانەدا کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردنشینن.

تورکیا لە پاڵ بەنداوی ئەتاتورک کار لەسەر کۆمەڵە بەنداوێکی تر دەکات، ئەوانیش پشت بە ئاوی دیجلەو فورات دەبەستن لەوانە: (بریجیك، قرە قایا، غازی عنتاب، کیبان، دجلە...هتد).

شارەزایان باس لەوە دەكەن كە ئەگەر پرۆژەی گاپ بە هەمان شێوە بەردەوام بێت كە لەسەرەتاوە دەستی پێكرا ئەوا ئاستی ئابوری توركیا بۆ ماوەی بیست ساڵ دەباتە پێشەوە، وە هەندێ لە وڵاتان هاوكاریان پێشكەش بەم پرۆژەیە كردووە، وەكو ئەمریكاو كەنەداو ئیسرائیل و فەرەنسا، لە كاتێكدا ئیسرائیل بەو پەڕی دەست گوشادیەوە قەرزی پێشكەش بە توركیا كردووە بۆ تەواو كردنی پرۆژەكەی، هەروەها ئیسرائیل داوای لە توركیا كردووە هەندێ زەوی لەناوچەی باشوری رۆژهەڵاتی توركیا پێ بفرۆشێت، پێدەچێت هۆكاری سەرەكی لە دوای ئەم داواكاریەوە دەستكەوتنی ئاو بێت، هەتا لە داهاتودا بەو هۆیەوە بتوانێ فشار بخاتە سەر سوریاو عێراق، جا دیزاینی پرۆژەكە لەلایان شارەزایانی ئیسرائیلەوە ئەنجام دراوە وەك ئەلری شارون لوزوروف.

هەروەها پرۆژەی بەنداوی ئۆرفە كە بۆ جێبەجێ كردنی ئیسرائیل هاوكاری دارایی توركیا دەكات، دوای تەواوبوونی توانای گلدانەوەی ئاوی دیجلەو فوراتی هەیە بۆ ماوەی (٦٠٠) رۆژ، ئەمەش واتای وشك كردنی ئاوی هەردوو رووبارەكە بە تەواوی.

رۆژنامەكانی سەر بەرەوتە ئیسلامیەكان هۆشیاریان لەسەر مەترسی ئەو پرۆژانە خستە روو چونكە لایەنە نێگەتیڤەكانی پرۆژەی گاپ بریتیە لە كەمكردنەوەی رێژەی ئەو ئاوەی دەگاتە عێراق و پاشان وێرانكردنی زەوی كشتوكاڵیەكان، سەرەنجام دروست بوونی دیاردەی بە بیابان بوون، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی ئاوی دیجلەو فورات و هاتنە ناوەوەی ئاوی سوێری كەنداوی عەرەب.

ئێستا لە نزیك سنوری توركیا ـ سوریا لەسەر رووباری فورات دوو بەنداوی تر دروست دەكرێت، ئەوانیش بەنداوی (بیرە جك) و (قرقامیش)ە دوای تەواو بونیان توركیا دەتوانێت بە شێوەیەكی نیمچە تەواو دەست بەسەر ئاوی روبارەكەدا بگرێت.

جا بەهۆی ئەو پێشبركێیەی كە دراوسێكانی سەرچاوەی ئاوی فورات پەیرەوی دەكەن بۆ كۆكردنەوەی گەورەترین گەنجینەی ئاو، لەبەر رۆشنایی ئەوەی كە جیهان گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی كە ئاو نرخی لەنەوت زۆرتر دەبێت.

لەگەڵ گەشەکردنی تەنگژەی دارایی جیهانی و دەرکەوتنی هەژاریو ئاوارەبوون لە عێراقدا، بۆیە لەگەڵ دەرکەوتنی زۆرێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەوە دەگەین کە چەند هەنگاوێکمان ماوە بۆ دۆزینەوەی کێوێکی ئاڵتون لە فوڕات، جا بەهۆی ئەو بەنداوانەوە کە لەساڵانی داهاتوودا لەسەری دروست دەکرێت لە ناوچە شاخاویەکاندا ئەوە بێتە دی!

لەم کات و دۆخە نەگونجاوە لەگەڵ بونی ڕەگەزو نەتەوەی جیاواز لەم ناوچەیەدا (سوننە، شیعە، کورد، تورك، عەرەب) ئەمە هۆکار دەبێت لەسەر ئەوەی زۆرێك لەوانە هیچ دوو دڵ نەبن کە بچن بۆ دەست کەوتنی ئەو ئاڵتونەو شەڕی لەسەر بکەن لەگەڵ ئەوەی گریمانەی ڕزگاربوون و گەڕانەوە زۆر لاوازەو لەسەدا یەك تێپەڕ ناکات[1].

بەڵام دەپرسین ئایا بە وشك بوونی فوڕات ئەو کێوە ئاڵتونە دەردەکەوێت؟

هیچ بەڵگەیەك نیە ئەوە بسەلمێنێت کە دەرکەوتنی ئەو کێوە لە چ کاتێکدا دەبێت، پاشان بە چ هۆکارێك ئەو ئاڵتوونە دەردەکەوێت، وەك وشکبوونی ئاوەکە یان ڕودانی بومەلەرزە یان بەهۆی کاری هەڵکەندنەوە یان لە ئەنجامی ڕودانی تەقینەوە لەو ناوچەیەدا.. هتد، هەروەها باس لەوەش نەکراوە کە شەڕ لەسەر ئەو ئاڵتونە لە نێوان کام وڵات و کام گەل و کام نەتەوەدا دەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فوڕاتی کردووە بەڵام نازانین لە چ بەشێکی فورات و لە چ شارێك و لە سنوری چ وڵاتێکدا ئەوە ڕوودەدات.

وە لە فەرموودەکەشدا کە باس لە زێڕ دەکات مەبەستی پێی زێڕی ڕاستیە، نەك هەندێك کەس وا گومان دەبەن کە دەڵێن: زێڕی ڕەشە بە واتای نەوتە، چونکە لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا وا هاتووە کە بە زێڕی زەرد بوترێت..

---

(١) www.islamimedicine.com

کەسێك لەوانەیە بپرسێت کە ئەم زێڕە چۆن چۆتە ناو ئاوی فوڕات، وە چ دەکات لەناو ئەم ڕووبارە، وە لە کوێوە هات؟ بۆ پێغەمبەری خوا نافەرمووێ: ئاوی نیل یان دیجلە بۆ فەرمووی فوڕات؟

لە وەڵامدا دەڵێم:

لە فەرموودەیەکی بێهێز هاتووە کە پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَنْزِلُ فِي الْفُرَاتِ كُلَّ يَوْمٍ مَثَاقِيلُ مِنْ بَرَكَةِ الْجَنَّة)[1].

واتە: هەموو ڕۆژێك لە قورسایی بەرەکەتی بەهەشت دادەبەزێتە ئاوی ڕووباری فورات.

وە بەندەش دوای توێژینەوەیەکی گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەم قورساییە زێڕەکە بێت، کە لە کۆتایی بونەوەر پێش هاتنی محەممەدی مەهدی دەریکەوێت.

وە نابێ ئەوەش لە بیریکەین داگیرکردنی عێراق لەبەر خاتر چاوی من و تۆ نەبووە، بەڵکو لەبەر خاتری چیایە زێڕینەکە بووە کە لە کتێبەکانی ئەوان باس کراوە.

## دووەم: زەوی گەنجینە شاراوەکانی دەردەخا:

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تقِيءُ الْأَرْضُ أَفْلَاذَ كَبِدِهَا، أَمْثَالَ الْأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَتَلْتُ، وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي، وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي، ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلَا يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا)[2].

---

(١) ضعيف: رواه الخطيب في تاريخ بغداد، (١/ ٢٣٢) برقم: (٥١). قال الألباني في (ضعيف الجامع حديث ضعيف، بە ژمارە (٥٢٢٦).

(٢) صحيح مسلم (٢/ ٧٠١) كتاب الزكاة، باب الترغيب قبل أن لا يوجد من يقبلها، برقم: (١٠١٣). (٧٠١/٢).

بەرگی سێیەم

واتە: زەوی جگەر گۆشەکانی خۆی دەرشێنێتەوە وەکو کۆڵەگەی زێڕو زیو دەخاتە گۆڕێ، جا پیاو کوژ دێ، دەڵێ: لە پێناو ئەمەدا خەڵکم کوشت! یەکێکی دی دەڵێ: لەبەر ئەمە پەیوەندی خزمایەتیم بڕی، دزیش دێ دەڵێ: لە پێناو ئەمە دەستم بڕاوە! پاشان وازی لێ دێنن و کەسیان هیچی لێ نابەن.

پێشەوا نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کە فەرمان دەداتە زەوی گەنجینەکانی دەرخات کە لەناخیدا شاردویەتیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) گەنجینانی بە (أَفْلَاذَ كَبِدِهَا) ناو بردوە، کە لەبنەڕەتدا بە واتای پارچە جەرگی وشتر دێت، هەندێکیش دەڵێن: بریتیە لە پارچە گۆشت، مەبەستی فەرمودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) وێچواندنە، واتە: ئەو پارچانە دەردەخا کە لە ناخیدا شاردراونەتەوە، لەبەر گەورەیی و زۆریشی بە کۆڵەگەی چواندون[1].

جا کە خەڵکی ئەو زۆریەی زێڕو زیو دەبینن لێی بێ نیاز دەبن و ئێش و ئازار دەخۆن کە بۆ وەدەست هێنانی ئەو مایە پوچە گوناە و تاوانیان ئەنجام داوە.

## سێیەم: هاتن و دەرکەوتنی (سوفیانی):

سوفیانی: لە نەوەی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانە، یەزیدیش برای پێشەوا موعاویەیە (ڕەزای خوای لێ بێ).. پیاوێکی کەڵەگەتە.. لە چاوەکی نوقتەیەکی سپی هەیە[2].. لە دۆڵێك دەردەچێت لە شاری دیمەشق پێی دەڵێن: دۆڵی (وادی اليابس)[3].

پێشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (يَخْرُجُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: السُّفْيَانِيُّ فِي عُمْقِ دِمَشْقَ، وَعَامَّةُ مَنْ يَتْبَعُهُ مِنْ كَلْبٍ، فَيَقْتُلُ حَتَّى يَبْقَرَ بُطُونَ النِّسَاءِ، وَيَقْتُلُ الصِّبْيَانَ، فَتَجْمَعُ لَهُمْ قَيْسٌ فَيَقْتُلُهَا حَتَّى لَا يُمْنَعُ ذَنَبُ

---

(١) شرح النووي على مسلم : (٢/٩٨).

(٢) الطبقات الكبرى (٧/ ٢٨٤).

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٧٠).

تَلْعَةٍ، وَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فِي الْحَرَّةِ فَيَبْلُغُ السُّفْيَانِيَّ، فَيَبْعَثُ إِلَيْهِ جُنْدًا مِنْ جُنْدِهِ فَيَهْزِمُهُمْ، فَيَسِيرُ إِلَيْهِ السُّفْيَانِيُّ بِمَنْ مَعَهُ حَتَّى إِذَا صَارَ بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ، فَلَا يَنْجُو مِنْهُمْ إِلَّا الْمُخْبِرُ عَنْهُمْ)[1].

واتە: پیاوێك پەیدا دەبێت پێی دەوترێت سوفیانی لە قوڵایی (دیمەشق)ەوە، زۆربەی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون لە خێڵی (کلب)ن، کوشتارێکی زۆر دەکات، هەتا وای لێدێت سکی ئافرەت هەڵدەدڕێت و منداڵ دەکوژێت، پاشان خێڵی قەیس لە دژی کۆدەبنەوە، ئەویش بەسەریاندا زاڵ دەبێت و دەیانکوژێت، لەو کاتەدا پیاوێك لە ئال و بەیتی من لەناوچەی (حرە) سەر هەڵدەدات و هەواڵی بە سوفیانی دەگات، ئەویش لەشکرێك لە لەشکرەکانی خۆیی بۆ دەنێرێت، بەڵام دەیانبەزێنێت، ئەم جارە سوفیانی بەخۆیی و سوپاکەیەوە بۆی بەڕێ دەکەون، هەتا کاتێك کە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن بەناخی زەویدا، کەسیان لێ ڕزگار نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە هەواڵیان بۆ دەهێنێتەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە لە پێش هاتنی (محەممەدی مەهدی) پیاوێکی ستەمکار لە وڵاتی سوریا دەسەڵات دەگرێتە دەست و چەندین شەڕو کوشتار دەکات تا لە کۆتاییدا (محەممەدی مەهدی) لە وڵاتی حیجاز سەر هەڵدەدات، پێ دەچێت کە سوفیانی دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بێت، بۆیە بوونی هێزێکی ئیسلامی لەناوچەکەدا پێ قەبوڵ ناکرێت و دوو جار لەشکر کێشی دەکاتە سەریان، جاری یەکەم سوپاکەی ڕۆدەچن بەناخی زەوی، بۆیە پێویستە بزانین کە سوفیانی ناوی ئەو پادشا ستەمکارە نیە، بەڵکو شۆڕەتێتی، پێ دەچێت بارو دۆخی سیاسی ناوچەکە لەو کاتە لەبار بێت بۆ سوفیانی، بۆیە دەتوانێت لەشکرەکەی دوو جار ڕەوانەی حیجاز بکات.

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٢٠) برقم: (٨٥٨٦). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

بەم شێوەیە بە سەرکردایەتی محەممەدی مەهدی سەرکردەیەکی زاڵم و ستەمکاری ئەو سات لەناو دەچێت و خوای پەروەردگار یارمەتی موسڵمانان و سوپاکەیان دەدات..

پێشەوا حوسەینی کوری عەلی (ﷺ) دەڵێت: (للمهدي خمس علامات: السفياني، واليماني، والصيحة من السماء، والخسف بالبيداء، وقتل النفس الزكية )[١].

واتە: بۆ مەهدی پێنج نیشانە هەیە: سوفیانی و یەممانی و دەنگێک لە ئاسمانەوەو ڕۆچوونێك لە بەیداء و کوشتنی نەفسی زەکیە.

## چوارەم: مردنی پادشایەك پێش هاتنی (محەممەدی مەهدی):

دایکمان ئوم سەلەمە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَكُونُ اخْتِلَافٌ عِنْدَ مَوْتِ خَلِيفَةٍ، فَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنَ الْمَدِينَةِ، فَيَأْتِي مَكَّةَ، فَيَسْتَخْرِجُهُ النَّاسُ مِنْ بَيْتِهِ وَهُوَ كَارِهٌ، فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ..)[٢].

واتە: ناکۆکیەك ڕوودەدات لە کاتی مردنی پادشایەك، لەو کاتەدا پیاوێك لە خەڵکی مەدینە هەڵدێت بەرەو شاری (مەککە)، ئەوانیش بەزۆر دەیهێننە دەرەوەو بە زۆر بەیعەتی پێ دەدەن لە نێوان ڕوکن و مەقام..

لەم فەرمودەیە بۆمان بەدەردەکەوێت کە لە پێش ئاشکرابوونی (محەممەدی مەهدی) پادشایەك دەمرێت، وە لەکاتی مردنەکەی ئاژاوەو ناکۆکیەکی زۆر دروست دەبێت، کە پێ دەچێت (محەممەدی مەهدی) تا ڕاددەیەك لایەن بێت لەو ناکۆکیەدا، بۆیە لەخۆی دەترسێت و لە شاری مەدینەوە هەڵدێت بەرەو شاری (مەککە).

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٥.

(٢) حسن: سنن أبو داود، (٦/ ٣٤٤) باب: أول كتب المهدي، برقم: (٤٢٨٦). وحسنه ابن القيم في (المنار المنيف) برقم: (٣٣١).

بەشی سێیەم

لەم فەرموودەیە وا دەردەکەوێت کە ئەو پادشایە پادشای (سعودیە) بێت، چونکە ناکۆکی کێشەکە لە شاری مەککەو مەدینە ڕوودەدات، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.

ئەگەر سەیر بکەین و بگەڕێینەوە بۆ چەند ساڵێك لە وڵاتی (سعودیە) چەندین کێشەو ناکۆکی لە نێوان بنەماڵەی (ئال سعود) سەری هەڵداوە کە چەندین سەدەیە دەسەڵاتی ئەو وڵاتەیان لە ژێر دەستدایەوە.. وە هەر جار نا جارێکیش کە پادشایەکیان دەمرێت کێشەو ناکۆکی دەکەوێتە نێو بنەماڵەی (ئال سعود) تا لە کۆتایی کۆنترۆڵ کردنی خۆیان لە دەست دەدەن و خوای پەروەردگار محەممەدی مەهدی دەنێرێت..

لە مانگی (ذي القعدة) بنەماڵەی ئال سعودو هۆزەکانی مەککە شەڕێکی خوێناویان لەناو سەر هەڵدەدات لە عەقەبە، لە دوای نوێژی عیشا محەممەدی مەهدی ئاشکرا دەبێت کە ئاڵای پێغەمبەرو (ﷺ) قەمیص و شمشێرێکی لایە، کاتێك نوێژی عیشا کرا دەچێتە لای گردی صەفا دواتر لەلای مەقامی ئیبراهیم و دوو رکات نوێژ دەکات و بە دەنگێکی بەرزەوە دەڵێت: ئەی خەڵکینە یادی خوای گەورە بکەنەوە، هاویەش بۆ خودا بڕیار مەدەن، پارێزگاری لە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، ئەوەی قورئان زیندووی دەکاتەوە ئێوەش زیندووی بکەنەوە، چونکە دونیا بەرەو کۆتایی دەڕوات، من بانگهێشتان دەکەم بۆ لای خودا و پێغەمبەر (ﷺ) و ئیشکردن بە قورئان، دواتر ڕووی بە کەعبەوە دەنێت و دەگری هەتا فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارەوە، ئەمجا حەوت زانا کە خەڵکی دەیانناسن لە وڵاتە جیاجیاکان هاتوون بۆ حەج کردن هەڵدەستنەوە، لە نێوان ڕوکن و مەقام بەیعەتی دەدەنێ، وە هەر یەکێك لەو پیاوانە (٣١٣) کەس بەیعەتیان لێ وەردەگرێت.. بیر بکەوە لەناو ملیۆنان حاجی تەنها ئەو ڕێژە کەمە بەیعەت دەدەن.. لە دوای بەیعەت دان نەکەس خەوی لێدەکەوێت نە خوێنی کەسیش دەرژێت [1].. ئەمجا خوای پەروەردگار خۆشەویستی لە

---

(١) رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (٩٩١).

نێو دڵەکان دروست دەکات و خەڵکیش بەرەو ڕووی مەهدی دەچن، ئا ئەمانە بە شەو ئەهلی خودان و بە ڕۆژیش شێرن، خودای گەورە خاکی سعودیە ئازاد دەکات لەسەر دەستی محەممەدی مەهدی، وە ئەوانەی لە سجنەکانی ئال سعودن هەموویان ئازاد دەبن، لە پاشان کۆمەڵێکی ئەهلی خودا لە خاکی ئێران و خوراسان بەرەو سعودیە دێن و پاڵپشتی محەممەدی مەهدی دەکەن و سەری دەخەن.. دواتر مەهدی جەیشەکانی بڵاوە پێدەکات بۆ ئەو وڵاتانەی کە ستەم و زوڵم باڵیان کێشاوە بەسەریاندا.. وە لەسەر دەستی محەممەدی مەهدی ئەستەمبۆڵی شاری تورکیا ئازاد دەکرێت..

## پێنجەم: ڕۆچوونی لەشکرێك لە بیابانی نێوان (مەککەو مەدینە):

پاش ئاشکرابوونی (محەممەدی مەهدی) لەشکرێك لە وڵاتی شامەوە هێرشی بۆ دەبەن، وە لە بیابانی نێوان مەککەو مەدینە لەشکرەکە بە تەواوی ڕۆدەچێت بەناخی زەوی.

دایکی باوەڕداران عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: (عَبَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي مَنَامِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) صَنَعْتَ شَيْئًا فِي مَنَامِكَ لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُهُ، فَقَالَ: الْعَجَبُ إِنَّ نَاسًا مِنْ أُمَّتِي يَؤُمُّونَ بِالْبَيْتِ بِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ، قَدْ لَجَأَ بِالْبَيْتِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ خُسِفَ بِهِمْ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ الطَّرِيقَ قَدْ يَجْمَعُ النَّاسَ، قَالَ: نَعَمْ، فِيهِمُ الْمُسْتَبْصِرُ وَالْمَجْبُورُ وَابْنُ السَّبِيلِ، يَهْلِكُونَ مَهْلَكًا وَاحِدًا، وَيَصْدُرُونَ مَصَادِرَ شَتَّى، يَبْعَثُهُمُ اللهُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ) [1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی نووستندا دەست و لەشی دەجوڵایەوە، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتی نووستندا شتێکت کرد پێشتر کاری وات نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جێی سەرسوڕمانە کەسانێك لە ئوممەتەکەم ڕوویان کردۆتە ماڵی بەیت بۆ پیاوێکی قورەیشی کە پەنای بردۆتە بەر کەعبە، هەتا کاتێك کە گەیشتنە بیابانەکە ڕۆچوون بەزەویدا، گوتمان:

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٠) كتاب: الفتن، باب الخسف بالجيش الذي يؤم البيت، برقم: (٢٨٨٤).

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو ڕێگایە خەڵکی جۆراو جۆر کۆدەکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ تیایاندایە بەچاو ڕۆشنی هاتووەو تیایاندایە بەزۆر هێنراوەو تیاشیاندایە ڕێبوارە، هەموویان بە یەك تیاچوون تیا دەچن، وە هەریەکیان بە ڕێیەکی جیاواز دەڕوات و خوا هەر یەکەیان لەسەر نیەتی خۆی زیندووی دەکاتەوە.

جا ئایا ئەوەی دێتە دەرو پەنا دەباتە بەر ماڵی خوداو خودا بەسەرخستنی خۆی پاڵپشتی دەکاو ئەو کەسانە لە نێو دەبات کە دەیانەوێ ئازاری بدەن، ئایا ئەمە ئەو مەهدیەیە کە لە فەرمودەکان باس کراوە؟ بەڵگەیەکی ڕاشکاومان نیە بۆ ئەمە.

ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ، فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ..) [١].

واتە: کەسێك پەنا دەباتە بەر ماڵی بەیت (واتە: کەعبە) پاشان کۆمەڵێك ڕەوانە دەکرێنە سەری، کاتێك کە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن بە ناخی زەویدا.

لە ریوایەتێکی تر دەفەرموێ: کۆمەڵێك پەنا دەبەنە بەر ئەم ماڵی بەیتە نەپارێزەرو نەپاڵپشتیان هەیەو نەژمارەو نە تفاق، سوپایەکیان ڕەوانە دەکرێتە سەر، کاتێك کە سوپاکە دەگەنە سوپایەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە شەرحی ئەو فەرموودەیە دەفەرموێ: مەبەست لەوەیە کە ئەو مەهدیەی ستایش کراوەو موژدە بە هاتنی دراوە لە کۆتایی بونەوەر، سەرەتای دەرکەوتن و سەرهەڵدانی لە خۆر هەڵاتەوە دەبێت، لە پاشاندا لای ماڵی بەیت بەیعەتی دەدرێتی، هەروەك چەند فەرموودەیەك ئاماژە بەوە دەکەن [٢].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٠٨) كتاب: الفتن، باب: الخسف بالجيش الذي يؤم بالبيت، برقم: (٢٨٨٢).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم، ابن كثير (١/ ٢٩ ــ ٣٠).

کەواتە گەورەترین نیشانەی دەرکەوتن و ناسینەوەی (محەممەدی مەهدی) ڕۆچوونی ئەو لەشکرەیە لە بیابانی حیجاز، وە پێ دەچێت خەڵکی لەسەرەتادا دڵنیا نەبن لەوەی کە ئەو پیاوەی پشتی داوە بەکەعبەوەو پەنای بۆ ماڵی بەیت بردووە (محەممەدی مەهدی) بێت، بەڵام دوای ڕۆچوونی ئەو سوپایە بەناخی زەویدا کە بەمەبەستی لەناو بردنی مەهدی ڕوو لە حیجاز دەکەن[1]، ئیتر هیچ گومانێك لەلای باوەڕدارانی ئەو سەردەمە نامێنێت کە ئەمە ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی بەهاتنی داوە لە کۆتایی بونەوەرو حوکمی ئیسلام لەسەر دەستی دەگەڕێتەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە ئاشکرا دەبێت ناوی (محەممەد)ەو باوکیشی ناوی (عەبدوڵلا)یە، چونکە ڕووداوی ڕۆچوونی ئەو سوپایە لە بیابانی حیجازدا پێشتر هەرگیز ڕووی نەداوەو تەنها لەسەردەمی ئەودا ڕوودەدات.

## ئەو سوپایە لە کوێ دێت ؟

سوپایەکی تۆکمە ئامادە دەکرێت لە خاکی عێراقەوە بە دوای پیاوێکن بە ناوی (مەهدی)، کاتێك دەگەنە خاکی سعودیە لە بەرزایی شاری مەدینە کە (ذي الحليفة)ی پێ دەڵێن: ڕۆدەچن بەناخی زەوی[2].

وە جەیشێکی تریش لە پایتەختی دیمەشقی شامەوە دێن، هەتا دەگەنە بیابانی نێوان خاکی ئوردن و سعودیە لەوێ ڕۆدەچن بەناخی زەوی.. ئەمجا خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەری ئەم ڕۆچوونە کۆدەبنەوە، نزیکەی ٣١٤ ئافرەت لەم بیابانەن [3].

---

(١) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ١٢.

(٢) البرهان في علامات مهدي آخر الزمان، لا ٥٤.

(٣) رواه الطبراني في (الأوسط) برقم: (٥٤٧٣). وقال الهيثمي: وفيه ليث بن أبي سليم وهو مدلس، وبيقة رجاله ثقات. (مجمع الزوائد) (٧/ ٣١٥).

## شەشەم: دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی کلکدار:

یەکێکی تر لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی (موحەممەدی مەهدی) دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی کلکدارە لە ئاسمان و بە دوایەوە دەدرەوشێتەوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەباس (ﷺ) دەڵێت: (ألا أخبركم بأشراط الساعة يحج الناس إلى هذا البيت الحرام يحج ملوكهم لهواً وتنزهاً وأغنياؤهم للتجارة ومساكينهم للمسألة وقراؤهم رياء وسمعة فعند ذلك يظهر كوكب له ذنب) [١].

واتە: هەواڵتان پێ بدەم بە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، خەڵکی حەج دەکەن و بەرەو بەیت بەڕێ دەکەون، سەرکردەکانیان بۆ خۆشی خۆیان و دەوڵەمەندەکان بۆ بازرگانی و هەژارەکان بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان و قوڕئان خوێنەکان و مامۆستایانی ئایینی بۆ ڕووپامایی و ناوبانگ دەچنە حەج.. لەو کات ئەستێرە کلکدارەکە سەرهەڵدەدات و دەردەکەوێت..

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرەکەیدا لە(ئەثەر) ێکی (صحیح) لە عبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە(ﷺ) دەڵێت: عەبدوڵلای کوری مولەیکە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: (غَدَوْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: مَا نِمْتُ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ. قُلْتُ: لِمَ؟ قَالَ: قَالُوا طَلَعَ الْكَوْكَبُ ذُو الذَّنَبِ، فَخَشِيتُ أَنْ يَكُونَ الدُّخَانُ قَدْ طَرَقَ، فَمَا نِمْتُ حَتَّى أَصْبَحْتُ)[٢].

واتە: ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی سەردانی ئیبن و عەباسم کرد گوتی: ئەم شەو تا بەیانی نەخەوتووم، گوتم بۆ؟ گوتی: گوتیان ئەستێرە کلك دارەکە دەرکەوتووە، منیش ترسام دووکەڵەکە سەری هەڵدابێت، ئیتر تا بەیانی خەوم لێنەکەوت.

---

(١) رواه ابن مردويه.. (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) (٦/ ٣٢).

(٢) تفسير القرآن العظيم (٧/ ٢٤٩). قال ابن كثير: وَهَذَا إِسْنَادٌ صَحِيحٌ .

پێشەوا کەعبی ئەحبار (ﷺ) دەڵێت: (يطلع من المشرق قبل خروج المهدي نجم له ذنب يضئ) [١].

واتە: پێش دەرچوونی مەهدی لەلای ڕۆژهەڵاتەوە ئەستێرەیەکی کلکداری درەوشاوە سەرهەڵدەدات..

سەردەمێك هەبووە دەرکەوتنی کلك دارەکان ترس و بیمی خستبوە دڵی خەڵکەوە، چونکە خەڵکی بڕوایان وابوە دەرکەوتنی کلك دارەکان ئاگرێکە نەخۆشی و شەڕو مردنی بە دواوەیە، هەرچەندە ئەمڕۆ بیروبۆچونی باشمان لەسەر کلك دارەکان هەیە، بەڵام هێشتا هەموو شتێکیان لە بارەوە نازانین.

کاتێك کلك دارێك دەردەکەوێت ئێمە بە گڕێکی بچکۆڵەی دەزانین لە کاتێکدا ڕەنگە تیرەکەی هەزار میل بێت، ئەو گڕەش «سەر» یان «ناوك» ی کلك دارەکەیە، زانایان بڕوایان وایە کلك دارەکان لە تەنێکی ڕەق تێکەڵ لەگەڵ گازەکاندا پێك هاتبن، کە تا ئێستاش سەرچاوەی ئەو ماددە ئاشکرا نەبووە.

کاتێك کلك دارێك لە خۆر نزیك دەبێتەوەو دەکەوێتە ژێر کاریگەریەوە کلکێکی لە شوێن بەدیار دەکەوێت کە بریتیە لە گازێکی زۆر ناسك کە تێکەڵە لەگەڵ وردیلەکانداو پێکەوە ماددەیەك دروست دەکەن کە لەناوکی کلکدارەکەوە دەردەچێت.

توخمێکی سێیەم هەیە بە دەوری ناوکی کلك دارەکەدا پێی دەوترێت»پەرچەمی کلك دار» کە بریتیە لە هەورێکی گڕگرتوو تیرەکەی هەندێك جار دەگاتە (١٥٠٠٠٠) هەزار میل بەڵکو هەندێك جار لەوەش زیاترە، کلك دارەکان لە شێوەو قەبارە جیاوازن هەندێکیان پان و کورتن، هەندێکی تریان باریك و درێژن، درێژی هەندێکیان دەگاتە پێنج ملیۆن میل و درێژی هەندێکی تریشیان دەگاتە سەد ملیۆن میل، هەندێك لە کلك دارەکانیش کلکیان نیە.. کلکدار کاتێك کلکەکە گەورەتر دەبێت خێراتر دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە لەخۆر نزیك دەبێتەوەو کاتێکیش لە خۆر دووردەکەوێتەوە یەکەمجار کلکی دوور دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە

---

(١) ضعيف: رواه نعيم في (الفتن) (١/ ٢٢٩) برقم: (٦٤٢) بإسناد ضعيف.

پاڵەپەستۆی تیشکی ڕۆژ گەردیلەی زۆر بچوك دەدات لەسەری کلك دارەکە بۆ ئەوەی لە خۆی دوور بخاتەوە، لەبەر ئەوەیە کاتێك کلك دارەکە لە خۆر دوور دەکەوێتەوە یەکەمجار کلکی دوور دەکەوێتەوە لە کاتی دەرکەوتنەوەیشیدا لە خۆر خێراییەکەی کەم دەبێتەوە، ئینجا وردە وردە لەبەر چاو دیار نامێنێت، ڕەنگە ئەو دیاردەیە چەند ساڵێك بخایەنێت بەڵام زۆربەیان لە ئەنجامدا هەر دەکەونە خوارەوە، کلك دارەکان گەشت لە دوای گەشت بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، بەڵام بۆ یەك سووڕ خواردن بە دەوری خۆردا پێوستیان بە کاتێکی زۆر دورو درێژ هەیە[1].

## با بزانین کلك دارەکان چین؟

کلك دارەکان چەند تەنێکی ئاماناوین لە شێوەی سەدیم دان، سەرێکی قەبەی شێواوی شێوە هەوری گەورەو پڕشنگداریان هەیە، دەوری ناوکەکەی تاوێریان داوە، ئەو ڕووناکیەی لێوەی دێت ڕووناکی دراوەی خۆرە لەبەر ساردیان دەیداتەوە، کلکێکی درێژیان هەیە کە بە هۆی پەرش بوونەوەی ماددەی سەرەکەیانەوە دروست دەبن، لە کاتێکدا لە خۆر نزیك دەکەونەوەو فشاری تیشك دان و ڕەشەبای خۆر کاریان تێ دەکات و ناودارتریان کلك داری (هالیە).

زانای فەلەکی (کلارك چابمن) کە لێکۆڵەرەوەیە لە دەستەی جیهانی بۆ جێبەجێکردنی زانستی لە شاری تویکسون لە ئەریزۆنا دەڵێت: هەڕەشەو مەترسی گەورە هەیە لەسەر بونەوەرەکان لە ناوچەی دوورەوە ئەمەش لە دوای ئەستێرەی بلۆتۆوە هەوری (ئوتر) هەیە کە پێك هاتووە لە بەردی گەورە گەورەو غازی بەستوو خۆڵ کە لە (١٠٠) ساڵێکدا جارێك بەرەو زەوی دێن بە هۆی ڕاکێشانیەوە، گەرمی خۆر غازە بەستووەکەی دەکات بە هەڵم و ئینجا کلکی بۆ دروست دەبێت و ڕووەکەشی دەتەقێتەوە بە دەرچوونی غازو غوبار لێوەی، کە

---

(١) المسيح الدجال قراءة سياسية في أصول الديانات الكبرى، سعيد ايوب، لا ٢٢٨ ـ ٢٢٩، الطبعة الخامسة ٢٠٠٧ م، دار الفتح الإعلامي العربي.

ئەوانیش (٢٠٠) دانه دەبن.. بە ڕاستی مەترسی گەورە ڕوو دەکاتە جیهانەکەمان کە ئێمە نایبینین و ڕەنگە هەستیشی پێنەکەین تا تەواو دێتە سەرمان.

زانای فەلەکی ئافرەت (کارۆلین شوماکر) کە ئێستا لە ژیاندایەو زۆرترین ژمارەی ئەستێرەی کلکداری دۆزیوەتەوە کە (٣٢) دانەیەو دەڵێت: (هول بوب) ئەستێرەیەکی کلکدارە کە بە خێرایی (٤٣) هەزار میل لە سەعاتێکدا دەڕوات و لەم سەدەیەی خۆماندا خولگەی زەوی بڕی و باش بوو بەری نەکەوت[1].

زانای فەلەکی (برایان مارسدن) لە بنکەی (هارفارد سمثونیان) بۆ فیزیایی فەلەکی حیسابێکی کردووە کە لە (١٤)ی أغسطس لە ساڵی (٢١٢٦)ع جارێکی تر ئەستێرەی کلك دار دەبینرێتەوەو بە هۆی تەقینەوەکانی سەر ڕووکەیەوە لە ڕێڕەوە نەگۆڕەکەی خۆی لایداوەو ڕەنگە بەر زەوی بکەوێ کە ڕۆژی دوایی دێ و ڕەنگە نەوەی منداڵەکانی ئەمڕۆ ئەو ڕۆژە سامناکە ببینن[2].

هەروەها جوولەکەکان باوەڕیان بە «مذنب هالی» هەیە کە لە ساڵی (١٩٤٨) ع لە دوورترین خاڵدا بوو لە خۆرەوە، لە (١٠/ شباط / ١٩٨٦) هەموو بە چاو بینیمان لە نزیکترین خاڵدا لە خۆرەوە، ئەم ئەستێرەی کلکداری هالیە هەموو (٧٦) ساڵ جارێك دێت.. لە کتێبی ئایینی جولەکە پەیوەندی بە دروست بوونی دەوڵەتەکەیان هەیە.

لێرەدا پرسیارێکی سەیر دروست دەبێت؟ کە حیسابی نیوە دەورە دەکەین دەبێ (٣٨) ساڵی پێ بچێت نیوەکەی تریش ٣٨ دەکاتە ٧٦.

بە گوێرەی ئاماری بیرکاری بێت دەبێ ساڵی (٢٠٢٤) هالی بگەڕێتەوە چونکە لە (٨٦×٣٨=٢٠٢٤) .

بەڵام هەرچی کۆمپیوتەر هەیە کە زانیاری لەسەر «هالی» پێدراوە کە لێی دەپرسی کەی دەگەڕێتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: ساڵی (٢٠٢٢) ئەمەش نهێنیەکی سەیرە.

---

(١) آيات الله المبصرة / أ .د .توفيق علوان، لا ١٢٣ .

(٢) آيات الله المبصرة / أ .د .توفيق علوان ل ١٢٤ .

بەشی سێیەم

یەکێك لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکان (مایکرۆ کۆمپیوتەر) کە دکتۆرێکی میسری دایناوە دەڵێت: هەموو کۆمپیوتەرێك کە زانیاری و داتای پێویستی پێدرابێ دەڵێ: هالی لە ساڵی (٢٠٢٢) جارێکی تر پەیدا دەبێتەوە.

وە دەرکەوت ڕۆیشتنی هالی لە ساڵی (١٩٤٨)ع هەتا ساڵی (١٩٨٦)ع دەکاتە (٣٨) ساڵی شەمسی، بەڵام (٣٨) ساڵی قەمەری دێتەوە کە دەکاتە ساڵی (٢٠٢٢) .

لە ساڵی (١٠٧٥)ك لە مانگی جمادی الآخرة ئەستێرەیەکی کلك دار دەرکەوت نزیکەی یەك مانگ بە ئاسمانەوە بوو.

ئەمەو ئەستێرەی بە کلك دار زۆر جار لە ئاسماندا دەرکەوتووە بە تایبەتی ئەوەی کە پێی دەگوترێت کلك داری (هالی) کە زاناکان دەڵێن: هەموو (٧٦) ساڵ جارێك دەردەکەوێت، ئەگەر ئەم ئەستێرەیە بەر زەوی بکەویٚ لە یەك چرکەدا کاولی دەکات و پاش سەعاتیکێش لە ئاسمانەوە ئاگر دەباریٚ.

لە ساڵی (١٩٩٧)ع کلك دارێك لە ئاسماندا دەرکەوت زۆر گەش و درەوشاوە بوو، زیاتر لە دوو مانگ بە ئاسمانەوە مایەوە زاناکان پێیان دەگوت: کلك داری (بوب ـ هیل)، وە دەڵێن: هەموو سیٚ هەزار ساڵ جارێك ئەم ئەستێرەیە بە دەردەکەوێت.

لە ساڵی (١٩٥٧)ع ئەستێرەیەکی کلکدار لە ئاسمان دەرکەوت، وە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بە هێواشی و لەسەرخۆ ڕووناکی نەما بە هۆی بەرزبوونەوەو گەڕانەوەی بۆ قوڵایی شوێنە ساردەکانی بۆشایی ئاسمانە دوورەکان لە نێوان ئەستێرەکان.

ئەم کلك دارانە سەردەمانی کۆن بە ناپیرۆزو نەگبەت دانراون و بڕوا وابووە کە دەرکەوتنیان نیشانەی نزیك بوونەوەی وشکە ساڵی و نەخۆشیە، هەر چەندە ئێستا سەرچاوەی ئەم ئەستێرانە لە ڕێی زانستەوە لێی دەکۆڵرێتەوە، بەڵام باوەڕ وایە لە تەپو تۆزی تەقینەوەی گرکانی هەندیٚ ئەستێرەو مانگ دروست بووبن،

بەڵام هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە ئەم ئەستێرانە هاوکات لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا دروست بوون، بەڵام تا ئێستا سەرچاوەی دروست بوونیان بە تەواوی نەزانراوە[١].

## حەوتەم: پەیدابوونی ڕووناکیەك لە ئاسمانی ڕۆژهەڵاتەوە :

دڵە ڕاوکێیەکی زۆر لە نێو دڵی مرۆڤەکان دروست بووە بە هۆی پەیدابوونی ستوونیەکی درێژ لای خۆر هەڵاتی عێڕاق..

پێشەوا خالیدی کوڕی مەعدان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پێشەوا عوبادەی کوری صامتەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِذَا رَأَيْتُمْ عَمُودًا مِنْ نَارٍ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي السَّمَاءِ فَأَعِدُّوا مِنَ الطَّعَامِ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّهَا سَنَةُ جُوعٍ)[٢].

واتە: گەر ستوونەکی درێژی ئاگریت لای خۆر هەڵاتەوە (عێراق) بینی لە مانگی ڕەمەزان لە ئاسماندا خۆراکی ساڵانەکەتان عەمبار بکەن، چونکە ئەو ساڵە ساڵی برسیەتیە.

پێشەوا ئەبی جەعفەر محەممەدی کوری عەلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (إذا رأيتم نار من المشرق، ثلاثة أيام أو سبعة، فتوقعوا فرج آل محمد إن شاءالله تعالى)[٣].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ١٠١).

(٢) أخرجه الطبراني في (المعجم الأوسط) برقم: (٣٧١) وقال الألباني ( ضعيف ) برقم : (٥١٤) في ضعيف الجامع.. وقال الطبراني : لم يرو هذا الحديث عن أم عبد الله ابنة خالد إلا بشر بن بكر، تفرد به: زيد بن بشير. وە ئیسنادی ئەم فەرموودەیە بێهێزە لەبەر چەند هۆکارێك:
یەکەم: لە سەنەدەکەدا ئەحمەدی کوری رشدینی تێدایە کە موتەهەمە بە دروستکردنی فەرموودەکە..
دووەم: خالیدی کوری مەعدان بە هیچ شێوەیەك گوێی لە عوبادەی کوڕی صامت نەبووە..

(٣) العرف الوردي، لا ٣٨.

بەرگی سێیەم

واتە: ئەگەر ئاگرێکتان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بینی، سێ یان حەوت ڕۆژان، ئەوا تەوەقوع بکەن کە ڕزگاربوونی ئالی پێغەمبەر محەممەدە ئەگەر خوا حەز بکات.

پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی (ﷺ) دەڵێت: (إِذَا رَأَيْتُمْ علامة مِنْ السماء نَاراً مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ تطلع ليلاً فعندها فرح الناس، وهي إقدام المهدي)[١].

واتە: گەر نیشانەیەکی ئاگرینت لە ئاسمانی خۆر هەڵاتەوە بینی و بە شەو دەرچوو، لەو سات خەڵکی زۆر دڵخۆش دەبن، ئەویش پێش هاتی مەهدیە.

وە زانایانی فەرموودەناس ئەم فەرموودەیان بە بێهێز داناوە، بۆیە پێویست بە دڵە ڕاوکێ ناکات.

## هەشتەم: زرمەیەک لە مانگی ڕەمەزان:

سەبارەت بەم دەنگ و زرمەیە زانایانی فەرموودە ناس دەفەرموون: بێ هێزە، هەندێکیشیان دەفەرموون: ئەمە بوختانە بەدەم پێغەمبەری خوا کراوە... بەڵام بۆ زانیاریتان هەر باسم کردووە.. وە پلەی فەرموودەکانیشم باس کردووە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِذَا كَانَتْ صَيْحَةٌ فِي رَمَضَانَ فَإِنَّهُ يَكُونُ مَعْمَعَةٌ فِي شَوَّالٍ، وَتَمْيِيزُ الْقَبَائِلِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَتُسْفَكُ الدِّمَاءُ فِي ذِي الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمِ، وَمَا الْمُحَرَّم، يَقُولُهَا ثَلَاثًا، هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ، يُقْتَلُ النَّاسُ فِيهَا هَرْجًا هَرْجًا، قَالَ: قُلْنَا: وَمَا الصَّيْحَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: هَدَّةٌ فِي النِّصْفِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ جُمُعَةٍ، فَتَكُونُ هَدَّةٌ تُوقِظُ النَّائِمَ، وَتُقْعِدُ الْقَائِمَ، وَتُخْرِجُ الْعَوَاتِقَ مِنْ خُدُورِهِنَّ، فِي لَيْلَةِ جُمُعَةٍ، فِي سَنَةٍ كَثِيرَةِ الزَّلَازِلِ، فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الْفَجْرَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَادْخُلُوا بُيُوتَكُمْ، وَاغْلِقُوا أَبْوَابَكُمْ، وَسُدُّوا كُوَاكُمْ، وَدِثِّرُوا أَنْفُسَكُمْ، وَسُدُّوا آذَانَكُمْ، فَإِذَا حَسَسْتُمْ بِالصَّيْحَةِ فَخِرُّوا لِلَّهِ سُجَّدًا، وَقُولُوا: سُبْحَانَ الْقُدُّوسِ، سُبْحَانَ الْقُدُّوسِ، رَبُّنَا الْقُدُّوسُ، فَإِنَّ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ نَجَا، وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ هَلَكَ)[٢].

---

(١) العرف الوردي، لا ٣٧.

(٢) موضوع: المسند للشاشي (٢/ ٢٦٢) برقم: (٨٣٧). وأخرجه نعيم بن حماد في كتاب

واتە: ئەگەر دەنگێکی گەورە هات لە مانگی ڕەمەزان، ئەوا شەڕو کوشتارێکی گەرم دەبێت لە مانگی (شوال)، وە خێڵ و لایەنەکان لە مانگی (ذي القعدة) دا دەچن بەیەکدا، وە خوێنێکی زۆر لە مانگی (ذی الحجه) دا دەڕژێت، ئینجا (موحەررەم)، بەڵام چ (موحەررەم) سێ جار دووبارەی کردەوە: هاوار هاوار، خەڵکی تیایدا بە لێشاو دەکوژرێن : دەڵێت: گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دەنگە گەورەیە چیە؟ فەرمووی: زرمەیەکە لە نیوەی مانگی ڕەمەزان لە شەوێکی جومعەدا، زرمەیەك دەبێت خەوتوو خەبەر دەکاتەوەو ئەوەی بە پێوەیە دای دەنیشێنێت و ئافرەتی پۆشتەو پەرداخ لە ماڵی خۆیان دەهێنێتە دەر ، لە شەوێکی جومعەدا لە ساڵێك کە بومەلەرزەی زۆر تێدا ڕوودەدات ، ئەو ڕۆژی جومعەیە کە نوێژی بەیانیتان تێدا کرد، بچنە ماڵەکانی خۆتانەوە، دەرگاکانتان داخەن و هەرچی کون و کەلێن لە ماڵەکانتاندا هەیە بیگرن و دای بخەن، وە خۆتان داپۆشن و توند گوێی خۆتان بگرن، لەگەڵ هەستان بە زرمەو دەنگەکە کرد، یەکسەر بچنە سوجدەو بڵێن: (سبحان القدُوس، سبحان القدُّوس ربنا القدوس) چونکە هەر کەس وابکات ڕزگاری دەبێت، هەرکەسیش وانەکات تیا دەچێت.

ئەم فەرموودەیە هەر دەڵێی باسی تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی دەکات.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (تَكُونُ هَدَّةٌ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ تُوقِظُ النَّائِمَ وَتُفْزِعُ الْيَقْظَانَ، ثُمَّ تَظْهَرُ عِصَابَةٌ فِي شَوَّالٍ، ثُمَّ مَعْمَعَةٌ فِي ذِي الْحِجَّةِ، ثُمَّ تُنْتَهَكُ الْمَحَارِمُ فِي الْمُحَرَّمِ، ثُمَّ يَكُونُ مَوْتٌ فِي صَفَرٍ، ثُمَّ تَتَنَازَعُ الْقَبَائِلُ فِي الرَّبِيعِ، ثُمَّ الْعَجَبُ كُلُّ الْعَجَبِ بَيْنَ جُمَادَى وَرَجَبٍ، ثُمَّ نَاقَةٌ مُقَتَّبَةٌ خَيْرٌ مِنْ دَسْكَرَةٍ تُقِلُّ مِائَةَ أَلْفٍ)[1].

---

الفتن عن ابن مسعود وفي سنده ابن لهيعة، وقال الذهبي في «التلخيص": ذا موضوع، وحكم بوضعه ابن القيم في «المنار المنيف». قال العقيلي رحمه الله ليس لهذا الحديث أصل من حديث ثقة ، ولا من وجه يثبت « انتهى . الضعفاء الكبير " (٥٢/٣)، وقال ابن الجوزي رحمه الله في باب خاص عقده باسم « باب ظهور الآيات في الشهور" : هذا حديث موضوع على رسول الله (ﷺ)، وقال الشيخ الألباني رحمه الله : موضوع، أخرجه نعيم بن حماد في «الفتن « (١٦٠/١) ..

(١) ضعيف جداً: المستدرك (٤/ ٥٦٣) برقم: (٨٥٨٠). قال الإمام الحاكم: قَدِ احْتَجَّ الشَّيْخَانِ رَضِيَ

واتە: زرمەیەك لە مانگی ڕەمەزان ڕوو دەدات، خەوتوو خەبەر دەکاتەوەو، بەخەبەریش ڕادەچڵەکێنێت ، پاشان کۆمەڵێك دەردەکەون لە مانگی (شەوال)، پاشان تێك پرژان و شەڕێکی گەرم لە مانگی (ذي الحجة) ڕوودەدات، پاشان هەتکی نامووس و پیرۆزیەکان دەکرێت لە مانگی (موحەررەم)، پاشان مردنێکی زۆر دەبێت لە مانگی (صفر) پاشان خێڵ و لایەنەکان تێك بەردەبن لە مانگی (رەبیع)دا ڕووداوی سەرسوڕهێنەر لە نێوان مانگی (جەماد) و (رەجب) ڕوودەدات ، پاشان وشترێکی ئامادە لە کۆشکێك کە جێی سەد هەزار کەسی تێدا ببێتەوە باشتر.

ئەگەر نمونەی ٢٠ساڵی ڕابرادوو بهێنینەوە لە ساڵانی (٢٠٠٠ تا ٢٠٢٠) ئەوا ١٥ مانگی ڕەمەزان کەوتە ڕۆژی هەینی و ئەو دەنگەیەش هیچ نەبیسترا، ئەو ساڵانەش (٢٠٠١ ـ ٢٠٠٤ ـ ٢٠١١ ـ ٢٠٢٠).. بۆیە ئەم زرمەیە هیچ ئەسڵێکی نییە هەروەکو زانایانی فەرموودەناس باسی دەکەن.

کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمە وتەی پێغەمبەر(ﷺ) نییە، بەڵکو هەڵبەستراوە بە دەمی پێغەمبەری خوا پێغەمبەر(ﷺ)، وە دوورە لە ڕاستیەوە.

تەنانەت زانایانی گەورەی فەرموودە وەکو عقیلی[١] و ئیبنو جەوزی[٢] و ئیبنو قەییم[٣] دەفەرموون: (فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە و ڕاست نییە لە ڕووی مەتن و سەنەدەوە پوچە).

تەنانەت شێخی ئەلبانی بە وردو درشتەوە قسەی لەسەر کردووەو وتەی زانایانی هێناوە لەو بارەیەوە[٤].

---

اللَّهُ عَنْهُمَا بِرُوَاةِ هَذَا الْحَدِيثِ عَنْ آخِرِهِمْ غَيْرَ مَسْلَمَةَ بْنِ عُلَيٍّ الْخُشَنِيِّ، وَهُوَ حَدِيثٌ غَرِيبُ الْمَتْنِ، وَمَسْلَمَةُ أَيْضًا مِمَّنْ لَا تَقُومُ الْحُجَّةُ بِهِ.

(١) الضعفاء الكبير (٣/ ٥٢).

(٢) الموضوعات (٣/ ١٩١).

(٣) المنار المنيف (لا ٩٨).

(٤) السلسلة الضعيفة، برقم: (٦١٧٨).

بۆیه تا ئێستا چەندین پانزەی ڕەمەزانی شەوی هەینی تێپەڕی و هیچ شتێکیش ڕووی نەدا، کەواتە ئەوە دەردەکەوێت بە واقیعی کە ئەم فەرموودەیە پوچەڵە.. بۆیه لەسەر موسڵمان پێویستە وریا بن لە خۆیانەوە وتەیەك نەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە نەی فەرموو بێت چونکە هەڕەشەی توندی لەسەرەو درۆکردن بە دەمی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەکو درۆکردن نییە بە دەمی خەڵکی دیکەوە، چونکە هەر کەسێك درۆیەك بە دەمی پێغەمبەر(ﷺ) بکات ئەوا با جێگایەك لە ئاگردا بۆ خۆی دیاری بکات.

## نۆیەم: خەڵکی تف ئاڕاستەی یەکتر دەکەن

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يخرج المهدي.. حتى يبصق بعضكم في وجه بعض)[1].

واتە: مەهدی دەرناچێت، هەتا هەندێك تف نەکات بە ڕووی هەندێکی تر..

ئەمەش کینایەتە لە بڕی ئەوەی کە جیاڕاییەکی ئەوەندە زۆر دروست دەبێت لە پێش هاتنی کۆتایی بونەوەر، کەسانێك یەکتری بە درۆ دەخەنەوەو نەفرەت لە یەکتری دەکەن، هەتا کار دەگاتە ئەوەی تف لە دەم و چاوی یەکتر بکەن.

هەر چەندە ئەم نیشانەیە جێگای بڕوا پێکراو نییە، چونکە نوعەیمی کوڕی حەمماد لە کتێبی (الفتن) ئاماژەی پێکردووە.

## دەیەم: گیرانی مانگ لە یەکەم شەوی ڕەمەزان و گیرانی ڕۆژ لە پانزەی ڕەمەزان:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) فەرموویەتی: (ينكسف القمر أول ليلة من رمضان والشمس ليلة النصف منه ..)[2].

---

(١) الحاوي، للسيوطي (لا ٢٢٦) .

(٢) ضعيف: رواه الدار قطني في سننه (٦٥/٢) قال الدكتور عبد العليم عبد العظيم البستوي في

واتە: مانگ دەگیرێت لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان، وە ڕۆژیش دەگیرێت لە پانزەی ڕەمەزان..

بەڵام بۆ ئاگاداریتان زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم وتەیە هەڵبەستراوە بەسەر زمانی پێشەوا عەلی کوری ئەبو تاڵیب (ﷺ) هەروەکو لە هامشەکە ئاماژەییم پێکردووە.. وە زیاتر شیعە ئەم بابەتە دەوروژێنن.. وە بە هیچ شێوەیەك پشتیان پێ نابەسترێ..

پێشەوا کەعبی ئەحبار (ﷺ) دەڵێت: (أن القمر ينكسف ثلاث ليال متواليات)[١]. واتە: بە دڵنیایی مانگ سێ شەو لەسەر یەك دەگیرێت.

## پانزەهەم: ڕۆچوونی گوندێك لە غوتەی ڕۆژئاوای دیمەشق کە پێی دەوترێت: حەرەستا:

پێشەوا خالیدی کوری مەعدان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (لا يخرج المهدي حتى يُخسف بقرية بالغوطة تسمى حرستا) [٢].

واتە: مەهدی دەرناچێت هەتا لە گوندێك ڕۆدەچێت لە غوتە ناودەبرێ بە حەرەستا[٣].

ڕۆچوونی گوندێك لە گوندەکانی دیمەشق پێی دەوترێ حەرەستا، لە دواییدا ئەبقەع و ئەصهەب دەردەچن، دواتر سوفیانی لە شام دەردەچێت ئەبقەع لە میصرو ئەصهەب لە جەزیرەی عەرەبی.. وە ئەعرەجی کیندی لە مەغریب، وە شەڕ ساڵێك بەردەوام دەبێت، دواتر سوفیانی بەسەر ئەبقەع و ئەصهەب زاڵ دەبێت[٤].

---

كتابه الموسوعة في أحاديث المهدي الضعيفة والموضوعة، لا ١٦٩..وقال البخاري: منكر الحديث.

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٩٥ .

(٢) بهجة الناظرين وآيات المستدلين، (لا ٢٧٠).

(٣) حەرەستا گوندێکی گەورەیە لە نزیك دیمەشق لەسەر ڕێگای حیمص، لە نێوان دیمەشق و ئەو گوندە زیاتر لە فەرسەخێکە. معجم البلدان (٢/ ٢٤١).

(٤) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٧١).

دوانزەهەم: دەنگێك لە ئاسمانەوە دێت بەناوی مەهدی، خەڵكی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا گوێ بیستی دەبن..

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت: (لينادين باسم رجل من السماء لا ينكره الذليل ولا يمتنع منها (منه) العزيز) [1].

پێشەوا سەعیدی كوڕی موسەییەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (تَكُونُ فُرْقَةٌ وَاخْتِلَافٌ حَتَّى يَطْلُعَ كَفٌّ مِنَ السَّمَاءِ وَيُنَادِي مُنَادٍ: أَلَا إِنَّ أَمِيرَكُمْ فُلَانٌ) [2].

واتە: فیتنەیەكی زۆرر جیاڕایی ڕوودەدات هەتا ناولەپی دەستێك لە ئاسمانەوە دەردەچێت.. هەتا بانگارێك بانگ دەكات: كە بە دڵنیایی پێشەواكەتان فلانە كەسە.

سێنزەهەم: بومەلەرزەیەكی زۆر ڕوودەدات:

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ، يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا) [3].

واتە: موژدەتان دەدەمێ بە مەهدی، پیاوێكە لە قورەیش لە ئال و بەیتی من، لە كاتی ناكۆكی نێوان خەڵك و زۆربوونی بومەلەرزەدا خودا دەینێرێت، زەوی پڕ دەكات لە ڕاستی و دادوەری، وەك چۆن پڕ ببوو لە ستەم، دانیشتوی ئاسمان و دانیشتوی زەوی لێی ڕازی دەبن، پارە بەرێكی بەش دەكات.

---

(١) صحيح: رواه ابن ابي شيبة في (المصنف) برقم: (٣٧٧٥٥) بإسناد حسن.

(٢) صحيح: أخرج نعيم بن حماد في الفتن (١/ ٣٣٩) بإسناد صحيح.

(٣) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١٧/ ٤٢٦) برقم: (١١٣٢٥). قال الإمام شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

بەرگی سێیەم

## چواردەهەم: سەرهەڵدانی شەڕێك لە نزیك ڕووباری فیش خابور:

شەڕێك لە (قەرقیسیا)[1] ڕوودەدات لە نێوان تورك و ڕۆمەکان، شەڕێکی خوێناوی کە دەبێتە هۆی ئەوەی سکی ئافرەت بدەڕێنن و منداڵ بکوژن، بۆیە پیاوە قوڕیشیەکان بەرەو ئەستەمبۆڵ هەڵدێن.

## پانزەهەم: کوشتنی کەسێك بەناوی (النفس الزکیه):

پێشەوا محەممەدی کوری حەنەفیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (كُنَّا عِنْدَ عَلِيّ (ﷺ)، فَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنِ الْمَهْدِيِّ ، فَقَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ..ذَاكَ يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ إِذَا قَالَ الرَّجُلُ اللَّهَ اللَّهَ قُتِلَ) [2].

واتە: ئێمە لەلای عەلی بووین (ﷺ) پیاوێك پرسیاری کرد سەبارەت بە مەهدی، پێشەوا عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ئەو پیاوە لە کۆتایی بونەوەر دەردەچێت، ئەگەر پیاوێك بڵێت: (الله الله) ئەوە کوژراوە.

پێشەوا موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی باس کردم و گوتی: (انَّ الْمَهْدِيَّ لَا يَخْرُجُ حَتَّى تُقْتَلَ النَّفْسُ الزَّكِيَّةُ، فَإِذَا قُتِلَتِ النَّفْسُ الزَّكِيَّةُ غَضِبَ عَلَيْهِمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ فَأَتَى النَّاسَ الْمَهْدِيُّ فَزَفُّوهُ كَمَا تُزَفُّ الْعَرُوسُ إِلَى زَوْجِهَا لَيْلَةَ عُرْسِهَا وَهُوَ يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطاً وَعَدْلاً ..) [3].

---

(١) قەرقیسیا شارێکە لە سەر ڕووباری خابور، ئەم جەنگە لە نێوان سێگۆشەی خابورو ئاوی فورات سەرهەڵدەدات (معجم البلدان (٤/ ٣٢٨)).

(٢) حسن: أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٤)، برقم: (٣٦٥٩)، وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، وسكت عايه الذهبي، والصحيح أنه على شرط مسلم فقط، وسنده حسن.

(٣) مصنف ابن أبي شيبة، لأبي بكر بن أبي شيبة، (٥١٤/٧) برقم: (٣٧٦٥٣). قال الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة: متنه منكر، وإسناده نظيف. سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة: (٥/ ١٧٦)، برقم (٢١٥٥).

بەرگی سێیەم

واتە: بە دڵنیاییی مەهدی دەرناچێت هەتا نەفسی زەكییە دەكوژرێت، كە كوژرا خەڵكی ئاسمان و ئەوانەی لە زەوین لێیان تورە دەبن، ئەمجا خەڵكی مەهدی دەهێنن و دەیرازێننەوە هەروەكو چۆن بووك بۆ پیاوەكەی دەڕازێننەوە لە شەوی بوكێنیدا، زەوی پڕ دەكات لە دادپەروەری.

سەرنج: ئەو (نەفس الزكیە) ی كە لەم فەرموودەیە هاتووە محەممەدی كوری عەبدوڵڵای كوری حەسەن نییە كە لەسەردەمی ئەبی جەعفەری مەنصوری عەباسی كوژرا، بەڵكو پیاوێكی ترە پێش هاتنی مەهدی دەكوژرێت[1].

بۆیە ئەو كاتەی ئەو پیاوە دەرچوو، سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) قسەی بۆ خەڵكەكە دەكردو فەرمووی: (وإن مرَّ بك المهدي وأنت في البيت فلا تخرج إليه حتى يجتمع الناس)[2]

واتە: ئەگەر مەهدی بەلایماڵتدا تێپەڕبوو بۆی دەرمەچوو هەتا خەڵكی بۆی كۆدەبنەوە.

وە پێش دەچێت ناوی (نەفس الزكیە) تەنها لەقەبێك بێت، چونكە ئەوەی ئاشكرایە ئەو وشەیەی كە لەم فەرموودەیە هاتووە بە واتای زمانەوانیە، نەك كەسێكی دیاریكراو، وەكو خوای پەروەردگار لە سورەتی (الكهف) فەرموویەتی: [قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ][3]. واتە: كەسێكی پاكی بێ گوناهت هەروا كوشت بێ ئەوەی كەسێكی كوشتبێ.

ئەم فەرموودانە هەمووی بەڵگەن كە پێش هاتنی مەهدی سەرتاپای زەوی پڕ دەبێت لە ستەم و كوشتنكاری.. چونكە ئەو سەردەم ئەگەر مرۆڤ ناوی خوا بهێنێت دەكوژرێت، وە بڕواداران زۆر عەصەبین، هەروەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ)[4].

---

(١) المهدي قادم، لا ٤٥.

(٢) حلية الأولياء، (٧/ ٣١).

(٣) سورة الكهف، الآية: (٧٤).

(٤) سنن الترمذي (٩/ ٤) باب: الصابر على كالقابض، برقم: (٢٤٢٨).

بەشی سێیەم

واتە: ڕۆژێك دێت ئەوەی ئارام دەگرێت لەسەر دینداری وەکو کەسێکە کە پشکۆی بە دەستەوە بێت.

وشەی (النفس) لە دەستەواژەی (النفس الزكية) تاکەو مەبەست پێی کۆیە، مەبەستیش (الأنفس الزكية)یە، چونکە ئەلیف و لام لەسەر وشەی (النفس) بۆ جنسە نەك بۆ عەهد بێت، ئەمەش لە قورئان و فەرموودە زۆر زۆرە.

کەواتە ئەم فەرموودانە مەبەست پێی لەوە نییە کە ئەم کوشتنە تەنها بۆ گەلێکی دیاریکراوی وەکو موسڵمانان بێت، بەڵکو سەرتاپای گەل و نەتەوەکان دەگرێتەوە.. بۆیە هەر موسڵمانێك بەبێ تاوان بکوژرێت بەبێ تاوانی ئەوە (نەفسی زەکیە)یە کە کوژراوە بەبێ هەق.. بۆیە لەم فەرموودەیە وای دەبینم هەر کەسێك بانگەشەو بانگەوازی ئیسلام بکات یان بڵێت: دەمەوێ تەتبیقی شەریعەتی ئیسلام بکرێت ئەوا دەکوژرێت، چونکە فەرموودەکە فەرموویەتی: (..إِذَا قَالَ الرَّجُلُ اللَّهَ اللَّهَ قُتِلَ)[1]. واتە: ئەگەر پیاوێك بڵێت: الله الله ئەوە کوژراوە.

ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین ڕۆژانە بە ئاشکرا ستەم لە موسڵمانان دەکرێت و دەکوژرێن بە دەست دوژمنانی ئەم ئوممەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کردووە، کە پادشایەتی زۆرداری دێت پێش زیندووبوونەوەی حوکمی هاتنەوەی ئیسلام.. ئەمجا دواتر مەهدی دێت.

## شانزەهەم: ڕووداوێکی گەورە لە شاری مەدینە ڕوودەدات:

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: (تَكُونُ بِالْمَدِينَةِ وَقْعَةٌ تَغْرَقُ فِيهَا أَحْجَارُ الزَّيْتِ، مَا الْحَرَّةُ عِنْدَهَا إِلَّا كَضَرْبَةِ سَوْطٍ، فَيَنْتَحِي عَنِ الْمَدِينَةِ قَدْرَ بَرِيدَيْنِ، ثُمَّ يُبَايِعُ إِلَى الْمَهْدِيِّ)[2].

---

(١) حسن: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٥٤)، برقم: (٣٦٥٩)، وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، وسكت عايه الذهبي، والصحيح أنه على شرط مسلم فقط، وسنده حسن.

(٢) الفتن، (١/ ٣٢٦) برقم: (٩٣٢).

واتە: لە مەدینەدا شەڕێك ڕوودەدات لەناوچەی (بەردەکانی زەیت) لە خوێندا دادەپۆشرێت، وە ناوچەی (حەرر)ەش هەروەکو شوێنی لێدانی قامچی لێ دێت، پاشان شەڕەکە بەبڕی ڕێگای دووجار حەوانەوەی پۆستەچی کە پێوانەیەکی ئەو زەمانەیە لە شاری مەدینە دوور دەکەوێتەوە، پاشان بەیعەت دەدرێت بە مەهدی.

ئاگاداری: (بەردەکانی زەیت) نزیکە لە یەکێك لە دەرگاکانی مزگەوت کە پێی دەگوترێ: باب السلام.

## حەڤدەهەم: دەرکەوتنی ناو لەپە دەستێك لە ئاسمان:

پێشەوا سەعیدی کوڕی موسەییەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (تَكُونُ فُرْقَةٌ وَاخْتِلَافٌ حَتَّى يَطْلُعَ كَفٌّ مِنَ السَّمَاءِ وَيُنَادِي مُنَادٍ: أَلَا إِنَّ أَمِيرَكُمْ فُلَانٌ)[1].

واتە: فیتنەیەکی زۆرر جیاڕایی ڕوودەدات هەتا ناولەپی دەستێك لە ئاسمانەوە دەردەچێت.. هەتا بانگارێك بانگ دەکات: کە بە دڵنیایی پێشەواکەتان فلانە کەسە.

## هەژدەهەم: سەرهەڵدانی جەنگێکی گەورە لە دابق:

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالْأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقٍ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ..)[2].

---

(١) صحيح: أخرج نعيم بن حماد في الفتن (١/ ٣٣٩) بإسناد صحيح.

(٢) صحيح مسلم، كتاب: الفتن، باب: فتح القسطنطنية (٢٢٢١/٤) برقم: (٢٨٩٧).

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا ڕۆم لە (ئەعماق)[١] یان (دابق) [٢] دانەبەزن، پاشان لەشکرێکیان بۆ دەردەچێت لە شاری مەدینەوە..

پێشەوا ذي مخرم (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا، وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِهِمْ، فَتَسْلَمُونَ وَتَغْنَمُونَ، ثُمَّ تَنْزِلُونَ بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ، فَيَقُومُ رَجُلٌ مِنَ الرُّومِ، فَيَرْفَعُ الصَّلِيبَ، وَيَقُولُ: أَلَا غَلَبَ الصَّلِيبُ، فَيَقُومُ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَقْتُلُهُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَكُونُ الْمَلَاحِمُ، فَيَجْتَمِعُونَ إِلَيْكُمْ، فَيَأْتُونَكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةً، مَعَ كُلِّ غَايَةٍ عَشْرَةُ آلَافٍ) [٣].

واتە: لەگەڵ ڕۆمدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن، ئێوەو ئەوان دەجەنگن لەگەڵ دوژمنێك کە لە پێش ئەوانەوەیە، پاشان سەردەکەون و دەستکەوتێکی باشتان دەبێت، پاشان لە مێرگێکدا دادەبەزن کە گردو پۆڵکەی زۆرە کە پێی دەڵێن: (مرج ذی تلول)[٤]، لەوێدا پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەستێت و خاچەکەی خۆیان بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: خاچەکەی ئێمە سەرکەوت، پیاوێکیش لە موسڵمانەکان هەڵدەستێت و دەیکوژێت، ئیتر ڕۆمەکان غەدر دەکەن و پەیمانی ئاشتیەکە دەشکێنن و جەنگە گەورەکان دەست پێدەکات، پاشان ڕۆمەکان کۆدەبنەوە بۆتان بەهەشتا ئاڵاوە، هەر ئاڵایەك (١٢) هەزار کەسی لەگەڵ دایە. واتە: ژمارەکەیان (٩٦٠٠٠٠) هەزار کەسە.

---

(١) ئەعماق: لە نێوان حەلەب و ئەنتاکیەیە، ناوێکی زۆری هەیەو وشکی ناکات مەگەر بە هاوینان نەبێت. سەرچاوە/ القاموس المحیط (٣/ ٢٧٧).

(٢) گوندی (دابق) لە گوندە مێژووییەکانە سەر بەشارۆچکەی (اخترین)ی سەر بە شاری (حلب)ە لە باکووری سوریا، نزیکەی دە کیلۆمەتر لە سنووری تورکیاوە دوورە، ڕووباری (قویق)ی پیا تێپەڕ دەبێت کە لە زستان و بەهاردا ڕێ دەکات، هەمیشە یەکێك بووە لە سنوورە گرنگەکانی موسڵمانان لە هەموو چەرخە ئیسلامیەکانداو داستانی گەورەش هەر لەوێ ڕوودەدات.

(٣) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٩١) برقم: (١٦٨٧٢). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٤) واتە: ئەو جێگایەیە کە سەوزایی و ناوی زۆر لێیە، واتە: مێرگ.

وە ڕۆمەکانی ئەو سەردەمە میراتگری ڕۆمەکانی پێشوون، کە لەو سەردەمەدا وڵاتانی خەڵکی وڵاتانی ئەوروپا دەگرێتەوە، پشت بەخوای گەورە دواتر بە درێژی باسی ئەو ڕووداوە گەورە دەکەین.

پێشەوا ئەبو دەرداء (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ، إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا: دِمَشْقُ، مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ)[1].

واتە: بنکەو خێوەتگای موسڵمانان لە ڕۆژی جەنگە گەورەکەدا لە (غوطة) دەبێت لە تەنیشت شارێکەوە کە پێی دەگوترێ (دیمەشق) کە یەکێکە لە چاکترین شارەکانی وڵاتی شام.

کەواتە (غوطة) بەشێکە لە دیمەشق، وە ئێستاش دیمەشق دەکەوێتە ناوەندی هەردوو (غوطە)ەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

## نۆزدەهەم: دەرچوونی شەست درۆزن کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: (لا تقوم الساعة حتى يخرج المهدي ولا يخرج المهدي حتى يخرج ستون كذابا كلهم يقول: أنا نبي)[2].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا مەهدی دەردەچێت، وە مەهدی دەرناچێت هەتا شەست درۆزن دەردەچێت، هەموویان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن و دەڵێن: من پێغەمبەرم.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣٦/ ٥٦) برقم: (٢١٧٢٥). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٢) لوامع الأنوار البهية، لا ٨٣ .

## بیست: دەرچوونی پیاوێك لەلای ڕۆژهەڵاتەوە:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) دەڵێت: (یخرج رجل قبل المهدي من اهل بیته من المشرق یحمل السیف علی عاتقه ثمانیة اشهر یقتل ویقتل ویتوجه الی بیت المقدس فلا یموت حتی یبلغه)[١].

واتە: پیاوێك پێش هاتنی مەهدی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت لە ئال و بەیتی منە هەژدە مانگ شمشێری لەسەر شان هەڵگرتووەو شەڕی لەگەڵ دەکرێت و شەڕیش دەکات، وە نامرێت هەتا ڕوو لە بیت و المقدس نەکات.

## بیست و یەك: بە ئاشکرا خەڵکی کافر دەبن:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) دەڵێت: (لا یُبایع المهدي حتی یُکفر بالله جهراً)[٢].

واتە: بەیعەت بە مەهدی نادرێت هەتا بە ئاشکرا خەڵکی کافر نەبن بە خوای گەورە.

## بیست و دوو: دەرچوونی نیشانەیەك لەگەڵ هەڵاتنی ڕۆژ:

پێشەوا ئەبوبەکری بەیهەقی لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَا یَخْرُجُ الْمَهْدِيُّ حَتَّی تَطْلُعَ مَعَ الشَّمْسِ آیَة)[٣].

واتە: مەهدی دەرناچێت هەتا لەگەڵ خۆردا نیشانەیەك هەڵدێت.

---

(١) ضعیف: رواه نعیم بن حماد في (الفتن) برقم: (٩٢٠) (٢/ ٦٩٩) بسند ضعیف.

(٢) حسن: رواه نعیم بن حماد في (الفتن) برقم: (٩٣٢) بسند حسن.

(٣) صحیح: سنن الواردة في الفتن (٥/ ١٠٣٧) برقم: (٥٥١). وإسناده صحیح ورجاله ثقات، التهذیب (٢٤٣/١٠).

## بیست و سێ: کوژرانی سەرۆکێکی عێراق:

پێشەوا ئەبی حەسەنی ڕەبەعی مالیکی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بە سەنەدێك بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (اذا وقعت الملاحم بعث الله من دمشق بعثا من الموالي أكرم العرب فرسا.. فاذا قتل الخليفة بالعراق: خرج عليهم رجل مربوع القامة، كث اللحية، أسود الشعر، براق الثنايا، فويل لأهل العراق من تباعة المراق، ثم يخرج المهدي منا أهل البيت، فيملأ الأرض عدلا، كما ملئت جورا)[1].

واتە: ئەگەر جەنگە گەورەکە ڕوویدا خوای پەروەردگار لە دیمەشقەوە پیاوێك لە (مەوالی) دەنێرێت کە باشترین و بەڕێزترین سوارچاکی عەرەبە.. کە خەلیفەیەك و سەرۆکێکی عێراق کوژرا، پیاوێکی چوار شانە بۆیان دەردەچێت، ڕیشی پڕە، مووی ڕەشە، ددانەکانی پێشەوەی کەمێ لە یەکتری دوورن[2].. لە سپیەتیدا ئەدرەوشێتەوە[3].. هاوار بۆ خەڵکی عێراق لە شوێنکەوتنی ئەوانەی کە لە ئایین دەردەچن، لە پاشان مەهدی دەردەچێت کە لە ئال و بەیتی منە، زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری، هەروەکو چۆن پڕ بوو لە زوڵم و ستەم.

## بیست و چوار: ڕۆچوونێك لەلای دەرچوونی چیایە زێڕینەکە

پێشەوا ئەبی غەتەفان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: گوێم لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص بوو (ﷺ) کە گوتویەتی: (تخرج معادن مختلفة، معدن منها قريب من الحجاز، يأتيه من شرار الناس.. فبينما هم كذلك إذ خسف به)[4].

---

(١) أخرجه الحافظ أبو عبدالله نعيم بن حماد، في كتاب (الفتن) من حديث سليمان بن حبيب بمعناه مختصراً.

(٢) الحاوي (٢/ ٢٢٠).

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة ، لا ١٦٥.

(٤) المستدرك على الصحيحين (١/ ٣٢٠). قال الحاكم: هذا حديث صحيح الاسناد.

واتە: کانزای جیاواز دەردەهێنرێت، کانزایەکیان نزیکە لە حیجاز، لەلایەن خراپترینی خەڵکی دەبێت.. هەر لەو نێوەندەیان ڕاستەوخۆ ڕۆدەچن بەناخی زەوی.

بەندە ئەوەندەی توێژینەوەی لەسەر کردبێت گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو ڕۆچوونە لە کاتی دەرهێنانی نەوت و کانزا ڕوودەدات.

## بیست و پێنج: شەڕێکی گەورە لە شاری مەدینە هەڵدەگیرسێت

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يكون بالمدينة وقعة يفرق فيها أحجار الزيت..ثم يبايع المهدي)[1].

واتە: لە شاری مەدینە ڕووداوێك ڕوودەدات، (کە ببێتە هۆی کوشتنی یەکتر) تا وای لێ هات بەردەکانی زەیت لە خوێندا نقوم ببن.. لە پاشان بەیعەت بە مەهدی دەدرێ.

پێشەوا ئەبو ذەر (ﷺ) دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم: (.. أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، يَعْنِي حَتَّى تَغْرَقَ حِجَارَةُ الزَّيْتِ مِنَ الدِّمَاءِ، كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: اقْعُدْ فِي بَيْتِكَ، وَأَغْلِقْ عَلَيْكَ بَابَكَ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ أُتْرَكْ؟ قَالَ: فَأْتِ مَنْ أَنْتَ مِنْهُمْ، فَكُنْ فِيهِمْ قَالَ : فَآخُذُ سِلَاحِي؟ قَالَ: إِذَنْ تُشَارِكَهُمْ فِيمَا هُمْ فِيهِ، وَلَكِنْ إِنْ حشِيتَ أَنْ يَرُوعَكَ شُعَاعُ السَّيْفِ، فَأَلْقِ طَرَفَ رِدَائِكَ عَلَى وَجْهِكَ حَتَّى يَبُوءَ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ)[2].

واتە: ئەگەر ڕۆژێك هات و خەڵك کەوتنە کوشتنی یەکتر تا وای لێ هات بەردەکانی زەیت[3] لە خوێندا نقوم ببن، چی دەکەیت ؟ فەرمووی: دانیشە لە ماڵی خۆتداو دەرگا لەسەر خۆت دابخە، گوتی: ئەی ئەگەر وازیان لێ نەهێنام

---

(١) العرف الوردي، لا ٣٧.

(٢) مسند الإمام أحمد (٥/ ١٤٩) برقم: (٢١٣٢٥).

(٣) شوێنێکە لە شاري مەدينة.

ئەویش فەرمووی : پێشتر لەگەل کێ دابوویت هەر لەگەڵ ئەواندا بە گوتی: ئەی شمشێرەکەم لەگەڵ خۆم بەرم؟ فەرمووی: کەواتە تۆش بەشدار دەبیت لە تاواندا لەگەڵیان، بەڵام ئەگەر زانیت شمشێریان لێ بەرزکردویتەوە و بریسکەکەی ترساندیتی، ئەوا لێواری عەباکەت بدە بە دەم و چاوت، بۆ ئەوەی ئەگەر کوشتی گوناهی خۆی و تۆش بچێتە ئەستۆی و پێی بچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

لەم فەرمووده بۆمان دەردەکەوێت کە لە کاتی فیتنەو ئاشوب و کوشتاری موسڵمانان لە ناو خۆیاند بە هیچ شێوەیەك بەشداربوون تیایدا دروست نیە.. بەڵکو دووره پەرێزی و هەڵهاتن لەو فیتنانە جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی تەنانەت ئەگەر بە زۆریش ڕاپێچ کرایت نابێت دەست بکەیتەوە، بەڵکو بکوژرێیت باشترە لەوەی بیکوژیت.

## بیست و شەش: تێکپرژانی حاجیەکان و کوشتارگەیەك لە مینا

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَحُجُّ النَّاسُ مَعًا، وَيُعَرِّفُونَ مَعًا عَلَى غَيْرِ إِمَامٍ، فَبَيْنَمَا هُمْ نُزُولٌ بِمِنًى إِذْ أَخَذَهُمْ كَالْكَلْبِ، فَثَارَتِ الْقَبَائِلُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَاقْتَتَلُوا حَتَّى تَسِيلَ الْعَقَبَةُ دَمًا، فَيَفْزَعُونَ إِلَى خَيْرِهِمْ فَيَأْتُونَهُ، وَهُوَ مُلْصِقٌ وَجْهَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ يَبْكِي، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى دُمُوعِهِ، فَيَقُولُونَ: هَلُمَّ فَلْنُبَايِعْكَ، فَيَقُولُ: وَيْحَكُمْ، كَمْ مِنْ عَهْدٍ قَدْ نَقَضْتُمُوهُ، وَكَمْ مِنْ دَمٍ قَدْ سَفَكْتُمُوهُ، فَيُبَايِعُ كَرْهًا، فَإِنْ أَدْرَكْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ، فَإِنَّهُ الْمَهْدِيُّ فِي الْأَرْضِ، وَالْمَهْدِيُّ فِي السَّمَاءِ) [1].

واتە: خەڵکی پێکەوە دەچنە حەج و پێکەوە دەچنە سەر کێوی عەرەفە بەبێ ئەوەی پێشەوایان هەبێت، وە لەکاتێکدا کە دێنە خوارەوە بۆ (مینا) هەروەك چۆن ئەو کەسەی سەگ قەپی لێگرتووەو تووشی هاری بووە، ئاواش ئەو خەڵکانە هار دەبن و بەیەکدا دەچن و کوشتارێکی وەها لەیەکتر دەکەن هەتا وای لێدێت جۆگەڵە خوێن لە (عەقبە)دا هەڵدەستێت، پاشان ڕوودەکەنە باشترین و چاکترین کەسیان و دێن بۆ لای، ئەویش ئەو کاتە دەم و چاوی ناوە بەکەعبەوەو دەگرێ

---

(١) ضعيف جداً: المستدرك (٤/ ٥٤٩) برقم: (٨٥٣٧). قال الإمام الحاكم: سنده ساقط.

هەر دەڵێی ئا ئێستا سەیری فرمێسکەکانی دەکەم و لەبەر چاومن، پێی دەڵێن: ئادەی هەستە بەیعەتت بدەینێ، ئەویش دەڵێت: ئاخ لە ئێوە چەند پەیمان و بەڵێنتان هەڵوەشاندەوەو چەندتان خوێنی بە ناهەق ڕشت، پاشان بەنابەدڵی خۆی بەیعەتی پێ دەدرێت ، ئەگەر کەوتنە ئەو کاتەوەو پێی گەیشتن ئێوەش بەیعەتی بدەنێ ، چونکە ئەوە پێشەوا مەهدیە.

ئەو کوشتن و کوشتارەی کە لە نێوان حاجیەکان لەو ساڵی ڕوودەدات تا ئێستا لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوودا دووجار ڕووی داوە، جارێکیان لە ساڵی (١٩٨٧)م زیاتر لە هەزار حاجی کوژران ، وە لە ساڵی (١٩٩٢)م نزیکەی (٣٠٠) حاجی کوژران، جا بە پێی فەرموودەکە لەو ساڵەدا کە (محەممەدی مەهدی) تێدا ئاشکرا دەبێت هەمان کارەسات بە گەورەترو دڵتەزێن تر دووبارە دەبێتەوە.

جا بۆیە ئەم فەرموودانە لە پلەی (لاواز) یان (هەڵبەستراو)ن کە ناتوانین پشتیان پێ ببەستین.



## بیست و حەوت: کات زۆر بە خێرایی دەڕوات

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونُ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونُ الشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونُ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونُ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونُ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کات لێك نزیك دەبێتەوە ساڵ وەك مانگی لێ دێت و مانگ وەکو هەفتەی لێ دێت و هەفتە وەکو ڕۆژی لێ دێت و ڕۆژێك وەکو سەعاتێکی لێ دێت سەعاتێکیش وەك و سووتانی پوشکی دارخورمای لێ دێت.

زانایانی ئیسلام چەند قسەو واتایەکیان بۆ وشەی نزیکبوونەوەی کات گوتووە یەکێك لەوانە:

---

(١) صحيح ابن حبان (٢٥٦/١٥) ، رقم : (٦٨٢٤) ، وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح عى شرط مسلم.

پێشەوا خەتابی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست لە نزیکبوونەوەی کات لەم فەرمووده ئەوەیە: لە سەردەمی محەممەدی مەهدی و پێغەمبەر عیسا ڕوودەدات لەبەر تام وەرگرتنی خەڵك لە ژیانداو بڵاوبوونەوەی دادپەروەری و ئەمن و ئاساییش[1].

## بیست و هەشت: خەڵکی لە هاتنی مەهدی بێ ئومێد دەبن

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: خوای گەورە مەهدی دەنێرێت لە پاش ئەوەی کە خەڵکی بێ ئومێد دەبن و دەڵێن: مەهدی نییە، بۆیە ئەوانەی محەممەدی مەهدی سەردەخەن لە خەڵکی شامن ژمارەیان ٣١٥ کەس دەبێت[2].

## بیست و نۆ: لە نۆ کەس حەوتی دەکوژرێت:

پێشەوا ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (لا يخرج المهدي حتى يقتل من كل تسعة سبعة)[3].

واتە: مەهدی دەرناچێت هەتا لە هەر نۆ کەسێك حەوتی دەکوژرێت.

## سی: بینینی تاریکایی:

پێشەوا ئەبی جەعفەر محەممەدی کوڕی عەلی (ﷺ) دەڵێت: (لا يخرج المهدي حتى تروا الظلمة)[4].

واتە: مەهدی دەرناچێت هەتا تاریکایی دەبینن.

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١٦).

(٢) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ٩٨) .

(٣) أخرجه نعيم بن حماد في (الفتن) (٢/ ٤٣).

(٤) العرف الوردي، (لا ٢٣٥) .

# ئەو وڵاتانەی ئازادیان دەکات !

پاش ئەوەی ئەو جەیشەی کە لە شام دێت و دژایەتی محەممەدی مەهدی دەکات ڕۆدەچێت بەناخی زەوی، هەتا ئەم دەنگۆیە بە دونیا بڵاودەبێتەوە، هەتا خەڵکی لە هەموو لایەك دێن و بەیعەتی دەدەنێ، ئەمجا جەیشێکی گەورەو تۆکمە لەلایەن موسڵمانانەوە ئامادە دەکرێت بۆ ئەوەی چەندین وڵات ئازاد بکەن لە ژێر دەسەڵاتی ستەم و ستەمکاری، گرنگترینیان ئەمانەن:

## یەکەم: ئازادکردنی دوورگەی عەرەبی

یەکەم جەیش کە شەڕ لەگەڵ محەممەدی مەهدی دەکات سوپایەکە لە دوورگەی عەرەبییەوە دێت، لەسەر داوای پیاوێك لە قورەیش، ئەویش سوفیانی پێدەوترێت لەسەر ڕای پەسند[١] ، سوپایەك ئامادە دەکرێت و گەمارۆ دەدرێن.

پێشەوا نافیعی کوری عوتبە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم..)[٢].

واتە: غەزای دوورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات.

---

(١) پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پەرتوکی (التذكرة) لاپەڕە ٧٠٢ دەڵێت: بە دڵنیایی مەهدی شەڕ لەگەڵ سوفیانی دەکات ئەوانەی لەگەڵیدان لە هۆزی (کەلب)ن، وە پیاوێکە لە قورەیش، هەتا هەندێك دەڵێن: ناوی عوروەی کوڕی محەممەدە، کونیەکەی ئەبو عوتبەیە.

تەنانەت سوفیانی لە نەوەی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانە، پیاوێکی چوار شانەیە، نوقتەیەکی سپی لە چاوی هەیە، لەلای دیمەشقەوە دەردەچێت ئەوانەی شوێنی دەکەون زۆربەیان لە هۆزی (کەلب)ن، شەڕوکوشتارێکی زۆر ئەنجام دەدات.

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

له فەرموودەیەکی تر دایکی باوەڕداران عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الْعَجَبُ إِنَّ نَاسًا مِنْ أُمَّتِي يَؤُمُّونَ بِالْبَيْتِ بِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ، قَدْ لَجَأَ بِالْبَيْتِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ خُسِفَ بِهِمْ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ الطَّرِيقَ قَدْ يَجْمَعُ النَّاسَ، قَالَ: نَعَمْ، فِيهِمُ الْمُسْتَبْصِرُ وَالْمَجْبُورُ وَابْنُ السَّبِيلِ، يَهْلِكُونَ مَهْلَكًا وَاحِدًا، وَيَصْدُرُونَ مَصَادِرَ شَتَّى، يَبْعَثُهُمُ اللهُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ)[1].

واته: جێی سەرسوڕمانە کەسانێك لە ئوممەتەکەم ڕوویان کردۆتە ماڵی بەیت بۆ پیاوێکی قوڕەیشی کە پەنای بردۆتە بەر کەعبە، هەتا کاتێك کە گەیشتنە بیابانەکە ڕۆچوون بەزەویدا، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگە جاری وا هەیە خەڵکی جۆراو جۆر کۆدەکاتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ تیایاندایە بەچاو ڕۆشنی هاتووەو تیایاندایە بەزۆر هێنراوەو تیاشیاندایە ڕێبوارە، هەموویان بە یەك تیاچوون تیا دەچن، وە هەریەکیان بە ڕێیەکی جیاواز دەڕوات و خوا هەر یەکەیان لەسەر نیەتی خۆی زیندووی دەکاتەوە.

(بەیداء) لە شاری مەدینەیە.

دووەم: ئازادکردنی وڵاتی ئێران:

له پاشان وڵاتێکی تر ئازاد دەکرێت لە فارس (ئێران) جەیشێك دێت لەو شارەوە بەڵام لە کۆتاییدا شکست دەهێنێت.

پێشەوا نافیعی کوری عوتبە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (ثُمَّ تَغْزُونَ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ)[2].

واته: پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات ، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٠) باب : الخسف بالجيش، برقم: (٢٨٨٤).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

## سێیەم: ئازادکردنی وڵاتی تورکیاو چیای دەیلەم

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: (لا تقوم الساعة حتى يملك رجل من أهل بيتي ، يفتح القسطنطنية وجبل الديلم)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا پیاوێك لە ئال و بەیتی من دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەستەمبۆڵی خاکی تورکیا و چیای دەیلەم ئازاد نەکات.

## چوارەم: ئازادکردنی بەلەنجەر[٢]

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەممان (ﷺ) دەڵێت: (لا يُفتح بلنجر، ولا جبل الديلم، إلا على يدَي رجل من آل محمد(ﷺ))[٣].

واتە: بەلەنجەر ئازاد ناکرێ، وە چیای دەیلەمیش ئازاد ناکرێ، ئیلا لەسەر دەستی پیاوێك لە ئال و بەیتی پێغەمبەرە(ﷺ).

## پێنجەم: ئازادکردنی صین

پێشەوا عەلی کوری ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: (ويفتح قسنطنية والصين وجبال الديلم، فيمكث على ذلك سبع سنين..)[٤].

واتە: قوستەنتنیەو صین و چیای دەیلەم ئازاد دەکرێ، لە پاشان حەوت ساڵان دەمێنێتەوە.

---

(١) البحر الزخار المسمى مسند البزار (١٥/ ٣٩٣) برقم: (٩٠١٥).

(٢) بەلەنجەر: شارێکە لە خەزر، عەبدورەحمانی کوری رەبیعەی باهیلی ئازادی کرد. (معجم البلدان (١/ ٤٩٠)).

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٥٧ .

(٤) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٥٨ .

بەرگی سێیەم

## شەشەم: ئازادکردنی ئەستەمبۆڵ

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (هَلْ سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَاقَ، حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا، فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلَاحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ قَالَ: فَيَقُولُونَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا، قَالَ ثَوْرٌ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ: جَانِبُهَا الَّذِي يَلِي الْبَحْرَ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّانِيَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الْآخَرُ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّالِثَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيُفَرَّجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُونَهَا فَيَغْنَمُون، فبينماَ هُمْ يَقْتَسِمونَ المَغانِمَ إذْ جَاءَهُمُ الصريخُ فقال: إنَّ الدّجال قدْ خَرَجَ، فَيَترکون كلَّ شيءٍ ويَرْجِعون)[1].

واتە: شارێکتان بیستووە بەشێکی لە ووشکایی دایەو بەشێکی لە ئاودایە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا هەفتا هەزار لە نەوەکانی ئیسحاق هێرشی بۆ دەکەن، کاتێك کە دەیگەنێ دادەبەزن نە بە چەك شەڕیان لەگەڵ دەکەن و نە تیریشیان تێدەگرن، هەر ئەوەندە دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) لایەکی دەڕوخێت، پاشان بۆ دووەم جار دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر)لایەکەی تریشی دەڕوخێت، پاشان بۆ جاری سێیەم دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) ئەمجارە بۆیان دەکرێتەوەو دەچنە ناوی و دەستکەوتێکی زۆریان دەبێت، وە لەکاتێکدا کە سەرگەرمی دابەش کردنی دەستکەوتەکانن، دەنگێك لەناویاندا بڵاودەبێتەوە کە (دەجال) هەستاوە، ئیتر هەموو شتێك بەجێ دەهێڵن و دەگەڕێنەوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە دوای سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە جەنگە گەورەکەدا دەفەرموێت: (فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطَنْطِينِيَّةَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ، قَدْ

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٤) كتاب: الفتن وأشراط الساعة، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٩٢٠).

عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ، إِذْ صَاحَ فِيهِمِ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِي أَهْلِيكُمْ، فَيَخْرُجُونَ، وَذَلِكَ بَاطِلٌ، فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ)[١].

واتە: پاش ئەوەی شاری ئەستەنبۆڵ ئازاد دەکەن، وە لە کاتێکدا کە سەر گەرمی دابەش کردنی دەستکەوتی شەڕەکەن و چەکو شمشێرەکانیان بە دار زەیتونەکاندا هەڵواسیوە، لەو کاتەدا شەیتان لەناویان هاوار دەکات و دەڵێت: مەسیحی دەجال لە دواتانەوە پەلاماری ماڵ و منداڵی داون، ئەوانیش بەپەلە دەگەڕێنەوەو هەواڵەکەش درۆیە، پاشان کە دەگەنە شام ئەنجا دەجال دەردەچێت.

## حەوتەم: ئازادکردنی وڵاتانی ڕۆم (ئەوروپاو ئەمریکا)

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (..وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ، فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يُمْسُوا، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الرَّابِعِ، نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَيَجْعَلُ اللهُ الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ، فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً - إِمَّا قَالَ لَا يُرَى مِثْلُهَا، وَإِمَّا قَالَ لَمْ يُرَ مِثْلُهَا - حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ، فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتًا، فَيَتَعَادُّ بَنُو الْأَبِ، كَانُوا مِائَةً، فَلَا يَجِدُونَهُ بَقِيَ مِنْهُمْ إِلَّا الرَّجُلُ الْوَاحِدُ، فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ؟ أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ..)[٢].

واتە: .. لە کاتی ئەو شەڕەدا هەڵگەڕانەوەیەکی توند دەبێت و خەڵکێکی زۆر پاشگەز دەبنەوە، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەن کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، پاشان شەڕ دەکەن هەتا شەو لێکیان جیا دەکاتەوە،

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢١) باب: في فتح قسطنطنية، وخروج الدجال، برقم: (٢٨٩٧).

(٢) صحيح مسلم ، كتاب الفتن ، باب إقبال الروم في كثرة القتل، (٢٢٢٣/٤) برقم: (٢٨٩٩).

پاشان ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە، هیچیان سەرنەکەوتوون و ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەنەوە کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، دیسان شەڕ دەکەن تا شەو لێکیان جیا دەکاتەوە، ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە بەبێ ئەوەی هیچیان سەرکەون، ئەوانەی بەڵێنی مردنیشیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان بەڵێنی مردن دەدەنەوە کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، پاشان دەست دەکەنەوە بە شەڕ هەتا ئێوارە دادێت ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە بەبێ ئەوەی هیچیان سەرکەون، وە ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان کە ڕۆژی چوارەم هات ئەوەی کە ماوە لە ئەهلی ئیسلام بۆیان ڕادەبەڕن و هەڵمەتیان بۆ دەبەن (لە هەموو وڵاتانی جیهان) خوای گەورە شکستیان پێ دەهێنێت، بە جۆرێك کە کوشتارێکیان لێ دەکەن ـ یان گوتی: هەرگیز نابینرێت ـ یان گوتی: هەرگیز نەبینراوە بەجۆرێك کە باڵندە لە نزیکیانەوە تێدەپەڕێت و بەجێیان ناهێڵێت بە مردوویی دەکەوێتە خوارەوە، ئەنجا ئەوەی یەك باوك سەد کەس بوون سەیر دەکات کەسیان نەماوە تەنها یەك پیاو نەبێت، ئیتر چ دەسکەوتێك دڵ پێی خۆش بێت؟ یاخود چ میراتیەك دابەش بکرێت..

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ أَنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيهِمْ، فَرَفَضُوا مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَيَقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشْرَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): إِنِّي لَأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ، وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ، وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ، هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ)[1].

واتە: لە کاتێکدا ئەمانە لەم حاڵە دەبن گوێیان لێدەبێت وە بەڵایەکی لەوە گەورەتر دامێن گیریان بووە کاتێ بانگکەر دێتە لایان و هاواری لێدەکات دەجال لە دوای خۆیانەوە بەربۆتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە، ئەوانیش چیان پێیە هەر هەمووی فڕێ دەدەن و ڕوو دەکەنە ماڵەوە، دە سوار چاك لە پێش خۆیانەوە دەنێرن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: من زۆر چاك ناوی خۆیان و باوکیان و ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم ئەوان لەو ڕۆژەدا چاکترین سواری سەر زەوین.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٣) باب: إقبال الروم وكثرة القتل، برقم: (٢٨٩٩).

### هەشتەم: ئازادکردنی وڵاتی هیندستان

بەڵێ.. محەممەدی مەهدی غەزای هیندستان دەکات و سەردەکەوێت بەسەر هندۆسیەکان و عیبادەتی مانگا ڕەتت دەکاتەوە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ليغزون الهند لكم جيش يفتح الله عليهم.. فيجدون ابن مريم بالشام)[1].

واتە: سوێند بەخوای گەورە جەیشێك غەزای هیندستان دەکەن خوای گەورە بۆیان ئازاد دەکات.. هەتا عیسای کوری مەریەم لە شام دەبینن و دەستیان دەکەوێت و پێی دەگەن.

### نۆیەم: ئازادکردنی (ڕۆما)ی پایتەختی ئیتاڵیا

ڕۆما دەکەوێتە هەردوو دوورگەی قوبرص و رودس یان لای بۆسنەو هەرسك، یان لای ئەستەنبۆڵ، ئەمانەش هەموویان موژدەی داهاتوون..

لە دیدی ئاینی ئێمەدا فتحکردن و ئازادکردنی وڵاتان بۆ وەرگرتن یان وەرنەگرتنی ئەم ئایینە بە دوو شێوە دەکرێت: فەتحی سەربازی و فەتحی ڕۆشەنبیری، لە دەقە ئایینەکاندا ئەمە ڕۆشنەو لە واقیعی ئێستای موسڵمانانیشدا ئەمەش هەر ڕۆشنە.

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوری عاصەوە ڕیوایەت دەکات کە لێیان پرسیوە کام شار سەرەتا ئازاد دەکرێت، ئەویش داوای کرد سندوقێکی بۆ بهێنن کە بە زنجیر دایخستبوو، کتێبێکی لە سندوقەکە دەرهێناو عەبدوڵلا گوتی: ڕۆژێکیان لە دەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووین شتمان دەنووسی، یەکیٚ پرسی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)!

---

(١) ضعيف: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) لا ٢٥٢. بسند ضعيف.

کام شارەیان لە پێشدا فەتح دەکرێت، قوستەنتینە یان ڕۆما؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مَدِينَةُ هِرَقْلَ تُفْتَحُ أَوَّلًا، يَعْنِي: قُسْطَنْطِينِيَّةَ) [١] واتە: شاری هیرەقل ئازاد دەکرێت یەکەمجار، واتە: قوستەنتنیە.

ئەگەر سەیری وشەی (تُفْتَح) بکەین بە کرداری ڕانەبردوو هاتووە، واتە: بە بەردەوامی ئەم ولاتە ئازاد دەکرێت، بەلام تا ئێستا (ڕۆما) کە پایەتەختی (ئیتالْیا)یە ئازاد نەکراوە.

دەی ئەوە ڕۆشنە کە محەممەدی فاتح فەتحی قوستەنتنیەی کرد لە ساڵی (١٤٥٣)ع، ئەوەی ماوەتەوە فەتحی (ڕۆما)ی پایەتەختی ئیتاڵیا بکرێت و ئیسلام بچێتە ئەوێ و دەسەلات پەیدا بکات، ئەم فەتحەش مەرج نیە فەتحێکی سەربازی بێت، بەڵکو دەکرێ فەتحێکی ڕۆشنبیری و فیکری و ژیاری بێت وەك چۆن ئەو هەموو ولاتەی دی ئیسلام تیایاندا بلاوبوویەوەو گەشەی کردو دەسەلاتیشی پەیدا کردو یەك سەربازی موسڵمانیش نەچوویە ناوی.

---

(١) صحيح: رواه الإمام أحمد في (المسند) (٢/ ١٧٦)، والحاكم في (المستدرك) (٣/ ٤٢٢) برقم: (٨٣٠١) وصححه ووافقه الذهبي/ والألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم: (١٩٣٤).

# ئەوانەی پاڵپشتی محەممەدی مەهدی دەکەن و سەری دەخەن کێن؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (المهدى منَّا يُختم الدين بنا كما فُتح بنا)[1].

واتە: مەهدی لە ئێمەیە، کۆتایی بەم دینە دەهێنێت، هەروەکو چۆن بە ئێمە کرایەوەو ئازاد کرا.

## یەکەم: سەرهەڵدانی ئاڵاڕەشەکان لە ڕۆژهەڵاتی خاکی خوراسانەوە:

لە پێش هاتنی محەممەدی مەهدی کۆمەڵێك دەردەچن لە ڕۆژهەڵات و خاکی خوراسانەوە ئاڵاکانیان ڕەشە، پێشەوا ثەوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إذا رأيتم الرايات السود قد جاءت من خراسان فأتوها ولو حبواً على الثلج فإنه خليفة الله المهدي)[2].

واتە: هەر کاتێك ئاڵا ڕەشەکانتان بینی لە خوراسانەوە هاتن ئەوا خۆتانی بگەیەننێ ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆتان خشاندبێت، چونکە خەلیفە مەهدیان لەگەڵ دایە..

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: محەممەدی مەهدی بە کەسانێك لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی خوراسان پشتیوانی دەکرێت و سەری دەخەن، وە ئەو کۆمەڵەیە دەسەڵاتی بۆ دادەمەزرێنن و کۆڵەکەکانی بۆ پتەو دەکەن و دەی چەسپێنن.

---

(١) أخرجه الحافظ أبوبكر البيهقي.

(٢) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك: (٤/٥١٠) برقم (٨٤٣٢)، وصححه الحاكم على على شرط الشيخين.. وقال البصيري في (الزوائد): إسناده صحيح ورجاله ثقات، وقال ابن كثير في (النهاية في الفتن والملاحم) (١/ ٣٩) هذا إسناد قوي صحيح.

پێشەوا قەزوینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوراسان سنوری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری جیحون مرو بەلخ و نیسابور دەکات[١].

واتە: مەنتیقەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کە بەشێکی دەکەوێتە ئەفغانستان و بەشێکی تری دەکەوێتە ئێران.

ئاگاداری: ئەو ئاڵا ڕەشانە ئەوانە نەبوون کە چوون بۆ سەرخستنی بەنی عەباس، هەر چەندە لەلای ڕۆژهەڵاتی خوراسانەوە سەریان هەڵدا و شەڕیان لەگەڵ بەنی ئومەییە کرد.

هەروەها ئەو ئاڵا ڕەشانە ئەوانە نەبوون کە لە ساڵی ٢٠١٤ سەریان هەڵدا بەناوی (دەوڵەتی ئیسلامی لە نێوان عێراق و شام) کە بوونە مایەی فیتنەو بەڵایەکی زۆر بەسەر ئیسلام و هەموو خەڵکی جیهان، بەناوی ئیسلام کوشتارێکی زۆریان کردو خانووی هەزاران خەڵکیان خاپوور کرد.. کە ئیسلام لەم جۆرە کەسانە بە دوورە.. بۆیە هەر کەسێك کە بانگەشەی قوڕئانی کردو ئاڵایەکی ڕەشی بەدوای خۆی گێڕا نابێت شوێنی بکەویت.. ئەگینا دونیات دەچێ و قیامەتت دەڕوات.. بۆیە مرۆڤ دەبێت زۆر عاقڵ و هۆشمەند بێت..

پێشەوا محەممەدی کوری حەنەفییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئاڵایەك لە خوراسانەوە دەردەچێت، پاشان یەکێکی تر دەردەچێت، جل و بەرگیان سپیە، لە پێش ئەوانیش پیاوێکە لە بەنی تەمیم پێی دەڵێن: شوعەیبی کوڕی صالح، لەسەر دەرگای ئیستەخەر[٢]، سەرکردایەتی مەهدی ڕێك دەخەن و باشی دەکەن، لە نێوان دەرچوونی بەنی تەمیم و ڕێکخەرانی مەهدی ٧٢ مانگە.. ئەمجا شەڕێکی خوێناوی دەبێت لە نێوان سوفیانی و ئاڵاڕەشەکان[٣].

---

(١) آثار البلاد، للقزويني، لا ٣٦١ .

(٢) ئیستەخەر: شارێکە لە کۆنترین شارەکانی فارس، جێگای نیشتەجێبوونی پادشاکانی فارس بووەو گەنجینەی زۆری تێدابووە. مزگەوتێکی لێیە ناسراوە بە مزگەوتی سلێمان (سەلامی خوای لێ بێ). معجم البلدان (١/ ٢١١).

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٠٠.

## دووەم: دەرچوونی جەیشێك لە تورکستان و شیشان

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری حاریس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يخْرُجُ قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، فَيُوَطِّئُونَ لِلْمَهْدِيِّ سُلْطَانَهُ)[١].

واتە: کۆمەڵێك لەلای ڕۆهەڵاتەوە دەردەچن، سەرکردایەتی مەهدی ئاسان دەکەن.

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوانەن کە لەناوەڕاستی قارەی ئاسیا دەردەچن، کە دەکاتە ئەفغانستان و پاکستان و داغستان و تروکستان و تاجیکستان و شیشان..

## سێیەم: خەڵکی کوفە لە خاکی عێراق:

وە ئەوانەی دڵخۆش دەبن بە هاتنی محەممەدی مەهدی و سەری دەخەن، خەڵکی کوفەن لە خاکی عێراق، هەروەکو پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) دەڵێت: (يا أهل الكوفه أنتم أسعد الناس بالمهدى)[٢].

واتە: ئەی خەڵکی کوفە ئێوە دۆڵخۆشترینی خەڵکین بە هاتنی مەهدی.

## چوارەم: یارانی ئەشکەوت:

پێشەوا عەبدوڵڵای کوری عەباس (ﷺ) دەڵێت: (أصحاب الكهف أعوان المهدى)[٣].

---

(١) ضعيف: رواه ابن ماجة برقم: (٤٠٨٨) في (سننه)، والطبراني في (المعجم الأوسط) برقم: (٢٨٥)، والبزار في (مسنده) برقم: (٣٧٨٤)، ويعقوب بن سفيان في (المعرفة) برقم: (٤٩٧/٢). قال البوصيري في (مصباح الزجاجة) (٤/ ٢٠٥): هَذَا إِسْنَاد ضَعِيف لضعف عَمْرو بن جَابر ، وَابْن لَهِيعَة.

(٢) صحيح: رواه ابن ابي شيبة (٦/ ٤٠٨) بسند صحيح.

(٣) ضعيف: ضعف الحافظ ابن حجر إسناده في (الفتح) (٦/ ٥٠٣).

واتە: یارانی ئەشکەوت یارمەتیداران و سەرخەرانی مەهدین.

کەواتە.. بەشێکیان لە خوراسان و بەشێکیان لە عێراق و بەشێکیان لە سوریا دەبنە پاڵپشت و یاریدەدەری محەممەدی مەهدی.

بەلای بەندەوە ئەو رایە زۆر بێ هێزە کە یارانی ئەشکەوت سوپای محەممەدی مەهدی سەر بخەن، چونکە زیندووناکرێنەوە لە گۆڕەکانیان لە کاتێکدا ئەوان لە ژیانی بەرزەخی دەژین.

## پێنجەم: خەڵکی شام و دیمەشق و بەیتولمەقدیس:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ .. حَتَّى يُقَاتِلَ آخِرُهُمُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ)[1].

واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من شەڕ دەکەن لەسەر حەق.. هەتا لە کۆتاییەکەی شەڕ لەگەڵ مەسیحی دەجال دا دەکەن.

لە ریوایەتێکی تر فەرمویەتی: (لا تزالُ عِصابةٌ من أمتي يقاتِلونَ على أبوابِ دِمَشْقٍ وما حَوْلَهَا، وعلى أبوابِ بيتِ المَقْدِسِ وما حولها.. ظاهرينَ على الحقِّ إلى أن تقومَ الساعةُ) [2].

واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من کە شەڕدەکەن لەسەر دەرگاکانی دیمەشق و ئەوەی دەوروبەری، وە لەسەر دەرگاکانی بەیت و المەقدیس و دەوروبەری.. هەر لەسەر حەق و ڕاستی دەمێننەوە هەتا ڕۆژی دوایی.

پێشەوا موعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) دەڵێت: ئا ئەوانە لە شامن[3].

---

(١) صحيح: المستدرك (٢/ ٨١) برقم: (٢٣٩٢) قال إمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

(٢) ضعيف: رواه الطبراني في (المعجم الأوسط) (١٩/ ٩٨). قال الألباني في السلسلة الضعيفة: ضعيف.

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ٩٧).

بەرگی سێیەم

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (لا تزالُ طائفةٌ مِن أمَّتي يقاتلونَ على أبوابِ بيتِ المقدِسِ، وما حولَها وعلَى أبوابِ أنطاكيَّةَ وما حولَها، وعلى أبوابِ دمشقَ وماحولَها، وعلَى أبوابِ الطَّالقانِ وما حولَها.. حتَّى يخرجَ لهم اللَّهُ كَنزَه منَ الطَّالقانِ، فيُحيي بهِ دينَه كما أُميتَ من قبلُ)[1].

**واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من شەڕ دەکەن لەسەر دەرگاکانی بەیت و المەقدیس و دەوروبەری و، وە لەسەر دەرگاکانی ئەنتاکیەو دەوروبەری و، وە لەسەر دەرگاکانی دیمەشق و دەوروبەرەکەی و، وە لەسەر دەرگاکانی تاڵیقان و[2] دەوروبەری، هەتا خوای گەورە لە تاڵیقان کەنزێکیان بۆ دەردەخات، دینەکەی خۆی سەردەخات هەروەکو چۆن لە پێشتردا مردبوو.. واتە: زیندووی دەکاتەوە.**

**پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) ڕاڤەی ئەو فەرموودەیە دەکات و دەڵێت: خوای گەورە کۆمەڵێك کەنزو خەزێنەی هەیە، مەبەست پێی زێڕو زیو نییە، بەڵکو کۆمەڵە پیاوێکن کە تەواو خوای گەورەیان ناسیوە، ئەوانیش سەرخەرانی محەممەدی مەهدین لە کۆتایی بونەوەردا [3].**

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (اذا وقعت الملاحم بعث الله من دمشق بعثا من الموالي أكرم العرب فرسا..)[4].

**واتە: ئەگەر جەنگە گەورەکە ڕوویدا خوای پەروەردگار لە دیمەشقەوە پیاوێك لە (مەوالی) دەنێرێت کە باشترین و بەرێزترین سوارچاکی عەرەبە.**

---

(١) ضعيف: السلسلة الضعيفة، برقم: (٦٣٨٩).

(٢) تاڵیقان: دوو شارن، یەکێکیان لە خوراسانە لە نێوان مرو وبەلخ، دووەمیان: گەورەترین شارە لە تەخارستان، کە ڕووباری زۆری لێیە. معجم البلدان (٦/٤).

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، (لا ٩٨).

(٤) أخرجه أبو عبدالله الحاكم، في (مستدركه)، وقال: حديث صحيح على شرط البخاري ومسلم، ولم يخرجاه.

بەرگی سێیەم

هەر چەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: لە شام دەردەچێت، بەڵگەیان فەرموودەی پێشەوا ئەبو ئومامەیە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: (فَبَيْنَمَا إِمَامُهُمْ قَدْ تَقَدَّمَ يُصَلِّي بِهِمُ الصُّبْحَ، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِمْ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ) [1].

واتە: پێشەواکەیان کابرایەکی پیاو چاکە، کاتێك کە پێش دەکەوێت بۆ ئەوەی پێش نوێژیان بۆ بکات بۆ نوێژی بەیانی، لەو بەرەبەیانیەدا عیسای کوری مەریەم لەناویاندا دادەبەزێت.

کەواتە هیچ فەرموودەیەکی ڕاشکاوانەمان نیە کە بفەرموێت: مەهدی لە جێگایەکی دیاریکراوەوە دەردەچێت.

ئێستا خوێنەر لە نێوان سێ ڕەئی دایە، چۆن بتوانین جەمع و تەوفیق لە نێوان فەرموودەکان بکەین، لەگەڵم دابن:

محەممەدی مەهدی یەکەمجار لە هەردوو حەرەمی مەککە بە دیار دەکەوێت دواتر دەچێتە بەیت و المقدس، لە پاشان دەجال دێت، لەوێ گەمارۆی دەدات، ئەمجا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەلای منارەی ڕۆژهەڵاتی دیمەشقی شام دادەبەزێت و دەچێت بۆ کوشتنی دەجال.. ئەمجا پێغەمبەر عیسا و محەممەدی مەهدی بە یەك دەگەن کە لەو کاتەدا قامەت بۆ نوێژ دەکرێت[2].

بەرگی سێیەم

---

(١) ضعيف: سنن ابن ماجة (٥/ ١٩٧) باب: فتنة الدجال وخروج الدجال، برقم: (٤٠٧٦). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٢) شرح الفقه الأكبر، لا ١١٢ .

## گەنجە تەمیمیەکە کێیە ؟

پێشەوا محەممەدی کوری حەنەفییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئالآیەك لە خوراسانەوە دەردەچێت، پاشان یەکێکی تر دەردەچێت، جل و بەرگیان سپیە، لە پێش ئەوانیش پیاوێکە لە بەنی تەمیم پێی دەڵێن: شوعەیبی کوڕی صالح، لەسەر دەرگای ئیستەخەر، سەرکردایەتی مەهدی ڕێك دەخەن و باشی دەکەن، لە نێوان دەرچوونی بەنی تەمیم و ڕێکخەرانی مەهدی ٧٢ مانگە[١].

دەتوانین بە کورتی کۆمەڵێك سیفاتی ئەو گەنجە تەمیمیە باس بکەین، کە لە فەرموودەکانەوە هاتووە:

**یەکەم:** گەنجێکی چوارشانەو بە توانایە.

**دووەم:** لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دێت و ئالآی محەممەدی مەهدی هەڵدەگرێ.

**سێیەم:** لە ڕووی بالآوە مامناوەندیە، نە کورتەو نە درێژە.

**چوارەم:** ناوی شوعەیبی کوری سالحە.

**پێنجەم:** جل وبەرگیان سپیە.

**شەشەم:** گەنجێکی تازە پێگەیشتووە.

**حەوتەم:** ریشی کەمەو، ڕەنگی گەنمی دەدات بەلای زەردەوە.

**هەشتەم:** ئەگەر شەڕ لەگەڵ چیاکان بکات تەفروتونای دەکات.

**نۆیەم:** کۆمەڵێك کەس کاروبارەکانی هەڵدەسوڕێنن.

---

(١) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٠٠.

دەیەم: پێشەوایەکە لە پێشەواکانی بەنی تەمیم[١].

ئەمە دە سیفات و نیشانە بوون لەم پیاوە بەنی تەمیمیە دەبێت بەدی بکریٚ..

هەر چەندە ئەرقامیەکان بانگەشەی شێخەکی خۆیان دەکەن کە ئاڵای مەهدی هەڵدەگرێت، کە ئەمەش هیچ ئەسڵ و بنچینەو بنەمایەکی نییە، چونکە:

یەکەم: ئەو گەنجەی ناوی شوعەیبە، بەڵام شێخی ئەرقەمەکان ناوی (ئەشعەری محەممەد)ە لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٧ بوو، تەمەنی زیاتر لە پەنجا ساڵ بوو.

دووەم: ئەو گەنجە لە ڕۆژهەڵاتەوە دێت، بەڵام شێخ ئەرقەم لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا سەری هەڵدا.

کەواتە بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان شێخ ئەرقەم (ئەشعەری محەممەد مالیزی) پەیوەندی بە شوعەیبی کوری ساڵحەوە نییە[٢].

---

(١) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٨٠ ـ ٨١ .

(٢) التقاء المسيحين في آخر الزمان، لا ٨١ .

# ئەو جەنگ و ڕووداوانەی کە لەسەردەمی (محەممەدی مەهدی) ڕوودەدەن

پاش ئەوەی کە محەممەدی مەهدی لە ڕۆژێکی پڕ لە ناکۆکی و فیتنەو ئاژاوەدا ناچار دەبێت لە ترسی گیانی خۆی بە نهێنی لە شاری مەدینەوە بەرەو شاری مەککە هەڵبێت، پاش ئەوەی لە شاری (مەککە) ئەو ساڵە لە کاتی حەجدا حاجیەکان دەستیان دەچێتە خوێنی یەکترو لە ئاستی (عەقەبە)دا خوێنیان وەکو جۆگەڵە هەڵدەستێت، (محەممەدی مەهدی)یش لە بێ تاقەتی خۆی و لە خەفەتی ئەو بارودۆخەی کە موسڵمانان تێی کەوتوون ڕوومەتی دەنێت بەکەعبەوەو بە کوڵ دەگری و لە خوا دەپاڕێتەوەو فرمێسك بەچاوەکانی دێتە خوارەوە، لەو کاتەدا کۆمەڵێك موسڵمانی باوەڕدارو زاناو ژیرو ووردبین ڕووی تێدەکەن و هانای بۆ دەبەن و داوای لێدەکەن کە ببێتە پێشەوایان و بەیعەتی پێ بدەن، بە هیوای ئەوەی لەسەر دەستیدا موسڵمانان لەوبارە ناهەموارەی کە تێی کەوتوون ڕزگاریان ببێت، جا لێرەدا بۆمان بەدەردەکەوێت کە ئەو خەڵکە بەجۆرێك لە جۆرەکان مەهدیان ناسیوەو بەشیاویان زانیوە کە ئەو ئەرکەی بخەنە ئەستۆ، چونکە (محەممەدی مەهدی) کەسێکی نەناسراو و نادیار نەبووە لەناو خەڵکەکەدا، بەڵکو دەستی لە ڕووداو و گۆڕانکاریە سیاسیەکاندا هەبووە، ئەگەر نا بۆچی بە نهێنی لە شاری مەدینەوە هەڵدێت بۆ شاری مەککە، وە ئەگەر پێشتر لەلای خەڵکی ناسراو و جێی متمانە نەبێت چۆن لەو کاتە تەنگانەدا لە دەوری کۆدەبنەوەو بەیعەتی دەدەنێ، چونکە خەڵکی لەو ڕاستیە ئاگادار نیە کە ئەوە پێشەوا مەهدی بێت بە بەڵگەی ئەوەی کە پێشەوا عەلی (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتِ، يُصْلِحُهُ اللَّهُ فِي لَيْلَةٍ)[1].

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢/ ٧٤) برقم: (٦٤٥) وقال الشيخ أحمد شاكر في تخريجه للمسند برقم: (٦٤٥) إسناده صحيح، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٦٧٣٥).

واتە: مەهدی لە ئال و بەیتی ئێمەیە، خوای گەورە لە شەوێکدا دەیسازێنێ بۆ ئەو کارە.

پرسیارێك/ ئایا هەر کەسێك هەواڵی هاتنی محەممەدی مەهدی پێ بگات، واجبە بەیعەتی بداتێ؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێم: بە سیفەتی محەممەدی مەهدی نەخێر، چونکە هیچ فەرموودەیەك نییە بفەرموێت واجبە، بەڵام بە سیفەتی گەورەی موسڵمانان واجبە[1].

باشە.. ئەگەر بەیعەت دان بە سیفەتی مەهدی واجب نەبێت، ئەی چۆن محەممەدی مەهدی سەردەخرێت؟

وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە، کە بەیعەت دان بە محەممەدی مەهدی قەدەغە نییە، بەڵام خوای پەروەردگار کۆمەڵە کەسانێکی لە دەوروبەری کۆدەکاتەوە هەر ئەوانن سەری دەخەن[2].

پاش ئەوەی کە بەنابەدڵی خۆی بەیعەتی دەدەنێ و خەڵکانێك لە دەوری کۆدەبنەوە، هەڵدەستێت بە ئەنجام دانی ڕاپەڕینێك لە شاری (مەککە) و دەست بەسەر شارەکەدا دەگرێت، دیارە دەست بەسەردا گرتنی شاری (مەککە)ش لەلایەن کۆمەڵێکی ئیسلامیەوە دەنگ دانەوەی خۆی دەبێت لە جیهانداو کارێکیشە لەلایەن کوفری جیهانیەوە بە هیچ شێوەیەك قبووڵ ناکرێت و بێ دەنگ نابن لەسەری، پاش ئەوەی کە کوفری جیهانی دڵنیا دەبن کە دەسەڵات دارانی سعودیە بەهۆی ناکۆکی سیاسی ناوخۆیان لەسەر دەستەڵات توانای سەرکوت کردن و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی ناو (مەککە) یان نیە، بۆیە ئەو پادشا ستەمکارەی کە لە ڕیوایەتەکاندا ناوی هاتووە، لەو کاتەدا بە تواناترین دەسەڵاتداری ناوچەکە دەبێت و پێشتر شەڕی کردووەو لە شەڕەکانیدا سەرکەوتوو بووە، ئینجا ڕێگەی پێ دەدرێت کە لەشکرکێشی بکات بۆ ناو خاکی (سعودیە)

---

(١) المهدي، عادل زكي، لا ٨١.

(٢) المهدي، لا ٨٢.

بۆ لەناو بردنی (محەممەدی مەهدی) و شوێن کەوتووەکانی، پاشان لەشکرەکەی سوفیانی ڕوو دەکاتە خاکی حیجازو لە پێشدا پەلاماری شاری (مەدینە) دەدات و شارەکە وێران و خاپور دەکات و خوێنێکی زۆری تێدا دەڕژێت.

پێشەوا موعازی کوری جەبەل (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (عِمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ، وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ، وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ)[1].

واتە: ئاوەدانکردنەوەی (بيت المقدس) کاول بوون و وێرانبوونی مەدینەی بەدوادا دێت، دەرچونی جەنگە گەورەکەش ئازادکردنی (قسطنطنية) ی بەدوادا دێت، ئازادکردنی (قسطنطنية)یەش دەرچونی دەجالی بەدوا دێت.

بەپێی ئەم فەرمودەیە دیارە (بيت المقدس) دەروخێنرێت دواتر ئاوەدان دەکرێتەوە، وە بەدوای سەر لە نوێ دروست کردنەوەشیدا وێرانبوونی شاری مەدینە دێتە دی، ئەمەش لە سەردەمی موحەممەدی مەهدی ڕوودەدات.

بەڵام بە بیروڕای بەندە لە دوای ڕووخانی بەیتولمەقدیس و ئاوەدانکردنەوە بۆ دووەم جار، بەیتولمەقدیس دەبێتە پایتەختی فەڵەستین و قودس.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: (تَكُونُ بِالْمَدِينَةِ وَقْعَةٌ تَغْرَقُ فِيهَا أَحْجَارُ الزَّيْتِ، مَا الْحَرَّةُ عِنْدَهَا إِلَّا كَضَرْبَةِ سَوْطٍ، فَيَنْتَحِي عَنِ الْمَدِينَةِ قَدْرَ بَرِيدَيْنِ، ثُمَّ يُبَايِعُ إِلَى الْمَهْدِيِّ)[2].

واتە: لە مەدینەدا شەڕێك ڕوودەدات لەناوچەی (بەردەکانی زەیت) لە خوێندا دادەپۆشرێت، وە ناوچەی (حر)ەش هەروەکو شوێنی لێدانی قامچی لێ دێت، پاشان شەڕەکە بەبڕی ڕێگای دووجار حەوانەوەی پۆستەچی کە پێوانەیەکی ئەو زەمانەیە لە شاری مەدینە دوور دەکەوێتەوە، پاشان بەیعەت دەدرێت بە مەهدی.

---

(١) صحيح: المستدرك على الصحيحين (٤/ ٥٨٣) برقم: (٨٣٦٦). قال الإمام الحاكم: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الرِّجَالِ.

(٢) الفتن، (١/ ٣٢٦) برقم: (٩٣٢).

بەردەکانی زەیت: شوێنێکە لە شاری مەدینە.

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە پێش هاتنی (موحەممەدی مەهدی) شاری (بیت المقدس) کاول دەکرێت و دواتر دروست دەکرێتەوەو ئاوەدان دەکرێتەوە، بۆیە وێرانکدرنی شاری (قودس)یش هەر لەسەر دەستی جوولەکە ڕوودەدات، ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر هەست بەو نیازو مەرامە گڵاوەی جوولەکە دەکرێت سەبارەت بە کاول کردنی ئەو شارەو ڕووخاندنی مزگەوتی پیرۆزی (ئەقصا) کە قیبلەی یەکەمی موسڵمانان و سێهەمی حەرەمە پیرۆزەکانە، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی لە جێگەی مزگەوتەکە (هەیکەلە) کۆنەکەی خۆیان دروست بکەنەوە کە پێیان وایە مزگەوتەکە لە شوێنی ئەودا دروست کراوە، بۆ ئەو مەبەستەش ئەمڕۆ لە چەندین لاوە تونێلیان لە ژێر زەویەوە لێداوە بەرەو خاکی ژێر مزگەوتەکەدا بەناوی گەڕان بە دوا شوێنی هەیکەلەکەدا کە ئەمەش ئەو مزگەوتە پیرۆزەی دووچاری خەتەری دارمان کردووە، بۆیە ڕاپەڕینێکی گەورە لەلایەن جەماوەری موسڵمانی ئەو شارەوە بەرپابوو دژ بە (ئەرێڵ شارۆن) کە یەکێکە لەسەرکردە توندڕەوەکانی جوولەکە بۆ ئەوەی بە پاسەوانێتی زیاتر لە (٣٠٠٠) هەزار سەربازی جولەکە پێی گڵاوی بخاتە ناو حەرەمی مزگەوتەوە، بەڵام ئەم جەماوەرە موسڵمانەو نوێژکەرانی مزگەوتەکە بە بەردو دار خۆی پاسەوانەکانیان ڕاوناو نەیانهێشت بە مەرامە گڵاوەکەی خۆی بگات، وە ڕاپەڕینیش هەر بەردەوامەو ڕۆژانە دەیان شەهیدو سەدان بریندارى لێ دەکەوێتەوە، ئەمانەش هەموو سەرەتان بۆ هاتنە دی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت: شارەکە دروست دەکرێتەوەو ئاوەدان دەکرێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێشتر ڕووخاوەو کاول کراوە بۆیە سەر لە نوێ دروست دەکرێتەوەو ئاوەدان دەکرێتەوە، دوا بەدوای ئاوەدانکردنەوەی (بیت المقدس)یش شاری مەدینەی پیرۆز کاول دەکرێت.

پاش ئەوەی کە لەشکری سوفیانی ئەو کاولکاری و کوشتن و کوشتارە ئەنجام دەدات لە شاری مەدینە، دوای ئەوە لە شاری مەدینە دەردەچێت و بەرەو شاری (مەککە) بەرێ دەکەوێت، بەڵام دیارە تۆڵەی خوای گەورە بەرێوەیەو

ئەو کەعبەیەی کە خوای گەورە لە لەشکری (ئەبرەهە)ی پاراست لە دەجالیش دەیپارێزیٚ، بەهەمان شێوە لە ستەمکارێکی وەك سوفیانی دەپارێزێت هەر بۆیە لەشکرەکە کە دەگەنە بیابانی نێوان مەککەو مەدینە بەجارێك ڕۆدەچن بە ناخی زەویداو کەسیان لیٚ دەرناچێت تەنها ئەوە نەبێت کە هەواڵی ڕۆچوونەکەیان دەگەیەنێت.

ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە لە هەمو جیهان دەبیسترێت و دەبێتە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر کە ئەو پیاوەی لە شاری (مەککە) بەیعەتی پێدراوە بەڕاستی ئەوە (موحەممەدی مەهدی)ە، بە تایبەتی پاش ئەوەی لای هەموو خەڵکی ئاشکرا دەبێت کە ناوی (محەممەد)ەو باوکیشی ناوی (عەبدوڵلا)یە، وە هەموو مەرجەکانی تریش کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردوون تێیدایە، ئیتر خەڵکی پۆل پۆل لە دەوری کۆدەبنەوەو بەیعەتی پیٚ دەدەن، ئەویش لەشکرێکی تۆکمەو بە توانایان لیٚ دروست دەکات و تەواوی خاکی حیجاز دەخاتە دەسەڵاتی خۆیەوەو بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵکو فرسەتەکە دەقۆزێتەوەو بوار نادات کات بە فیڕۆ بڕوات هەتا دوژمنەکانی لە کوفری جیهانی فریای خۆیان بکەون و ڕێگری لیٚ بکەن.

لەوانەیە کەسێك لێرەدا پرسیار بکات و بڵێت: ئەی لەو کاتەدا دەوڵەتی ئەمریکاو ئەوڕوپا لە کوێن و چۆن ڕێگە بە دروست بوونی ئەم دەوڵەتە ئیسلامیە دەدەن؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەوەیە: کەوا لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وا دەردەکەوێت کە لەوکاتەدا جیهانی کوفر سەرقاڵی جەنگێکی گەورەبن لە نێوان خۆیان، بۆیە لە سەرەتادا سەریان ناپرژێت هێزو توانایان ئاڕاستەی ئەم لێشاوە ئیسلامیە بکەن، بەڵکو زیاتر لەوەش لە فەرموودەکان وا دەردەکەوێت کە وڵاتانی خۆرئاوا بەناچاری هاوپەیمانیەك لەگەڵ ئەم هێزە ئیسلامیە دروست بکەن وەك تەکتیکێکی کاتی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بەرەیەی کە لە خۆرهەڵاتدا لەگەڵیدا دەجەنگن، جا بەر لەدەرکەوتنی دەجال باری موسڵمانان زۆر باش

دەبێ و هێزێکی مەزنیان دەبێ، وادیارە دەرکەوتنی دەجالیش بۆ لەنێوبردنی ئەو هێزەیە، لەو سەردەمیدا نێوانی موسڵمانان و ڕۆم خۆش دەبێ، هەروەکو پێکەوە شەڕی دوژمنێکی هاوبەش دەکەن و بەسەریدا سەردەکەون، ئینجا شەڕ لەنێوان موسڵمانان و خاچیەکان بەرپا دەبێ، هەروەکو (ذي مخرم) (ﷺ) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا، وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِهِمْ، فَتَسْلَمُونَ وَتَغْنَمُونَ، ثُمَّ تَنْزِلُونَ بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ، فَيَقُومُ رَجُلٌ مِنَ الرُّومِ، فَيَرْفَعُ الصَّلِيبَ، وَيَقُولُ: أَلَا غَلَبَ الصَّلِيبُ، فَيَقُومُ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَقْتُلُهُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَكُونُ الْمَلَاحِمُ، فَيَجْتَمِعُونَ إِلَيْكُمْ، فَيَأْتُونَكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةً، مَعَ كُلِّ غَايَةٍ عَشَرَةُ آلَافٍ)[١].

واتە: لەگەڵ ڕۆمدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن، ئێوەو ئەوان دەجەنگن لەگەڵ دوژمنێك کە لە پێش ئەوانەوەیە، پاشان سەردەکەون و دەستکەوتێکی باشتان دەبێت، پاشان لە مێرگێکدا دادەبەزن کە گردو پۆڵکەی زۆرە کە پێی دەڵێن: (مرج ذی تلول)، لەوێدا پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەستێت و خاچەکەی خۆیان بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: خاچەکەی ئێمە سەرکەوت، پیاوێکیش لە موسڵمانەکان هەڵدەستێت و دەیکوژێت، ئیتر ڕۆمەکان غەدر دەکەن و پەیمانی ئاشتیەکە دەشکێنن و جەنگە گەورەکان دەست پێدەکات، پاشان ڕۆمەکان کۆدەبنەوە بۆتان بەهەشتا ئاڵاوە، هەر ئاڵایەك (١٢) هەزار کەسی لەگەڵ دایە. واتە: ژمارەکەیان (٩٦٠٠٠٠) هەزار کەسە.

هەر چەندە وشەی (مرج ذی تلول) بە سێ واتا دێت و چوارەمی نییە:

**یەکەم:** ئەو جێگایەیە کە مەڕوماڵاتی لێ دەوەڕێت[٢].

**دووەم:** ئەو جێگایەیە کە سەوزایی و ئاوی زۆر لێیە، واتە: مێرگ.

**سێیەم:** هەر شتێك لەسەر زەوی کۆببێتەوە لە خۆڵ.

---

(١) مسند الإمام أحمد (٤/ ٩١) برقم: (١٦٨٧٢). قال شعيب الأروؤناط: حديث صحيح.

(٢) مختار الصحاح (لا ٦٣٠).

هەر چەندە بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر ڕای دووەم بە بەهێز دادەنێت، چونکە لە ئێستادا خاکی شام هەمووی سەوزاییە.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ئەم فەرموودەیە بۆ مان دەردەکەوێت کە لەم سەردەمەدا هەردوو ئەمریکا دۆزرایەوە، کە خاکێکە دەکەوێتە دوای شاری ڕۆم کە ئەوروپایەو، وە دوای شاری موسڵمانان کە ئاسیاو ئەفریقیایە، وە دوژمنی ئێمەو دوژمنی ئەوروپایە کە دەکەوێتە پشتمان و ئەوان لەسەر خەریتەی گۆی زەوی، وە کاتێك سەیری دەکەین دەکەوێتە پشت ویلایاتی یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆیە دوژمنایەتی ئەوروپا و ئێمەی موسڵمانان دەکات، بەڵکو دژایەتی هەموو جیهان دەکات.

وە ئەمریکا لەسەر خەریتەی گۆی زەوی دەکەوێتە نێوان هەردوو خەتی پانی کە ٦٠،٢٠ پلەیە، وە دەوڵەتە گەورەکانی ئیسلامی، هەروەها دەوڵەتانی ئەوروپا دەکەوێتە نێوان هەردوو خەتی پانی ٦٠،٢٠ پلە.

ئەگەر وردببینەوە دەبینین موسڵمانانی ئەو کات چەند بەهێزن، بەشێوەیەك غەزا دەکەن و غەنیمەت دەگرن و بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە، دەشبینی تا چ رادەیەك دەستیان بەدینەکەیانەوە گرتووە، کاتێك ئەو گاورە خاچ بەرز دەکاتەوە، گوایە ئەو سەرکەوتنەی موسڵمانان لە بەدەست هێنانی بەشداربوون بۆ خاچە، موسڵمانێکی بە غیرەت ڕاست دەبێتەوەو ئەو خاچە دەکوتێ و دەیشکێنێ، جا ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی لەو ناوچەدا دەبن دەست دەدەنە چەکەکانیان و لەگەڵ کەمی ژمارەشیان لەوێدا، ڕووبەڕووی ڕۆمەکان دەبنەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) یش شایەتیان بۆ دەدا کە شەهیدن و خودا ئەو ڕێزەی لێناون، جا ئەو غەدرەی ڕۆمەکان و ڕووداوەکانی دوای ئەوە دەبنە هۆی ڕوودانی داستانەکە.

ئەم پەیمانی ئاشتیەی نێوان دەوڵەتانی خۆرئاواو لەشکری ئیسلامیش لە کاتێکدا دێت کە (محەممەدی مەهدی) چەند شەڕێکی سەرکەوتووی تێدا ئەنجام دەدات و دەسەڵاتی بەسەر تەواوی ناوچەکە دەچەسپێنێت.. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە ڕۆژێك دێت موسڵمانان هەردوو زلهێزی ئیمپراتۆری ڕۆم و فارس تێك دەشکێنن و ئازادی دەکەن.

لەو ساتە کە خاچ بەرز دەکرێتەوە ڕۆمەکان دەیانەوێت بیشارنەوە[١]، لە کاتێکدا موسڵمانان یارمەتی داون لە هاوپەیمانیەکە.

وە ژمارەی ئەوانەی کە ڕۆمەکان کۆیاندەکەنەوە دەگاتە نزیك ملیۆنێك، هەروەکو چۆن لە فەرموودەکانی پێشوو ئاماژەمان پێی کردووە.. وە کۆکراوەی هەموو فەرموودەکان دەگاتە ٩٦٠٠٠٠ هەزار کەس، وە کۆکردنەوەی ئەو ژمارەیەش نزیکەی نۆ مانگی تەواوی دەوێت، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: (فيجتمعون لكم قدر حمل امرأة ثم يغدرون بكم)[٢].

واتە: بۆتان کۆدەبنەوە بە ئەندازەی حەملی ئافرەتێك، پاشان غەدرتان لێ دەکەن.

ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە ڕۆمەکان غەدرەکەیان ئاشکرا ناکەن هەتا تەواو خۆیان کۆدەکەنەوەو ئامادەدەبن بۆ جەنگ لەگەڵ موسڵمانان، ئەوەش دڵنیایی ئەوە دەدات کە ئەو غەدرەی دەکرێت هۆکارە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە.

بەڵام بە نیسبەت جەیشی موسڵمانان هیچ ڕیوایەتێك باسی ناکات کە ژمارەکەیان چەندە، بەڵام ئەوە باس دەکات لە هەموو وڵاتان بەشدار دەبن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جەیشی محەممەدی مەهدی.

پێشەوا نافیعی کوڕی عوتبە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ)[٣].

---

(١) ئەو کاتەی هێزی ئەمریکا هاتە ناو بەغدا هەستان بە لەناوبردنی بتی صەدام حوسەین یەکێك لە جوندیەکان بە شێوەیەکی ئیستیفزازی ئاڵای ئەمریکی بەرزکردەوە بەسەر بتەکەو تێی ئاڵاند، پێش ئەوەی بشکێنرێ، ئەم مەشهەدەش لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنم بینی ئەوەم بیر هاتەوە کە ئەم جوندیە ڕوحی دەمارگیری هەیە، وە ڕاستەوخۆ ئەو فەرموودەم بیر کەوتەوە کە پێش هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە صەلیب بەرز دەکرێتەوە. المهدی، عادل زەکی (لا ١٣٩).

(٢) رواه الحاكم في (المستدرك) برقم: (٦٣٢٤).

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

واتە: غەزای دوورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات ، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات.

ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە بە ئازادکردنی ئەو سێ شوێنە، وە خاڵێکی گرنگ هەیە بۆ نیوە دوورگەی عەرەب و فارس کە دەفەرمووێ: خودا بۆتانی ئازاد دەکات (فیفتحها الله لکم)، چونکە ئەم دوانە لەسەر دەستی هاوەڵان دابووەو (خیطاب)ەکەش بۆ ئەوان بووە، بەڵام بۆ ئازادکردنی ڕۆم کە شاری (قسطنطنیة)یە دەفەرمووی: (فیفتحها الله) خوا ئازادی دەکات و وشەی (لکم) بەکار ناهێنێ، چونکە لە سەردەمی هاوەڵاندا نەبووە، هەرچەندە لە سەردەمی موعاویەش هەوڵ درا، بەڵام ئازادکردنی ئەو شارە گەیشتە سەردەمی (محەممەد فاتح) کە لە مەوپێش باسمان لێوە کرد.

کەواتە مەهدی پێش ئەوەی شەڕ لەگەڵ ڕۆم و دەوڵەتانی خۆرئاوادا بکات شەڕ لەگەڵ تەواوی دورگەی عەرەب و وڵاتی فارسدا دەکات لەو شەڕانەشدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت و دەسەڵاتی خۆی لە تەواوی ناوچەکەدا دەچەسپێنێت، بەڵام پاش ئەوەی شەڕی ڕۆمەکان و دوژمنەکانیان کۆتایی پێ دێت و سەردەکەون کە لەو شەڕەدا موسڵمانەکان و ڕۆمەکان هاوکاری یەکتر دەبن دژی ئەو دوژمنە، ئیتر ڕۆمەکان و دەوڵەتانی خۆرئاوا دەست بەتاڵ دەبن بۆ شەڕی دەوڵەتەکەی مەهدی، هەر بۆیە لە ماوەیەکی کەم سەر لە نوێ خۆیان کۆدەکەنەوەو لە فرسەتێك دەگەڕێن کە بیکەن بە بیانوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ئاشتیەکەو هێرش کردنە سەر لەشکری ئیسلامی لەناوچەکەدا، تا لە کۆتاییدا ڕووداوی کوشتنی ئەو پیاوە خاچ پەرستەی کە خاچەکەی بەرز دەکاتەوە لەلایەن کەسێکی موسڵمانەوە دەکەن بە بیانوو و ئاگر بەست لەگەڵ موسڵمانان دەشکێنن و دەست دەکەن بە لەشکرکێشی و لە ئاکامدا ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە ڕوودەدات کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا جەنگی وا ڕووی نەداوەو پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرمودەکان بە (الملحمه الکبری) ناوی دەبات واتە: جەنگە گەورەکە[1].

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، هاوڕێ موحەمەد ئەمین، لا ١٢٧.

# جەنگی (الملحمة الكبرى)

پێشەوا کەعبی ئەحبار (ﷺ) دەڵێت: ئەو کاتەی مەهدی بەرەو رەملەی خاکی ڕۆم دەردەچێت، ژمارەی جەیشەکەی خۆی لە سەد هەزار کەس دەدات، داوا لە پادشای ڕۆم دەکات کە بەرەو باوەڕو یەکتاپەرستی بڕوا بهێنێت، ئەویش سەرکەشی دەکات و هەشت سەد کەشتی ئامادە دەکات، دوو مانگ جەنگ لە نێوانیان ڕوودەدات، هەتا خوای پەروەردگار محەممەدی مەهدی سەردەخات، ئەمجا دەچێتە نێو خاکی قوستەنتنیە، ئەمجا مەهدی لەلای دەرگای شوڕەکانەوە دەچێتە ژوورەوەو حەوت تەکبیرە لێدەدات..

خەڵکێکی زۆری شار موسڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن، نزیکەی ساڵێك دەمێننەوە و مزگەوت دروست دەکەن، لە پاشان بەرێ دەکەون هەتا دەگەنە شارێك پێی دەڵێن (مرد قاريه) لەوێ دەسکەوتەکانی زێڕو زیو دابەش دەکەن، دواتر گوێیان لە دەنگێك دەبێت کە دەجال لە دواتانەوەیە، کە دەگەڕێنەوە ئەبینن هیچ ڕووی نەداوە، دواتر کۆمەڵێك کەشتی دروست دەکەن لە دارەکانی چیای لوبنان، حەبلەکانیشی لە دارخورمای بەیسانە، دوای دروستکردنیان سواری کەشتیەکانیان دەبن لە شارێك پێی دەوترێ عەککا، هەر کەشتیەك هەزار سەرنشینی تێدایە، لەو سات موسڵمانان دەبنە چوار بەش، بەشێکیان لە ڕۆژهەڵات، بەشێکیان لە ڕۆژئاوا، بەشێکیان لە شام و، بەشەکەی تریان لە حیجاز، وەکو ئەوەی لە یەك پیاو بن، خوای پەروەردگار ڕق و کینە لە نێو دڵەکانیان هەڵدەگرێت، ئەمجا لە عەککا بەرەو ڕۆمیە دەڕۆن، هەتا دەگەنە معەسکەرێ، ڕاهیبێك لە ڕۆمیە بۆیان دەردەچێت، کە یەکێکە لە زانایان، دەڵێت: کوا پێشەواکەتان، موسڵمانانیش دەڵێن: ئەوەتا، ئەویش دەچێتە لای و لەگەڵی دادەنیشێ، پرسیاری سیفەتی خوای گەورەو فریشتەکان و بەهەشت و دۆزەخ و سیفەتی ئادەم و سیفەتی پێغەمبەرانی ئاراستە دەکات هەتا دەگاتە

پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێ)، کە وەڵامەکە دەبیستێ دەڵێت: شایەتی دەدەم ئەو ئایینەی ئێوە ئایینی خودایە و ئایینی پێغەمبەرانە[١].

ڕاهیب دەڵێت: ئەی مەهدی! ئایا ئەهلی بەهەشت دەخۆن و دەخۆنەوە؟

ئەویش دەڵێت: بەڵێ..

ڕاهیبیش دەچێتە سوجدەو دەڵێت: ئەوە ئەو دینەیە کە خوای پەروەردگار بۆ موسای دابەزاندووەوە سیفەتی پێغەمبەرەکەتان لە ئینجیلی بەرقەلیط (واتە: جیاوازی نێوان هەق و باتیڵ، یان سوپاس کار دێت) ناوی خاوەنی وشترە سورەکە هەیە.. ئێوە خاوەنی ئەو شارەن.. ڕێگام پێ بدەن بۆ ئەوەی بانگەوازی خەڵکی بکەم بۆ ئایینی خوای گەورە.

ئەمجا دەچێتە ناوەندی شارو هاوار دەکات و دەڵێت: ئەی خەڵکی ڕۆمیە، منداڵی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم هاتوون ۆ ئەم خاکە، ئێوە لە تەوڕات و ئینجیل بینیوتانە، پێغەمبەرەکەیان خاوەنی وشترە سورەکەیە، وەڵامیان بدەنەوەو گوێڕایەڵیان بن.. خەڵکەکەش سەرکێشی دەکەن و پەلاماری دەدەن و دەیکوژن، خوای گەورەش ئاگرێکیان لە ئاسمانەوە بۆ دەنێرێت، هەتا دەگاتە ناوەندی شار، ئەمجا مەهدی دەڵێت: ئەی خەڵکینە ڕاهیبەکە شەهید کرا[٢].

پاش ئەوەی کە (محەممەدی مەهدی) دڵنیا دەبێت کە ڕۆمەکان نیازی غەدریان هەیەو سەرجەمی دەوڵەتەکانی خۆرئاوا کۆبونەتەوەو جگە لە شەڕکردن هیچ ڕێگە چارەیەکی تر نەماوە، ئەویش سەرجەم لەشکری ئیسلامی کۆدەکاتەوەو لە شاری مەدینەوە بەرەو سوریا بەرێ دەکەوێت، وە لەوێ لەشاری (الغوطة)ی نزیك (دیمەشق)ی پایتەخت دەگاتە خێوەتگای سوپاکەی.

پێشەوا ئەبو دەرداء (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ، إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا: دِمَشْقُ، مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ)[٣].

---

(١) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٣٥.

(٢) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٣٦.

(٣) صحيح:مسند الإمام أحمد (٣٦/ ٥٦) برقم: (٢١٧٢٥). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

بەرگی سێیەم

واتە: بنکەو خێوەتگای موسڵمانان لە ڕۆژی جەنگە گەورەکەدا لە (غوطة) دەبێت لە تەنیشت شارێکەوە کە پێی دەگوترێ (دیمەشق) کە یەکێکە لە چاکترین شارەکانی وڵاتی شام.

پێشەوا ئیبنو مونیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: داستانی ڕۆمەکان، تاکو ئێستا بەم جۆرە کۆنەبوینەوە، وە هیچ هەواڵمان پێ نەگەیشتووە کە بەشداری جەنگیان کردبێ بەم ژمارە زۆرە، کە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم جەنگە تا ئێستا ڕوونەداوە، لەمەشدا هەواڵێکی موژدەدەرو ترسێنەر هەیە ئەوەش لەبەر ئەوەی کەوا ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کۆتایی بۆ موسڵمانانە، لەگەڵ زۆری سوپاکەشیان، وە مزگێنی ئەوەی تیایە کەوا ژمارەی سوپای موسڵمانان لە ڕۆژی دواییدا زۆر لە ئێستا زیاتر بێت[1].

وڵاتانی خۆرئاواش لە بەرامبەردا لەشکرێکی بێ شومار کۆدەکەنەوە کە پێکهاتووە لە هەشتا ئاڵاو هەر ئاڵایەکیش دوانزە هەزار سەربازی لەگەڵ دایە، (ذي مخرم) (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا، وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِهِمْ، فَتَسْلَمُونَ وَتَغْنَمُونَ، ثُمَّ تَنْزِلُونَ بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ، فَيَقُومُ رَجُلٌ مِنَ الرُّومِ، فَيَرْفَعُ الصَّلِيبَ، وَيَقُولُ: أَلَا غَلَبَ الصَّلِيبُ، فَيَقُومُ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَقْتُلُهُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَكُونُ الْمَلَاحِمُ، فَيَجْتَمِعُونَ إِلَيْكُمْ، فَيَأْتُونَكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةً، مَعَ كُلِّ غَايَةٍ عَشْرَةُ آلَافٍ)[2].

واتە: لەگەڵ ڕۆمدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن، ئێوەو ئەوان دەجەنگن لەگەڵ دوژمنێك کە لە پێش ئەوانەوەیە، پاشان سەردەکەون و دەستکەوتێکی باشتان دەبێت، پاشان لە مێرگێکدا دادەبەزن کە گردو پۆڵکەی زۆرە، لەوێدا پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەستێت و خاچەکەی خۆیان بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: خاچەکەی ئێمە سەرکەوت، پیاوێکیش لە موسڵمانەکان هەڵدەستێت و دەیکوژێت، ئیتر ڕۆمەکان غەدر دەکەن و پەیمانی ئاشتیەکە دەشکێنن و جەنگە گەورەکان

---

(١) فتح الباري (٦/ ٢٧٨).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٩١) برقم: (١٦٨٧٢). قال شعيب الأرووناط: حديث صحيح.

دەست پێدەکات، پاشان ڕۆمەکان کۆدەبنەوە بۆتان بەهەشتا ئالاوە، هەر ئالایەك (١٢) هەزار کەسی لەگەڵ دایە.. ئەم لەشکرە گەورەیەش لەناوچەی (ئەعماق) و (دابق) دادەبەزن کە دوو شوێنن لە سوریا لە نزیك شاری (حەلەب)، پاش ئەوەی کە هەردوو سوپا بەرامبەر یەکتر دەوەستن گفتوگۆیەك ڕوودەدات لە نێوان هەردوو لادا، ڕۆمەکان داوا لە موسڵمانەکان دەکەن ئەو کەسانەیان تەسلیم بکەن کە دەست درێژیان کردۆتە سەریان و موسڵمانەکانیش ڕازی نابن و گفتوگۆکە شکست دەهێنێت و لە کۆتاییدا شەڕ دەست پێ دەکات.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: ئەوە بۆچی وشەی (من وراءهم) بە واتای پێش ئەوانەوە لێکداوەتەوە، ئەی لە زمانی عەرەبی (من وراءهم) بە واتای پشت ئەوانەوە نییە ؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم: وشەی (من وراءهم) مەبەست پێی پێش ئەوانە، ئەوە یەکێکە لەو وشانەی کە دژیان هەیە. وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: [وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾][١]. واتە: چونکە لە پێشیانەوە پاشایەك هەبوو هەموو کەشتیەکی (چاکی) داگیر دەکرد.. لێرەدا وشەی [وَرَآءَهُم] بە واتای پێشیانەوە هاتووە، خاوەنی پەرتووکی (المختار) دەڵێت: (وراء) بە واتای (خلف) دێت، بەڵام هەندێ جار بە واتای (قدام) دێت، کە یەکێکە لە دژەکان[٢].

دوای توێژینەوەیەکی زۆرم نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك کە ئەو دوژمنە سەرسەختە کێیە، وە ناشتوانین بەڵگەی یەکلایی بهێنینەوە بڵێین فلانە وڵاتە، یان لە فلانە ساڵ ئەو ڕووداوە ڕوودەدات، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەو ڕووداوە لەو سەردەمە ڕوویدات ئەوە وڵاتانی صین و ڕوسیاو کۆریای باکورە، بەڵام ناشکرێ بە دڵنیایی بڵێین ئەو ڕووداوە لەم سەردەمە دەبێت، هەر چەندە سەید بەرزنجی لە نوعەیمی کوری حەماددەوە نەقل دەکات و دەڵێت: ئەو دوژمنە هاوبەشە فارسەکانن[٣]، بەڵام زانایان وتەی نوعەیم وەرناگرن.

---

(١) سورة الكهف، الآية: (٧٩).

(٢) مختار الصحاح، لا ٨٨ .

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ١٠٠ .

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالْأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقٍ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ، مِنْ خِيَارِ أَهْلِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإِذَا تَصَافُّوا، قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ، فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ: لَا، وَاللهِ لَا نُخَلِّي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا، فَيُقَاتِلُونَهُمْ، فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لَا يَتُوبُ اللهُ عَلَيْهِمْ أَبَدًا، وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ، أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ، وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ، لَا يُفْتَنُونَ أَبَدًا..)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا ڕۆم لە (ئەعماق) یان (دابق)[٢] دانەبەزن، پاشان لەشکرێکیان بۆ دەردەچێت لە شاری مەدینەوە، لە باشترین و چاکترین خەڵکی زەوین لەو ڕۆژەدا، کاتێك کە هەردوولا بەرامبەر یەك ڕیز دەبن، ڕۆمەکان دەڵێن: دەست مەهێننە ڕێمان با ئەو کەسانەی کە دەست درێژیان کردۆتە سەرمان و ئێوە داڵدەتان داون بیانکوژین، موسڵمانەکانیش دەڵێن: نەبەخوا هەرگیز ناهێڵین دەست درێژی بکەنە سەر ئەو برایانەی ئێمە (ئەمەش بەڵگەیە لەو سەردەم کە ڕێژەی موسڵمانان زۆر زۆرە لە چاو ڕۆمەکان)، پاشان شەڕیان لەگەڵ دەکەن، سێیەکی لەشکری موسڵمانەکان لەو ڕۆژەدا هەڵدێن، هەتا هەتایە خوا لێیان خۆش نابێت و سێیەکەی تریشیان دەکوژرێن، ئەوانەش باشترین شەهیدن لەلای خوای گەورە، وەسێیەکیشیان خوای گەورە سەریان دەخات هەرگیز جارێکی تر تووشی فیتنە نابنەوە..

کەواتە وڵاتانی خۆرئاوا وەکو سیاسەت و ڕەفتاری ئێستاشیان کە زۆربەی زۆرمان دەیبینین لەو ڕۆژەشدا ئەو جەنگە گەورەیە بە بیانووی تەسلیم کردنی چەند کەسێکەوە هەڵدەگیرسێنن کە لەلای ئەوان بە تیرۆرست ناسراون، بەڵام

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية (٢٢٢١/٤) رقم الحديث (٢٨٩٧).

(٢) گوندی (دابق) لە گوندە مێژووییەکانە سەر بەشارۆچکەی (اخترين)ی سەر بە شاری (حلب)ە لە باکووری سوریا، نزیکەی دە کیلۆمەتر لە سنووری تورکیاوە دوورەو ناوبانگی هەیە بە کشتوکاڵ بە تایبەت گەنمء نیسکء پەتاتە، ڕووباری (قويق)ی پیا تێپەڕ دەبێت کە لە زستان و بەهاردا ڕێ دەکات، هەمیشە یەکێك بووە لە سنوورە گرنگەکانی موسڵمانان لە هەموو چەرخە ئیسلامیەکانداو داستانی گەورەش هەر لەوێ ڕوودەدات.

بەرگی سێیەم

ئەو ڕۆژە ئەمڕۆ نیە کە هەر موسڵمانێك ئەمریکا بە دڵی نەبێت وڵاتەکەی خۆی دەیدات بەدەستەوەو تەسلیمیان دەکات، بەڵکو ئەو ڕۆژە لەشکری ئیسلامی بەسەرکردایەتی موحەممەدی مەهدی بەرگری لە تاکتیکی موسڵمانان دەکات ئەگەر لەو پێناوەشدا جەنگێکی جیهانی هەڵبگیرسێنێت.

ئەم بەڵگانە هەموو ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم شەڕە بەرەو نزیکبوونەوەیە، چونکە ئەمریکای ئەمڕۆ نمونەی ڕۆم دەگێڕێت لەم سەردەمە، وە هێزەکانی کۆکردۆتەوە لە وڵاتی شام، وە چواردەورەی هەمووی گرتووە بە چەکی پێشکەوتوو، بەڵام موژدەتان لێ بێ ئەی خەڵکی شام دوژمنان توانایا بەسەرتانەوە نیە، ئەمەش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە پێشەوا زەیدی کوری سابیتی ئەنصاری(ﷺ) دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (يا طوبى للشام! يا طوبى للشام ! يا طوبى للشام!قالوا: يا رسول الله وبم ذلك ؟ قال: تلك ملائكة الله باسطوا أجنحتها على الشام)[1].

واتە: خۆشبەختی بۆ شام! خۆشبەختی بۆ شام! خۆشبەختی بۆ شام! گوتیان: لەبەر چ شتێك ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: فریشتەکانی خوای گەورە باڵەکانیان داخستووە لەسەر شام.

پێشەوا عیززی کوری عبدالسلام (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیشارەت بەوە دەدات کە خوای گەورە فریشتەکان ڕەوانە دەکات بۆ ئەوەی پارێزگاری لەم خاکە بکەن[2].

ئینجا ئەوروپاو ڕۆژئاواییەکان خۆیان کۆدەکەنەوەو خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شەڕی دژ بە موسڵمانان لەناوچەی (ئەعماق) و (دابق) لە نزیك شاری حەلەب ئەمەش لە نزیك سنووری وڵاتی تورکیا سوپاکەیان دادەبەزێت، وە هەشتا وڵاتی ڕۆژئاوا بوونەتە هاوپەیمان، هەر وڵاتێك دوانزە هەزار سەربازی هێناوە بە هەموو جۆرە چەکێکی پێشکەوتوو.. لەم لاشەوە سوپای محەممەدی مەهدی دوای

---

(١) رواه الترمذي في سننه (٣٣١/٢) وصححه الألباني في تخريج أحاديث فضائل الشام للربعي.

(٢) ترغيب أهل الإسلام في سكنى الشام، للعز بن عبد السلام ، لا ٣٤.

سەرکەوتنیان لە ناوچەکانی (سوریا و عێراق و سعودیەو ئەردەن و لوبنان و فەڵەستین و زۆربەی خاکی ئێران و..هتد)، هەموو جۆرە چەکێکی سەربازی و هەموو پێداویستیەکانی جەنگیان بە دەست هێناوە ئینجا شەڕ لەگەڵ وڵاتانی ئەوڕوپا ڕوودەدات..

سوپای محەممەدی مەهدی لە شاری (دیمەشق)ی وڵاتی (سوریا) بەڕێدەکەون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی وڵاتانی ئەوڕوپا، ئیدی شەڕێکی زۆر سەخت دەست پێدەکات و کوژراوێکی ئێجگار زۆر لە هەردوولا دەبێت، دواتر موسڵمانان سەردەکەون..

دوای سەرکەوتنی موسڵمانان، پاشماوە شکستخواردووەکەی ئەوڕوپا پاشەکشە دەکەن بۆ وڵاتی (تورکیا) هەتا دەگەنە (ئەستەنبۆڵ)، ورەیان بە جۆرێك ڕووخاوە کە توانای هیچ ڕووبەرووبونەوەیەکیان نامێنێ و موسڵمانانیش دوایان دەکەون تا دەگەنە خاکی ئەستەمبۆڵ.. دواتر موسڵمانان ئەو شارو وڵاتەش ڕزگار دەکەن..

ئەو دوو جەنگە گەورەیەی کە لەو ماوەیە ڕوویدا بووە هۆی مردنی مەلاین مرۆڤ و تێکچوون و کاولبوونی سەدان شارو وڵات و برسیەتی و نەخۆشی، ئەمەش بە جۆرێك ڕووی لە مرۆڤایەتی کرد کە باس ناکرێ !

ئاسمانی بونەوەر بوو بە یەك پارچە دوکەڵ و تەپ و تۆزی جەنگ، ئەو چەکە کیمیاوی و نایترۆجینی و ئەتۆمیانەی کە لەو جەنگەدا بەکارهاتوون بوو بە هۆی لەناوچوونی هەزاران ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە، هەرچی نەخۆشی هەیە بڵاوبۆتەوە، ئەو مرۆڤانەی کە ماون بوونەتە قوربانی ئەم نەخۆشیانە، ئەمە بێجگە لەو هەموو کەمئەندامانەی کە لە جەنگەکان بە جێماون و کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە، ئەمەش بە هۆی ئەو چەکانەی لەو جەنگانە بەکارهاتوون.

بەهۆی ئەو جەنگانەی کە لەم جەنگانەوە بە کارهاتوون، تەبەقەیەکی دووکەڵی زۆر ئەستوورو ترسناك دەوری زەوی گرتووە کە ناهێڵێت تیشکی خۆر بگات بە زەوی بۆ ماوەیساڵێك، واتە: یەك ساڵ ئەو خەڵکە سەر لێشێواوەی کە ماونەتەوە

دوای ئەو جەنگانە تیشکی خۆر نابینن و هەردەم وەك شەو وایەو کاتەکانیان لیێ تێك دەچیێ، وە نازانن شەوە یان ڕۆژە نیوەڕۆیە یان بەیانیە یان عەسرە.

لەو ساتە پڕ ناخۆش و زەحمەتەدا گەورەترین فیتنە سەر هەڵدەدات ئەویش دەرچوونی دەجالە.

دەجال لە کاتێك دێت کە برسیەتی و نەخۆشی بوونی هەیە، وە هەرچی خواردن و خواردن و خۆشی و شادی هەیە لایەتی، بۆیەش خەڵکی بە سانایی شوێنی دەکەون... هەیە لە برسانەو هەیە لە ترسانەو هەشە باوەڕی تەواوی پێیەتی.. خەڵکی ئاواتەخوازن کەسێك هەبێت تا لەو برسیەتیە ڕزگاریان بکات، بەڵام ئەمە تەنها لای دەجال دەست دەکەویێ.

جەنگی دابق خەریکە بەرەو نزیکبوونەوە دەچێت و دەریاری ناوەڕاستیش جەمەی دێت لەگەڵ کەشتی گەورەو فرۆکە.. هەموو وڵاتانی زلهێزی دونیاو دەیانەوێت نزیك ببنەوە.

(دابق) ئەو جەنگەیە کە هەموو باوەڕدارێکی ڕاستگۆ چاوەڕوانیەتی، چونکە کۆتا جەنگە لە نێوان موسڵمانان و کوفر.

بۆچی ناونراوە بە (دابق) ؟

چونکە لە ناوچەی (دابق)ی شام لە نزیك تورکیا ئەو جەنگە ڕوودەدات، کە تیایدا موسڵمانەکان سەرکەوتن بە دەست دەهێنن و خاکی ئەستەنبۆڵیش بەبیێ جەنگ ئازاد دەکرێت و هەتا دەگەنە نێو جەرگەی ئەوروپا و ئەویش ئازاد دەکریێ.. خەریکە پاشماوەی دەرکەوتنی ئەو جەنگە بە تەواوی دەردەکەوێت...

سەبارەت بە چۆنیەتی شەڕەکە پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (..وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ، فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ

بەرگی سێیەم

وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ، لَا تَرْجِعُ إِلَّا غَالِبَةً، فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يُمْسُوا، فَيَفِيءُ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ، كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ، وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الرَّابِعِ، نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَيَجْعَلُ اللهُ الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ، فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً - إِمَّا قَالَ لَا يُرَى مِثْلُهَا، وَإِمَّا قَالَ لَمْ يُرَ مِثْلُهَا - حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ، فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتًا، فَيَتَعَادُّ بَنُو الْأَبِ، كَانُوا مِائَةً، فَلَا يَجِدُونَهُ بَقِيَ مِنْهُمْ إِلَّا الرَّجُلُ الْوَاحِدُ، فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ؟ أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ..)[1].

**واتە: .. لە کاتی ئەو شەڕەدا هەڵگەڕانەوەیەکی توند دەبێت و خەڵکێکی زۆر پاشگەز دەبنەوە، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەن کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، پاشان شەڕ دەکەن هەتا شەو لێکیان جیا دەکاتەوە، پاشان ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە، هیچیان سەرنەکەوتوون و ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەنەوە کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، دیسان شەڕ دەکەن تا شەو لێکیان جیا دەکاتەوە، ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە بەبێ ئەوەی هیچیان سەرکەون، ئەوانەی بەڵێنی مردنیشیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان بەڵێنی مردن دەدەنەوە کە تا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، پاشان دەست دەکەنەوە بە شەڕ هەتا ئێوارە دادێت ئەمانیش و ئەوانیش دەکشێنەوە بەبێ ئەوەی هیچیان سەرکەون، وە ئەوانەی بەڵێنی مردنیان دابوو هەموو لەناو دەچن، پاشان کە ڕۆژی چوارەم هات ئەوەی کە ماوە لە ئەهلی ئیسلام بۆیان ڕادەپەڕن و هەڵمەتیان بۆ دەبەن و خوای گەورە شکستیان پێ دەهێنێت، بە جۆرێك کە کوشتارێکیان لێ دەکەن ـ یان گوتی: هەرگیز نابینرێت ـ یان گوتی: هەرگیز نەبینراوە بەجۆرێك کە باڵندە لە نزیکیانەوە تێدەپەڕێت و بەجێیان ناهێڵێت بە مردوویی دەکەوێتە خوارەوە، ئینجا ئەوەی یەك باوك سەد کەس بوون سەیر دەکات کەسیان نەماوە تەنها یەك پیاو نەبێت، ئیتر چ دەسکەوتێك دڵ پێی خۆش بێت؟ یاخود چ میراتیەك دابەش بکرێت.**

بەرگی سێیەم

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن ، باب إقبال الروم في كثرة القتل، (٢٢٢٣/٤) برقم: (٢٨٩٩).

ئەم شەڕە لەنێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان سەرهەڵدەدات بە ماوەیەك پێش هاتنی دەجال.

ئایا ئەمریکا لەم شەڕەدا بەشدارە یان نا ؟

چەند بۆچوونێك هەیە:

**یەکەم:** هەموو سوپای کوفر یەکدەگرن لە ژێر ئاڵای ئەمریکا، بۆیە ناو دەبرێت بە هێزی (قوات التحالف).

**دووەم:** ئەمریکا شپرزە دەبێت و لێك هەڵدەوەشێتەوە، وە ئەوڕوپا یەك دەگرێت لە ژێر ئاڵای دەوڵەتانی فەرەنسا یان ئەڵمانیا یان بەریتانیا.

**سێیەم:** ئەمریکا لە ئەوڕوپا جیا دەبێتەوە، ئەوڕوپا لەگەڵ موسڵمانەکان یەك دەگرن و بەسەر ئەمریکا دادەدەن و ئەمریکا دەبێتە دوژمنیان و شەڕیان لەگەڵ دەکەن.



بەڵێ ... بەڕاستی سەر لە نوێ سەرخستنەوەی ئیسلام و ڕوو بەڕووبوونەوەی کوفری جیهانی باجی خۆی دەوێت، نە موسڵمانان دەتوانن بە ئاسانی و شکۆمەندی و سەربەرزی ڕابردوویان بگێڕنەوەو نە سەرانی کوفریش بە ئاسانی دەست لە دەسەڵاتی ئەمڕۆیان هەڵدەگرن، بەڕاستی موسڵمانان دەبێ بزانن کە ئەو شەڕە یەك لاکەرەوەیان لە پێشە، دەبێ دڵنیابن کە جەنگی جیهانی ئەم جارە لە نێوان کوفرو ئیسلامدایە، ئەگەر ئەم ڕاستیەش لە دڵی موسڵمانانی ئەمڕۆدا هێشتا نەگەیشتبێتە پلەی (یەقین)، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێین کە ئەوە ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە لەلایەن داڕێژەران و نەخشە کێشەرانی سیاسەتی دەوڵەتە زلهێزەکانی کوفری جیهانی، بۆ نمونە (ولیام غار کار) کە لە کۆتایی ساڵەکانی پەنجاکاندا کتێبی (أحجار على رقعة الشطرنج)ی نووسیوە پاش ئەوەی کە بە بەڵگەوە دەیسەلمێنێت کە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم بە دەستی سەرمایەدارانی جوولەکەو پلان و دانەری زایۆنزمی جیهانی هەڵگیرسا، ئەنجا دێتە سەر باسی جەنگی جیهانی سێیەم و دەڵێت: (نصل إلى الحرب العالمية

الثالثة المقبلة وهذه رسم المخطط لها أن تنشب بنتجية النزاع الذي سوف يثيرة رؤوس المؤامرة الصهيونية العالمية بين الصهيونية السياسية والعالم السياسي)[1].

واتە: دێینە سەر جەنگی سێیەمی جیهانی داهاتوو ئەم جەنگەشیان وا نەخشەی بۆ کێشراوە کە لە ئاکامی ئەو ململانێیەدا ڕوو بدات کە سەرانی پیلان گێڕی زایۆنیزمی جیهانی لە نێوان زایۆنیزمیەتی سیاسی و جیهانی ئیسلامیدا بەرپای دەکەن.

کەواتە سیاسەت مەدارێکی خۆرئاوایی وەك (ولیام غای کار) هەر لە ساڵانی پەنجاکانەوە درکی بەو نەخشەو پلانە کردووە کە بەجۆرێك دارێژراوە کەوا جەنگی جیهانی سێیەم لە نێوان جیهانی ئیسلامی و بەرەی خۆرئاوادا ڕوو بدات، لە درێژەی کتێبەکەی دا زیاتر تیشك دەخاتە سەر ئەو نەخشەو پیلانەو دەڵێت: ئەو جەنگە وا نەخشەی بۆ کێشراوە کە هەردوو جیهانی ئیسلامی و جیهانی مەسیحی تێوە بگلێنرێت و بەیەکدا بدرێن، بە جۆرێك کە هەردوو لایان تیا بچن و یەکتری بتوێننەوەو لە کۆتاییشدا دەوڵەتێکی جولەکەی جیهانی دروست بکەن کە پایتەختەکەی (قودس) بێت و ئەو پادشا چاوەڕوان کراوەش حوکمی بکات کە باوەڕیان وایە لە (تەوارت) دا موژدەی پێ دراوە.

ئەو جەنگە جیهانیە چاوەڕوان کراوەش ئەمڕۆ تەواوی جولەکەو گاورەکان وەك بیروباوەڕێکی ئایینی قەناعەتیان پێیەتی و لە پەرتوکەکانی خۆیاندا بەشەڕی (هرمجدون) ناوی دەبەن، پێشیان وایە کە گۆڕەپانی شەڕەکەش لە (فەڵەستین و سوریاو لوبنان) دەبێت، لەم چەند ساڵەی دواییشدا دەیان کتێبیان لەو بارەوە نووسیوە.

گاورەکانیش ئەو بیرو باوەڕەشیان لەو (ئینجیل)ەوە وەرگرتووە کە ئەمڕۆ لەبەر دەستیان دایە هەروەك لە (سفر الرؤيا/١٦)دا هاتوو دەڵێت: (وجَمَعَتْ الأرواح الشيطانية جيوش العالم كلها في مكان يسمى (هرمجدون))[2].

واتە: ڕۆحە شەیتانیەکان لەشکرەکانی جیهانیان هەر هەموو لە شوێنێکدا کۆکردەوە کە پێی دەگوترێت (هرمجدون).

---

(١) أحجار على رقعة الشطرنج ، وليام غاي كار ، لا ٢٠ .

(٢) الإنجيل : لا ٣٨٨.

ئەم قەناعەتەش نەك هەر تەنها لە بیروباوەڕی خەڵکی سادەو پیاوە ئایینیەکانی گاورو جولەکەکاندا بوونی هەیە، بەڵکو لە مێشکی دەسەڵاتدارو سیاسەت مەدارەکانیش هەیە[1].

خاوەنی پەرتووکی (البعد الديني في السياسة الأمريكية) دەڵێت: (ان سبعة من رؤساء أمريكا يؤمنون بمعركة هرمجون)[2].

واتە: حەوت لە سەرکردەکانی ئەمریکا باوەڕیان بە شەڕی (هرمجدون) هەیە.

هەر لەو بارەیەشەوە (رونالد ريغان)ی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا دەڵێت: (إنَّ هذا الجيل هو الجيل الذي سيرى (هرمجدون))[3].

واتە: خەڵکی ئەم جیلەی ئێستا ئەو خەڵکەن کە شەڕی (هرمجدون) دەبینن.

ئەم جوولەکانە بەردەوام لەسەر خراپەو خراپەکارین کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات ئەوە مێژوو شاهێدە چیان کرد لە تاوان و خیانەتکاری ، جا نەك هەر لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەمە پیشەیان بووبێت، بەڵکو بگرە لە هەر وڵاتێکدا بووبن کەوتونەتە ئاژاوە نانەوەو پارە پەیدا کردن بە سوو خۆری و بەدڕەوشتی ..هتد، بۆیە لە هەر وڵاتێك تاوانباریان ئاشکرا بووبێت قەتل و عامیان کردوون.

کاتێك ڕووسیاو ئەوروپای ڕۆژهەڵات کەوتنە گیانیان کۆچیان کرد بەرەو ئەوروپای خۆرئاوا .. دەڵێن: لە ساڵی (١٦٠٧)ع لاهوتیەکی جوولەکە بە ناوی (توماس برايتمان) لە پەڕاوێکیدا باسی بیروبۆچونێکی کرد کە گوایە خوا دەیەوێت جوولەکە بگەڕێنێتەوە بۆ فەلەستین بۆ خواپەرستی لەوێ.. هەندێ لە بیریارو ژیرەکانی ئەوروپا گوتیان: بۆ ئەوەی لە کۆچی جوولەکە ڕزگارمان بێت و ئەو بەڵایەمان لە کۆڵ بێتەوە چاك وایە ئەو بیرو بۆچونە وەرگیرێ و جوولەکە ڕووی بکرێتە فەلەستین.

---

(١) الوعد الحق، د. عمر عبدالكافي، لا ٣٢٢ .

(٢) الوعد الحق والوعد المفترى ، لا ٣١ .

(٣) النبوة والسياسة ، جريس هالس ، لا ٦٦ .

لە ساڵی (١٦٤٩)ع دوو جوولەکەی لاهوتی بەریتانیا کە لە هۆڵەندا دەژیان نامەیەکیان ئاڕاستەی حکومەتی بەریتانی کردو تیایدا داوایان لێکرد کە شەرەف مەندبێت بە گواستنەوەی جوولەکە بە کەشتی بەریتانی بۆ فەلەستین، چونکە ئەوە ئیرادەی خوایە جا ئەم بیروبۆچونە پەرەی پێدرا لە سەدەی نۆزدەدا.. گوایە خوا دوو مەملەکەتی هەیە یەکێکیان کە لەسەر زەویە کە ئیسرائیلەو مەملەکەتێکیش هەیە لە ئاسمان کە (کەنیسە)یەو .. پێغەمبەر (عیسا)ش بۆ جارێکی تر دێتەوە سەر زەوی، بەڵام لە کاتێکدا دێت کە جوولەکە کۆبونەوە لە فەلەستین داو جەنگێکی گەورە لە (هەرمەجدون) لە شام ڕوو بدات ئەم بیروبۆچوونە هەڵەیان لە ئەمەریکادا بڵاوکردەوەو دەڵێن: نزیکەی چل ملیۆن مەسیحی دڵیان بەمە خۆشەو هەوڵی زۆر دەدەن و پشتیوانی جوولەکە دەکەن و ئەو یارمەتیەی لەمانەوە بۆی دێت، لە هەموو جوولەکانی جیهانەوە ئەوەندەی دەستناکەویٚ .. ئەم کۆمەڵە گاورەی کە ئاوا بیر دەکەنەوە پێیان دەگوترێت: (المسيحيه الصهيونيه)، کە خەڵکانی کاربەدەست و سیاسی و دەسەڵات داری گەورەیان لەگەڵ دایە، یەکیٚ لەوانە سەرۆکی ئەمریکی (ڕیگان) بوو کە دەیگوت: من ئاواتە خوازم کە خوا پایەدارم بکات بەوە کە دەست بنێم بە سویچی نەوەویەکداو شەڕی (هەرمەجدون) هەڵگیرسیٚ و زوو پێغەمبەر (عیسا) بگەڕێتەوە.

لە سەردەمی (ڕیگان) (بات روبرتسون) کە یەکێکە لە سەرکردەکانی ئەم دەستەو تاقمە ئامادەی کۆبونەوەکانی مەجلیسی ئەمنی قەومی ئەمریکی دەبوو، بۆ ئەوەی هەر بڕیارێکیاندا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا بگونجیٚ لەگەڵ بیروبۆچونی ئەو کۆمەڵەداو لە بەرژەوەندی ئیسرائیلدا بێت.. هەروەها بۆ هەڵبژاردنی بۆشی بچوك ئەم کۆمەڵە ڕۆڵێکی گەورەیان بینی، چونکە (بۆشی کوڕ) ئالوودەی مەی خواردنەوە بوو، توانیان بیهێننە مەیدانەوەو لە سەدا چلی دەنگەکانی بۆ مسۆگەر بکەن.

ئەم کۆمەڵە دەوری (بۆش)یان گرتووەو ڕاوێژکاری زۆر نزیکی (جیری فولویل)ە کە لەم کۆمەڵەیەو بیست ساڵە بەرنامەیەکی سەعاتی هەیە لە تەلەفزیۆنی ئەمەریکی داو وەزیری دادی ئەمریکیش هەر لەمانەو زۆر (متطرف)

ه، تەنانەت نووسەری وتارەکانی سەرۆك بۆش (مایکل جاکسۆن)ە کە یەکێکە لەو دەستەو تاقمە، بۆیە هەندێ عیبارات لە وتارەکانی سەرۆکدایە کە لەلای ئەو دەستەو تاقمە ڕەواجی هەیە وەك (ناوهێنانی هێرش بۆ سەرجیهانی ئیسلامە لە مەسەلەی تەقینەوەکانی ئەمریکا بە شەڕی خاچ پەرستان.

ئەو دەستەو کۆمەڵە بەلایانەوە گرنگە کە قودس بگرن و پاشان مزگەوتی ئەقصا بڕوخێنن و هەیکەلی پێغەمبەر (سولەیمان) بینا بکەنەوە! بۆیە لە ساڵی (١٩٦٩)ع ئەوەی کە مزگەوتی ئەقصای سوتاند یەکێ بوو لە کۆمەڵی (المسيحية الصهيونية)[1].

ژنە نووسەری ئەمەریکی (جريس هالسل) لە پەرتوکی (النبؤة والسياسة) دەڵێت: (اننا نؤمن كمسيحيين ان تأريخ الإنسانية سوف ينتهي بمعركة تدعى (هرمجدون)، وإنّ هذه المعركة سوف تُتوَّج بعودة المسيح الذي سيحكم بعودته على جميع الأحياء والأموات على حدٍّ سواء)[2].

واتە: ئێمە وەکو گاورەکان باوەڕمان وایە کە مێژووی مرۆڤایەتی بە جەنگێك کۆتایی دێت کە پێی دەگوترێت (هرمجدون)، ئەم شەڕەش بە گەڕانەوەی (مسیح)ی چاوەڕوان کراو کۆتایی دێت، کە لە گەڕانەوەکەیدا حوکمی هەموو زیندوو مردووەکان وەك یەك دەکات.

جوولەکەش هەرچی لێ بکەوتایە بازاڕ دەیان چنیەوەو فشاری زۆریان دەخستە سەر ناو براو.. پاشان پەڕاوێکی تری دەرکرد بە ناوی (يد الله) کە ئەمیش هەر لەسەر ئەو مەسەلەیەو دای بە دکتۆر محەممەد سماکی داتاوەری بگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی[3].

---

(١) المسيحية الصهيونية ، برنامج بلا حدود ٢٠٠٢/١٢/٣٠.

(٢) النبؤة والسياسة ، جريس هالس ، لا ١٩ .

(٣) المسيحية الصهيونية ، برنامج بلا حدود ٢٠٠٢/١٢/٣٠) .

بەرگی سێیەم

**ئاگاداری:** مەسیحی دەجال دەرناچێت ئیلا لە دوای سەرهەڵدانی جەنگێكی جیهانی نەبێت..

لە دوای ئەو شەڕەدا سێیەكی جیهان لەناو دەچێ، كە پێی دەگۆترێ جەنگی تنین (Dragonwar).

وە زۆربەی جولەكەكانیش لە پشت ئەو جەنگەوەن ئیلا ژمارەیەكی زۆر كەم نەبێت، خوای پەروەردگار باسیان دەكات فەرمووبەتی: [كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُ][1]. واتە: هەر جارێك ئاگرێكیان هەڵگیرساندبێ بۆ ئاژاوە نانەوەو جەنگ خوای گەورە ئەو ئاگری كوژاندۆتەوە.

جولەكەكان دەوریان زۆریان هەبوو لە هەڵگیرساندنی دوو جەنگی جیهانی و، شەڕی عێراق و ئێران.

بەڵام دەوری سێیەمیان لە جەنگی جیهانی سێیەمین پلانێكی وایان بۆ داڕشتووە كە مرۆڤایەتی لە ژیانیان بە چاوی خۆیانیان نەبینوە، هەروەكو لە تلمودا هاتووە[2].

جولەكەكان دوای ئەو جەنگە حەوت ساڵان دەمێننەوە كە چەكەكانیان دەسوتێنن كە دوای شەڕەكە دەستیان كەوتووە.. دواتر ڕاستەوخۆ دەجال دەردەچێت.

بەڵێ.. ئەم ڕاستیانە هەمووی بەڵگەن لەسەر نزیك بوونەوەو هاتنە دی فەرموودەو بەڵێنەكانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ڕوودانی ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە كە هەرگیز مرۆڤایەتی كارەساتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە، جەنگێك دەبێت هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: تەنانەت باڵندەش بە ئاسمانی شەڕەكەوە ڕزگاری نابێت و دەكەوێتە خوارەوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو هەموو چەكە كیمیایی و ئەتۆمیەی كە لەو شەڕەدا بەكار دەهێنرێت، جا لەو سەردەمەدا موسڵمانان لەگەڵ یەكدا یەك دڵ و یەك دەست و یەك ڕێز كۆدەبنەوەو ڕوو

---

(١) سورة المائدة، الآية: (٦٤).

(٢) المسيح الدجال منبع الكفر والضلال، لا ١٤.

بەرووی کوفری جیهانی دەبنەوەو بۆ جارێکی تریش حوکم و شەریعەتی خوا لەسەر زەوی دەچەسپێننەوە، بۆیە ئەو کەسانەی وا تێ دەگەن کە هەر کات مەهدی هات لە سفرەوە دەست پێدەکات و لە سفرەوە خەڵکی بەرەو ئیسلام بانگ هێشت دەکات، ئەوانە بەهەڵەدا چوون.. بەڵکو لە پێش هاتنی مەهدی ڕابونێکی ئیسلامی بەهێز سەران سەری جیهان دەگرێتەوەو قۆناغ بە قۆناغ بەرەو پێشەوە دەڕوات و موحەممەدی مەهدیش لە کاتی هاتنیدا تەنها ئەرکی کۆکردنەوەی جەمسەرەکانی ئەو ڕابوونەو ڕابەرایەتی کردنیان لە ئەستۆ دەگرێت.

بە گوێرەی فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام کۆمەڵێك لەسەر هەق دەمێنن لەم ئوممەتە سەرکەوتوو سەرفرازن بەهۆی ڕاستیو لەسەر هەق بونیان دوژمنیان ناتوانن زەرەریان پێ بگەیەنن، ئەوانەشی لە وڵاتی شامن لە دەوروبەری دیمەشق و بیت المقدس و ڕێگاکانیان.

وە کۆتایی بنکەی جیهادو فەرمانڕەوایی ئیسلام لە بیت المقدس دەبێت لەسەر دەستی (محەممەدی مەهدی)و ڕابەرایەتی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لەوێ پشت بە خودای خۆیان دەپارێزن لە خراپەی (یەئجوج و مەئجوج).

جا ئێستا ئەم قودسە داگیرکراوە لەسەر دەستی جولەکەی سەهیۆنی، بە پشتیوانی ووڵاتانی ڕۆژئاواو ئەمریکا، هۆکاری داگیرکردنەکەیان لەسەر بناغەیەکی بیروباوەڕی جولەکە تەوراتیە.

هەروەکو چل هەتا پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی ئیسرائیل (ئیبن عزیون) دانی بەوە دانا لە نەتەوە یەکگرتووەکان گوتی: لەوانەیە ئێمە مافی سیاسی یان قانونیمان نەبێت بە دروست کردنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە فەلەستین بەڵام مافێکی ئایینیەو بەڵێنمان پێدراوە لە (نیل) هەتا (فورات)[1].

ئینجا گوتی: هەر جولەکەیەك لە ئەمڕۆوە کۆچ نەکات بۆ فەڵەستین ئەوە سەرپێچی تەوراتی کردووەو کافر بووە بە دینی جولەکە.

---

(١) خطب الشيخ محمد حسان (٣٢٩/٢).

پاشان گوتی: فەلەستین هیچ واتاو قیمەتێکی نیە بەبێ قودس، وە قودسیش هیچ واتایەکی نیە بەبێ (هەیکەل)[1]، وە هیچ واتایەك نیە بۆ دروست کردنی دەوڵەتی ئیسرائیل بەبێ فەلەستین[2].

لە بیروباوەڕی جولەکەو گاورەکان ئەوەیە کە مەسیحی دەجال دەرناچێت ئیلا دەبێت لە پاش بیناکردنەوەی هەیکەلەکەوە بێ، لە کاتێکدا ئەوان بانگەشەی ڕزگارکردنی هەیکەلەکە دەکەن لە ژێر قوبەی صەخرەدا.. وە لە ئێستادا ملیۆنان گاور لە ویلایەتی موتەحەیدەو بە سەدان هەزار دۆلاریان کردۆتە خۆبەخشی لە پێناوی تێکدانی مزگەوتی ئەقصا و دروستکردنی هەیکەل، چونکە عەهدی قەدیم و تلمود وا هاتووە کە مەسیحی دەجال دەرناچێت ئیلا لە پاش بانگەشەی بیناکردنەوەی هەیکەلەکە نەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا جولەکە چەندین جار هەوڵی ڕووخاندنی مزگەوتی ئەقصایان داوە، کە ئەمەش بە چاوی ڕووناك لەکەناڵەکانی ئاسمانی و گۆڤارەکانی ڕۆژانە باسی لێ دەکرێت.

تەنانەت جولەکەکان توانیان قەناعەت بە ملیۆنان مەسیحی بهێنن کە هاتنی مەسیحی دەجال نزیك بۆتەوە، چونکە لە بیروباوەڕی بەشێکی گاورەکان بڕوایان بەسەرهەڵدانەوەی مەسیح نییە ئیلا لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی نەبێت.

دکتۆر محەممەد عەلی بار (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لەساڵی حەفتایەکان خۆم چەندین جار گوێم لە گۆرانیەك بوو بە زمانی ئینگلیزی کە دەیگوت: ئەی مەسیح وەرە (O, Jesus Come)، بەڵام ئەوەی نامۆ بوو لەلای منەوە ئەوە بوو لە شاری موسڵمانە عەرەبەکان پەخش دەکرا

---

(١) مەبەست پێی هەیکەلی سلێمانە کە دەیانەوێ لە شوێنی مزگەوتی ئەقسا دوای ڕوخاندنی ئەم هەیکەلە دروست بکەن، کە بریتیە لە سێ نهۆم، نهۆمی یەکەم بۆ حاخامەکان (زاناکان)، نهۆمی دووەم بۆ ئافرەتە بەڕەڵاکان بۆ ڕابواردن، نهۆمی سێیەم بۆ مێرد منداڵە لوس و پێش چاوەکان بۆ کاری جنسی گەر لە ئافرەتەکان بێزاربوون.

(٢) خطب الشيخ محمد حسان (٣٢٩/٢).

بە زمانی ئینگلیزی، هەروەها خۆم بینیم لە پارکی (هاید بارك) لە ساڵی (١٩٧١) دوو لەو جولەکانەی کە تەیلەسانیان لەبەر کردبوو، یەکێکیان باسی نزیکبوونەوەی دەرچوونی دەجالیان دەکرد، کە ئەسفاری کۆن باسی دەکرد.. وە بەڵگەکان ئیشارەت بە نزیکبوونەوەی دەدا [1].

کەواتە بۆ ڕزگار کردنی (قودس) دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین بۆ ئەوەی بگەین بە ئامانجەکانمان:

١- دەبێ موسڵمانان بگەڕێنەوە سەر بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلامی.

٢- دەستگرتن بە بەها بەرزەکان.

٣- پتەوکردنی برایەتی لە نێو موسڵمانەکان.

٤- خۆ ڕزگارکردن لە ترس و لەرزو بێ هێزی و بێ ناوەڕۆکی کە سەرچاوەکەی خۆشویستنی دونیایە.

بەرگی سێیەم

## ئایا ناوی ئەمریکا لە قورئان هاتووە ؟

بێگومان ئەمریکا لە قورئان ناوی هاتووەو پێغەمبەری خۆشەویستیش لە فەرموودەکان باسی فەرمووە..

هەر چەندە هەندێك دەڵێن: بە هیچ شێوەیەك ئەمریکا ناوی لە قورئان نەهاتووە، چونکە هیچ دەستەواژەیەك نییە بە ڕاشکاوانە باسی ئەمریکا بکات، بەڵام ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، بەڵکو قورئان و فەرمووده باسی ئەمریکا دەکەن، بەڵام بە ڕاستەوخۆیی باسی ناکرێ، بەڵکو بە تەلمیح .. نمونەش زۆرە، لەوانە:

یەکەم: خوای گەورە لە قورئان باسی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیامان بۆ دەکات کە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دێتە دی، وەکو دەفەرموێ: [حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ ..][2].

---

(١) المسيح الدجال منبع الكفر والضلال، لا ١٥.

(٢) سورة يونس، الآية: (٢٤).

واتە: هەتا ئەو دەمەی زەوی بۆ خۆی ڕەنگاو ڕەنگ دەبێ و، خۆی دەردەخا و خۆی ئارایش دەدا و خاوەنەکەی وا دەزانێ لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایەو، چۆنی بوێ دەتوانێ سوودی لێ وەرگرێ و هیچ کەسێك نییە لێی تێکبدات، جا لە ناکاو بە شەو یان بە ڕۆژ فەرمانی ئێمە بۆ وێرانکردنی دێت (گڕەبا ـ یان بروسکە لێی دەدا) و دەیسوتێنێ..(لە بەرگی دووەم ڕاڤەی ئەم ئایەتە قورئانیەمان کرد بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای سەردەم).

جوانکردنی زەوی و ڕازاندنەوەی ئەوان وا گومان دەبەن تواناییان بەسەر هەموو گۆڕانکاریەکانی ژیان هەیە کە ئەمەش ئیشارەتە بۆ پێشکەوتنی ئەو زانستە پێشکەوتووەی کە هەندێکیان گومان دەبەن کە بتوانن مرۆڤ دروست بکەن بە هەموو سیفەتەکانیەوە.

**دووەم:** ئەمریکا عادی دووەمە کە قورئان باسی دەکات، کە کاتێ دەفەرمویێ: عادی یەکەممان لەناو برد..

خوای گەورە لە قورئان باسی ئیمپراتۆریەتی گەلی عاد دەکات و دەفەرمویێ: [وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾][1].

واتە: خوای گەورە ئەو زاتە بوو کە گەلی عادی یەکەمی لەناوبرد هەرچەندە زۆر بە دەسەڵات و بە تواناش بوون..

(عاد) گەلی پێغەمبەر هود بوو (سەلامی خوای لێ بێ) کە خوای گەورە وەسفی عادی کۆن دەکات بە (عادی یەکەم) ؟

بۆیە کە خوای پەروەردگار باسی عادی یەکەم بکات دەبێ عادی دووەمیش بە دوای خۆیدا بهێنێت، بۆیە قورئان باسی عادی یەکەم دەکات کە لەسەردەمی مێژووی دابەزینی قورئان عادی دووەم نەهاتبوو، وە پێش هاتنی قیامەتیش دەبێ عادی دووەم بێت، هیچ قەدەغەکراوێکیش نییە ئەگەر عادی سێیەم و چوارەمیش بێت..

---

(١) سورة النجم، الآية: (٥٠).

من پاڵپشتی خۆم دەخەمە وتەی بەشیر محەممەد عەبدوڵلا کە لە پەرتوکی (زلزال الأرض العظيم) دەڵێت: ئەمریکا عادی دووەمە، ئەو سیفەتانەی کە لە عادی دووەم هەیە هەمان وەسفە کە لە عادی یەکەم هاتووە.

ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان هەردوو عادەکان !!

خوای گەورە وەسفی گەلی عادی یەکەم دەکات کە دەوڵەتێك بوو هاوشێوەی نەبوو لە سەردەمانی پێشوو و داهاتوو، خوای گەورە دەفەرموێ: [إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٨﴾][1].

واتە: ئایا نەتدیت ئەی محەممەد کە پەروەردگاری تۆ چۆنی کرد بە گەلی عاد، کە خاوەنی پایەی بەرزو خانوو و کۆشکی ستوندار بوون، ئەو قەومەی وێنەی دروست نەکرابوو لەسەر زەوی و شاراندا لە هێزو دەسەڵات..

لەم ئایەتە قورئانیە خوای گەورە وەسفی دەوڵەتێکی پێشکەوتوو دەکات کە خاوەنی شارستانیەت بوون، وە ئەمڕۆش ئەمریکا هاوشێوەی نییە لە هەموو بوارەکانی هەندەسەو بیناياتی بەهێز، بۆیە ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین ئەمریکای خاوەن کۆشکی ستوندار..

فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕاشکاوانە باس لە گەورەترین فیتنەو ئاشوب دەکات لەسەر گۆی زەوی کە لە ڕۆژی دروستکردنی ئادەم تا هاتنی ڕۆژی دوایی فیتنەی وا گەورە نییە، وە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی ناوە بە (الملحمة الكبرى).. ئەم شەڕە گەورە لە نێوان موسڵمانەکان و دەوڵەتانی ڕۆم دەبێت.

وە لە تەورات و ئینجیل ناوی هاتووە بە (هەرمەجیدون) کە ئەمەش یەکەمین شەڕە لە پێش دەرچوونی دەجال، وە کۆتاییشی دێت بە هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ).

دوای جەنگە گەورەکە موسڵمانەکان سەرکەوتوو دەبن بەسەر ڕۆمەکان، ئینجا موسڵمانەکان هەردوو شاری ڤاتیکان و ڕۆما ئازاد دەکەن، بۆیە هەموو وڵاتانی

---

(١) سورة الفجر، الآية: (٧ ـ ٨).

بەرگی سێیەم

ئەوروپا ئایینی ئیسلامی تیایدا بڵاودەبێتەوە.. دواتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی شارێك دەكات كە ئازاد دەكرێت بەناوی (القاطع) كە ئەم شارە لەسەر دەریای سەوزە.. وە دوای ئازادكردنی ئەو شارە دەجال دەردەچێت..

پێشەوا حوزەیفەی كوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (غزا طاهر بن أسماء بني إسرائيل، فسباهم وسبا حلي بيت المقدسي، وأخرقها بالنيران، وحمل منها في البحر الفاً وتسعمائة سفينة حلي، حتى أوردها روية) لە ریوایەتێكی تر فەرموویەتی: (ليستخرجن المهدي ذلك حتى يرده إلى بيت المقدس، ثم يسير ومن معه حتى يأتوا خلف رومية، مدينة فيها مائة سوق، في كل سوق مائة ألف سوقي، فيفتحونها، ثم يسيرون حتى يأتوا مدينة يقال لها القاطع، على البحر الأخضر المحدق بالدنيا، ليس خلفه إلا أمر الله تعالى، طول المدينة ألف ميل، وعرضها خمسمائة ميل، لها ثلاثة آلاف باب، وذلك البحر لا يحمل جارية السفينة لأنه ليس له قعر، وكل شيء ترونه من البحار إنما هو خلجان من ذلك البحر، جعله الله تعالى منافع لابن آدم)[1].

(١) أخرجه الحافظ أبو نعيم في (مناقب المهدي).

# لەناوچوونی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕۆڵی جوولەکە لەو جەنگــەدا، گەڕانەوەی جولەکەکانی جیهان بۆ فەلەستین



لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: ئەی باشە ئەو قەوارەیەی کە ئەمڕۆ بە دەوڵەتی ئیسرائیل ناو دەبرێت لە پاش ئەو جەنگە گەورەیەی لە نێوان لەشکری ئیسلامی و هاوپەیمانێتی ئەوروپا کە ڕوودەدات چی بەسەردێت بە تایبەت کە لەو جەنگەدا هێزەکانی ئەوروپا دەشکێن و ئیسرائیلیش بێ پشت و پەنا دەمێنێتەوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین خوای گەورە دەفەرموێ: [وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُـۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ ][(١)].

واتە: ئیسرائیلیەکانمان ئاگادار کردو هەواڵمان پێدان لە نامەکەیاندا کە سوێند بەخوا ئێوە خراپەکاری دەکەن لە زەویدا دووجارو، بێگومان بەرز دەبنەوەو زاڵ دەبن (بەسەر خەڵکیدا) بە بەرزبونەوەیەکی زۆر گەورە، جا کاتێ یەکەمین بەڵێن (لەو دوانە) هات (کە بەڵێنتان پێدراوە) دەینێرینە سەرتان چەند بەندەیەکی خۆمان کە خاوەنی دەست وەشاندنێکی بەتینن لە جەنگدا، ئینجا ئەوانە دەگەڕێن بەناو

---

(١) سورة الإسراء (٤ ـ ٧).

ولآتەكاندا ، وە ئەوە بەڵێنێكی بەدی هێنراو بوو، لە پاشان جارێكی تر ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەكەینەوە، وە دارایی و كوڕی زۆرتان پێ دەبەخشین، وە لەشكرو نەفەرتان (لە جاری پێشوو) زۆرتر دەكەین.

لە ئایەتی دووەمەوە باسی بەنی ئیسرائیل دەكات هەتا ئایەتی (١٠٤) ، مامۆستا (بسام جوار) هەندێ شتی جوان و ڕێك و پێكی بەلاغی لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەرهێناوە.. خوای گەورە باسی دوو ئیفساد و دوو پەیمان دەكات لە هەمان كاتدا (ئیفساد)ی یەكەم لەو بەروارەوەیە كە پێغەمبەر سولەیمان وەفات دەكات.

بۆچی لەوێدا ئەو بەروارە دادەنرێت بە ئیفسادی یەكەم؟ چونكە بەنی ئیسرائیل دووبەرەكیان تێكەوت، دووبەرەكی گەورەترین فاكتەرەو دیاردەی فەسادە.

لە كتێبەكانی مێژوودا ئاماژە بۆ بەروارێك دەكات كە (٩٣٥)جار پێش لە دایكبوونی پێغەمبەر عیسا.. بەڵام لە هەندێ كتێبی تردا دوو ژمارەی تر هاتووە: یەكێكیان دەڵێت (٩٢٦) و ئەویتریان دەڵێت: (٩٣٠).

ئایا ئێمە شوێن كامیان بكەوین ؟

زۆرینەیان ئاماژە بۆ (٩٣٥) دەكەن بەڵام لە شوێنێكدا دەڵێ: ٩٢٧ لە شوێنێكدا دەڵێ ٩٣٠ ئێمە چۆن بزانین؟ چونكە زۆر پێویستیمان بەو بەروارەیە .

خودای گەورە باسی وەفاتی پێغەمبەر سولەیمانمان بۆ دەكات لە سورەتی (سبأ) دەفەرموێ: [وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾][1].

---

(١) سورة سبأ (١٢ ــ ١٣).

ئا لەو (فاء) ەوە دەست پێ دەکات (د.جوار) پیتەکانی لە سەرەتای سورەتەکەوە ژماردووە[١].

تێبینی: بیرمان نەچێت سورەتی (سەبەء) لە دابەزیندا یەك ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیوە.. واتە: سورەتێکی مەککیەو ڕاستەوخۆ دوای سوڕەتی (ئیسراء) هاتۆتە خوارەوە .. لە زەمەندا نەك لە زنجیرە بەندی ڕیزکردنی سورەتەکانی قورئاندا.. چونکە لە ژماردنی سورەتەکانی قورئاندا ٣٤، وە(ئیسراء) ١٧ یە.. بۆیە زانایانی راڤەی قورئانی پیرۆز دەفەرموون: (سبأ) سوڕەتێکی مەککیە .

دکتۆر جواد هەڵساوە بە ژماردنی پیتەکان لە ئایەتی یەکەوە لە سورەتی (سبأ) هەتا کۆتایی ئایەتی ١٣ دەکاتە ٩٣٤ پیت.. بەڵام ئەو ئایەتی چواردەهەمینە کە بە (فاء) دەست پێ دەکات باسی مردنی حەزرەتی سولەیمان دەکات، لە زمانی عەرەبی (فاء) تعقیبیە، واتە: پەیوەندیەك هەیە لە نێوان ڕابردوو و ئەوەی داهاتوو.. لەگەڵ ئەم (فاء)ە دەکاتە (٩٣٥)، ئێمەش کەواتە ئەو ژمارەیەی کە لە کتێبی مێژوودا هەیە پەسەندی دەکەین و دەڵێین (٩٣٥) ی پێش لە دایکبونی پێغەمبەر عیسا بەرواری وەفاتی پێغەمبەر سولەیمانەو سەرەتای فەسادی بەنی ئیسرائیلە.

ڕاستەوخۆ دوای وەفاتی پێغەمبەر سولەیمان تەنها نەوەی (یەهودا) نەبێ مانەوە لە قودس و دەوڵەتەکەیان دەوڵەتی (یهودا) ی ناو بوو.. زۆرینەی بەنی ئیسرائیل کۆچی کرد بۆ باکوور.. لەوێ دەوڵەتێکیان دروست کرد ناویان نا (ئیسرائیل)، تەورات رەخنە لەو کردارە دەگرێت لە «سفر الملوك الأول» دا باسی ئەوە دەکات کە خوێنی ئێوەم حەلاڵ کرد ڕێگەمدا بە داگیرکەر کە زەلیلتان بکەن و بە دیلی بتانبەن و ئەشکەنجەتان بدەن، چونکە ئیشی خۆتانم دایە دەست (یربعانی کوری ینباط) ئەمە سەرکردەیەك بوو سەری لێشێواندن و سەرەتای (إفساد) لەو ساڵەوە دەست پێدەکات[٢].

---

(١) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٢ .

(٢) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٣ .

بەرگی سێیەم

کەواتە بەنی ئیسرائیل دوای ئەم بەروارە دەوڵەتێکیان هەبوو لە باکور ناوی ئیسرائیل بوو، وە دەوڵەتێکیان هەبوو لە قودس ناوی (یهودا) بوو، ئەم دەوڵەتە لە ساڵی ٧٢٢ پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا ئاشوریەکان لەناویان برد، ئەم دەوڵەتە (١٣٦) ساڵ دوای ئەو واتە: لە (٥٨٦) پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا لە ناوچوو، گرنگ ئەوەیە ناکۆکیەکە دوای ئەم بەروارە دەستی پێکرد..

بەنی ئیسرائیل دوای بەرواری ٩٣٥ دوبەرەکیان تێکەوت و بوونە خاوەنی دوو دەوڵەت:

١- دەوڵەتێکیان هەبوو لە باکوور ناوی ئیسرائیل بوو.. ئەم دەوڵەتە لە ساڵی ٧٢٢ پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا ئاشوریەکان لە ناویان برد.

٢- دەوڵەتێکیان هەبوو لە قودس ناوی یەهودا بوو.. لە ساڵی ٥٨٦ پێش لە دایکبوونی پێغەمبەر عیسا بەخت نەسری بابلیەکان لە ناوی برد .

لە پەرتوکی (السيرة النبوية) هی (محەممەد ئەبو شغبە) جەخت دەکاتە سەر ئەو بەروارە ٦٢٢/١٠/١٠ کە بریتیە لە شەوڕەوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە خوای گەورە لە مەککەوە گواستیەوە بۆ قودس پاشان بڵندبوونەوەی بۆ ئاسمانەکانە.

ئیبن و حەزمی زاهیری کە یەکێکە لە ڕاڤەکەرانی قورئان جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کەوا ڕووداوی شەو ڕەوی یەك ساڵ پێش کۆچ هیجرەت بوو ئیتر دوو سێ مانگ زیاتر یان کەمتر کێشە نیە.. گرنگ ئەوەیە لە سنووری ساڵێك تۆزێ زیاتریش بووە ..

بەرواری شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) لە ٦٢٢/١٠/١٠ بووە.. کۆتایی قۆناغی ئیفسادی یەکەمە، ئیفسادی یەکەم ڕوویداو تاوانەکەشی [وَعْدُ أُولَىٰهُمَا] ڕوویدا ئینجا لێرەدا زاناکان کومەڵێك جیاوازیان هەیە لە نێواندا [عِبَادًا لَّنَآ] کە بە پێنج شێوە هاتووە.. مەرج نیە ئاماژە بێت بۆ خواناسێکی یەکتاپەرستی ڕێك و پێك، هەر کەسێك بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا بەڵام [أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ] بوون.. خوای

گەورە ئاشوریەکان و بابلیەکانی بۆ ناردن گرنگ ئەوەیە پەیمانی یەکەم کۆتایی هات لە پێش ئیسلام[١].

پەیمانی دووەم ١٩٤٨ع کە ڕوونە لای هەمووتان ١٩٤٨ دروست بوونی ئیسرائیلە بەڵام لە ڕووی فەرمیەوە ـ ڕەسمی ١٩٤٨/٥/١٥ ئیسرائیل ئیعلانی دەوڵەتەکەی خۆی کرد .

سوپای ئەردەنی و سوری و عێراقی کردیان بە شەڕ لەگەڵیان.. بەڵام جامیعەی عەرەبی بڕیارێکی دەرکرد «وقف إطلاق النار» کە پێی دەگوترێ هودنەی یەکەم واتە: لە ١٩٤٨/٦/١٠ع. واتە: بە فەرمی و لەسەر کاغەز لە ١٩٤٨/٥/١٥ دەوڵەتی جوولەکە دروست بوو.. پاش ٢٥ ڕۆژو لە بەرواری ١٩٤٨/٦/١٠ بە کردەوە پراکتیکی دەوڵەتەکە دروست بوو.

مامۆستا محەممەد ئەحمد راشد باسی رووداوێك دەکات کاتێ گەنج بوو، لە ساڵی ١٩٤٨ع پیرەژنێکی دراوسێیان کە جوولەکە بووە دیارە جوولەکە لەو بەروارەدا لە لە هەموو شوێنێکی عێراقدا هەبوون، دەڵێ ئەو پیرەژنە دراوسێیەمان بە گریانەوە هات بۆ لای دایکم، دایکم پێی گوت: پێویستە پێ بکەنیت چونکە ئێوە بوونەتە دەوڵەت، گوتی: ئاخر حاخامەکان وایان پێ گوتوین ئەم دەوڵەتە ٧٦ ساڵ دەخایەنێ، واتە لە کتێبە ئاسمانیەکاندا نووسراوە کە ئەم جارە دەوڵەتی ئیسرائیل دروست دەبێت بۆ ماوەی ٧٦ ساڵ.

د.بەسام جوار هەستاوە بەم حیسابە، وە لای ئێوە دیارە کە ساڵ لای جولەکەکان بە ساڵی مانگی حیساب دەکرێ وەکو تەقویمی عەرەبی وایە ١٩٤٨، ٧٦ ساڵی مانگی بۆ زیاد بکەی : ٧٦٠ * ٣٥٤,٣٦٧ = ٢٦٩٣١,٨٩٢ ڕۆژ[٢].

بۆیە ئەوەندە ڕۆژە زیاد دەکرێ بۆ بەرواری دروست بوونیان ١٩٤٨/٦/١٠ دەکاتە ٢٠٢٢/٣/٥ ئەمە لەلای جوولەکەکان کۆتایی دەوڵەتەکەیانە، ئێمەی

---

(١) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٤ .

(٢) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٥ .

موسڵمان کە دەگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز وەك د. بسام جوار ژمارەی وشەکانی سورەتی ئیسراء لە ئایەتی دووەوە کە باسی بەنی ئیسرائیل دەکات: [ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾]. لەوەوە حیساب دەکات هەتا [ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾] ، ئەم لەفیفانە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بەنی ئیسرائیل دەبنە چەندین قەوم، بەڵام جاران هەموویان یەك نەتەوە بوون، خوای گەورە دەفەرمووێ: لە وڵاتانی جیهاندا کۆتان دەکەمەوە لەیەك شوێندا، چونکە لە سەرەتای سورەتەکە دەفەرمووێ: [فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾].

کە سزای دووەم و پەیمانی دووەم دێت خوای گەورە دەفەرموێ: ئەو قەومە خواناسەی کە دەیانێرم سێ کار دەکەن لەگەڵتاندا:

یەکەم: ڕووتان ڕەش دەکەن مەرج نیە ئەو ڕوو ڕەشیە بریتی بێت لە خەڵوز و بیدەن لە دەم و چاوتان.. بەڵکو بریتیە لە شکاندنی کەسایەتیان لە ماسمیدیاکاندا، چی پیلانیان گێڕاوە بۆ خەڵکی سەر زەوی هەمووی کەشف دەبێ بۆ هەموو خەڵکی دەردەکەوێ کە چەندین ساڵە یەهود فێڵیان کردووەو ڕاست نەبوون لەگەڵ خەڵکیدا.

دووەم: [وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ ] ئەو دوژمنانەتان کە بریتین لە قەومێکی خواناس دێنە ناو ئەو مزگەوتەوەو ڕزگاری دەکەن لە دەستان.

سێیەم: [وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ] هەرچی ئەپارتمانێکی بەرز لە قودس کە هەیە هەمووی دەڕوخێنرێ، کەواتە [لَفِيفًا ] ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو دیاردەیە کە ڕوویدا سزاکەش لەگەڵیدایە لە هەمانکاتدا.

کە ژمارەی وشەکانی ئایەتەکان دەژمێری (١،٢،٣) [لَفِيفًا ] کۆتایی وشەیە لە ئایەتی ١٠٤ زنجیرەی ئەم وشەیە دەکات «١٤٤٣».

یەکێك لە نهێنیانە:

هەموو وشەیەك لەو وشانە ئاماژەیە بۆ ساڵێك لە ساڵەکان.. ئەمە دادەنرێ بە ساڵی کۆچی ٢٠٢٦ عیسایی بەرامبەر بە ١٤٤٣ ی کۆچی.

لەوانەیە کەسانێك پرسیارمان لێبکەن و بڵێن: ئێوە بەڵگەتان چیە؟

لە وەڵامیاندا دەڵێین: بەڵگەمان زۆر بە هێزە، چونکە ئەم ١٩٤٨/٦/١٠ بریتیبوو لە ٣ ی شەعبان ی ساڵی ١٣٦٧ کۆچی، ئەگەر ئەم ژمارە ڕۆژانەی بۆ زیاد بکەین دەکاتە ٢/شعبان/١٤٤٣ ئەمە هەمووی نهێنی و ڕازی ڕێزبەندی قورئانە.

ئاشکرایە لای بەڕێزتان کە لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەو ١٩٤٨ سەرەتای فەساددی دووەم بوو، لە پێنجی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ع ئیسرائیل پەلاماری سوریاو سینایداو هەمووی داگیرکرد، گەورەی کرد لەسەر حیسابی زەوی موسڵمانان لەو شەڕەدا ئیسرائیل سەرکەوت ٥،٦،٧،٨،٩ حوزەیران هەموو شتێکی تەواو کرد و لە ١٠ ی حوزەیران ئاگر بەست ڕاگەیانرا هەموو شتێك بڕایەوە (١٩٦٧/٦/١٠)ع ئەو کاتە هەمووی داگیر کرا تا ئەمڕۆ سینا نەبێت کە داویەتیەوە بە میسر، بە گوێرەی ڕێکەوتنێك ئەگەر تەماشا بکەین ١٩٤٨/٦/١٠ تا ١٩٦٧/٦/١٠ ڕێك ١٩ ساڵە.

لە سورەتی (سبأ) لە ئایەتی ١٤ کە لە «فاء» ەوە دەست پێ دەکات (فلما قضينا عليه الموت ما دلهم على موته) ئایەتەکانی پێش ئەو ١٩ وشەیە ٨٤ پیتە، ئەم ئایەتە باسی گەورەبوونی دەوڵەتی سولەیمان دەکات باسی ڕامبوونی «جن» دەکات کە کۆشك و تەلاریان کردووەو کەناڵی ئاویان ڕاکێشاوە و کارگەیان داناوەو کە لە توانای مرۆڤدا نیە.

ئەم ١٩ کەرەتی ٨٤ بکەین ئەم دوو ژمارەیە کە لێکدانی یەکتری دەکەین دەکاتە ١٥٩٦ ، لە تەوراتدا دەڵێت: حوکمی سولەیمان ٤٠ ساڵ بووە، ٤٠ ساڵی لێ دەرکەین دەکاتە ١٥٥٦، ئایا ئەم ژمارەیە چیە؟[1]

ئەم ژمارەیە بریتیە لە وەفاتی پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) هەتا هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ قودس ساڵی شەمسیە ئەو ژمارەیە ئەو حیکمەتەی تێدایە.

وتەیەکی خۆشی تریش لێرەدا هەیە ئەگەر تاکە تاکەی ژمارەکانی ئەم پێکهاتەیە کۆبکەینەوە بەم چەشنە ٦ +٥+٥+١=١٧. ڕیزبەندی سورەتی (إسراء) لە قورئاندا ١٧ یە.

جوولەکەکان باوەڕیان بە «مذنب هالی» هەیە کە لە ساڵی ١٩٤٨ع لە دوورترین خاڵدا بوو لە خۆرەوە ، لە ١٠/ شباط / ١٩٨٦ ع هەموو بە چاو بینیمان لە نزیکترین خاڵدا لە خۆرەوە، ئەم ئەستێرەی کلکداری هالیە هەموو ٧٦ ساڵ جارێك دێت.. لە کتێبی ئایینی یەهودیدا پەیوەندی بە دروست بوونی دەوڵەتەکەیان هەیە.

بەڵام لێرەدا پرسیارێکی سەیر دروست دەبێت؟ کە حیسابی نیوە دەورە دەکەین دەبێ ٣٨ ساڵی پێ بچێت نیوەکەی تریش ٣٨ دەکاتە ٧٦ .

بەگوێرەی ئاماری بیرکاری بێت دەبێ ساڵی ٢٠٢٤ ع هالی بگەڕێتەوە چونکە لە ٨٦+٣٨=٢٠٢٤. بەڵام هەرچی کۆمپیوتەر هەیە کە زانیاری لەسەر «هالی» پێدراوە کە لێی دەپرسی کەی دەگەڕێتەوە ؟ لە وەڵامدا دەڵێت : ساڵی ٢٠٢٢ « ئەمەش نهێنیەکی سەیرە .

یەکێك لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکان» مایکرۆ کۆمپیوتەر « کە دکتۆرێکی میسری دایناوە دەڵێت: هەموو کۆمپیوتەرێك کە زانیاری و داتای پێویستی پێدرابێ دەڵێ: هالی لە ساڵی ٢٠٢٢ ع جارێکی تر پەیدا دەبێتەوە .

---

(١) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٦ .

دەرکەوت ڕۆیشتنی هالی لە ساڵی ١٩٤٨ع هەتا ساڵی ١٩٨٦ ع دەکاتە ٣٨ ساڵی شەمسی، بەڵام ٣٨ ساڵی قەمەری دێتەوە کە دەکاتە ساڵی ٢٠٢٢ ع.

ئەگەر ئەو ماوەیە حیساب بکەین کە لە نێوان دروست بوونی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕووخانیدا هەیە ٦٢١/١٠/١٠ عیسایی هەتا ٣/٥/ ٢٠٢٢ دەکاتە «١٤٠٠٤» ساڵ.

* ١٥٥٦ کە ماوەی فەسادی یەکەمە[1].

* ١٤٠٠،٤ کە ماوەی فەسادی دووەمە .

ئەگەر ئەم دوو ژمارەیە جارێك کۆبکەینەوەو جارێکیش لێکی دەربکەین ئەنجامەکەی بەم شێوەیە دەبێت .

١٥٥٦ + ١٤٠٠٤ =٢٩٥٦,٤ .

١٥٥٦ - ١٤٠٠٤ = ١٥٥,٦ ئایا ئەم دوو ژمارەیە پەیوەندیەك لە نێوانیاندا هەیە؟

بەڵێ.. پەیوەندی نێوان ئەم دوو ژمارەیە ئەوەیە ژمارەی یەکەم ١٩ جار لە ژمارەی دووەم گەورترە.

١٩ بریتیە لە ١٠ + ٩ .

ئەگەر ١٥٥,٦ * ١٠ = ١٥٥٦ بەرواری فەسادی یەکەمە .

ئەگەر ١٥٥,٦ * ٩ = ١٤٠٠،٤ بەروای فەسادی دووەمە .

واتە: ئەم ژمارانەش ڕازی خۆیان تێدایە.

ڕۆژی «شەممە» لەلای جولەکەکان هەموو ٦ ڕۆژێك حەوتەمینەکەی دەبێ پشوو بدەن، دەبێ واز لە کار بهێنن، هەموو شەش ساڵێ بۆ حەوتەمەکەی نابێ زەوی بکێڵن قەلەمی مێو بکەن، جۆرە ئیشێکی بازرگانی کشتوکاڵی پیشەسازی بکەن ، بە دەقی تەورات سزای لەسەرە.

---

(١) زوال اسرائیل، بسام حرار، لا ٣٢ .

«شەممە» واتە پشودان سڕبوون «شەممە» لەوە هاتووە .

ئێمە لێرەدا دوو بەروارمان دەرهێنا بەرواری عیسایی و کۆچی .

(٢ شەعبانی ١٤٤٣ کۆچی ) یان (٢٠٢٢/٣/٥) بە بەرواری عیسایی کە دەوڵەتی ئیسرائیل نامێنێ بە شەممە دەست پێ دەکات و بە شەممە کۆتایی دێت[1].

بێینە سەر بەرواری جوولەکەکان خۆیان کە پێی دەگوترێ «ساڵنامەی» عیبری ئەم بەرواره ٢٠٢٢ع بە ساڵنامەی عیبری ٥٧٨٢ دەکات ٥٧٨٢ بێین ئەم ژمارەی ٧ بکەین بۆ ئەوەی بزانین چەند جار «سبت» هاتووە ٨٢٦ دەردەچێت، ٥٧٨٢ + ٧ = ٨٢٦ بە گوێرەی شەریعەتی خۆیان دەبوایە ٨٢٦ ساڵ پشوویان بدایەو ئیشیان نەکردایە.

ئێستا ئەم راستیە بنووسین «سبت بنی ئیسرائیل» واتە: سڕبوونی بەنی ئیسرائیل، بەڵام تێبینی بکەن بە پێی ڕەنووسی قورئانی پیرۆز «مصحف عثمان» واتە: ناکەین بۆ وشەی ئیسرائیل بە حیسابی ئەبجەد وەری بگرین دەکاتە ٨٢٦ .

(شەممە ٥ ی ئازار بەرواری لەناو چوونیانە «سبحان الله» ئەگەر بنووسین «السبت» ٥ ی ئازار بە حیسابی ئەبجەد وەری بگرین .

٤٩٣ + ٥ +٩٠٣ دەکاتە ١٤٠١ .

لە ٦٢١ ی زایینیەوە کە دەرچوونی پێغەمبەرە بۆ قودس هەتا ئەم بەروارەی لێدەریکەین ٢٠٢٢ – ٦٢١ = ١٤٠١ .

دوای ١٤٠١ ساڵ لە بەرواری «ئیسراء» دەوڵەتی ئیسرائیل نامێنێ، ئەگەر ٢٠٢٢ بە عەرەبی بنووسین وەکو ڕەنووسی «مصحف عثمان» دەڵێین: (ألفان واثنین وعشرون) ئەگەر ئەمە کۆبکەینەوە بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ١٤٠١ .

---

(١) زوال اسرائیل، بسام حرار، لا ٣٧ .

ئەو ئایەتەی کە گوتمان کۆتایی هاتووە بە (لفیفا) ئایەتی ١٠٤ ی سورەتی «ئیسراء»ە، [فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفٗا ] وشەکانی لە ئایەتی دوو وە ژمێردران تا وشەی (لفیفا) ، کە ڕیز بەندیەکەی ١٤٤٣ بوو دوای ئەمە ئایەتی ١٠٥ دێت (وبالحق أنزلناه وبالحق نزل) وشەی (بالحق) ڕیز بەندیەکەی ١٤٤٤ دەبێت، وشەی (أنزلناه) ١٤٤٥ دەبێت، (بالحق) ١٤٤٦ (نزل) ١٤٤٧، ئەم ژمارانە کۆبکەینەوە ئەکاتە ٥٧٨٢ بە ساڵنامەی عیبری واتە: لەناوچونتان بە ساڵی کۆچی ١٤٤٣ لە هەمووشی سەیرتر بە حیسابی ئەبجەدی ئەم ئایەتە کۆبکەیتەوە (فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ) کە تۆڵەی کۆتایی خوا هات دەکاتەی ٢٠٢٢ [1].

دەبێ بزانین ململانێی جولەکە بەردەوام دەبێت بەڵام ئەمە تەنها لە ڕوانگەیەکی زانستی قورئانیەوە بەرواری لەناوچوونی دەوڵەتەکەیانە، بەڵام جوولەکە دەمێنێت بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەجال و شوێنکەوتوانی زۆربەی جوولەکە دەبن، کێشەیان هەر درێژەی هەیە بەڵام دەوڵەتیان لە ٢٠٢٢/٣/٥ نامێنێت .

بەڵێ.. لە قەدەری جوولەکەدا خوای گەورە نوسیویەتی کە دوو جار بواریان بۆ دەڕەخسێت لە خاکی (فەڵەستین) دەسەڵات بگرنە دەست و مزگەوتی (بەیت و المقدس)یش بکەوێتە دەستیان، جاری یەکەم لە دوای وەفاتی پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) کە هەرچی خوا پێی ناخۆشە لە ماوەی دەسەڵاتیاندا کردیان بە جۆرێك کە گاڵتەیان بە شەریعەتی خوایان دەکردو دەیان پێغەمبەری نێردراوی خوایان سەر بڕی، تا خوای گەورە ڕق و قینی خۆی ڕشت بەسەریانداو لەشکری (نبوخذ نصر)ی ناردە سەریان و تەخت و تاراجی لەبن دەرهێنان و زیاتر لە (٥٠٠) هەزار کەسی لێ کوشتن، ئەوەشی کە ماوە بە کۆت و زنجیرکراوی ڕەوانەی شاری (بابل) کرد، بە جۆرێك کە بۆ ماوەی دوو سەدە خۆیان نەوەکانیان لەو شارەدا دەست بەسەر بوون، وە لەو کاتەوە هەتا ئەم سەدەیە جولەکە پەرتەوازەو ئاوارەی وڵاتان بوون، تا لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا بەشی دووەمی ئەم قەدەرە خواییە هاتە دی و بۆ جاری دووەم لە

---

(١) زوال اسرائیل، بسام حرار، لا ٣٧ .

خاکی (فلسطین) و (بەیت و المقدس) دەسەڵاتیان گرتەوە دەست، بەڵام هەر عاقڵ نەبوون، ئەم جارەش زۆر زیاتر لە جاری یەکەم دەستیان داوەتە خراپەکاری، بەجۆرێك کە فەسادی جوولەکە لە هەموو قوژبنێکی ئەم دونیایەدا ڕەنگدانەوەی هەیە، وە ڕق و کینەی پەرتەوازەیی ئاوارەیی و سەرگەردانی زیاتر لە دوو هەزار ساڵی بەرامبەر هەموو خەڵکی جیهان لەخۆ گرتووە[1].

دەزگای سیخوڕی ئەمریکی CIA پێشبینی ئەوەیدا کە دەوڵەتی جوولەکە لەسەر خاکی فەلەستین لە مەترسیدایەو پێ دەچێت لە ماوەی (٢٠) ساڵی داهاتوو دەوڵەتی ئیسرائیل نەمێنێت لەسەر خاکی فەلەستین بەپێی ئەو بۆچون و سەرنجانەی کە ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکی پێشبینیان کردووە، لە ئێستادا گەڕانەوەی ئەو هاوڵاتیانەی کە دانیشتووی ئیسرائیلن بۆ وڵاتانی تری جیهان زیادی کردووەو بە پێچەوانەی (٢٠) ساڵی ڕابردوو کە لە هەموو جیهانەوە جوولەکەکان بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە.

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون بەپێی هاوڵاتیانی کۆچکردوو ساڵانی ١٩٤٧ بۆ ١٩٤٨ع کۆچکردوانی ساڵی ١٩٦٧ع بۆ فەلەستین ئەوا ڕێژەی ئێستای ئەوانەی بە پێچەوانەوە لە ئیسرائیلەوە کۆچ دەکەن بۆ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو بە تایبەتی کالیفۆرنیا زۆر زیاترە لەو هاوڵاتیانەی کە لەو ساڵانەدا بەرەو فەلەستین کۆچیان کردوە، لە کۆی (٥٠٠٠٠٠) ئیسرائیلی (٣٠٠٠٠٠) هەزاریان کۆچیان کردووە بۆ کالیفۆرنیاو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەوانەشی کە تا ئێستا پاسپۆرتی ئەمریکیان نیە لە هەوڵی بەدەست هێنانی دان.

یاسا ناسی گەورەی نێو دەوڵەتی (فرانکلن لامپ) لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی (برس)دا لەو بارەیەوە گوتی: هۆکاری ئەم کۆچکردنەیان ئەو ڕاستیەیە کە هەموو ڕۆژێك هەستی پێ دەکەن، کاتێك کە لەبەردەم دیوار ڕادەوەستن و بەچاوی خۆیان دەیخوێننەوە، هەروەها گوتی: ئەمریکیەکان بە پێچەوانەوە هانیان دەدەن کە بگەڕێنەوەو بە شێوازێکی زۆر ڕەگەز پەرستانەوە دەڕواننە داهاتویان.

---

(١) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٨ .

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیەش دەرکەوتووە کە ژمارەی فەلەستینیەکان لە زۆربوون دایەو لە داهاتوودا ژمارەی فەلەستینیەکان زۆر زیاتر دەبێت لە ژمارەی جولەکەکان[1].

هەروەها (لامپ) گوتیشی لە ماوەی گەمارۆی (٣) ساڵی سەر کەرتی غەززە سەرنجی ڕای گشتی جیهانی بەلای کەرتی غەزەو فەلەستینیەکاندا ڕاکێشا ڕای گشتی ئەمریکاش لەو بارەیەوە زۆر گۆڕاوە لەوەی کە ماوەی (٢٥) ساڵی ڕابردوودا هەموو ئەو هاوکاریانەی پێشکەش بە جوولەکەو قەوارەی جوولەکە کراوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: کاتێ کە پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێبێ) (بیت المقدس)ی دروستکرد، داوای سێ شتی لە خودا کرد، خوای گەورە دووی بۆ هێنایە دی، وەمن ئومێد دەکەم سێیەمیشی بۆ بێتە دی.. داوای کرد حوکم و دەسەڵاتێکی بداتێ بە گوێرەی حوکم و بڕیاری خودا بێت، خودا پێی بەخشی، وە داوای کرد خوا موڵکی بداتێ بۆ کەسی تر نەبێ لە دوای خۆی، خوای گەورە ئەویشی پێ بەخشی، وە داوای کرد هەر کەسێك لە ماڵ بچێتە دەر تەنها مەبەستی نوێژکردن بێت لە (مسجد الأقصى)[2] ئەوە لە گوناهەکانی دەردەچێت وەکو ئەو ڕۆژەی لە دایك بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ئێمەش داوا کارین کە خوای گەورە ئەوەشی پێ بەخشی بێت.

ئەو قودسەی کە ئێستا دەیبینین لە ژێر چەپۆکی سەهیۆنیەو لەلایان دەسەڵاتدارانی عەرەب و موسڵمانان زۆر بێ نازەو بێ سەرپەرشتیارە..بەڵام لە ڕاستیدا زۆر شوێنێکی گەورەو پیرۆزە.

---

(١) زوال اسرائيل، بسام حرار، لا ٣٩.

(٢) مزگەوتی ئەقسا: واتە: ئەو پەڕی دووری چونکە دوورترین پەرستگاو مزگەوت بوو لە کەعبە کە خودای تێدا پەرسترا، یان چونکە دوورە لەپیسی، یان لە چاو مەدینە دوورترە لە کەعبە، وەنزیکەی (٢٠) ناوی هەیە کە ئەمانەن:(إلياء .. بيت المقدس.. القدس.. أوري سليم.. كور.. بيت إيل.. سلم.. شلم.. صهيون.. مصرون.. كورشيلا.. بابوس...

ئەم فەرمودانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە دەسەلمێنن کە دەبێ موسڵمانان هەوڵ و کۆشش بدەن بۆ گەڕاندنەوەی مزگەوتی (ئەقصی) بۆ باوەشی ئیسلام و موسڵمانان و جیاوازی پێنەکرێ لەگەڵ شاری مەککەو مەدینە.

قودس بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) ئازاد کراوە دوای ئەوەی لەسەر دەستی خاچ پەرستەکان داگیر کرا، پاشان سەر لە نوێ شەرەفی ڕزگارکردنی مزگەوتی ئەقسا بە (سەلاحەددینی ئەیوبی) درا.

ئەم جارەیان جوولەکە لەسەر پلانیووردو نهێنی و نەخشەی دارێژراو کار دەکەن، مەبەست و ئامانجیشیان هەروەك خۆیان دەڵێن: گێڕانەوەی حوکمی پێغەمبەر داووده (سەلامی خوای لێ بێ)، وە بنیاتنانەوەی هەیکەلەکەی پێغەمبەر سولەیمانە (سەلامی خوای لێبێ) لە شوێنی ئێستای (بيت المقدس) دا پاش ڕووخاندنی مزگەوتەکە، پاشانیش لەوێوە دەوڵەتێکی جیهانی دابمەزرێنن کە حوکمی هەموو جیهان بکات و سەرجەم خەڵکی جیهان کە جوولەکە نین بکەنە نۆکەرو خزمەتکاری جوولەکەو تۆڵەی دوو هەزارساڵی ڕابردوویان لێ بکەنەوە[١].

لەو پێناوەشدا لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا گەورە سەرمایەدارانی جوولەکەو پیاوانی بەرزی ئاینیان لەسەرانسەری جیهاندا چەند کۆنگرەیەکیان ئەنجامدا بە مەبەستی نەخشەدانان بۆ گەیشتن بەم ئاواتە، کە دواترینیان لە ساڵی (١٨٩٧) ع لە شاری (بازل) لە سویسرا ئەنجامدرا لە ژێر چاودێری (تیودور هرتزل) [٢]

---

(١) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١٧٠.

(٢) (هرتزل) کەسێکی بەناوبانگە لەناو جوولەکەکان، دامەزرێنەری بزوتنەوەی زایۆنزمی جیهانیە، کاتێك داوای لە سوڵتان عبدالحمید کرد کە فەڵستینی پێ بدات تا دەوڵەتی جوولەکەی لێ دابمەزرێنێ، سوڵتان ئەم وەڵامەی دایەوەو گوتی: (هرتزل) واز لەو داوایە بهێنەو هەنگاوی بۆ مەهاوێ، چونکە ناتوانم واز لە تەنها بستێکی زەوی بهێنم ئەوە موڵکی من نیە، بەڵکو ماف و موڵکی موسڵمانانە، وە گەلی موسڵمانان ئەو زەویەیان بە خوێنی خۆیان ئاو داوە، هەر کاتێك خیلافەتی ئیسلامی نەما با ئەوانیش فەلەستین بەرن،

که ناسراوه به باوکی جووله‌که، پوخته‌ی ئه‌و نه‌خشه‌و پلانه‌ش که له‌لایان سه‌رانی جووله‌که‌ی جیهانیه‌وه له‌م کۆنگرانه‌دا دارێژرا ناونرا (بروتوکولات حکماء صهیون) و گرنگترینی خاڵه‌کانیشی ئه‌مانه‌ن:

ده‌ست به‌سه‌ر داگرتنی ته‌واوی سه‌رچاوه‌کانی پاره‌و زێڕو هۆکاره‌کانی ڕاگه‌یاندن له جیهان، که به‌هۆی پاره‌وه ده‌توانن هه‌ر فیتنه‌و ئاشوبێك له هه‌ر شوێن و کاتێکدا خۆیان بیانه‌وێت دروستی بکه‌ن و ئه‌و لایه‌نه‌شی تێدا سه‌ر بخه‌ن که خۆیان مه‌به‌ستیانه، وه له ڕێگه‌ی هۆکاره‌کانی ڕاگه‌یاندنیشه‌وه ده‌توانن قه‌ناعه‌تی خه‌ڵکی بگۆڕن و ڕای گشتی جه‌ماوه‌ریش به ئاره‌زووی خۆیان هه‌ڵسوڕێنن.

داماڵینی خه‌ڵکی له ئاینی ئیسلام و مه‌سیحیه‌ت و ڕووخاندنی حکومه‌ته دینیه‌کان، چونکه ئاین گه‌وره‌ترین به‌ربه‌رسته له‌به‌ر به ئه‌نجام گه‌یشتنی پیلانه‌کانی ئه‌واندا ئه‌ویش له ڕێگه‌ی:

أ- دارشتنی چه‌ند بیرۆکه‌یه‌کی نوێ له بواره جیاجیاکانی ژیان له‌لایه‌ن چه‌ند زانایه‌کی خۆیانه‌وه که ئه‌و بیرۆکانه دژ به دین بن و ئاین له ژیاندا داببڕن، وه ئه‌مانیش له ڕێگای هۆکاره‌کانی ڕاگه‌یاندنه‌وه خه‌ڵکی قه‌ناعه‌ت پێ بکه‌ن[1].

بۆ نموونه:

• بیرۆکه‌ی شیوعیه‌ت له‌لایه‌ن (کارل مارکس و ئه‌نجلس) که هه‌ردووکیان جووله‌که‌ن.

• بیرۆکه‌ی گێڕانه‌وه‌ی بنچینه‌ی مرۆڤ بۆ مه‌یموون له‌لایه‌ن (چارلس داروین) که ئه‌ویش جووله‌که‌یه[2].

---

نه‌خێر پێم خۆشه پارچه پارچه‌م بکه‌ن، به‌ڵام فه‌له‌ستین له ده‌وڵه‌تی ئیسلامی دانه‌بڕن، ئێمه نامانه‌وێت به زیندووی تونکاریمان بکه‌ن .

(١) بروتوكولات حكماء صهيون ، محمد خليفة التونسي بروتوكول ، لا ١٢ .

(٢) ماوه‌یه‌ك پێش ئێستا له چه‌ند ڕۆژنامه‌یه‌کی جیاجیا بڵاوبویه‌وه که خه‌ڵکانێك ده‌یانویست بگه‌ڕێنه‌وه سه‌رم ئه‌م فیکره‌ی داروین، بۆیه به پێویستم زانی چه‌ند ساتێك له‌گه‌ڵ قسه‌کانی

(داروین) بین بۆ ئەوەی بزانین لەم بوارەدا چیمان پێ دەڵێت: ئەفسانەی گەڕاندنەوەی ئەسڵی مرۆڤ بۆ مەیمون سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانیە کۆنەکان ، بەڵام کاتێك (چارلز داروین) ی بەریتانی ئەم ئەفسانەیەی هێناو خستیە دوو توێ ی کتێبێکی زانستیەوەو لە ساڵی (١٨٥٩)ع بڵاوی کردەوەو وای لێهات پانتاییەك لە ناوەندە زانستیەکان داگیر بکات و بووە هەڵێك بەدەست خاوەن بیرو ئایدیا چەپ و پڕوپوچانەی دەیانگوت: گەردون بە ڕێکەوت دروست بووەو دەستی هیچ دروستکەرێکی لە پشتەوە نیە، داروین لەم کتێبەیدا باس لەوە دەکات کە زیندەوەرەکان هیچیان لە یەك جیا نین و هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ سەر یەك بنەماو بەسەرچوونی کات گۆڕان بەسەریاندا هاتووەو بوونەتە ئەمەی ئێستا هەن .

ئەم دژایەتی کردنەی گەردوون هیچ بنەماو بەڵگەیەکی زانستی لە پشتەوە نەبووە، چونکە هەر خۆی لەسەرەتای کتێبەکەیدا دان بەوەدا دەنێت و لە بابەتێکدا باس لەو نارەحەتیانە دەکات کە ڕووبەڕووی تیۆرەکەی بونەتەوەو ناوەڕۆکی بابەتەکەی دەردەخات و دەڵێت: ئەم بیردۆزەیە نەیتوانیوە وەڵامی زۆرێك لەو پرسیارانە بداتەوە کە هاتونەتە بەردەمی و دەستەوسان بووە لە بەرامبەریاندا .

ئەو بەربەست و نارەحەتیانەی لەو سەردەمەی خۆیدا ڕوبەڕووی تیۆرەکەی بویەوە واچاوەڕوان دەکرا پێشکەوتنەکان لایبەرن و دەرکەوتووە لێکۆڵینەوە زانستیەکان پاڵپشت بن بۆ ئەم تیۆرە، بەڵام دەرەنجامەکان پێچەوانەی چاوەڕوانیەکان بوون و ئەو پارچە لەقانەی تیۆرەکەی پشتی پێ بەستبوو یەك لە دوای یەك تێکشکان و پوچەڵ کرانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو پڕوپاگەندەو بازاڕ گەرمیەی برەوی بەم بیردۆزەیە دەدا، بەڵام نەیتوانی بگاتە خواستی خۆی و تاسەر بخایەنێت .

زانای بەناوبانگی بایەلۆجی (میشیل دانتون) لە کتێبەکەیدا بەناوی (تیۆرەکە لە قەیراندا) هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی ئەم بیردۆزەیەو بەزینی لەبەرامبەر زانست دا لە چەند خاڵێکدا دەخاتە ڕوو لەوانە:

- هەتا ئێستا ئەو تیۆرە نەیتوانیوە ئەوە ڕوون بکاتەوە کە سەرەتا ژیان لەسەر گۆی زەوی چۆن دەستی پێکردووە .

- داروین ئەوەی لە کتێبەکەیدا دەیخاتە پێش چاومان هیچ بنەمایەکی نیەو بێ تواناو دەستەوسانە لە ئاست سەلماندن و گەشەسەندنی مرۆڤ کە لە ڕاستیدا ئەمە لەبار چوونی مرۆڤە نەك گەشە سەندن هەر لەکاتی خۆیداو بەدەرکەوتنی تیۆرەکە زۆر دژایەتی کراو لەلایان بیرو ڕا جیاوازەکانەوە بەربەرچ درایەوەو جگە لەوەی بەڵگە ئاشکراکانی قورئان و گەردوون هەر زوو بە ساوایی لەباریان برد، دۆزینەوە زانستیەکانیش بەدرۆیان خستەوە، بەڵام دۆزینەوەکان لەبەرچاوی ڕای گشتی دەشاردرانەوە، چونکە چەپەکان جگە لەم بیردۆزە

جوولەکە لە پشت زۆرترین خراپەکانی ئەم دونیایەوەن و لە هەرکوێ بووبن میوانێکی ڕەزا تاڵ بوون و لە هیچ شوێنێك جێیان نەبۆتەوە!

جوولەکە فوویان کرد بە بیردۆزی داروین داو دەیانویست بەهەر فرو فێڵێك بێت دژی دین بەکاری بهێنن و بەخەڵکی بسەلمێنن کە نەوەی مەیموون!

هەروەها ئەو زانایەش کە پڕوپاگەندەی بۆ ئەو بیردۆزەی دەکرد لە گۆڤاری (العلوم الأمريكية) ساڵی ١٩٦٥ع لە بارەیانەوە دەڵێ: ئەو زانایانەی کە باس

---

بێ بنەما هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو بۆ دژایەتی کردنی ئەسڵی خیلقەت و بوونی خوایەتی بێ هاوتاو دروست کەر .
ئەم بیردۆزەیە هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی بووە جێی مشتومڕی بیرمەندو لێکۆڵەرەوان و لە نێو ئەو فەرهەنگ و شارستانیانەی لەسەر بنەمای دین بنیات نرابوو هەڵایەکی زۆری نایەوە ، بۆیە نەیتوانی درێژە بخایەنێت و لەبار برا ، ئەوەتا ئێستاش دوای (١٥) ساڵ لێکۆڵینەوە لەلایەن گرووپێکی زانستی ئەمەریکی یەوە ئەم تیۆرە پوچەڵ کرایەوە ئەویش بە دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەرێك کە دەگەڕێتەوە بۆ (٤٤٠,٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش .
ئەم گرووپە زانستی یە کە پێك هاتوون لە چەند زانایەکی بایەلۆجی و زانکۆکانی (کالیفۆرنیاو کیت سێت) دوای لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ لەسەر ئەم پەیکەرە لە ڕاپۆرتێکدا گۆڤاری (ساینس)ی ئەمەریکی بڵاوی کردەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەسڵی مرۆڤ هەر مرۆڤەو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە ئەو بیردۆزەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات مرۆڤ لەوەچەی مەیمونە، ئەمەش هیچ بنەمایەکی زانستی نی یەو هیچ پەیوەندیەك نیە لە نێوان مەیمون لە جۆری (شەمپازیا) و مرۆڤدا ، وە دوای سەڵماندنی ڕاستیەکە ئەوەش دەخەنە ڕوو کە ئەو بیردۆزەیە هەڵەیەو تا ئێستا هەر زانستێکی زیندەوەرزانی لەسەر ئەو بچینەیە پێ ئەبێت هەڵدەوەشێنرێتەوەو کاری پێ ناکرێت.
هەروەها زانای جیۆلۆجی بەناوبانگ (د.زغلول نجار) لەم بارەیەوە دەڵێت : ئەم دۆزینەوەیە گورزێکی کاریگەرو بەهێزە بۆ بیرۆکەکەی داروین کە لەلایەن خودی خۆیانەوە بەدرۆ خرایەوەو هەڵوەشێنرایەوە کە ساڵانێکە نەك هەر ڕۆژ ئاوا بەڵکو وڵاتانی عەرەبیش لەسەر ئەو تیۆرە پروپوچەڵە دەرۆن و کاری پێ دەکەن .
لێرەدا پەی بە گەورەیی و ڕوونی بەڵگەکانی خوای پەروەردگار دەبرێت کە هەموو زانستەکان دەرخەرو سەلمێنەری ئەو ڕاستیەن و هەموو بیردۆزە زانستی یەکان لە ئاستیدا دەبنە بڵقی سەر ئاوو لەناو دەچن و دەستەوسانی ئەوانە دەردەکەوێت کە لە ئاست یەك پیتی قورئاندا چەندە بێ دەسەڵاتن .

لە (تطور) دەکەن ئەمانەتی عیلمیان نیە بۆیە پەنا دەبەنە بەر هەر فێڵێك تا دەلیلی درۆ بچنن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە دەیانەوێت.. ئەمەش وای کرد کە ئێستا لە ئەمریکادا بەڕەسمی بیردۆزی داروین لەبەرنامەی خوێندندا لابرێ و بەتەواوی ڕیسوا بوو!

نوسەرێکی جوولەکە کە ناوی (بنسکر)ە گاڵتە بە جوولەکە دەکات و دەڵێ: ئەوەی بڵێ جوولەکە گەلی هەڵبژێردراوی خوا نیە کوێرە.. ئەوان خوا هەڵی بژاردوون بۆ ئەوەی هەموو جیهان ڕقی لێیان بێت.

(کلاتزکین) کە ئەمیش جوولەکەیەو دەڵێت: جوولەکە گەلێکی ڕاڕاو بێ بناغەن و ژیانێکی درۆ و فاسید دەژین.

• بیرۆکەی ڕەهای جنسی لەلایەن (سیجموند فرۆید) کە ئەویش جوولەکەیە .

• بیرۆکەی (عبثية وجودية) لەلایەن (جان پۆل سارتر) کە ئەویش جوولەکەیە .

• بیرۆکەی دروست بوونی کۆمەڵگاکان لەلایەن (دوکاریم) کە ئەویش جوولەکەیە.

• بیرۆکەی ئیلحادیەت لە فەلسەفەدا لەلایەن (فردریك نیتشە) کە ئەویش جوولەکەیە .

وە دەیان بیرۆکەی تر کە بونە مایەی وەلانانی ئاین لە فیکرو ڕەفتارو ژیانی خەڵك.

ب- هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم کە بەشێوەیەك نەخشەی بۆ داڕێژرابوو کە ئاکامەکەی بە ڕووخاندنی هەردوو دەوڵەتە ئاینەکەی جیهانی ئەو کاتە کۆتایی پێ بێت، واتە: دەوڵەتی خیلافەتی عوسمانی ڕەمزی ئیسلام و دەوڵەتی قەیسەری ڕوسیا ڕەمزی مەسیحیەت تا کەس نەمێنێت بەرگری لە ئاین بکات و ببێتە بەربەست لەبەردەم بە ئەنجام گەیشتنی پلانەکانی جوولەکەدا[1].

وە لە شوێنی ئەواندا دوو دەوڵەتی تریان دروست کرد لەسەر بناغەی بێ

(١) أحجار على رقعة الشطرنج ، وليام غاي كار ، لا ٢٠ .

باوەڕی و دوژمنایەتی کردنی ئاشکرای ئاین، یەکەمیان: دیکتاتۆریەتی شوعیەت بوو لە ڕوسیا لەسەر دەستی (لینین و تروتسکی) کە هەردووکیان جوولەکە بوون، ئەوی تریشیان دیکتاتۆریەتی عەلمانی تورکیا بوو لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتورك) ی بەکرێ گیراوی جوولەکە، بەم دوو ڕێگایە توانیان کە ئیلحادو عەلمانیەت و بێ دینی بکەنە دروشم و کاڵای جیهان لەسەدەی بیستەم[1].

هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم کە بەشێوەیەك نەخشەی بۆ داڕێژرابوو کە ئاکامەکەی بە دروست کردنی دەوڵەتێکی جوولەکە لە (فەڵەستین) کۆتایی پێ بێت، هەروەك لە ساڵی (١٩٤٨)ع ئەو دەوڵەتە ڕاگەیەندرا.

ئەمەو لە ڕێگەی ئەم دوو جەنگەوە سەرمایەدارانی جوولەکە توانیان بەشی زۆری سەرچاوەکانی پارەو ئابوری جیهان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان .

کارکردن بۆ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی سێیەم کە لە باسی (الملحمة الکبری) ڕوونمان کردەوە، بە شێوەیەك نەخشەی بۆ داڕێژراوە کە هەردوو جیهانی ئیسلامی و مەسیحی تێدا بدرێت بەیەکداو هەردوو لایان بەیەکتر لەناوبەرن و مرۆڤایەتی دووچاری نەهامەتی و قەیرانێکی وەها بکەن کە دەسەڵاتی هیچ شتێك نەمێنێت و ڕازی بێ بە هەر کەس کە بتوانێت کۆتایی بەو جەنگ و ماڵ کاولیە بهێنێت.

پاش کۆتایی ئەو جەنگە دێنە سەر جێبەجێکردنی خاڵی کۆتایی نەخشەو پلانەکانیان ئەویش هاتنی ئەو ڕزگارکەرەیە کە پێویست وایە لەسەر دەستی دا کۆتایی بە هەموو جەنگ و ناکۆکیەکانی جیهان بهێنرێت و دەوڵەتێکی جیهانی دابمەزرێنێت لەسەر شێوازی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمڕۆ کە بتوانێت حوکمی هەموو جیهان بکات، ئەو ڕزگار کەرەش لە پرۆتۆکۆلەکەیاندا باسی دەکەن، دەبێ پاشای هەموو جیهان بێت و هەموو جیهان بە خوای بزانێت و بۆ ئەم مەبەستەش گەورەترین درۆو بوختان لە مێژوودا هەڵدەبەستن کە گوایە ئەم

---

(١) أحجار علی رقعة الشطرنج ، وليام غاي كار ، لا٢١ .

ڕزگارەکەرە (مەسیح) خۆیەتی و جارێکی تر دابەزیوەتە سەر زەوی بۆ ئەوەی خوایەتی لەسەر زەوی دا بکات و بەندەکان و شوێن کەوتووەکانی و جیهان بە گشتی ڕزگار بکات لەو تەنگ و چەڵەمەیەی کە تێی کەوتوون و خۆشی و کامەرانی بگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی ، ئەو ڕزگارکەرەش بۆ ئەوەی کە خەڵکی بە تەواوی قەناعەتی پێ بکەن کە (مەسیحی ڕزگار کەر) خۆیەتی و خوای ڕاستیانە دەبێت توانایەکی بێ سنووری هەبێت وەك (مەسیحی) یەکەم جار بتوانێت چەند کارێکی وەك (معجزه) ئەنجام بدات کە لە توانای خەڵکی ئاسایدا نەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەرچی زانست و زانیاری پێشکەوتوو هەیە تەنانەت سیحریش دەخەنە خزمەتیەوە تا بتوانێت چاوبەستی خەڵك بکات و قەناعەتیان پێ بهێنێت.

ئەوانەی باسمان کرد هەمووی هەقیقەتی هەیەو ڕووداوەکانی ئەم سەدەی ڕابردووش باشترین بەڵگەن لەسەر ڕاستی بوونی ئەو نەخشەو پلانەی کە لە (پرۆتۆکۆلات)دا بەرنامە ڕێژی بۆ کراوە ، بۆیە چەندان پەرتووك هەیە لەم بارەیەوە بۆ ئەوەی خەڵکی ڕابدەن لەسەر ڕێگای ڕاست و بەرەو گومڕاییان ببەن.

خوای گەورە لە سەرەتای ئایەتەکانی سورەتی (ئیسراء) بەڵێنی دابوو، ئەوا بۆ جاری دووەم جوولەکە لە خاکی (فەلەستین) دەستەلاتیان گرتۆتەوە دەست و دەست درێژی دەکەنە سەر مزگەوتی ئەقسا و هەوڵی ڕووخانی دەدەن و هەموو جیهانیشیان غەرقی فەسادو خراپەکاری کردووە، بەڵام هەر لەو ئایەتەدا خوای پەروەردگار بەڵێنی داوە کە ئەم جارەش بە دەردی جاری پێشوو لەناودەچن بەڵکو خراپتریش.

پێسەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ، فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللهِ هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي، فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ، إِلَّا الْغَرْقَدَ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ)(١).

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٩) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٩٢٣).

واتە: رۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا موسڵمانان شەڕ لەگەڵ جوولەکەکاندا دەکەن، موسڵمانەکان زاڵ دەبن بەسەریانداو دەیانکوژن، هەتا وای لێدێت جوولەکە لەبن بەردو داردا خۆی دەشارێتەوە، خوای گەورە بەردەکە یان دارەکە دێنێتە قسەو دەڵێت: ئەی موسڵمان ئەی بەندەی خوا، ئەمە جوولەکەیە لە پشت منەوە، وەرە بیکوژە تەنها داری توترِك نەبێت قسە ناکات، چونکە لە داری جوولەکەیە.

ئەم فەرمودەیە تێگەیشتنێکی دەویٚ، ئەم کوشتارەی جوولەکە پێش هاتنی قیامەتەو ئەو کاتە جوولەکە بەرەو فەلەستین دێنەوەو بەشوێن (دەجال)ەوەن، کەواتە پێش ئەوە دەبێت ئەم دەوڵەتی ئیسرائیلە لەناو بچێت و موسڵمانان فەڵەستینیان دەست بکەوێتەوەو پاشان جوولەکە پەرش و بڵاوببنەوە بەدونیادا بۆ جارێکی تر، پاش ئەوە سەر لەنویٚ خولیای گەڕانەوە بۆ فەڵەستین بکەوێتەوە مێشکیان و بکەونەوە شەڕکردن و ئینجا ئەو شەڕە ڕوبدات.

هەروەکو پێشتر گوتمان: هەندێك لە زانایان لەوانە (محەممەد ئەحمد راشید) بەهاوکێشەیەکی بیرکاریانەی زۆر ورد لە ڕووی چەند ئایەتێکی قورئانەوە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی لە ڕۆژی (٢٠٢٢/٣/٥) دەوڵەتەکەیان دەڕوخێت و نامێنێت و سەر لەنویٚ تەفرو تونای وڵات دەبنەوەو شەڕو کوشتار خوێنیان لە موسڵمانان دوردەکەوێتەوە.

ئامارەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە دەوڵەتی ئیسرائیل بەرەو تیاچوون دەڕوات، گەندەڵی زیاد دەکات تیایدا، ستەم و ستەمکاری تا بێت زۆر دەبێت، لایەنگران و دۆستانی بەرەو کەم بوونەوە دەڕۆن، میللەتانی دونیا لێیان هەڵدەستیٚ لەبەر ئەو هەموو ستەم و قەسابخانانەی کە دروستیان کردووە بۆ میللەتی فەلەستین بەتایبەتی.

مامۆستا سەعید حەوا (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: بە دڵنیایی لە ئێستادا دەوڵەتی جولەکە لە هەموو ڕوویەکەوە بە پێی ئەو دەقانەی کە هاتوون دەبێت کۆتایی پیٚ بیٚ، وە کۆتایی هاتنیشی پەیوەندی نییە بە دابەزینی

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)[١]، وە ئەو بەڵگانەی کە هاتوون کە دارو بەرد دەبن بە ڕێنیشاندەری موسڵمانان لەسەر جولەکە بۆ ئەوەی بیکوژن لەلای ئەو جولەکانەی ئێستا نەهاتووە، بەڵکو لەگەڵ ئەو جولەکانەن کە لەگەڵ دەجالدا دەڕۆن[٢].

وە پایتەختی دەوڵەتی موسڵمانان لەو سەردەم لە قودس دەبێت، وە پێغەمبەر عیساش دەچێتە قودس پاش ئەوەی کە دابەزی لە شاری دیمەشق، ئەمەش بەڵگەیە کە فلستین کە دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی موسڵمانان، وە دەوڵەتی جولەکەکان لەو سەردەم کۆتایی پێ هاتووە.

ئەلدۆف هیتلەر لە کتێبی (کفاح) دەڵێ: ئەوەی وایکردووە کە من ڕقم لە جولەکە بێت ئەوەیە بە بەردەوامی خەریکی پارە کۆکردنەوەن بەهەموو ڕێگایەکی لارو وێر، بۆم دەرکەوتووە جوولەکە لە پشت هەموو خانەکانی لەشفرۆشیەوەن و ئەوان بازاڕی بۆ دروست دەکەن، هەروەها دەڵێت: پاش ئەوەی ڕاستەقینەی جوولەکەم بۆ دەرکەوت، دەستم کردە خوێندنەوەو توێژینەوەو بیروڕای سەرکردەکانیان، سەیر دەکەم لەبەردەم عەقیدەکەیدا خۆم دەبینمەوە وەك لەسەر ڕق و خۆپەرستی ڕاوەستاوە، عەقیدەیەك ئەگەر ڕێگە بدەیت بەرقەرار بێت بەشەرییەت دەبات بە قوڕدا[٣].

هەروەها دەڵێت: ئەوەندە جوولەکەی کە دەستم بۆ نەبردوون دەمەوێ لە داهاتوودا هەڵسوکەوتیان شایەت بێت لەسەر ئەوەی کە من پێی گەیشتووم!! لە ڕاستیدا دەرکەوتووە کە جوولەکە لە پشت هەموو ئەو بەرنامە خراپانەوەن کە میللەتان فێری سەماکردن و بەڕەڵایی دەبەن.

سەنتەرێکی یەهودی لە ڕۆژئاوادا کە هەموو ساڵێك ڕاپرسی دەکات تا ئاستی دۆستان و لایەنگرانی جولەکە دەربخات، لە ساڵی (٢٠٠٩)ع ئەو

---

(١) هەروەکو کۆمەڵێك لە بانگخوازانی جولەکە بانگەشەی بۆ دەکەن، بە تایبەتی پرۆتستانتەکان.

(٢) الأساس في السنة وفقهها ـ العقائد (٢/ ١٠٢٥).

(٣) القرن الخامس العشر الهجري، أنور الجنيدي، لا ١٩٧، التحديات في وجه الدعوة الإسلامية والعالم الإسلامي.

ڕاپرسیەی کرد ئەنجامەکەی ئەوەندە ترسناك بوو نەیانوێرا ڕاپبگەیەنن، چونکە لایەنگرانی جولەکە بە ڕادەیەك کەمبوەتەوە کە زەنگی ترسناکیە بۆیان.

جوولەکە تەنها لە ئیسلام دەترسن و بە دێوێکی بەنجکراوی دەزانن و دەترسن بە ئاگا بێتەوە، کاتێك کارتەر لە هەڵبژاردندا سەرکەوت، رابینی جوولەکە پێی گوت: بەڕاستی دێوەکەی ئیسلام خەریکە جوولە جوڵ بکات.. نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکاش گوتی: ئێمە هەوڵی دواخستنی هوشیاربوونەوەی دێوەزمەی ئیسلام دەدەین.

بۆیە هاتنە دی ئەم موژدەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوای کوشتنی دەجال دەبێت هەروەکو لە داهاتوودا باسیان دەکەین ، نەك لە دوای جەنگە جیهانیە گەورەکە، وە لە دوای ڕوودانی جەنگەکە هەتا هاتنی دەجال لە فەرمودەکاندا هیچ باسی جوولەکە نەکراوە.

مامۆستا (هاورێ) لە پەرتوکەکەیدا دەڵێت: سەرانی جوولەکە کە داڕێژەی پیلانی ئەو جەنگەن هەوڵ دەدەن بەشێوەیەك لە شێوەکان جوولەکەکانی ئیسرائیل لە ئاگری ئەو جەنگە دوور بگرن تا ئەو کاتەی هەموو لە دەوری دەجال کۆدەبنەوە، وە ئەگەر خەڵکانێکیان لەو جەنگەدا تیابچێت یاخود ئیسرائیل بەر گورزی موسڵمانان بکەوێت ئەوە دڵنیابن وەك جەنگی جیهانی دووەم لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە مەسەلەکە هەزار ئەوەندەی قەبارەی خۆی گەورە دەکەن تا بتوانن لەو ڕێگەیەوە زیاتر سۆزی وڵاتانی ئەوڕوپاو جیهان بەرەو خۆیان ڕاکێشن و خۆیان بە غەدر لێکراو و بەستەزمان و تیاچووی ئەو نێوەندە لە قەڵەم بدەن.. هەروەها پێشمان وایە کە لە دوای سەرکەوتنی موسڵمانان لەو جەنگەدا ئیسرائیل وەکو دەوڵەت نامێنێت، چونکە مەعقول نیە لەشکری ئیسلامی بەرەو (ئەستەنبۆڵ) بکەوێتە ڕێ بۆ ڕزگارکردنی بەڵام گوێ نەدات بە بونی قەوارەی ئیسرائیل لەبن هەنگڵیدا، بە تایبەتی کە گۆڕەپانی شەڕەکەش لو سوریاو فەلەستین و لوبنان بێت.

بەرگی سێیەم

# چوونە ژوورەوەیەک بۆ
# نیشانە گەورەکانی کۆتایی بونەوەر

ئەم نیشانانەی کە باسمان کردن لەلای زاناکان بە نیشانە بچووکەکان ناوبران، بەڵام دوا زەنگی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی بریتیە لە ڕوودان و سەر هەڵدانی کۆمەڵێك نیشانەی گەورە کە لە ماوەیەکی کورت و کەمدا یەك بە دوای یەکدا دێن بە شێوازێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی باسی دەکات و دەفەرموێ: (خُرُوجُ الآيَاتِ بَعْضِهَا عَلَى بَعْضٍ يَتَتَابَعْنَ كَمَا يَتَتَابَعُ الْخَرَزُ)[1].

واتە: هاتن و دەرچوونی نیشانەکان یەك بە دوای یەکدا دەبێت، هەروەکو چۆن ملوانکەیەك دەپچڕێت مۆروەکانی یەك بە دوای یەکدا دێن.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە، کە پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ﷺ) دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الآيَاتُ خَرَزَاتٌ مَنْظُومَاتٌ فِي سِلْكٍ، فَإِنْ يُقْطَعِ السِّلْكُ يَتْبَعْ بَعْضُهَا بَعْضًا)[2].

واتە: نیشانەکان وەك مۆروی هۆنراوە وان لەسەر پەتێك، هەر لەگەڵ پەتەکە پچڕا یەك بە دوای یەکدا دەخزێن و دەکەونە خوارەوە.

ئەو نیشانە گەورانە لەلای زانایان ڕوون و ئاشکرایە کە لە ماوەیەکی کورتدا یەك بە دوای یەکدا دێن، وە کە دەستی پێکرد وەستانی نیە تا کەوتنە خوارەوەی دوا مورو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەرتیب کردنی نیشانەکان، واتە: (کامیان بە دوای کامیان دادێن و کامیان لە پێش کامیاندا ڕوو دەدات) زاناکان لەوە یەك دەنگ نین بە تایبەت کە لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

(١) صحيح: موارد الظمئان إلى زوائد ابن حبان (٦/ ١٣٦) برقم: (١٨٨٣). وذكره الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٧/ ٣٢١) باب: أمارات الساعة وآياتها، قال: رواه الطبراني في الأوسط، ورجاله رجال الصحيح.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٤٦٨) برقم: (٧٠٣٩). قال أحمد شاكر: اسناده صحيح.

زۆر جار ئەو نیشانانە بە تەرتیبەکەی خۆیان نەهاتوون، یاخود تەرتیبەکەیان لە فەرمووده‌یەکەوە بۆ فەرمووده‌یەکی تر جیاوازی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانراوە تا ڕاددەیەکی زۆر لە ڕوانگەی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕەوتی ڕوودانی ئەو نیشانانە ڕێك بخرێت.

بۆ نمونە: پێشەوا (موسلیم) لە صەحیحەکەیدا ئەو نیشانە گەورانە دوو جار لەسەر زاری یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە ئەویش پێشەوا حوزیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاریە(ﷺ)، بەڵام تەرتیبی نیشانەکان لە دوو فەرموودەکەدا لە یەکتر جیاوازن ئەوەتا لە یەکێکیاندا دەفەرموێت: (اطَّلَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: مَا تَذَاكَرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ - فَذَكَرَ - الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَيَأَجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ)[1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێمان دەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین، فەرمووی: ئەوە باسی چی دەکەن؟ گوتمان: باسی ڕۆژی دوایی، فەرمووی: کۆتایی بونەر هەڵناسێت هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنی نەبینن، پاشان فەرمووی: دووکەڵ و دەجال و دابەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم و، یەئجوج و مەئجوج و سێ ڕۆچوون، ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچوونێك لە خۆر ئاواو ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاو دەنێت بەرەو شوێنی حەشر کردنیان.

لە ریوایەتێکی تر کە پێشەوا (موسلیم) لە هەمان هاوەڵ دەیگێڕێتەوە، ئەم جارە لەفظ و تەرتیبەکە جیاوازە بەم جۆرە: (إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَكُونُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَالدُّخَانُ وَالدَّجَّالُ،

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٢٢٢٥/٤) برقم: (٢٩٠١).

وَدَابَّةُ الْأَرْضِ، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قُعْرَةِ عَدَنٍ تَرْحَلُ النَّاسَ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا دە نیشانە ڕوو دەدات: ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچوونێك لە خۆرئاواو ڕۆچونێك لە دوورگەی عەرەب و دووکەڵ و دەجال و دابەی زەوی و، یەئجوج و مەئجوج و، هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواوەو، ئاگرێك کە لەناوچەی عەدەن دەردەچێت و خەڵکی کۆچ پێ دەکات.

لەم فەرموودەیەدا بۆمان بەدەردەکەوێت کە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە گێڕانەوەی ئەو نیشانانە تەرتیبەکەیان نەپاراستووە، بەڵام لە ڕێگەی تێبینی و ووردبوونەوە لە فەرموودەکان تەرتیبی هەندێکیانمان بۆ بە دەردەکەوێت، وەکو (محەممەدی مەهدی) پێش دەجال دێت و دواتر ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوەو عیسای کوڕی مەریەمیش لە کۆتایی تەمەنی دەجالدا دێتە خوارەوە، چونکە لەگەڵ هاتنە خوارەوەی دەجال دەکوژرێت و پاشانیش لە حوکمڕانی پێغەمبەر عیسا یەئجوج و مەئجوج دێن، بەڵام هەندێك لە نیشانەکانی تر وەك دووکەڵ و ڕۆچوون و دابە و هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواو ئەوانە هیچ بەڵگەیەکی ئەو تۆ نیە بۆ تەرتیب کردنیان، ئێمەش بە پشتیوانی خوای گەورە هەوڵ دەدەین لێرەدا بە پێی توانا لە تەرتیبی زاناو نووسەرە بەڕێزەکانی پێشوو لەم بوارەدا دەرنەچین و بە پێی تواناش هەوڵ دەدەین ڕووداوەکان بە تەرتیبێکی ڕاست و لە شوێنی خۆیدا باس بکەین.

وە ئەگەر سەرنج بدەینە سەر فەرموودەکان دوو وشە بەکارهاتوون (واو) لەگەڵ (أو) وە هەردووکیشیان لە زمانی عەرەبی هیچ واتایەکی تەرتیب ناگەیەنێ، واتە: مەرج نییە ئەو دە نیشانەیە یەك لە دوای یەك بێن.. هەردوو فەرموودەکان وەکو یەکە بەڵام شێوازی تەرتیبەکان جیایە، چونکە فەرموودەکەی پێشەوا حوزەیفەی غیففاری (ﷺ) کە پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردووە بە دوو ڕیوایەتی جیاواز هاتوون هەروەکو لە پێشتردا ئاماژەم پێی کرد.

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٢٢٢٦/٤) برقم: (٢٩٠١).

بەرگی سێیەم

وە تێکڕای هەواڵەکان ئەوە دەردەکەوێ کە دەرکەوتنی دەجال یەکەمین نیشانەی گەورەیە کە گۆڕانی باری گشتی زۆربەی سەر زەوی ڕادەگەیەنێ و ئەمەش بە مردنی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) هەمووی کۆتایی دێ[1].

پێشەوا شەنقیتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (وأشراط الساعة الكبرى : العشرة، وهي: نزول عيسى، وخروج الدجال، ويأجوج ومأجوج، والدابة، ورفع القرآن، وطلوع الشمس من مغربها، وإغلاق باب التوبة، والخسف)[2].

واتە: لە نیشانە گەورەکانی کۆتایی بونەوەر، دە (١٠) دانەیە، ئەویش: دابەزینی پێغەمبەر عیسا، دەرچوونی دەجال، یەئجوج و مەئجوج، گیانلەبەرەکە، هەڵگیرانەوەی قورئان، هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە، داخستنی دەرگای تەوبە، ڕۆچوون.

باوکی عەبدوڵلای کوڕی حاکیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: وا دەردەکەوێ ڕۆژهەڵاتنەکە پێش دەرکەوتنی ئاژەڵەکە بکەوێ، پاشان هەر لەو ڕۆژ یان لە ڕۆژێکی نزیکدا ئاژەڵەکە دەربکەوێ[3].

پێشەوا ئەبی عالیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دەستپێکردنی یەکەمین لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی هەتا دەگاتە کۆتایی شەش مانگی پێدەچێت[4].

بەڵام قسەکەی ئەبی عالیە ئەوەیە لە پاش هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە ئەوەندەی پێدەچێت، چونکە دەجال لە دەوروبەری (٤٣٩) ڕۆژ دەمێنێتەوە، وە عیسای کوڕی مەریەم (٧ یان ٤٠) ساڵ دەمێنێتەوە[5].

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت: (يَبْقَى النَّاسُ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا عِشْرِينَ وَمِائَةَ سَنَةٍ)[6].

---

(١) فتح الباري بشرح صحيح البخاري، (٣٥٣/١١).
(٢) أضواء البيان، (٣/ ٣١٤).
(٣) فتح الباري بشرح صحيح البخاري، (٣٥٣/١١).
(٤) فتح الباري (١١/ ٣٦٢).
(٥) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ٨.
(٦) مصنف ابن ابي شيبة (١٥/ ١٧٩) برقم: (٣٨٧٥٥).

بەشی سێیەم

واتە: خەڵکی دەمێننەوە لە پاش هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە بە (١٢٠) ساڵ.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: هەشت مانگی پێدەچێت[1].

بە پێی ئەم بەڵگانە بۆمان بە دەردەکەوێت کە ئەم بونەوەرەی تیایدا دەژین لە پاش هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە (٣) ساڵی تر دەخایەنێت[2].

پێشەوا موعازی کوری جەبەل (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الملحمة العظمى وفتح القسطنطنية وخروج الدجال في سبعة أشهر)[3].

واتە: جەنگە گەورەکەو ئازادکردنی قوستەنتنیەو دەرچوونی دەجال لە ماوەی حەوت مانگە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری بوسر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بين الملحمة وفتح القسطنطنية ست سنين، ويخرج الدجال في السابعة)[4].

واتە: لە نێوان جەنگە گەورەکەو ئازادکردنی قوستەنتنیە شەش ساڵە، دەجال لە حەوتەمین ساڵ دەردەچێت.

لە ریوایەتی عەبدوڵلای کوڕی بوسر(ﷺ) فەرموویەتی: (بين الملحمة وفتح المدينة ست سنين ويخرج الدجال في السابعة)[5].

واتە: لە نێوان جەنگە گەورەکەو ئازادکرنی شارەکە شەش ساڵەو دەجال لە حەوتەمین دەردەچێت.

---

(١) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ٨.

(٢) صحيح علامات الساعة الكبرى، لا ٩ .

(٣) ضعيف: أخرجه الحاكم في (المستدرك على الصحيحين)، كتاب: الملاحم والفتن، (٤/ ٤٢٦). والترمذي، كتاب: الفتن، باب: ما جاء في علامات خروج الدجال، وفي سنده أبوبكر بن أبي مريم، وهو ضعيف.

(٤) سنن ابي داود، برقم: (٤٢٩٥). قال الحافظ الذهبي عنه في (سير أعلام النبلاء) (٧/ ٦٥): ضعفه أحمد بن حنبل وغيره من قبل حفظه.

(٥) فتح الباري (٦/ ٢٧٦).

## ئازادکردنی شاری ئەستەنبۆڵ

شاری ئەستەنبۆڵ[١] بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ پایتەختی دەسەڵاتی ڕۆم و مەسیحیەکان بوو کە یەکەم جار لەسەر دەستی سەرکردەیەکی ئیسلامی لاودا ئازاد کرا بە ناوی (محەممەد فاتح) هەر چەندە لە بەشی یەکەم باسمان لە (محەممەد فاتح) کرد، دوای ئەوە ئەو شارە بۆ ماوەی زیاتر لە چوار سەدە پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی بوو کە عوسمانیەکان دەیان برد بەڕێوە، تا دواتر لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم خیلافەتی ئیسلامی ڕووخاو (سوڵتان عبدالحمید)ی دووەم کە کۆتایی خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانی بوو وەلانراو جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەستی (کەمال ئەتاتورك) کە پیاوێکی عەلمانی دژ بە ئیسلام بوو، لە ماوەی دەسەڵاتی هەوڵیدا بە هەموو شێوەیەك ئیسلام لە تورکیادا ڕیشە کێش بکات و ناسنامەی ئیسلامی ئەو وڵاتە بگۆڕێت، بۆ ئەو مەبەستەش ڕژێمێکی عەلمانی داپلۆسێنەری تێدا دامەزراندو پایتەختەکەشی لە (ئەستەنبۆڵ)ەوە گواستەوە بۆ (ئەنقەرە)، وە لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا (ئەستەنبۆڵ) لە ژێر دەسەڵاتی عەلمانیەت و کوفر دایە، وە هەرواش دەمێنێتەوە هەتا لەسەر دەستی سوپای (موحەممەدی مەهدی)دا ئازاد دەکرێت، وە ئازادکردنی ئەو شارەش لە پاش ئەوە دێت کە موسڵمانەکان لە جەنگە گەورەکەدا سەردەکەون و هێزو دەسەڵاتی ڕۆم و دەوڵەتە خۆرئاواییەکان لە بن هەڵدەکۆڵن و ئیتر هیچ ڕێگرو بەربەستێك نامێنێت لەبەردەمیاندا، وە پێ دەچێت کە پاشماوەی لەشکرە شکاوەکەی ڕۆمەکان بەرەو شاری (ئەستەنبۆڵ) پاشەکشێ بکەن و هەڵ بێن، بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە لەشکری عەلمانی تورکیاش لە جەنگە گەورەکەدا هاوپەیمانی ڕۆمەکان بووە دژی موسڵمانەکان، هەر بۆیە لەگەڵ سەرکەوتنی

---

(١) لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەناوی (قوسطنطنية) هاتووە، بەڵام من بەناوی ئەستەنبۆڵ ناوی دەبەم، چونکە شاری ئەستەنبۆڵ لای زۆربەی زۆریمان ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام وشەی (قوسطنطنية) هەموو کەس نایزانێت.

موسڵمانەكان لە جەنگە گەورەكەدا بەبێ وەستان لەشكری ئیسلامی ڕوودەكاتە شاری (ئەستەنبۆڵ)، هەروەك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە.

خوێنەری سەنگین: ئازادكردنی شاری ئەستەمبۆڵ بریتیە لە جەنگێكی گەورەو فرەوان لە نێوان موسڵمانان و خاچ پەرستان بەرپا دەبێ.. هۆیەكەشی هەمان ئەو هۆیەیە كە لەفەرمودەی ڕابردوو باسكراوە، جا ئەم فەرمودەیە باسی ترسناكیەكانی جەنگ دەكات و لە بارەی ئارامی موسڵمانان دەدوێت، پاشان بەسەر دوژمنانیان سەردەكەون، جێی سەرنجە كە ژمارەیەكی زۆر گاوری موسڵمان بوی چاك لە ڕیزی لەشكری موسڵمانان دا دەبن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە دوای سەركەوتنی موسڵمانەكان لە جەنگە گەورەكەدا دەفەرموێت: (فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطَنْطِينِيَّةَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ، قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ، إِذْ صَاحَ فِيهِمِ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِي أَهْلِيكُمْ، فَيَخْرُجُونَ، وَذَلِكَ بَاطِلٌ، فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ)[1].

واتە: پاش ئەوەی شاری ئەستەنبۆڵ ئازاد دەكەن، وە لە كاتێكدا كە سەر گەرمی دابەش كردنی دەستكەوتی شەڕەكەن و چەكو شمشێرەكانیان بە دار زەیتونەكاندا هەڵواسیوە، لەو كاتەدا شەیتان لەناویان هاوار دەكات و دەڵێت: مەسیحی دەجال لە دواتانەوە پەلاماری ماڵ و منداڵی داون، ئەوانیش بەپەلە دەگەڕێنەوەو هەواڵەكەش درۆیە، پاشان كە دەگەنە شام ئینجا دەجال دەردەچێت .

پێشەوا كەعبی ئەحبار(ﷺ) سەبارەت بە چۆنیەتی ئازادكردنی ئەستەمبۆڵ دەڵێت:

لەو ڕۆژی محەممەدی مەهدی سەیری ئاڵاكەی دەكات، ئەمجا ئاوی بۆ دەهێنن بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی ئەنجام بدات، ئینجا هەموو لێی دووردەكەونەوە، دواتر ڕوو لە خەڵكی دەكات و دەڵێت: ئەی خەڵكینە تێپەڕبن بە نێو دەریاكان، بە دڵنیایی خوای گەورە دەریاتان بۆ شەق دەكات هەروەكو چۆن بۆ بەنی

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢١) باب: في فتح قسطنطنية، وخروج الدجال، برقم: (٢٨٩٧).

ئیسرائیلی شەق کرد، ئەمجا نوێژی بەیانی ئەنجام دەدرێت و بەرێ دەکەون[١].. با گوێمان لە پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) بێت بزانین چی دەڵێت:

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (هَلْ سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَاقَ، حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا، فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلَاحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ قَالَ: فَيَقُولُونَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا، قَالَ ثَوْرٌ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ: جَانِبُهَا الَّذِي يَلِي الْبَرَّ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّانِيَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الْآخَرُ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّالِثَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيُفْرَجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُونَهَا فَيَغْنَمُون، فبينماَ هُمْ يَقْتَسِمونَ المَغانِمَ إذْ جَاءَهُمُ الصريخُ فقال: إنَّ الدّجال قدْ خَرَجَ، فَيَتركون كلَّ شيٍ ويَرْجِعون)[٢].

واتە: شارێکتان بیستووە بەشێکی لە ووشکایی دایەو بەشێکی لە ئاودایە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا هەفتا هەزار لە نەوەکانی ئیسحاق هێرشی بۆ دەکەن، کاتێك کە دەیگەنێ دادەبەزن نە بە چەك شەڕیان لەگەڵ دەکەن و نە تیریشیان تێدەگرن، هەر ئەوەندە دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) لایەکی دەڕوخێت، پاشان بۆ دووەم جار دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) لایەکەی تریشی دەڕوخێت، پاشان بۆ جاری سێیەم دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) ئەمجارە بۆیان دەکرێتەوەو دەچنە ناوی و دەستکەوتێکی زۆریان دەبێت، لەکاتێکدا کە سەرگەرمی دابەش کردنی دەستکەوتەکانن، دەنگێك لەناویاندا بڵاودەبێتەوە کە (دەجال) هەستاوە، ئیتر هەموو شتێك بەجێ دەهیڵن و دەگەڕێنەوە.

لەم فەرمووده پیرۆزەدا بۆمان بەدیار دەکەوێت ئەو کەسانەی شاری (ئەستەنبۆڵ) ئازاد دەکەن کۆمەڵە موسڵمانێکن لە نەوەی (ئیسحاق)ن، کە

---

(١) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٠٩ .

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٤) كتاب: الفتن وأشراط الساعة، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٢٩٢٠).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆمەڵێکی زۆریش لە ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا موسڵمان دەبن و لە ڕیزی لەشکری ئیسلامی دەجەنگن و (ئەستەنبۆڵ)یش لەسەر دەستی ئەواندا ئازاد دەکرێت.

ڕۆمیش هەر لەنەوەی ئیسحاقن، لەبەر ئەوەی عیصی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە.

زاناکان دەڵێن: بەنی (ئیسحاق) مەبەست پێ ی ڕۆمەکان خۆیانن..

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە شەرحی موسلیمدا (٨٨/١٨) دەڵێ: پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە هەموو بنەڕەتەکانی صەحیحی موسلیم واهاتوە کە نەوەی ئیسحاقن، هەندێکیش دەڵێن: ناسراوەو چاکەکانی نەوەی ئیسماعیلن، فەرمودەکەش ئەوە دەگەیەنێ و مەبەستیش عەرەبە..)[1].

بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەبەستی عەرەب بووە کە لەو سەردەمە (بەنی ئیسماعیل)ن، ئەوەیە کە لە فەرمودەکەی (ذی مخمر) دا هاتووە: ڕۆمەکان بە هاوەڵەکەیان دەڵێن: عەرەبمان بۆ کپ کردیتەوە، ئینجا ناپاکی دەکەن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ داستانەکە، بۆیە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی ئەو جەنگە لە نێوان عەرەب و ڕۆمەکاندا.

ڕواڵەتی فەرموودەکانی ئەم بەشەش هەر لەسەر ئەوەیە، ئەوانەش کە دەستپێشخەری دەکەن لە شەڕی داستانەکە، هەر ئەوانن فەتحی ئەستەمبۆڵ دەکەن.

منیش دەڵێم هیچ گرفتێك لێرەدا نیە، چونکە دین هی هەموو خەڵکە، کێ خوداش بیەوێ موڵکی دەداتێ، (محەممەدی فاتیح) زیاتر لە سێسەد ساڵ پاش نەوەوی غەزای قوستنتنیەی کرد، زۆرینەی سەربازەکانیشی غەیرە عەرەب بون، دوریش نیە دوبارە شتێکی وا ڕوویداتەوە. فەرمودەی داستانەکەی پێشتر

---

(١) شرح صحيح مسلم (١٨/ ٤٣).

بەرگی سێیەم

باس کرا بەڵگەیە لەسەری، ڕۆمەکان بە موسڵمانەکان دەڵێن: لێمان گەڕێن لەگەڵ ئەواندا بجەنگێین کە لەخۆمانن و موسڵمان بون.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ڕۆم لە کۆتایی دونیا موسڵمان دەبن، وە لەوانەیە ڕزگارکردنی شاری ئەستەمبۆڵ لەسەر دەستی کۆمەڵێك لەواندا بێتە دی، هەروەکو لە فەرموودەکەدا هاتووە کەوا هێرشی بۆ دەکەن بە سوپایەکی هەفتا هەزار سەربازی لە نەوەی ئیسحاق.. وە ئەوانەی شاری ئەستەنبۆڵ ئازاد دەکەن خەڵکی سوریان..

ئەوەشی کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەم قسەیە کەوا ڕۆمەکان مەدح کراون، پێشەوا عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ، فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَبْصِرْ مَا تَقُولُ، قَالَ: أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالًا أَرْبَعًا: إِنَّهُمْ لَأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ، وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ، وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ، وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ: وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی دێت ڕۆم لە هەموو خەڵکی زیاترن، جا پێشەوا عەمری کوری عاص(ﷺ) گوتی: جوان سەیرکە کە چی دەڵێی، گوتی: دەڵێم ئەوەی لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) گوێ لێ بووە، جا مادەم وادەڵێی دەنا ڕۆمەکان چوار ڕەوشتی جوانیان هەیە: بەڕاستی ڕۆم لە هەموو کەس نەرمترن لە کاتی ئاشوبدا، وە لە گشت کەس بە پەلەترن بۆ ڕابوونەوەی لە دوای موسیبەتدا، وە بەپەلەترینی دۆڕاوانن لە جەنگدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە، وە باشترینیانن بۆ هەژارو بێهێزەکان، وە پێنجەمیش چاکەی بە ڕێك و جوانی ئەنجام دەدەن، پاشاکانیان قەدەغە کراون لە ستەم کردن لە خەڵك.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەو کۆمەڵەی یەکەم جار ڕۆمەکان لە پێش دەستپێکردنی جەنگە گەورەکەدا داوایان دەکرد کە موسڵمانەکان تەسلیمیان بکەن، هەر لەو ڕۆمانە بوون کە پێشتر موسڵمان بوون و

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٢) باب: تقوم الساعة والروم أكثر الناس، برقم: (٢٨٩٨).

چوونەتە ڕیزی لەشکری ئیسلامیەوە، وەك لە فەرموودەکەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆمەکان لە دوای جەنگە گەورەکە بە ڕادیەیەك ورەیان دەڕوخێ و هێزی ئەژنۆیان دەشکێت کە توانای هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکیان نامێنێت لەبەردەم لەشکری ئیسلامدا، هەر بۆیە لەگەڵ بیستنی دەنگی (لا إله إلا الله والله أكبر) دەروازەی شاری ئەستەنبۆڵ لەبەردەم ئەو هێزە ئیسلامیەدا دەکرێتەوەو بەبێ شەڕو کوشتار دەست بەسەر شارەکەدا دەگرن[1].

دەڵێت: ئەمە ئێستا هەیە لەسەردەمی ئێمەدا، بەڵکو بەشی هەرە زۆری لەشکری ئیسلام لە خاکی شام و میصر لەو کەسانەن کە لە خۆیانن کەوا ئەمڕۆ سوپاس بۆ خوا شەڕ دەکەن لەگەڵ ئەهلی کافری خۆیان هەروەك لە سەردەمی ئێمە چەندین جار ڕووی داوە، وە لە یەکجاردا بە هەزاران ڕووبەڕووی کافران دەبنەوەو سوپاس هەر بۆ خوا لەسەر سەرخستنی ئیسلام و شکۆدارکردنی[2].

ڕزگارکردنی ئەستەمبۆڵ بەبێ جەنگ ڕووی نەداوە تا ئێستا، ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (فَتْحُ القُسْطَنْطِينِيَّةِ مَعَ قِيَامِ السَّاعَةِ)[3].

واتە: ڕزگارکردنی ئەستەمبۆڵ لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دوایی دایە..

(القُسْطَنْطِينِيَّةِ) ئەستای پێ دەڵێن.. کە پایەتەختی خیلافەی عوسمانی بوو لە پێشتردا، وە لە ئێستادا (ئەستامبۆڵ)ی پێ دەوترێ.

پێشەوا ترمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: مەحمودی کوڕی غەیلان کە مامۆستای پێشەوا (ترمذی)ە دەڵێ: ئەستەمبۆڵ شاری ڕۆمەکانەو ڕزگار دەکرێ لە کاتی دەرچوونی دەجالدا[4].

---

(١) شرح النووي لمسلم (١٨/ ٢١).

(٢) شرح النووي لمسلم (١٨/ ٢١).

(٣) سنن الترمذي (٤/ ٨٠) باب: ما جاء في علامات خروج الدجال، برقم: (٢٢٣٩). حديث غريب.

(٤) جامع الترمذي (٦/ ٤٩٨) مع تحفة الأحوذي، للمباركفوري.

بەرگی سێیەم

ڕزگارکردنی ئەستەمبۆڵ لەلایەن تورکەکانەوە بەشەڕو جەنگ ڕوویدا لەسەردەمی محەممەد فاتح، جا لە کۆتایی دونیا جارێکی تر ڕزگار دەکرێ هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوین.

پێشەوا ئەحمەد شاکر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو ڕزگارکردنەی ئەستەمبۆڵ کە لە فەرموودەکەدا موژدەی پێدراوە لە پاشە ڕۆژێکی نزیك یان دوور دێتە جێ کە هەر خوای گەورە دەزانێ کەی دەبێ، کە ئەوەش ڕزگار کردنێکی دروستەو ڕاستە بۆ ئەم شارە مەزنە لەو کاتەی کە موسڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ دینەکەیان کە پشتیان تێکردبوو، بەڵام ڕزگارکردنەکەی تورك کەوا پێش ئەم چەرخەی ئێمە رووی داوە ئەوە ڕێ خۆشکردنێکە بۆ ڕزگارکردنی یەکجاریە گەورەکەی، پاشان ئێستا ئەم شارە لە ژێر دەستی موسڵمانان دەرچووە، هەر لەو کاتەوەی کەوا دەوڵەتەکەیان ڕایگەیاندووە کەوا وڵاتێکی ئیسلامی نیە و گشت یاساو کارێکی دەوڵەت بەستورەکانی بێدینان و کافرانە، جا لە پاشە ڕۆژدا ڕزگارکردنی ئیسلامی بۆ دێت إن شاءالله هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین[1].

پێشەوا عەمری کوڕی عاص (ﷺ) دەڵێت: قوستەنتنیە سێ جار غەزای تێدا ئەنجام دەدرێ:

غەزای یەکەم: بەڵایەکی زۆر زۆر توندە.

غەزای دووەم: لە نێوان خەڵکی قوستنتنیەو موسڵمانان ئاشتەوایيەك مۆر دەکرێت هەتا دەگاتە ئەو حاڵەتەی کە موسڵمانان مزگەوتی تێدا دروست بکەن..

غەزای سێیەم: خوای گەورە ئازادی دەکات بە وشەی (الله أکبر).. سێیەکی وێران دەکرێ، وەسێیەکی دەسوتێنرێت، وە سێیەکی تر دەسکەوتەکانی دابەش دەکرێت[2].

---

(١) مسند الإمام أحمد (١٨/ ١٠٣) برقم: (٩٣٩٥).

(٢) عقد الدرر في أخبار المهدي المنتظر، لا ١٣٤ .

ئەوەی زانراوە کە (محەممەد فاتح) فەتحی قوستەنتنیەی کرد لە ساڵی (١٤٥٣)ع هەروەکو لەبەشی یەکەمی نیشانەکان ڕوونمان کرەوە، جا ماوەتەوە فەتحی (ڕۆما)ی پایتەختی ئیتاڵیا بکرێت و ئیسلام بچێتە ئەوێ و دەسەڵات پەیدا بکات.. ئەم فەتحەش مەرج نیە، هەروەکو دکتۆر یوسف قەرزاوی (خودای گەورە بیپارێزێ) دەڵێت: فەتحێکی سەربازی بێت، بەڵکو دەکرێ فەتحێکی ڕۆشنبیریو فیکری بێت وەك چۆن ئەو هەموو وڵاتانەی تری ئیسلام تیایدا بڵاوبوەیەوەو گەشەی کردو یەك سەربازی موسڵمانیش نەچویە ناوی..

فەتحی ئاشتیانەش لە ئیسلامدا ناوبراوەو لە قورئان و فەرمودەدا هاتووە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: [إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾]. مەبەستیش پێی ئەم ئاشتینامەیە فەتحە؟!.. دیارە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیروڕایان تا ئەو کاتە وابووە کە فەتح تەنها بە سوپا دەکرێ و فەتح دەبێ فەتحی سەربازی بێت[1].

بەڵێ.. ئەوەبوو ساڵی (١٩٩٥)ع واتە: پاش فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ لە شاری (ڕۆما) منارەی یەکەمین مزگەوت چوو بە ئاسمانداو بووە خێرو بەرەکەت بۆ ئەو وڵاتە، ئەم مزگەوتەی ڕۆما لە جوانترین گەڕەکی شاردا دروست کراوە کە گەڕەکی (پاریولی)یە کە تەنیا (١٠)کم لە ڤاتیکانەوە دوورە، بە ماوەیەکی زۆر کەم یەك ملیۆن موسڵمان ئیسلامەتیان ڕاگەیاندو ئەمەش بووە هۆی قەشەو پیاوانی کڵێسە لێیان بکەونە تەقەو بەر دەرگای مەحکەمەیان پێ بگرن و بکەونە کێشە نانەوە بۆیان، بەڵام بە ئیزنی خوا سەر کەوتوو نەبوون.. نەك ئەوەش بەڵکو لەماوەیەکی زۆر کەمدا زیاتر لە (٥٠٠) گاوری کاسۆلیکی ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند[2].

موسڵمانانی ڕۆما چوار دەوری مزگەوتەکەیان کردووە بە باخ و باخات و گوڵ و گوڵزارو ئەوەندەی تر گەڕەکەکەیان ڕازاندۆتەوە، سەیر ئەوەیە شارەوانی

---

(١) تأريخنا المفترى عليه، د. يوسف القرضاوي، لا ٢٧٠.

(٢) المعجزة المتجددة، لا ١٤٠.

ڕۆما ویستی لە دووری (١٥٠)م لە مزگەوتەکەوە کۆگای خۆڵ و خاشاك دابنیٚ و تێیدا کۆیبکاتەوە، خوا کردی ئەم هەوڵەشیان شکستی خوارد.

کەواتە دوور نیە ئەمجارەیان ئیسلام فەتحی ئەوڕوپا بکاتەوە بە فیکرو ڕەوشت بەرزی و کەلتوری دەوڵەمەندی خۆی.. موعجیزەکەی پێغەمبەریش بێتە دی.

## هــاتنی دەجــال

## بیروباوەڕی ئەهلی سوننە سەبارەت بە دەجال

ڕوون و ئاشکرایە یەکێك لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەت باوەڕ بوونە بە ڕۆژی دوایی کە پایەکە لە پایەکانی باوەڕ، وە یەکێك لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی: دەرچونی مەسیحی دەجالە.

لەبەر مەزنی و گەورەیی ئەو ڕووداوەو شەڕی فیتنەی دەجال پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدرێژی بۆی باس کردوین بە وردی، وە ئاگاداری کردوینەتەوە.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێشەوا قازی عیاز(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم فەرمودانەی کە پێشەوا موسلیم و هی دیکەش لە بابەت دەجال دەیگێرنەوە بیانوە بۆ ڕاڕاوەی ئەهلی هەق لەبارەی ڕاستی هەبوونی دەجال، کە بریتیە لە کەسێك خودا بەندەکانی خۆی پێ تاقی دەکاتەوە، جا هەندێك توانای وای داوەتێ لە تواناکانی خوادان، وەکو زیندوکردنەوەی ئەو مردوەی بەخۆی دەیکوژێ و نەشونماکردنی دونیا و فەڕو پیت لەگەڵیدا، بەهەشت و دۆزەخەکەی و هەردوو ڕوبارەکەیو شوێنکەوتنی گەنجینەکانی زەوی بۆ ئە و فەرمان دانی بە ئاسمان تا باران ببارێنێ و بارانیش بباریێ و فەرماندانی بە زەوی تا لێی بڕوێ و بەر فەرمان بوونی زەوی، ئەمانە هەمووی بە تواناو ویستی خوای مەزن ڕوودەدەن و دێنە ئاراوە، پاشان خودا کەنفەتی دەکا، نەدەتوانێ ئەو پیاوە بکوژێ کە پێشتر کوشتبوویو زیندوی کردبۆوە، نەکەسێکی دیکە، کارەکەی مایە پوچ دەبێ و پێغەمبەر عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) دەیکوژێ و خوای گەورەش بڕواداران جێگیرو سەلامەت دەکات، ئەمە ڕێڕەوی ئەهلی سوننەیە، لەگەڵ سەرجەم فەرمودەناسان و فەقیهان و وردبینان، بە پێچەوانەی ئەوانەی ئینکاری

دەکەن و بەڕاستی دانانێن لە خەواریج و جەهمیەو هەندێك لە موعتەزیلەکان، هەروەها بە پێچەوانەی بوخاری موعتەزیلی و هاوڕێیانی لە جەهمیەکان کە دەڵێن: بونی دەجال ڕاستە، بەڵام بانگەشەکانی خەڵەفان و خەیاڵاتەو ڕاستیان نیە..

دەڵێن: ئەگەر ڕاست بوایە بە موعجیزەی پێغەمبەران پاڵپشت نەدەکرا، ئەمەش هەڵەیەکە هەموو تێی کەوتوون.. چونکە ئەو بانگەشەی بۆ پێغەمبەرایەتی نەکردوە، تا کردەوە سەراساکانی و ئەو شتانە لەگەڵیدان وەکو بەڕاست دانانی وابن، بەڵکو ئەو بانگەشەی خواوەندێتی دەکات، کەچی هەر لەهەمان بانگەشەکەی خۆیدا ، حاڵ و باری مایەی وەدرۆ خستنەوەیەتی، لەگەڵ بونی بەڵگەی وەدیهاتویی تێیدا و کەم و کوڕی لە وێنەو شێوەی و ناتەواوی لە ئاست لابردنی کوێریەکەی چاوی، سڕینەوەی ئەو گەواهی کوفرەی لەنێو چاوانیدا نوسراوە، جا لەبەر ئەو بەڵگانە کەسی پێ فریو نادرێ لە شوانەوێرەی خەڵکی (رعاع الناس) بترازێ، ئەویش بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەك یا بە ئارەزووی تێربوون یان لە ترسان و بۆ خۆپاراستن، چونکە ئاشوبەکەی هێندە مەزنە عەقڵەکان دەتاسێنێ و سەران سوڕدەمێنێ، لەگەڵ خێرایی تێپەڕینی بە زەویدا، کە هێندە لە شوێنێکدا نامێنێتەوە تا لاوازەکان لە حاڵی ڕامێنن و بەڵگەکانی وەدیهاتویی و کەموکوڕیەکانی تاوتوێ بکەن و هەڵیان سەنگێنن جا لەو بارەدا ئەوی بەڕاستی بزانێ باوەڕی پێ دێنێ[1].

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەم فەرموودانەی پێشەوا (موسلیم) و غەیری ئەویش لەبارەی بەسەرهاتی دەجالەوە باسیان کردون بەڵگەن بۆ ڕێبازی ئەهلی هەق کە دەجال هەیەو کەسێکە خوا بەندەکانی خۆی پێ تاقیدەکاتەوە، وە توانا‌داری دەکات بەسەر هەندێك لەو شتانەدا کە تەنیا لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خوادان.. وەك زیندووکردنەوەی ئەو مردووەی کە دەیکوژێ، وە دەرکەوتنی جوانی و پیت و پیزی دونیا لەگەڵیدا،

---

(١) شرح النووي على مسلم: (١٨/٥٨).

وە دوو ڕووبارەکەی و شوێنکەوتنی خەزنەکانی زەوی بۆی، وە فەرمانکردنی بە ئاسمان کە ببارێنێ و دەبارێنێ، وە بەزەوی کە بڕوێنێ و دەڕوێنێ!

ئا ئەمە ڕێبازی ئەهلی سوننە و سەرجەم فەرمووده ناسان و شەرعزانان و عەقیدە زانەکانە، بە پێچەوانەوەی ئەوانەوە کە نکووڵی یان لەوە کردووەو بە ناڕاستیان زانیوە وەك خەواریج و جەهمییەکان و هەندێك لە موعتەزیلەکان[1].

## بوختانێك و کوفرێك :

بەداخەوە زۆرێك لە بانگەشەکارانی گاورەکان لەناو خاکی موسڵمانان پەرە بە بوختانێك دەدەن و دەڵێن:

محەممەد پێغەمبەری موسڵمانان مەسیحی دەجالە! بۆیە ئەم درۆیەیان لە نێو مێشکی شوێنکەوتوەکانیان دروست کردووە.

لە ساڵی ١١٤٢ ی عیسایی داوا لە (بەترِس دیرکلونی) کرا بە وەرگێرانی قوڕئان بە زمانی لاتینی، ئەو سات (بەترِس) هەستا بە دانانی کورتەیەك لەم وەرگێڕانەی قوڕئان کە دەڵێت: محەممەد مەسیحی دەجالی پێ دەوترێت[2].

(دیرکلونی): ئەو کەسە بوو کە پەرەی دا بە شەڕی سەڵیبی، وە لە ژێر دەستیاندا هەموو پاپاکانی جیهان دەردەچن[3].

ئینجا دوای دوو سەدە کروتشی هات هەمان وتەی دیرکلونی دووبارە کردەوە، بۆیە دوای سێ سەدە قوڕئان وەرگێڕدرا بۆ سەر زمانی فەرەنسی، لە پێشەکیەکەیدا نووسیان: ئەی خوێنەری خۆشەویست.. لە کۆتاییدا دەجالی عەرەبی گەورە گەیشت، ئەمەش لە دوای هەزار ساڵ کە فەرەنسا بە ئینگلتەرا تێپەڕی[4].

---

(١) شرح النووي على مسلم: (١٨/٥٨).

(٢) فضل الإسلام على الحضارة الغربية، مونتجمري وات، لا ١٠٠ .

(٣) عالم الصليبين، يوشع براور، تحقيق: قاسم عبده.

(٤) عالم الفكر ، لا ٦٦ .

بەرگی سێیەم

تەنانەت لە ساڵی ١٩٨٤ ی عیسایی گۆڤارێكی پڕ لە وێنە دەردەچوو لە قاهیرە، كە یەكێ لە بانگەشەكارانی مەسیحیەت بە ناوی (جین داكسون) دەیگوت: لە داهاتوو پێش دەركەوتنی دەجال ئایینێك سەر هەڵدەدات بەڵام ئایینی مەسیحیەت نییە.. بەڵكو جۆرێكی ترە لە یەكتاپەرستی.. وە ئەو ئایینە ئایینی دەجالە[1].

تەنانەت هەندێك لە مامۆستایانی زانكۆی كاسۆلۆكی وای دادەنێن كە محەممەد پێغەمبەری موسڵمانان دەجالە[2]... حاشا

بۆیە ئەم وتەیە زۆر بەربڵاوە لە نێو موسڵمانەكانی ئەفەریقیا و هیندستان، تەنانەت لە هەندێ لە وڵاتەكانی خەلیج و ئەندەنوسیاش هەیە..

تەنانەت لە سودان بانگەشەكاران زۆر ئەم دەستەواژە بەكار دەهێنن، بە تایبەتی سەرۆكی ئەركانی قواتی سودانی جیهانی، ئەمەش بە یارمەتی ئەوانەی دەركران لە باشوری سودان[3].



وەڵامێك بۆ ئەوانەی هاتنی دەجال ڕەت دەكەنەوە :

هەندێك لە زانایان ئینكاری دەرچوونی دەجال دەكەن و دەڵێن: دەجال ڕاست نیە، چۆن ڕۆژێك بەساڵێكەو ڕۆژێك بە مانگێكەو ڕۆژێك بە هەفتەیەكە، پیاو زیندوو بكاتەوەو بیمرێنێت و كەنز لە ژێر زەویدا دەرێنێ، نا.. دەجال نیە، ئەو جۆرە كەسانەش بێگومان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاگاداری كردوونەتەوە، بۆیە هەندێ لە فیرقەی گومڕابووەكان وەكو موعتەزیلەو جەهەمیە ئینكاری بوونی دەجال دەكەن، لەگەڵ ئەوەش هەندێك لە زانایانی فەرموودەناسی ئەم سەردەمە ئینكاری دەكەن لەوانە شێخ موحەمەد عەبدە، بەڕاستی ئەمە مامۆستاو زانایەكی

---

(١) گۆڤاری آخر ساعة، لە بەرواری ١٩٨٤/٩/٢٦ دەرچووە.

(٢) تفسير دانيال/ ايرنسايد ١٣٠ .

(٣) جريدة الأحرار القاهرية، ١٤/ ٤/ ١٩٨٦ .

زۆر گەورەی شاری میصرە، چەندە نوسینی هەیە لەبارەی تەفسیر، ئەم زانایە بەرێزە ئینکاری بوونی دەجال دەکات و دەڵێت: دەجال واتە: سەرهەڵدانی ئاشوب و خراپەکاری، هەروەها موحەمەد فەهیم ئەبو عوبەیە یەکێکە لەو زانایانەی کە کیتابی (الملاحم)ی ئیبنو کەسیری تەحقیق کردووە، لەو کاتەی کە دێتە سەر باسی دەجال لە کیتابەکەی تەعلیقێك دەنوسیٚ لە هامشەکەی و دەڵێت:

دەجال هیچ حەقیقەتی نیە، بەڵکو ئەوە مەبەستی پیٚ بڵاوبوونەوەی شەڕو ئاشوب و خراپەکاریە، بریا ئەم تەعلیقەی لەم کیتابە نەنوسیبوایە، قسەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئێمە بەس بوو، هەندێکیش دەڵێن: دەجال سەر هەڵدەدات بەڵام بەهەشت و دۆزەخی پیٚ نیە، یەکێکی وەکو زانای گەورە محەممەد ڕەشید رضا کە خاوەنی زانستێکی زۆرە بەڵام لەم بابەتەدا نەپێکاوە[1].

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەڵێت: جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) وتاری بۆ داین و پاش سوپاس و ستایشی خوا فەرمووی: (أَلا وَإِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ بَعْدِكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ ، وَبِالدَّجَّالِ ، وَبِالشَّفَاعَةِ، وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ ..)[2].

واتە: لە دوای من کەسانێك دێن ڕەجم و دەجال بەدرۆ دەخەنەوە، وە شەفاعەت و سزای گۆڕیش بەدرۆ دەخەنەوە.

هەر چەندە ئەم بابەتە لەبەرگی دووەمی کتێبەکە بە درێژی باس کردووە.

**ئەوانەی باوەڕیان بە هاتنی دەجال نیە قسەکانیان زۆر بێهێزە جا بە کورتی وەڵامێکیان بۆ دەدەینەوە:**

**یەکەم:** ئەو هەموو فەرموودانەی کە هاتوون دەربارەی دەجال و کارە سەرسوڕهێنەرەکانی گشتی چەسپاوەو فەرموودەی ڕاست و دروستی لەسەرە، بۆیە دروست نیە ڕەت بکرێنەوە یاخود تەفسیری ناشایستەیان بۆ بکریٚ بە جۆرێك لە مەبەستیان دوورکەونەوە.

---

(١) الرقائق للعريفي ، لا٤٠٠.

(٢) مسند الإمام أحمد (١/ ٢٣) برقم: (١٥٦) . قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

**دووەم:** کارە سەر سوڕهێنەرەکانی دەجال وەکوو زیندووکردنەوەی مردوو یان شتی تر، هەر هەمووی ڕاستن و شتی خەیاڵات و بێ واتا نین، بەڵکو ئەو جۆرە کارانە خوای گەورە پێی دەدات بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی، وە دەجال ئەوە نیە کە کارەکانی لەگەڵ هی پێغەمبەران بەراورد بکرێ لەبەر ئەوەی دەجال داوای پێغەمبەرایەتی ناکات لە کاتی ئەو کارانەدا بەڵکو ڕوودانی ئەم کارە سەیرانە ئەو کاتەیە کە داوای خوایەتی دەکات[1].

**سێیەم:** ئەوەی کە خوا پێی داوە لەو کارە سەیرانە پێچەوانەی سوننەتی خوای گەورە نیە، چونکە گەر وا بڵێین ئەوا موعجیزەی پێغەمبەرانیش ڕەت دەکەینەوە، بەڵکو موعجیزەکانی پێغەمبەران بۆ باوەڕ هێنانی خەڵکە بە خوای گەورە ، وە کارە سەیرەکانی دەجال بۆ تاقیکردنەوەی بڕوای خەڵکە.

لە کۆنەوە هەندێك لە کۆمەڵە گومڕاکان، وەکو موعتەزیلەو جەهەمیە، نکوڵیان کردووە لە دەرچوونی دەجال.. ئەوانەش کە لە هاوچەرخەکانن بەشێکیان نکوڵیان لێ کردووە:

مامۆستا محەممەد عەبدە[2] دەڵێت: دەجال بریتیە لە ئەفسانەو درۆ.

محەممەد فهیم أبو عیبە لە پەراوێزدانانی لەسەر کتێبی (الملاحم)ی (ابن کثیر)دا دەڵێت: ئەوە بڵابوونەوەی گەندەڵی و خراپەیە.

هەندێکیش دەڵێن: دەجال دەردەچێت هیچ تاقیکردنەوەیەکی پێ نیە نەبەهەشت و نە دۆزەخ، لەوانەی ئەم بۆچونەیان هەیە (محەممەد ڕەشید رضا) کە خاوەن زانستە، بەڵام لەم مەسەلەیەدا هەڵەی کردووەو بە درۆخستنەوەی نیشانەیەك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هەڵەیەکی هەرە گەورەیە.

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١٠٥).

(٢) محەممەد عەبدە حەسەن خیرالله: لە بنەماڵەیەکی (الترکماني)یە، موفتی وڵاتی میسر بووە لەسەردەمی خۆیدا، لە شاری ئەسکەندەریە کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی ١٩٠٥ ع، لە قاهیرە نێژراوە. الأعلام، للزرکلي (٦/ ٢٥٢).

بۆیە وتەی ئەوانەی کە هاتنی دەجال ڕەت دەکەنەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، تەنانەت سەدان بەڵگەش لەسەر هاتنی دەجال ڕەت دەکەنەوە، خودای گەورە لەو جۆرە کەسانە پارێزراومان بکات.

## بە زەبرترین کەس لە دژی دەجال تەمیمیەکانن :

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بە بەنی تەمیمەکانی دەفەرموو: (هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّال.. هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَ)[1].

واتە: بە زەبرترین کەسانن لە ئوممەتم لە دژی دەججال، کاتێکیش زەکاتەکانیان گەیشت فەرمووی: ئەوە زەکاتی کەسەکانمانە.

پێشەوا عیکرەمەی کوری خالید(ﷺ) دەڵێت: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی گێڕامەوە کە: (أَنَّ تَمِيمًا ذُكِرُوا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: أَبْطَأَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ تَمِيمٍ عَنْ هَذَا الأَمْرِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى مُزَيْنَةَ ، فَقَالَ: مَا أَبْطَأَ قَوْمٌ هَؤُلاَءِ مِنْهُمْ، وَقَالَ رَجُلٌ يَوْمًا : أَبْطَأَ هَؤُلاَءِ الْقَوْمُ مِنْ تَمِيمٍ بِصَدَقَاتِهِمْ ، قَالَ: فَأَقْبَلَتْ نَعَمٌ حُمْرٌ وَسُودٌ لِبَنِي تَمِيمٍ ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): هَذِهِ نَعَمُ قَوْمِي، وَنَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْمًا، فَقَالَ: لاَ تَقُلْ لِبَنِي تَمِيمٍ إِلاَّ خَيْرًا، فَإِنَّهُمْ أَطْوَلُ النَّاسِ رِمَاحًا عَلَى الدَّجَّالِ)[2].

واتە: هۆزی تەمیم باسکران لەلای پێغەمبەرو(ﷺ) پیاوێك گوتی: ئەم هۆزە گورج نەبوون لە موسڵمان بووندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشای موزەینەی کردو فەرمووی: خاویان پێ ناوترێت، وتی: ئەو کەسانە لە هۆزی تەمیم دواکەوتن لە هێنانی زەکاتەکەیان ، ئینجا هەندێ ڕەشەوڵاخی هۆزی تەمیم گەیشت، ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوەیە ڕەشە وڵاخی کەسەکانم، پیاوێکیش قسەی ناشیرینی بەهۆزی تەمیم گوت: پێغەمبەری خوا

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٥٧) كتاب: الفضائل، باب: من فضائل غفار، برقم: (٢٥٢٥).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ١٦٨) برقم: (١٧٥٦٨) قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

بەرگی سێیەم

(ﷺ) فەرمووی: جگە لە قسەی باش هیچ بەهۆزی تەمیم مەڵێ، چونکە ڕمەکانیان لە هەمووان درێژترە لە دژی دەجال.

ئەگەر بڕوادار ناچار بوو ڕووبەڕووی بێتەوە، ئەوا دەبێ بە ئەرکەکەی هەستێ و هەق ڕوون بکاتەوەو بیانوبڕیەکی چاکی بکات هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ وَاللهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ)[1].

واتە: ئەگەر من لەناوتاندا بم کە دەجال دەردەکەوێ، لە جیاتی ئێوە بیانوبڕی دەکەم، ئەگەر دەریش کەوت و من لەنێوتاندا نەبووم، هەریەکەو بۆ خۆی بەرپرسەو خوداش ئاگادارو چاودێری هەموو موسڵمانێکە.

## باسی دەجال لە قورئان :



پرسیار کراوە لە زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەوەی کە بۆچی لە قورئاندا بە ڕاشکاوانە باس لە هاتنی دەجال نەکراوە، لەگەڵ ئەوەی کە فیتنەو بەڵایەکی زۆر گەورەیەو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ئاگاداریان داوە لە خراپەکاریەکەی، کە ئایا بۆچی خوای گەورە باسی نەکردووە لە قورئان، جا زانایانی ئیسلام لەم بارەوە چەند وەڵامێکیان داوەتەوە:

**یەکەم:** فیتنەی دەجال لە قورئاندا باسی لێوەکراوە لە ناوەڕۆکی ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: [هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾][2].

واتە: ئایا بێجگە لەمەچاوەڕوانن کە فریشتەی گیان کێشان بێتە لایان یا پەروەردگارت بێتە لایان، یان هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت بێت؟

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٧).

(٢) سورة الانعام، الآية: (١٥٨).

ڕۆژێك کە هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگارت بێ، ئیتر بڕوا هێنان بۆ هیچ کەسێك کە لەبەرا بڕوایان نەهێناوە یان بە باوەڕی خۆیان کاری چاکیان نەکردووە سوودێکیان پێ ناگا، بڵێ: چاوەرێ بن کە ئێمەش چاوەڕێین.

جا ئەم ئایەتەش ئەوانەن: دەجال.. هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاوا.. ئاژەڵەکە.. کە ئەوانەش هاتوون لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجْنَ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ)[١].

واتە: سێ شت هەن کاتێ کە هاتن ئەوا بڕوا هێنان سوود نادات بۆ هیچ کەسێ گەر لە پێشتردا بڕوای نەهێنابێ یان بڕواکەی چاك ڕانەگرتبێ: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، دەجال و ئاژەڵە زەویەکە.

دووەم: قورئان باسی هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا دەکات، وە عیسا ئەو کەسەیە کە دەجال دەکوژێ، جا بە مەسیحی ڕێنمایی دەر باسەکەی کورت کردۆتەوەو ناوی مەسیحی گومڕاکەری نەهێناوە لەبەر ئەوەی ڕەوشتی عەرەب وایە کە هەر باسی یەکێ لە دوو پێچەوانەکان دەکات.

سێیەم: خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی دەجال دەکات و دەفەرموێ: [ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ][٢].

واتە: بەڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی لە بەدی هێنانی خەڵك گەورەترە، بەڵام زۆرینەی خەڵکی نایزانن.

جا مەبەست بە خەڵك لێرەدا دەجالە، کە پێناسەی گشتیە بۆ مەبەستی هەندێك.

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١٣٧) باب: بيان الزمن الذي لا يقبل فيه، برقم: (١٥٨).

(٢) سورة غافر، الآية: (٥٧).

پێشەوا ئەبو عالیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: واتە: گەورەتر لە دروستبوونی دەجال لە کاتێك کە جولەکەکان بە گەورەی دەزانن[١].

پێشەوا بەغەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم ئایەتەی پێشوو مەبەست پێی دەجالە.

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر ئەم تەفسیرە بچەسپێ ئەوا جوانترین وەڵامە بۆ ئەم پرسیارە کە ئەم دەکەوێتە ڕیزی ئەو کارانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیویستوە ببێتە بار قورسی بەسەر ئوممەتەکەیەوە گەر ڕوونی بکردبایەوە، وە بەڕاستیەتی هەر لای خوایە[٢].

چوارەم: قورئان بۆیە باسی دەجالی نەکردووە لەبەر کەم زانین و بێڕێزی بۆی، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە داوای خوایەتی دەکات، لە کاتێکدا کە ئەمە مرۆڤەو هەرگیز بەم کەم و کوڕی و دروست کراویەی ناتوانێ هاوشێوەی پەروەردگاری گەورەو تەواو و بەرز بێت و خۆی دووریگرێ لە کەم و کوڕی، جا لەبەر ئەوە کارەکەی لای خوا زۆر کەم و هیچە کە شایەنی نیە باس بکرێت، وە لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەران ئاگادارییان دەربارەی داوە، هەروەك پێشتر باسمان کرد کەوا گشت پێغەمبەرێك ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە شەڕی دەجال و فیتنەکەی.

ئەگەر ڕەخنە بگرن و بڵێن: بۆچی قورئان باسی فیرعەونی کردووە کە بانگەشەی خوایەتی کردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: فیرعەون ئەما کارەکەی بەسەرچوو، وە باسکردنیشی بۆ ئەوەیە ئێمە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرین، بەڵام کاری دەجال ئاوا لە کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات و ماوە، بۆیە باسی نەکراوە لەبەر تاقیکردنەوەی بۆ ئێمە بەهۆیەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بانگەوازەکەی کە خۆ بەخوا دانانە زۆر لەوە

(١) تفسير جامع لأحكام القرآن (١٥/ ٣٢٥).

(٢) فتح الباري (١٣/ ٩٢).

ڕوونترە کە پوچەڵ بکرێتەوە، لەبەر ئەوەی دەجال کەمایەتی پێوە دیارو بەرچاوەو لۆمەکەی بە خۆیەوەیە کە زۆر بچوکترە لەو پلەو پایەی کە بانگەوازی دەکات، بۆیە خوای گەورە باسی نەکردووە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەزانێ لە دڵی بڕوادارەکانی کەوا وێنەی ئەم کارانە تەنیا بڕوایان پێ زیاد دەبێ و مل کەچ تریان دەکات بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و نایانترسێنێت[١].

پێشەوا ئیبنو حەجەر دەڵێت: پرسیارکردن دەربارەی ناو نەهێنانی دەجال لە قورئان بەردەوام باس دەکرێت لەبەر ئەوەی خوای گەورە باسی یەئجوج و مەئجوجی کردووە لە قورئاندا و باسی فیتنەکەی کردوون کە نزیکە لە فیتنەی دەجال[٢].

## پیلانی هێرشی دەجال بۆ جیهان :

دەجال کە لە خاکی خوراسانەوە دەردەچێت بە خۆی و هێزەکەیەوە، خەڵکی ئێران بە هەلاکەت دەچن و کەرمانیش داگیر دەکرێت، بۆیە کەرمان دەبێت بە دوو میحوەر:

**میحوەری یەکەم:** لە کەرمانەوە دەست پێدەکرێت و بەلای گەرووی هورمز دا دەڕوات بۆ داگیرکردنی میصرو ئەو وڵاتانەی لە نێوان دووبەحرەکەدان ئینجا بەرەو مەککەو مەدینە دەچێت.. ئامانجیش لەم هێرش کردنە لەناوبردنی بینای ئیسلامە..

ئینجا دەجال پێش دەکەوێت خۆی و هەفتا هەزار جولەکە، وە دروشمیان وشەی (برو برو)یە.. ئینجا بە نێو خاکی ئێراندا دەگەڕێت و لە پاشان بەرەو خاکی عێراق بەڕێ دەکەون و پاشان بەرەو شام، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَينزِلَنَّ الدَّجَّالُ بخُوزَانَ وكَرْمَانَ فِي سَبْعِينَ أَلفًا، كأَنَّ وُجوهَهم المَجَانُّ المُطْرَقَةُ)[٣].

---

(١) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ٢٠.

(٢) فتح الباري (١٣/ ٩١ ـ ٩٢).

(٣) مسند الإمام أحمد (٢/ ٢٣٧ ـ ٢٣٨) برقم: (٨٤٥٣) قال ابن كثير: اسناده جيد قوي حسن..

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە دەجال دادەبەزێت لە حوڕان[١] و کەرمان[٢] کە حەفتا هەزار جوولەکەی لەگەڵدایە، دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانی داپۆشراوە..

بەڵێ.. دادەبەزێتە کەرمان، کەرمانیش لەسەر ڕێگای سەرەکی گەرووی هورمزە پاشان بەرەو خەلیج تێدەپەڕێت، هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (فيصير أهله ثلاث فرق: فرقة تقول نشامُه، ننظر ما هو، وفرقة تلحق بالأعراب، وفرقة تلحق بالمصر الذي يليهم)[٣].

بۆیە جولەکەکان دەتوانن ئەو دەریا بۆ ئەو دەریا ببڕن بە هۆی دەجالەوە، ئینجا هێرش دەکەن بەرەو یەمەن دەڕۆن و دواتر ئامانجیان داگیرکردنی مەککەو مەدینە دەبێت، بەڵام ناشتوانن بچنە ئەو دوو شارەوە، هەر چەندە لە فەرموودەکەی تەمیمی داری دانی بەوەنا کە هەموو دونیا لە ماوەی چل ڕۆژ دەکات بەڵام ناتوانێت بچێتە مەککەو مەدینە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەشچێت..

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلَّا عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا..)[٤].

واتە: هیچ شارێك نامێنێت کە دەجال پێی تێ نەخات جگە لە مەککەو مەدینە، لەسەر هەر یەك لە ڕێگاکانی فریشتە ڕیزیان بەستوە، پاسەوانی دەکەن..

---

(١) حوران یان حەوران مەنتیقەیەکە لە خاکی سوریا..

(٢) کەرمان یەکێکە لەو سیٔ یەك ئاریزطایەی ولآتی ئیرآن..

(٣) مسند الإمام أحمد (٤/ ١٩٢) برقم: (١٧٩٢٠). والحاكم في المستدرك (١/ ٣٤٦) برقم: (٨٤٧٣). قال الحاكم» هذا حديث صحيح الاسناد على شرط مسلم.

(٤) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٥) باب: قصة الجساسة، برقم: (٢٩٤٣).

**میحوەری دووەم:** لە کەرمانەوە دەڕوات هەتا دەگاتە ڕووباری کەرمە عەلی لە خاکی عێراق، وە لەوێوە بەرەو ڕووباری ئوردن، ئامانجیش لەم هێرش کردنە لەناوبردنی قیادەی عەسکەری ئیسلامە لە قودس..

لەناو ئەو میحوەرەدا جولەکەو ئافرەتانی خەڵکی ئەسبەهانی تێدایە، ئامانجیش لەو میحوەرە گەیشتنە بە قودس، وە لەلای کەرمە عەلی جەنگێك دەست پێدەکات، بۆیە لای ڕووبارەکە خەڵکی دەبن بە سیٚ بەشەوە:

بەشی یەکەم: شوێن دەجال دەکەون

بەشی دووەم: لەلای ڕووباری کەرمە عەلی دەبێت بەشەڕ لەگەڵ جولەکەکان.

بەشی سێیەم: ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فرقة تتبعه وفرقة تلحق بأرض آبائها بماء الشيح، وفرقة تأخذ بشط الفرات يقاتلهم)[1].

دوای سەرکەوتن موسڵمانان بەرەو گوندێکی شام بەڕێدەکەون، ئینجا لەویٚ موسڵمانەکان ڕووبەرووی دەجال و جولەکەکان دەوەستنەوە، پشت بەخوای گەورە لە داهاتوودا بە درێژی باسی ئەم بابەتە دەکەم.

(١) المستدرك على الصحيحين (٤/ ٤٩٦).

# هاتن و دەرچوونی دەجال

پاش ئەوەی کە موسڵمانان لە جەنگی (الملحمة الكبرى)دا سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و دواتریش شاری (ئەستەنبۆڵ) ئازاد دەکەن، لەو کاتەدا هەواڵی سەرهەڵدان و هاتنی (دەجال) وەك ئاگر بەناو پوشی ووشکدا بەهەموو جیهاندا بڵاودەبێتەوەو دەبێتە باس و خواسی سەر زاری هەموو خەڵکی.

لە ژێر ڕۆشنایی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باس لە ڕووداوەکانی ئەم قۆناغە دەکات، دیارە موسڵمانانیش لەو سەردەمەدا ڕۆژ بەڕۆژو ڕووداو بە ڕووداو دەزانن چ ڕوودەدات و چیان لە پێشە، هەر بۆیە لەگەڵ ڕزگارکردنی شاری (ئەستەنبۆڵ) کاتێك کە هەواڵی دەرچوونی دەجال دەبیستن بە شێوازێك شپرزە دەبن و دەشڵەژێن کە هەرچی دەستکەوتیشیان هەبووە هەمووی بەجێ دەهێڵن و بە پەلە بەرەو شام دەگەڕێنەوە، هەروەکو پێشتر باسمان لێوەی کرد، چونکە ئەوان لەو فەرموودە پیرۆزانەوە ئەوەیان بۆ ڕوون بۆتەوە کە هاتنی دەجال لەو کاتەدا دەبێت، وە دەشزانن کە دەجال چ فیتنەیەکی گەورەیەو ڕووبەڕووبوونەوەشی لە توانای ئەواندا نیەو تاکە قەڵاو پەناگەی لەشکری ئیسلامیش بۆ خۆپارستن لە فیتنەی دەجال وڵاتی شامە، بۆیە بەپلەو بێ دواکەوتن بۆ شام دەگەڕێنەوە.

بەڵێ... دەجال ئەو فیتنە گەورەیە کە لە ئاخیر زەماندا ڕوودەدات و یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی و لە گەورەترین ئەو ئاشوبانەیە کە بە درێژایی مێژوو مرۆڤایەتی دووچاریان بووە، هەروەکو ئەبو دەهماءو ئەبو قەتادە دەڵێن: بەلای هیشامی کوڕی عامیردا تێپەڕدەبوین و دەچووینە لای عیمرانی کوڕی حوصەین(ﷺ) ڕۆژێکیان گوتی: ئێوە بەلای مندا ڕەت دەبن و دەچنە لای پیاوانێك لەمن زیاتر ئامادەی لای پێغەمبەر(ﷺ) نەبون و لەمن شارەزاتر نەبون بە فەرموودەکانی گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەیەوە دەیفەرموو: (مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ خَلْقٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ)[1].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في بقية من أحاديث الدجال، (٢٢٦٦/٤)، حديث رقم: (٢٩٤٦).

واتە: لە دروست کردنی ئادەم هەتا هەستانی ڕۆژی دوایی هیچ فیتنەیەك نیە لە دەجال گەورەتر بێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجُوا لَمْ يَنْفَعْ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا: الدَّجَّالُ وَالدَّابَّةُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا)[١].

واتە: سێ شت هەن هەر کاتێ دەرچوون، ئەوەی پێشتر باوەڕی نەهێنا بێت، لە دوای ئەوان باوەڕهێنان سوودی پێ ناگەیەنێت: دەجال و دابەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهَا لَمْ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ أَعْظَمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا إِلَّا حَذَّرَ أُمَّتَهُ، وَأَنَا آخِرُ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَنْتُمْ آخِرُ الْأُمَمِ، وَهُوَ خَارِجٌ فِيكُمْ لَا مَحَالَةَ) [٢].

واتە: ئەی خەڵکینە! هەتا ئێستا هیچ فیتنەیەك نەبووە لەسەر ڕووی زەوی، لەو ڕۆژەوەی کە خوای گەورە نەوەی ئادەمی لەسەر زەوی بڵاوە پێ کردووە لە فیتنەی دەجال گەورەتر بێت، وە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە کە ئومەتەکەی لە دەجال ئاگادار نەکردبێت، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوەش کۆتایی ئومەتانن، بە دڵنیاییەوە لەناو ئێوەدا دەردەچێت.

جا فیتنەیەك هێندە گەورە بێت کە هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) ئومەتەکانی خۆیان لێ ئاگادار کردبێتەوە، ئێمەش دڵنیابین کە چار ناچارە هەر لەناو ئێمەدا دەردەچێت، بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانێك زانیاری تەواوی دەربارەی ئەو فیتنە گەورەیە هەبێت، تا لە کاتی هاتنیدا پێی هەڵنەخەڵەتێت و بزانێت چۆن خۆی لێ دەپارێزێت.



---

(١) سنن الترمذي (١١/ ٣٢٤) باب: ومن سورة الأنعام، برقم: (٣٣٥١).

(٢) صحيح الجامع الصغير (٢٧٣/٦) ورقمه (٧٧٥٢) واسناده صحيح.

## واتای هەردوو وشەی (المسیح) و (الدجال):

پێشەوا قورتبی باس لە بیست و سێ قسەو بۆچوون دەکات دەربارەی هاتنی واتای ئەم ناوەو لێ وەرگیرانی، وە خاوەنی (القاموس) دەیگەیەنێتە پەنجا بۆچوون و وتە دەربارەی هاتنی ئەم ناوە واتە: مەسیح کە لە ئەسڵەوەدا واتای چیە؟

پێشەوا ئیبنو ئەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دەجال بە مەسیح ناونراوە، چونکە چاوێکی داپۆشراوەو سڕاوەتەوە، مەسیح: بەو کەسە دەگوترێت کە لا ڕویەکی داپۆشرابێ، نەچاوی هەبێ نەبرۆ.

لێرەدا (مەسیح) بە واتای بەرکار (مفعول) هاتووە، وشەی (المسیح) لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی (فعیل)ە لە (مسح)ەوە هاتووە واتە: (سڕین) و (دەست پێداهێنان)، وە یەکێك لە داتاشراوەکانیشی (ساح) بە واتای گەڕان و سیاحەت دێت[1].

زانایان دەڵێن: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) پێی دەگوترێت: (مسیح) لەبەر ئەوەی دەستی دەهێنا بەهەر نەخۆشێکدا چاك دەبۆوە، یان لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا زۆر سیاحەت و گەڕانی دەکردو لە شوێنێکدا جێگیر نەدەبوو[2].

دەڵێن: دەجالیش هەر بە (مەسیح) ناودەبرێت، لەبەر ئەوەی چاوی ڕاستی سڕاوەتەوەو ڕوناکی تێدا نەماوە، یان لەبەر ئەوەی لە ماوەی (٤٠) ڕۆژدا هەموو زەوی دەگەڕێت[3].

وشەی (دەجال)یش لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی (فعال) لە (دجل) ەوە هاتووە بە واتای داپۆشین و تێکەڵ کردن، وە(دجال) بۆیە پێی دەگوترێت(دەجال)

---

(١) التذكرة في أحوال الموتى (للقرطبي) لا ٦٧٩.

(٢) الفائق، للزمخشري، (٣/ ٣٦٦).

(٣) فتح الباري بشرح صحيح البخاري (٢/ ٢٠٤).

بەرگی سێیەم

چونکە بەفێڵ و درۆ هەق و ڕاستی لە خەڵکی دادەپۆشێت و ڕاست و چەوتیان لیٚ تێکەڵ دەکات[١].

پێغەمبەریش (ﷺ) هەردوو (مەسیح)ەکەی بەوە لە یەك جیاکردۆتەوە کە بە عیسا (سەلامی خوای لیٚ بێت) دەڵێت: (مەسیحی هیدایەت)، وە بە دەجالیش دەڵێت: (مەسیحی گومڕایی)[٢].

وشەی (مەسیح) لە بنچینەدا شۆرەتی پێغەمبەر عیسایە (سەلامی خوای لیٚ بێت)، بەڵام دەجال چونکە لە کاتی هاتنیدا خۆی وابەخەڵك دەناسێنێت کە گوایە مەسیحی چاوەڕوان کراوەو هاتۆتە سەر زەوی، بۆیە بەویش دەگوترێت (مەسیح)، بەڵام مەسیحی درۆو گومڕایی، نەك (مەسیحە) ڕاستیەکە کە عیسایە (سەلامی خوای لیٚ بیٚ).. چونکە پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: بۆیە ناونراوە دەجال بەناڕەواکەی هەق دادەپۆشیٚ. وە لە عەرەبیدا ئەگەر بڵێین: (دجل البعير بقطران) واتە: وشترەکەی بە قەتران داپۆشی، یان (دجل الإناء بذهب) واتە: دەفرەکەی بە زێڕ داپۆشی[٣].

پێشەوا ئیبنو دورەید (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: بۆیە بەدەجال ناونراوە چونکە هەق بە درۆ دادەپۆشیٚ، دەشڵێن: چونکە بەڕوی زەویدا دەگەڕیٚ... دەشڵێن چونکە زەوی دادەگریٚ[٤].

بەڵام شێخ محەممەد ناصر الدين الألباني (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: وشەی (دەجال) لە (دَجَل)ەوە هاتووە، واتە: داپۆشی، وە دەجال واتە: زۆر داپۆشەر.

---

(١) لسان العرب (١١/٢٣٦-٢٣٧).

(٢) فتح الباري (١٣/ ١٢٩).

(٣) فتح الباري بشرح صحيح البخاري (٩١/١١)، ولسان العرب (١١/ ٢٣٦)، وترتيب القاموس (٢/ ١٥٢).

(٤) حكاية مسيح الدجال، للشيخ محمد ناصرالدين الالباني، لا ١٢ .

بەرگی سێیەم

بۆیە بە دەجال ناوبراوە، چونکە زۆر هەق دادەپۆشێ بە ناهەق و درۆ، هەروەها کوفرەکەی خۆی لە پێش چاوی خەڵکی دادەپۆشێ بە درۆ و فێڵ و سەر لێشێواندن[1].

دەجال واتای ئاخنراو بە درۆی گەورەو وورد، پێشەوا قورتبی دەڵێ: دەجال لە زمانەوانی بەم واتایە هاتووە، بەڵام ناوی دەجال ئێستا وای لێهاتووە تەنیا ئەو دەجالە کوێرە درۆزنەی پێ دەناسن کە لە کۆتایی بونەوەر پەیدا دەبێت[2].

هەر چەندە بەندە رایەکی تایبەت بە خۆی هەیە، کە بۆیە پێی دەوترێ دەجال چونکە نە چاوی هەیە نە برۆ.. ئەمەش پاڵپشت بە فەرموودەیەك کە پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ، عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ)[3].

(ظفرة) بەواتای تانە دێ کە پێستەیەکە چاو دادەپۆشێ.

پێشەوا ئەصمەعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: بریتیە لە پارچە گۆشتێك لەلای پیلوانەوە دەڕوێ.

ئایا ڕاستە بە مەسیحی دەجال دەگوترێت: مەسیخ ؟

ئەو ناوە زۆر بەربڵاوە لەناو خەڵکی، تەنانەت من چەندین پەرتوکم بینیوە بە ناوی مەسیخ، بەڵام ئەم وشەیە لە هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) نەچەسپاوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی لێناوە

• (الأعور الكذاب): پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە فەرموویەتی: (يخرج الأعور الدجال مسيح الضلالة قبل المشرق في زمن اختلاف من الناس وفرقة)[4].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) التذكرة، لا ٦٥٩.

(٣) صحيح مسلم، كتاب: الفتن، باب: ذكر الدجال وصفته وما معه، برقم: (٢٩٣٤).

(٤) صحيح: رواه البزار ورجاله رجال الصحيح غير علي بن المنذر وهو ثقة كما في المجمع (٧/ ٣٤٩).

واتە: دەجالی کوێری مەسیحی گومڕا لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت لەسەردەمێك کە جیاڕایی لە نێو خەڵکی هەیەو بوونەتە پارچە پارچە.

• (مسيح الضلالة): پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وَأَمَّا مَسِيحُ الضَّلَالَةِ، فَإِنَّهُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ، أَجْلَى الْجَبْهَةِ، عَرِيضُ النَّحْرِ، فِيهِ دَفَأٌ)[١].

واتە: بەڵام مەسیحی گومڕایی، ئەوە چاوی کوێرە، ناوچاوانی پان و دیارە، ملی ئەستورو پانە، چەمانەوەیەکی کەمی تێدایە.

• لە هەندێك فەرموودەی تر بە (الدجال) هاتووە بەبێ باسکردنی وشەی مەسیح، پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ فَذَكَرَ أَنَّهُ رأى عيسى بن مريم عليه السلام ثُمَّ ذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ فَإِذَا رَجُلٌ جَسِيمٌ أَحْمَرُ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ قَالُوا هَذَا الدَّجَّالُ أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطَنٍ رَجُلٌ مِنْ خُزَاعَةَ)[٢].

واتە: لە کاتێکدا کە من نووستبوم تەوافم دەکرد بە دەوری بەیتدا... (باس دەکات کە (عیسای کوری مەریم)ی دیتووە (سەلامی خوای لێ بێت)، پاشان دەجالی دیوەو وەسفی دەکات و دەفەرموێت: سەیر دەکەم پیاوێکی کەتەیە، سورە قژی سەری لولە، چاوی کوێرە، دەڵێی ترێیەو ڕوناکی تێدا نیە، گوتیان: ئەوە دەجالە، شێوەی لە هەموو کەس زیاتر لە (ئیبنو قەطەن) دەچێت، کە پیاوێك بوو لە خێڵی خوزاعە[٣].

• (المسيح الدجال): پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ .. حَتَّى يُقَاتِلَ آخِرُهُمُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ)[٤].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٣/ ٢٨٢) برقم: (٧٩٠٥). قال شعيب الأرناؤوط: حديث حسن.

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٦٠) باب: الطواف بالكعبة في المنام، برقم: (٧١٢٨).

(٣) ناوی (عەبدولعوزای کوری قطن کوری عەمری خوزاعی)ە و هەر لەسەردەمی جاهیلیدا مردووە.

(٤) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٢/ ٨١) برقم: (٢٣٩٢) قال إمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

بەرگی سێیەم

واتە: كۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من شەڕ دەكەن لەسەر حەق.. هەتا لە كۆتاییەكەی شەڕ لەگەڵ مەسیحی دەجال دا دەكەن.

كەواتە: لە هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە وشەی (مەسیخ).

هەرچەند لە زمانی عیبرانی پێی دەڵێن: (ها ما شیح)، لە زمانی ئارامی سریانی پیٙ دەڵێن: (مەشیح)، لە زمانی عەرەبی و یۆنانی پیٙی دەڵێن: (مەسیح)[١].

لەقەبەكەی مەسیحە.. هەروەكو لە فەرموودەی تەمیمی داری هاتووە..

هەندێكیش دەڵێن: كونیەی ئەبو یوسفە[٢]، ئەمەش بۆ ئەوەی موسڵمانەكان هەڵبخەڵەتێنێت بەم ناوەوە.

وە لەلای جولەكەكان پێی دەڵێن: ئەمیروسسەلام یان ئینتی كرست[٣].

لەلای نەصرانیەكانیش پێی دەوتریٙ: سەرۆك[٤].

هەندێكیش پێی دەڵێن: دیكتاتۆر[٥].

هەندێكیش پێی دەڵێن: الحاكم الاعلی[٦].

هەندێكیش پێی دەڵێن: ئەو ژمارەیەی كە ڕەمزە بۆ ناوەكەی ژمارە [٧]٦٦٠ە، وە زمانی ئەو ژمارەیە لەلای ئەهلی كیتاب زۆر ئاشكرایە، لە كاتێكدا ئەگەر ناوێك بپۆشن یان زانیاریەك بە زمانی ژمارە قسە دەكەن[٨].

---

(١) المسيا المنتظر، د. أحمد حجازي السقا، (لا ٧٩).

(٢) الفتن، ابن كثير، لا ١٧٢ .

(٣) جين داكسون آخر ساعة ١٩٨٤/٩/٢٦ .

(٤) تفسير الرؤيا / حنا ٢٩٥ .

(٥) مشتهى كل الأمم، صايغ .

(٦) تفسير الرؤيا / حنا ٢٩٥ .

(٧) الرؤيا ١٨/ ١٣ .

(٨) المسيح الدجال، سعيد ايوب، لا ٢٤٧ .

## شێوەو ڕووخساری دەجال

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفێکی وای دەجالی کردوە، کەسێتیەکەی دەردەخاو وێنەی شێوەی جەستەی دەکێشێ، چونکە دەجال پیاوێکە لە نەوەی ئادەم، لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆمەڵێکی زۆر لە سیفاتی شێوەو ڕوخساری باس کراوە، بۆ ئەوەی خەڵك باش بیانناسنەوە هەر کات پەیدابوو موسڵمانان پێی هەڵنەخەڵەتێن و بە فیتنەکەی گومڕا نەبن، ئەو نیشانانەش هێندە ڕوون و ئاشکران کە مەگەر کەسێکی نەزان و گومڕا دەرکی پێ نەکات، ئەگینا هەموو موسڵمانێك دەیناسێتەوە کە دەجالە، گرنگترین سیفات و ڕوخسارەکانیشی ئەوەیە کە پیاوێکی (گەنجە، سورە، کورتە باڵایە، سنگە پێی لێك نزیکن و پاژنەکانی لە یەك دوورن، قژی لوولە، ناوچەوانی پان و گەورەیە، ملی ئەستورو پانە، چاوی ڕاستی سڕاوەتەوە لە شوێنی خۆیدا، واتە: نەدەرپەڕیوەتە دەرەوەو نەچووە بە قوڵدا، بەڵکو دەڵێی دەنکی ترێیەو ڕووناکی تێدا نیەو چاوی چەپیشی گۆشتێکی زیادەی ئەستوورە بە پێلوەکەیەوەیە لەناوچەوانی نوسراوە (ك. ف. ر) هەموو موسڵمانێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێت بیخوێنێتەوە، وە نەزۆکەو منداڵیشی نابێت).

ئەگەر دەجال پەروەردگار بایە ئەم کەم و کورتیانەی لادەبرد کە لەخۆیدا هەن، کە لایان نابات، بەڵگەی ئەوەیە بەندەیەکی لاوازی دەستەوسانەو ناتوانێ خۆی لە نەنگیەکانی دەرباز بکات.

پێشەوا ئیبنو عەرەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دەرخستن و خستنە ڕووی سیفەت و کەموکوڕیە جیاجیاکانی دەجال ئەوە دەگەیەنێ کە ناتوانێت کەم و کوڕی خۆی چارە بکات هەرچۆنێك بێ، لە خودی خۆیدا حوکمی بەسەردا بڕاوە[1].

---

(١) فتح الباري: (٩٨/١٣).

### چەند فەرمودەیەك سەبارەت بە: شێوەو ڕوخساری دەجال:

پێشەوا عوبادەی کوری صامت (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ مَسِيحَ الدَّجَّالِ رَجُلٌ قَصِيرٌ أَفْحَجُ، جَعْدٌ أَعْوَرُ، مَطْمُوسُ الْعَيْنِ لَيْسَ بِنَاتِئَةٍ وَلَا حَجْرَاءَ، فَإِنْ أُلْبِسَ عَلَيْكُمْ، قَالَ يَزِيدُ: رَبُّكُمْ، فَاعْلَمُوا أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)[1].

واتە: مەسیحی دەجال پیاوێکی کورتە، سنگە پێکانی لێك نزیکن و پاژنە پێکانی لێك دوورن ، قژ لولەو، کوێرە، چاوی سڕاوەتەوەو نەدەرپەڕیوەو نەچووە بە قوڵدا، ئەگەر هەر لێتان تێك چووئەوا بزانن کە خواکەتان کوێر نیە.

واتای لێك دوری ڕان و قاچەکانیەتی، دەشڵێن: بریتیە لە لێك نزیکی سینگە پێیەکانی و لێك دوری پاشیانیەکانی، هەروەها دەڵێن: بریتیە لە خوارو خێچی قاچەکان.

### سیفەتە جەستەییەکانی دەجال:

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ فَذَكَرَ أَنَّهُ رأى عيسى بن مريم عليه السلام ثُمَّ ذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ فَإِذَا رَجُلٌ جَسِيمٌ أَحْمَرُ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ قَالُوا هَذَا الدَّجَّالُ أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطَنٍ رَجُلٌ مِنْ خُزَاعَةَ)[2].

واتە: لە کاتێکدا کە من نووستبوم تەوا فم دەکرد بە دەوری بەیتدا... (باس دەکات کە (عیسای کوری مەریم)ی دیتووە (سەلامی خوای لێ بێت)، پاشان دەجالی دیوەو وەسفی دەکات و دەفەرموێت: سەیر دەکەم پیاوێکی کەتەیە، سورە قژی سەری لولە، چاوی کوێرە، دەڵێی ترێیەو ڕوناکی تێدا نیە، گوتیان: ئەوە دەجالە، شێوەی لە هەموو کەس زیاتر لە (ابن قطن) دەچێت، کە پیاوێك بوو لە خێڵی خوزاعە[3].

---

(١) سنن أبو داود (٤/ ١١٦) باب: خروج الدجال، برقم: (٤٣٢٠).

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٦٠) باب: الطواف بالكعبة في المنام، برقم: (٧١٢٨).

(٣) ناوی (عەبدولعوزای کوری قطن کوری عەمری خوزاعی)ە و هەر لەسەردەمی جاهیلیدا مردووە.

پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی دەجالی بۆ کردین و فەرمووی: (إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ طَافِئَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قَطَنٍ)[1].

واتە: دەجال لاوێکە قژی زۆر لولە، چاوی کوژاوەیە، پێم وایە شێوەکەی لە (عەبدوالعوزای کوڕی قطن) دەچێت.

## سەبارەت بە دەجال کە نەزۆکەو منداڵی نابێت :

لە فەرمودەکەی ئەبی سەعیدی خودری(ﷺ) لەگەڵ (ئیبن صەیاد)دا هاتووە کە (ئیبن صیاد) پێی دەڵێت: (أَلَسْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: إِنَّهُ لَا يُولَدُ لَهُ قُلْتُ: بَلَى)[2].

واتە: ئەی تۆ گوێت لە پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە کە دەفەرموێت: دەجال منداڵی نابێت؟ گوتم: بەڵێ.

**بە کورتی سیفەتە ڕواڵەتییەکانی دەجال:**

- کورتەو باڵاو لنگ پەل.
- قژ لوول.
- تووکن (قژی پڕە).
- چاوی بە قوڵاچووە وەکو ترێیەکە سەر ئاو کەوتبێت، چاوی چەپی کوێرە.
- سپی پێستە.
- نێوچەوانی پانە.
- لەنێوچەوانی نوسراوە (ك،ف،ر) هەموو باوەڕدارێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار دەیخوێنێتەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٧).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٤١) باب: ذكر ابن صياد، برقم: (٢٩٢٧).

دەتوانین ئەم قسانەی ڕابردوو بە تێکڕا پوخت بکەینەوەو بڵێین: پیاوێکی کورتە باڵایە، قەڵەوە، سەری گەورەیە، هەردوو چاوی خەوشی تیایە، چاوی ڕاستی وەکو ترێیەکی سەر ئاو کەوتووە، چاوی چەپیشی پێستی لەسەرە، قژی زۆرەو پڕە، سپی پێستە، ناو شانی پانەو لنگ پەلە[1].

به کورتی و کوردی:

دەجال وەکو سەرۆکێك یان ئیمپڕاتۆریەتێك حوکم دەکات لە نەزەریەی سیاسی و ئابوری، لە مروی خوڕاسانەوە دەردەچێت کە دەکاتە سنوری تورکمانستی ڕووسی و جولەکەیە.. پیاوێکی چوار شانەیە.. کورتە باڵایە.. لە تەمەنی لاوێتیە، ڕەنگی دەم و چاوی ئەسمەرێکە بەرەو لای سوور نزیکە، چاوی چەپی کوێرە وەچاوی ڕاستەی سەوزە، دەنگی وەکو ئەوەی وایە بە لووتی قسە بکە (لە کوردەواری پێی دەڵێن: گنە)یە، لە بازاڕەکان هاموشۆ دەکات، منداڵی نابێت.. زۆر حەز دەکات لەگەڵ ئافرەتان تێکەڵ بێت، گوێدرێژێکی پێیە ڕەنگەکەی بەلای سەوزی دایە[2].. قژی زۆرە.. هەر کەسێك بینی با لێی دوور بکەوێتەوە یان هەڵبێت، وە ئەوەی توانیشی بەرامبەری ڕابوەستێت با تف لە دەم و چاوی بکات.

---

(١) المسيح الدجال ويأجوج ومأجوج، د.حامد البسيوني، لا ٢٠.

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٣٢٥.

## کوێری دەجــال

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی چاوانی دەجالی کردوە، چونکە دەجال هەر چەندە سیفەتەکانی دیکەی بشارێتەوەو خۆیان لێ دەرباز بکات، بەڵام ناتوانێت خۆی لە چاوانی دەربازبکات و لێیان ڕزگار بێ، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەی روونکردۆتەوە کە دەجال کوێرە، لە هەندێك فەرمودەی تریش دا هاتووە کە چاوی ڕاستەی کوێرە، هەندێك فەرمودەی تریش هەن دەڵێن چاوی چەپیەتی، ڕاستریش وایە ڕاستەی کوێریێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو چاوەی بە دەنکە ترێی دەرپەڕیو شوبهاندوە، لە فەرمودەیەکی تر هاتوە کە چاوی ڕاستەی کوێرەو دەرپۆقیوەو ناشاردرێتەوە، وەکو بەڵغەمی سەر دیوارێکی سپیکراو وایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەختی کردۆتە سەر کوێریەکەی (چونکە کوێریی شوێنەوار نیشانەیەکی دیارە، زاناو ڕەشۆکی خەڵکی هەستی پێ دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کە پەی بە بەڵگەی عەقڵی نابەن)[1]. دەنا زانایان دەرکی پێ دەکەن دەگەنە هەقیقەتی بانگەشەکەی، ئەمەش چەند فەرمایشتەکی پێغەمبەرە(ﷺ) دەربارەی کوێری دەجال:

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أَعْوَرِ الْعَيْنِ الْيُمْنَى. كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ)[2].

واتە: چاوی ڕاستەی کوێرەو دەڵێی دەنکە ترێی دەرپەڕیوە.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئاراستەی گێڕانەوەکانی بەرەو لایەکی دیکەی بردووە، وادەبینێ کە هەموو ئەو گێڕانەوانەی هەردوو چاوانی بە (عوراء) وەسفی دەکەن ڕاستن، ئەم وشەیەش لێرەدا بە پێی زمانی عەرەبی

---

(١) فتح الباري: (١٣/٩٦).

(٢) صحيح مسلم في كتاب الفتن، باب ذكر الدجال،(٤/٢٢٤٧).

بە واتای عەیب دێ، هەردوو چاوی دەجالیش عەیب دارن، ئەم وەسفەش دراوەتە پاڵ چاوی ڕاست و دراوەتە پاڵ چاوی چەپیش، هەروەها وشەی (طافية) بۆ یەکێکیان بەکارهاتووە، واتە: کوژاوەتەوەو دامرکاوەو ڕوناکی لێبڕاوە، بۆ ئەوی تریش (طافية) بەکارهاتووە، واتە: دەرپەڕیوەو بەرجەستەیە، جا بەپێی توێژینەوەی پێشەوا (نەوەوی)، چاوێکی نابینێ چونکە ڕوناکی تێدا نەماوە، ئەمەشیان داپۆشراوەو نەدەرپەڕیوەو نەبەقوڵداچووە، بەڵام چاوەکەی دی کوێر و بێ ڕوناکی نیە، بەڵکوو نەنگی و عەیبێکی تری هەیە، کە دەرپەڕین و بەرجەستەییە[١].

پێشەوا باوکی سەعید(ﷺ) دەڵێت: (وَعَيْنُهُ الْيُمْنَى عَوْرَاءُ جَاحِظَةٌ، وَلَا تَخْفَى كَأَنَّهَا نُخَامَةٌ فِي حَائِطٍ مُجَصَّصٍ، وَعَيْنُهُ الْيُسْرَى كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ)[٢].

واتە: چاوی ڕاستەی کوێرەو دەرپۆقیوەو ناشاردرێتەوە، دەڵێی بەڵغەمە لەسەر دیوارێکی سپیکراو، چاوی چەپیشی وەکو ئەستێرە وایە.

**ئاگاداری:** لە هەندێك فەرموودەدا کە دەڵێ: چاوی ڕاستی کوێرە، وە لە هەندێکی تر دەڵێ: چاوی چەپی.

لێرەدا پێشەوا ئیبنو حەجەر دەڵێت: فەرموودەکەی ئیبنو عومەر لە هەردوو صەحیحەکان هاتووە کە دەڵێ: چاوی ڕاستی کوێرە لە پێشترە لە فەرموودەکەی پێشەوا موسلیم کە دەڵێ: چاوی چەپی کوێرە لەبەر ئەوەی ئەو فەرموودەی کەوا بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە پێشترو ڕاستترە لەوەی کە تەنیا یەکێکیان گێڕابیانەتەوە[٣].

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الدَّجَّالِ: أَعْوَرُ هِجَانٌ أَزْهَرُ، كَأَنَّ رَأْسَهُ أَصَلَةٌ، أَشْبَهُ النَّاسِ بِعَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قَطَنٍ، فَإِمَّا هَلَكَ الْهُلَّكُ، فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)[٤].

---

(١) شرح النووي على مسلم: (٦١/١٨).

(٢) ضعيف: مسند الإمام أحمد (١٨/ ٢٧٦) برقم: (١١٧٥٢). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٣) فتح الباري (١٣/ ٩٣).

(٤) صحيح: مسند الإمام أحمد (١/ ٢٤٠) برقم: (٢١٤٨). قال شعيب الأرناؤوط: صحيح لغيره.

واتە: دەجال کوێرە سپی و سۆرە سەری وەك مارێکی زل وایە، زۆر بە عبدولعوززای کوری قوطن دەچێ، جا ئەگەر گومرِا و فەوتاوان بەهۆی دەجالەوە فەوتان، بزانن خودای پەروەردگارتان کوێر نیە.

پێشەوا حوزیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الدَّجَّالُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُسْرَى جُفَالُ الشَّعْرِ)[١].

واتە: دەجال چاوی چەپی کوێرە، قژی زۆرو بژە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێو خەڵکی هەستاوە پێ و بەوەی شیاو و شایستەیە ستایشی خودای کردو، پاشان باسی دەجالی کردو فەرمووی: (إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ وَمَا مِنْ نَبِيّ إِلاَّ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ لَقَدْ أَنْذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ وَلَكِنِّي أَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ ، وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)[٢].

واتە: من لە دەجال ئاگادارتان دەکەمەوەو هیچ پێغەمبەرێکیش نەبوە قەومەکەی لێ ئاگاداركردبێتەوە بەڵام من شتێکتان لەبارەی دەجال پێ دەڵێم: هیچ پێغەمبەرێك بە قەومەکەی خۆی نەگوتوە، دەجال یەك چاوەو خودای بەرز یەکچاو نیە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی ئەو چاوەی دەجال دەکات کە کوێر نیەو پێی دەبینێت و دەفەرمووێ: (عَيْنُهُ خَضْرَاءُ كَالزُّجَاجَةِ)[٣].

واتە: دەجال چاوی سەوزە وەك شوشە.

لە کۆی ئەم فەرموودانەوە پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وای بۆ دەچێت، کە دەجال هەردوو چاوەکەی عەیب دارە، بەڵام چاوی ڕاستی بە تەواوی کوێرەو سڕاوەتەوە، وە چاوی چەپی هەر چەندە ساغەو دەبینێت، بەڵام

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٤٨) كتاب: الفتن، باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٤).

(٢) صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال (٤/ ١٣٤) برقم: (٣٣٣٧).

(٣) صحيح: مسند الإمام أحمد (٥/ ١٢٤) برقم: (٢١١٨٤) قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

پارچە گۆشتێکی زیادەی ئەستوری پێوەیە کە ئەویشی عەیب دارو ناشیرن کردووە، هەروەها پێشەوا نەوەوی و قورتبی هەمان ڕایان هەیە[1].

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باسی جیاڕایەکی کردوە: کە هەندێك دەڵێن: نوسینەکە ڕاستەقینەیە، هەروەکوو باسمان کرد، هەندێکیش دەڵێن: مەجازەو ئاماژەیە بۆ سیما دیارەکانی، ئەوەشی کردۆتەوە بەڵگەو بیانو کە دەفەرموێ: هەموو بڕوادارێکی خوێدەوار و نەخوێندەوار دەیخوێنێتەوە، بەڵام ئەم بۆچونە لاوازە[2].

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وَأَمَّا مَسِيحُ الضَّلَالَةِ، فَإِنَّهُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ، أَجْلَى الْجَبْهَةِ، عَرِيضُ النَّحْرِ، فِيهِ دَفَأٌ)[3].

واتە: بەڵام مەسیحی گومڕایی، ئەوە چاوی کوێرە، ناوچاوانی پان و دیارە، ملی ئەستورو پانە، چەمانەوەیەکی کەمی تێدایە.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الدَّجَّالُ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ)[4].

واتە: دەجال چاوی داپۆشراوە، بێگومان لە نێو چەوانیدا نوسراوە کافر.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەوەی زانایان گوتویانە ئەوەیە کە ئەم نوسینە ڕاستیە، وە نوسینەکە بە نووسین نوسراوە کافر، کە ئەوەش نیشانەیەکە لە ڕێزی ئەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر کافری و درۆزنی ئەم پیاوە، کە خوای گەورە بە دیاری دەخات بۆ گشت

---

(١) شرح النووي لصحيح مسلم(٢/٢٣٥) والتذكرة، للقرطبي (لا ٦٦٣).

(٢) شرح النووي على مسلم: (١٨/٦٠).

(٣) مسند الإمام أحمد (١٣/ ٢٨٢) برقم: (٧٩٠٥). قال شعيب الأرناؤوط: حديث حسن.

(٤) صحيح البخاري (٩/ ٦٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٧١٣١).

موسڵمانێك، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار، بەڵام دەیشارێتەوە لە کەسانێك کە دەیەوێت بە هیلاکیان بدات کە ئەمەش هیچ ڕێگریەك نیە لەسەری[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵێت:

جا ئەوە چی تێدا نیە ئەگەر هەندێك لە خەڵکی ئەم نوسینەی نێو چەوانی دەجال ببینن یان نا، یاخود مرۆڤی نەخوێندەوار بیخوێنێتەوە لەبەر ئەوەی پەی بردن بە شتەکان لە چاوی مرۆڤدا خوای گەورە دروستی کردووەبۆ بەندەکەی چۆن ویستویەتی کەی ویستی لەسەردا ئەوە بڕوادار بە چاوی بینینی دەبینیَ هەر چەند خوێندەواریش نەبێت، بەڵام کافر نایبینێت، بۆیە خوای پەروەردگار بۆ بڕواداری دروست کردووە پەی بردن بە شتەکان بە دوور لە خۆ فێرکردن، لەبەر ئەوەی ئەو سەردەم کە دەجال تیایدا دێت شتەکان لە سروشتی خۆیان لادەدەن[2].

پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە توانای ئەوە دەدات بە کەسێك نەخوێنەوار بتوانێت دەجال بناسێتەوەو نێوچەوانی بە جوانی بخوێنێتەوە کە تیایدا نوسراوە (کافر).

پێشەوا حوذەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ، عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ)[3].

(ظفرة) بەواتای تانە دیَ کە پێستەیەکە چاو دادەپۆشیَ.

پێشەوا ئەصمەعی(ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵیَ: بریتیە لە پارچە گۆشتێك لەلای پیلوانەوە دەڕویَ.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (الدجال أعور، وهو أشد الكذابين)[4].
واتە: دەجال کوێرە، یەکێکە لە سەرسەختترینی درۆزنەکان.

---

(١) شرح النووي صحيح مسلم (١٨/ ٦٠).

(٢) فتح الباري (١٣/ ١٠٠).

(٣) صحيح مسلم، كتاب: الفتن، باب: ذكر الدجال وصفته وما معه، برقم: (٢٩٣٤).

(٤) صحيح: أخرجه الإمام أحمد في (المسند) (٣/ ٣٣٣) بإسناد صحيح.

## حیکمەت لە دەرچوون و دەرکەوتنی دەجال چیە؟

حیکمەت لە دەرچوونی دەجال ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار بەندەکانی خۆی تاقی دەکاتەوە بە ناردنی بەو دەجال بەو چەند دیاردە ناعادەتی و توانا سنوردارییەوە بەڵام پەروەردگاری بەسۆز چەند نیشانەیەکی داناوە بۆ ناسینی دەجال، بۆ ئەوەی خەڵکی زۆر پێی هەڵنەخەڵەتێن.

بەڵام دڵ نەخۆشەکان و ئەو نەفامانەی کە هەموو دیاردەیەکی ناعادەتی بە کەرامەت دادەنێن و جیاوازی ناکەن لە نێوان خواپەرستی و شەخس پەرستی، ئەوانە هەر دەخەڵەتێن و دەکەونە داویەوەو شوێنی دەکەون.

وە هاتنی دەجالیش زۆر نزیکە، چونکە هەر شتێك کە بەڕێوە بێت و لەهاندا بێت ئەوە هەر نزیکە[1].



---

(١) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ١٩.

# شوێنی هاتن و دەرچوونی دەجال

سەبارەت بە شوێنی هاتنی دەجال ئەوەیە کە لەڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێ، لە وڵاتێکی فارسی کە پێی دەڵێن: خوراسان، هەروەکو ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الدَّجَّالَ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالْمَشْرِقِ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ)[1].

واتە: دەجال لە خاکێك دەردەچێت لە خۆرهەڵات، پێی دەگوترێت خوراسان.

## کێ شوێنی دەکەوێت؟

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ مِنْ يَهُودِيَّةِ أَصْبَهَانَ ، مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنَ الْيَهُودِ)[2].

واتە: دەجال لە گەڕەکی جولەکەکانی شاری ئەصفەهان[3] دەردەچێت و هەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵ دایە.

کەواتە شوێنکەوتووەکانی دەجال جولەکەکانن، چ جولەکەیەك؟

کەواتە ئەگەر دەجال جولەکە بێت، دەبێت هەڵگری چ بیروباوەڕێك بن؟

هەڵگری ئەو بیروباوەڕەن کە دەجال:

فەرمان بە ئاسمان دەکات باران ببارێت دەبارێت

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٥٧٣) برقم: (٨٦٠٨). قال الإمام الحاكم: حديث صحيح.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢١/ ٥٦) برقم: (١٣٣٤٤). قال شعيب الأرناؤوط: حديث حسن.

(٣) ئەسفەهان: شارێکی ئێرانیە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئێرانەوە، نزیکەی (٣٤٠)کم لە پایتەختی ئێرانەوە دوورە بەلای باشووردا و بەپێی سەرچاوە فەرمییەکان (٢٥ ـ ٣٠) هەزار جوولەکەی تیا دەژیت.

وە فەرمان بە زەوی دەکات کە سەوز بێت زەویش سەوز دەبێت.

بە لای کەلاوەی ڕوخاودا تێدەپەڕێت، پێی دەڵێت: کەنزو زێڕەکەت بهێنە دەرەوە، ئیتر هەرچی کەنزو زێڕی تێدایە وەکو مێش هەنگ شوێنی دەکەون.

کەواتە جولەکەی دەجال جیاوازە لەگەڵ ئەو جولەکانەی کە گوێڕایەڵی پێغەمبەرانیان کردووە، ئەوە چۆن ڕوویداوە؟ وە چۆن دەجال دەچێتە ژێر کاریگەری جولەکەکان؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەوترێت:

جولەکەی دەجال ئەو جولەکانەن کە جولەکەیان دروست کرد، واتە: ئەو جولەکانە لە هەق و ڕاستی لایاندا.. و وە دوژمنایەتیان کردو وە باوەڕیان بە پێغەمبەر عیسا و پێغەمبەر محەممەد (ﷺ) نەهێنا، ئا ئەمانە شوێن دەجال دەکەون و دەجالیش بە ئارەزووی ئەوان لە کۆتایی بونەوەر دەردەچێت.

پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالًا، يَا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتُوا)[١].

واتە: دەجال لە ڕێگەیەکی نێوان شام و عێراق دەردەچێت، بەڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆتان ڕاگرن.

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بێگومان شوێنی دەرچوونی دەجال لەلای خۆرهەڵاتەوە دەردەچێ[٢].

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

سەرەتای دەرکەوتنی لە ئەصفەهان دەبێ لە گەڕەکێك کە پێی دەڵێن: گەڕەکی جولەکان[٣].. یان گوندێك لە گوندەکانی ئەصبەهان کە پێی دەوترێ: رستقباد[٤].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم» (٢٩٣٧).

(٢) فتح الباري (١٣/ ١٩).

(٣) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٢٨).

(٤) ضعيف: رواه الطبراني في (الأوسط) برقم: (٤٨٥٩) قال الهيثمي: فيه سيف بن مسكين، وهو

بەرگی سێیەم

چۆن بتوانین جەمع و تەوفیق بکەین لە نێوان ئەم سێ فەرموودەیە:

کە دەفەرموێ: لە خوراسان.. و ئەسفەهان و.. عێراق..

کۆکردنەوەی ئەم فەرموودانە یەکەمجار لە خوراسانەوە دەردەچێت، خۆی وەکو سەرکردەیەك نیشان دەدات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی زیاتر پەیدا بکات، دواتر لە ئەسبەهان سەرهەڵدەدات و بەهێز دەبێت و لە نێو خەڵکی بڵاو دەبێتەوە.. تاکوە خەڵکێکی زۆر بە کارە سیحراویەکانی هەڵبەخەڵەتێنێت، وە دەرچوونی لە (خولەی نێوان عێڕاق و شام) لەوێ فەسادی بڵاودەکاتەوە بەڕاست و چەپیدا..

یەکەم: لە خوراسان..

دەجال لە خاکێك دەردەچێت کە پێی دەڵێن: خوراسان، وە پێش دەرچوونی دەجال سەرخەرانی محەممەدی مەهدی لەوێوە دەردەچن، تەنانەت زانایانی ئیسلامیش لە کۆندا کاریگەری زۆریان هەبووە لە خوراسان..

پێشەوا قەزوینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لە سنوری خوراسانی ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت لە دوای ڕووبارێك کە پێی دەوترێت: ڕووباری حیجون کە دەکەوێتە دوای بوخارا، لە دەوروبەری مرو و بەلخ و هەررەو نەیسابور[1].

وە دەرچوونی لە جێگایەك دەبێت پێی دەوترێ (مرو) ئا لەوێوە دەجال دەردەچێت.. بە بەڵگەی فەرموودەی پێشەوا ئەبوبەکری صدیق (ﷺ) کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (یخرج الدّجال من مروا من یهودیتها)[2].

---

ضعيف جداً (مجمع الزوائد ٧/ ٣٣٩).

(١) آثار البلاد/ للقزويني، لا ٣٦١ .

(٢) الفتن، نعيم بن حماد: (٣٨٤) .

وە (مرو) دەکەوێتە نزیك سنوری سۆڤیەتی لە نزیك هەرێمی تورکمانستان، وە گرنگترین شارەکانی ئەو هەرێمەش (کیفا ـ خاردزو ـ مرو ـ ئەشخاباد)ە، وە (مرو) لەسەرووی سێگۆشەی هەردوو شاری خاردزو ئەشخابادە[1].

پێشەوا قەزوینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە چیایەکی هەرێمی خوراسانە ناوی (کلستان)ە، ئەشکەوتێکی لێیە هاوشێوەی ڤێلایەکە، کەسێك ئەگەر بیەوێت بچێتە ئەو ئەشکەوتەوە دەبێت سەری خۆی دابنوێنێتەوە، وە مەسافەیەکی تەواو دەڕۆی تا لە کۆتاییەکەی ڕووناکیەك بەدی دەکەیت، وە لەناو ئەو ئەشکەوتە کۆمەڵێك ڕووبار هەیە کە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێت[2].

کەواتە: لە ڕۆژهەلاتی خوراسان دەردەچێت ـ لە مەنتیقەیەك پێی دەڵێن: (مرو) لە دوای ڕووباری حیجوونە ـ وە چیایەك هەیە پێی دەڵێن: کلستان...

## دووەم: لە ئەسبەهان..

ئەسبەهان یان ئەسفەهان جیاوازی نییە..

ئەسبەهان شارێکە لە خاکی ئێران کە جولەکەکان چاوەڕێی هاتنی دەجال دەکەن و پێیان وایە لەسەر دەستیدا حوکمی هەموو جیهان دەکەن و دەیان ساڵیشە زەمینە بۆ هاتنی ساز دەکەن، بۆیە دەجال لە گوندێکی ئەسفەهان مەوعیدیان لەگەڵ دەجال دەبێت، لە گوندێك پێی دەڵێن: (الجفر) کە لە شاری (دسرابارین بهوذان)[3].

هەر چەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆرم سەبارەت بە یەك گەیشتنیان لە گوندەکە سەرچاوەیەکی زۆرم دەست نەکەوت تا بگەمە یەقین.. لە ڕووی دروستی و نادروستی، تەنیا لە پەرتوکی (کنز العمال) ناوی ئەو گوندەم دەست کەوت..

---

(١) المسيح الدجال، سعيد ايوب، لا ٢٣٨ .

(٢) آثار البلاد/ للقزويني، لا ٣٦١ .

(٣) كنز العمال (٨٧٣١).

بەڵێ.. خەڵکی ئەو ناوچانەو جولەکەکانی ئەصفەهان دەست و دایەرەی دەجال دەبن و هەر لەسەرەتاوە کاری دەجال دەچەسپێنن، بەڵام دواتر لە هەموو وڵاتانی جیهان و لە هەموو زمان و ڕەگەزەکان خەڵکانێکی زۆر شوێن دەجال دەکەون و باوەڕی پێ دەکەن، جگە لەمانەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژە بەوە دەکات کە بەتایبەت ئافرەت زۆر شوێنی دەکەوێت و زوو باوەڕی پێ دەهێنن.

(ئەبو نوعەیم) باسی یەکێك لە گوندەکانی سەر بەئەسفەهان دەکات کە ناوی (جولەکاوە ـ الیهودیە) بوو، چونکە تایبەت بوو بە دانیشتوانی جولەکەو تا سەردەمی ئەیوبی کوڕی زیادی ئەمیری میصر هەروا مابوو، لەسەردەمی (مەهدی کوڕی منصوری عەبباسی)، ئینجا موسڵمانان تێیدا نیشتەجێ بوون و هەر بەشێکی بۆ جولەکەکان مایەوە[1].

دەجالیش لەلای جولەکەکان ناوی مەسیحی کوڕی داودەو دەڵێن: گوایە لە کۆتایی بونەوەر دەردەکەوێ و دەسەڵاتی دەگاتە دەریاو وشکانی و ڕووبارەکان لەتەکی دەڕۆن و دەڵێن: گوایە یەکێك لە نیشانەکانی خودا موڵکیش بۆ وان دەگەڕێتەوە، بەڵام لە گریمانەکانیان درۆیان کردوە، چونکە دەجال مەسیحی گومڕایی و درۆزنە، مەسیحی ڕێنمونیش کە عیسای کوری مەریەمە، دەجالی مەسیحی گومڕایی دەکوژێ، هەروەکو جوولەکە شوێنکەوتوەکانیشی دەکوژێ[2].

پێشەوا سەلمانی کوڕی عیسا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (بلغني أن الدجال يخرج من جزيرة أصبهان في البحر يقال لها ماطولة)[3].

واتە: پێم گەیشتووە کە دەجال دەردەچێت لە دوورگەیەکی ئەسبەهان لەناو دەریایەك پێی دەگوترێت: ماطولة.

---

(١) لوامع الأنوار البهية: (١١٢/٢).

(٢) لوامع الأنوار البهية: (١٠٧/٢).

(٣) الفتن، نعيم بن حماد : لا ١٥٠ .

کەواتە: لە دوای دەرچوونی دەجال لە خوراسان. دەچێتە ئەسبەهان بۆ ئەوەی چاوی بە جولەکەکان بکەوێت لە گوندی الجفر لای دەریای ماتوڵە.

بۆیە دوای بە دواداچوونێکی زۆرم بۆ دەریای ماتوڵە.. نەگەیشتمە دەرەنجامێك کە ئەم دەریایە لە ئێران هەبێت یان هەبێت و بەڵام ناوی دەریاکە گۆڕا بێت.

## سێیەم: ڕێگەیەکی نێوان شام و عێراق (الخلة):

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەی دەرچوونی لە (الخلة) کە ڕێگەیەکە لە نێوان شام و عێراق، واتە: دەجال لە مرو دەردەچێت و لە جفر شوێنی دەکەون و وە لە نێوان عێراق و شام بەلای ڕاست و چەپیەوە گەندەڵی و فەسادی دروست دەکات..

**ڕێگای نێوان عێراق و شام دەکاتە کوێ ؟**

بۆ دیاری کردنی شوێنی نێوان سنوری عێراق و سنوری شام پێویستمان بە چەندین توێژینەوە هەیە:

لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسوریایان دەگوت: شام، دواتر شام بوو بە چوار باڵ:

(حیمص و دیمەشق و فەلەستین و ئوردن)، دوای ئەوەی فەرەنسا دیمەشقی داگیر کرد، ئیتیفاقیەی سایکس بیکۆ هاتە پێش سەبارەت بە شام، وڵاتێکی وەکو فەرەنسا بڕیاریدا کە باکوری شام دابەش بکات بۆ دوو کیان ئەوانیش سوریا و لوبنان بوو.. وە بەریتانیا لای باشوری شامی کردە دوو کیان، ئەوانیش فەلەستین و ئوردن بوو.. بۆیە بۆ هەر کیانێك لەم چوار وڵاتە جەوازو سنورو دەستورو ڕاگەیاندنیان جیاواز کرد.

ئەو کات دەوڵەتی شام و عێراق پێکەوەبوون کە ناسراوبوو بە دەوڵەتی هیلالی.. ئەگەر ئەو هیلالیە لەسەر نەخشە دابنێین، دەبینین کە دیجلەو فوڕات دەکەوێتە

لای ڕۆژهەڵات، و پاشان بەلای ڕۆژئاوا دەوڵەتی سوریاو شام دەگرێتە خۆی، و پاشان لەلای باشوور فەلەستین و ئوردن دەگرێتەوە[1].

بەبۆچوونی خۆم وایە هەر یەك لە وڵاتانی سوریا و ئوردن و لوبنان دەورێکی گەورەیان دەبێت لەشەڕ کردن لەگەڵ دەجال، بەڵام بە نیسبەت فەلەستین بۆچوونم جیاوازە:

کە بەشێکی قودس و دەوروبەری دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان و محەممەدی مەهدی لە کاتی دەرچوونی دەجال؟

وە بەشەکەی تر دەکەوێتە دەست جولەکەو دەجال، بە بەڵگەی فەرموودەی نەهیکی کوڕی سورەیم (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَزَالُونَ تُقَاتِلُونَ الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُقَاتِلَ بَقِيَّتُكُمُ الدَّجَّالَ بِالْأُرْدُنِّ عَلَى النَّهَرِ أَنْتُمْ شَرْقِيُّهُ وَهُمْ غَرْبِيُّهُ)[2]. واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن شەڕ لەگەڵ هاوبەش پەیداکەرەکان دەکەن، پاشماوەتانیش لەگەڵ دەجالدا شەڕ دەکەن لەسەر ڕووباری ئوردن، ئێوە لە ڕۆژ هەڵاتەکەی و ئەوان لە ڕۆژئاواکەی.

پێشەوا نوهەیك(ﷺ) دەڵێت: لەو کاتەدا نەمدەزانی ئوردن لە کوێیە.

مەبەستیش لەو دەریا جیاکەرەوەیە لە نێوان فەلەستینی داگیرکراو و ئوردندا.

ئەو بەشەش هەمان ئەو جێگەیەیە کە دەجال دیاری کرد، کاتێك تەمیمی داری چاوی پێکەوت لە دوورگەکە.. کە پرسیاری دەربارەی دارخورماکانی (بیسان)[3]ی، لێکرد کە بەرنادات لە پێش دەرچوونی دەجال .. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەڵکی ئەو مەنتیقەیە بەرەو گەندەڵیەکی ئێجگار زۆر دەڕۆن، وە دانیشتوانی ئەو مەنتیقەیە لە پێش هاتنی دەجال جوولەکە تیایدا نیشتەجێ

---

(١) الأردن وفلسطين، سعيد التل، لا ١٩ .

(٢) ضعيف: مسند الشاميين، للطبراني (١/ ٣٦٨) برقم: (٦٣٨). قال ابو اسحاق الجوزجاني في (أحوال الرجال) (١/ ٧٤): ضعيف الحديث.

(٣) (بيسان) : شارێكة لة فةلةستين.

دەبن، ئەو مەنتیقەیە پێی دەڵێن: (غور الاردن).. (غور الاردن)یش لە دەریاچەی تەبەریە دەست پێدەکات هەتا دەگاتە بیسان وە کۆتاییەکەی زەغرو ئەریحایە.

جوگرافیناسەکان دەڵێن: بەشێکی غۆر لەسەر سنوری ئوردنە، ئەگەر بیسان زیاتر بکێشێت دەگات بە سنوری فەلەستین[1].

بۆیە لە فەرموودەکەی تەمیمی داری هاتووە کە دەجال لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت وشکبوونی کانیاوی (زەغر)[2]ی ڕاگەیاند.

بۆیە ئەو ڕێگایەی نێوان شام و عێراق کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دەکاتە سنوری ئیسرائیل لە کۆتایی بونەوەر، وە ئەم سەردەمەی کە ئێمەی تیایداین ڕاگەیاندنەکانی ئیسرائیلی زیاتر لەو ڕێگایەیان دەست بەسەر داگرتووە کە پێی دەوترێ (الخلة).

ئایا دەجال ئەو ڕێگایەی نێوان عێراق و شام پێدەزانێت، لە کاتێکدا لە نێو دێرەکەدایە، وە ئایە مەسیحی و جولەکەکان زانیاریان هەیە؟ بێگومان زۆر زانیاریان لایە، بەس نایدرکێنن، تەنانەت دەوترێت: کە ڕۆژێك دێت ئاشوریەکان نیوەی ئیسرائیل داگیر دەکەن.

## ژمارەی شوێنکەوتووانی دەجال و پۆشینی جل وبەرگیان:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِنْ يَهُودِ أَصْبَهَانَ، سَبْعُونَ أَلْفًا عَلَيْهِمُ الطَّيَالِسَةُ)[3].

---

(١) الأردن وفلسطين، سعيد التل، لا ٢٢ .

(٢) (زەغر): گوندێکە لە شام لە قەراغ دەریای مردوو. بەڵام (ئیبنو ئەپیر) دەڵێت: (زەغر) لە شامە لە خاکی (البلقاء) بڕوانە: النهایە (٢/ ٣٠٤). هەندێکیش بە دەریای مردوو دەڵێن: (بحيرە زغر) لەبەر مێرگێکی نزیك لەو دەریایە.

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٦) باب: في بقية من أحاديث الدجال، برقم: (٢٩٤٤).

واتە: هەفتا هەزار لە جولەکەکانی ئەصفەهان شوێن دەجال دەکەون پۆشاکی تەیلەسانی سەوزیان لەبەر دایە( شاڵێکی ئاودامانە کە ئەیدەن بە شانیاندا).

لە ریوایەتێکی تر دەفەرموێ: (..عَلَيْهِمُ السيجان)[1]. واتە: پۆشاکی سیجانیان لەبەر دایە.

سیجانیش ئەو قوماشە ئەستورەیە کە لە سوف یان ئیسفەنج یان هاوشێوەی ئەوان دروست دەکرێت، ئەمەش ئیشارەتە بۆ ئەوەی کە دەجال لەناوچەیەك دەردەچێت کە پلەی گەرمی لە ژێر سفر دایە[2].

جیاوازی نییە لە نێوان تەیڵەسان و سیجان، بەڵام سیجان تەیڵەسانێکی سەوزە.

**ڕووی ئیعجازی ئەم فەرموودەیە..**

لەم فەرمودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها لە جولەکەکانی ئەصفەهان هەفتا هەزار شوێن دەجال دەکەون، ئەمە جگە لە هەزاران جولەکەی جیهان.. وە سەبارەت بە شاری ئەصفەهانیش پێویستە ئەو ڕاستیە بزانین کە ئەمڕۆ لە هیچ شارێکی موسڵمانشینی جیهاندا هێندەی شاری ئەصفەهان جوولەکەی تێدا نیشتەجێ نیە، بەڕاددەیەك کە چەندین گەڕەکی تایبەت بەخۆیان هەیە لەو شارەدا هەر بۆیەش دەجال دەیکاتە بنکەی دەرچوونی خۆی.

چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانیویەتی لە ئەسفەهان جولەکەی لێیە؟ لە سەردەمێکدا کە هۆکارەکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن نەبوون بووە!

چۆن زانیویەتی کە جولەکەکان لە (ئەسفەهان) دەمێننەوە هەتا کاتی دەرکەوتنی دەجال، لە کاتێکدا کە زۆرێك لە جولەکەکانی جیهان کۆچیان بۆ ئیسرائیل کرد، ئەی بۆچی جولەکەکانی ئەسفەهان مانەوەو نەچوون بۆ ئیسرائیل؟

---

(١) صحيح: رواه أحمد (٥٥/٢١) وحسنه المحققون في طبعة مؤسسة الرسالة. وقد وثقه أحمد وغيره، وبقية رجالهما رجال الصحيح، ورواه الطبراني في (الأوسط). سةرضاوة: مجمع الزوائد (٧/ ٣٣٨) بة ذمارة (١٢٥١٣).

(٢) المسيح الدجال قراءة سياسية في أصول الديانات الكبرى، سعيد ايوب (لا ٢٢٤)، الطبعة الخامسة ٢٠٠٧ م، دار الفتح الإعلامي العربي.

وشەی (طیالسە) کۆی (طیلسان)ە، وە بە (تەیلەسان) یان (تەیلوسان) دەخوێندرێتەوە لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەجەمیەو بە عەرەبی کراوە، لە کتێبی (معیار اللغة)شدا بە واتای جل و بەرگێکی چنراو هاتووە کە نادورێت، بەسەر شاندا دەدرێت و لەش دادەپۆشێت[١].

(طیلسان) پۆشاکێکە وەکو عەبا دەدرێت بەشانداو لەشی مرۆڤ دادەپۆشێت و بە زۆری ڕەنگی سەوزەو زیاتر زانایانی ئاینی جولەکەو موسڵمان لەبەری دەکەن[٢].

ڕای بەهێزیش لەسەر (ئەسبەهان یان ئەسفەهان) ئەوەیە کە مەبەست لەناوچەی (ئەسفەهان) بێت کە دەکەوێتە ناوەڕاستی (ئێران)ی ئێستاوە، وە ژمارەی ئەو جولەکانەش کە لە ئێران ماونەتەوە لە هەر سێ هەرێمی (ئەسفەهان و تاران و هەمەدان)دا دەژین نزیکەی (٣٥) هەزار کەس دەبن[٣].

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: سەرەتای دەرکەوتنی لە ئەسفەهان دەبێ لە گەڕەکێك کە پێی دەڵێن: گەڕەکی جولەکەکان[٤].

لەبەرچی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە جوولەکەکان شوێنکەوتەی دەجال دەبن و تەیلەسانیان لەبەردایە؟

یەکەم: ئاگادار کردنەوەیە کە ئەوانە لە گەورەکانی جوولەکەن، پاشان هەموو شوێنەکەوتووانی دەجال جولەکەن و هەفتا هەزارن؟

لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، بەڵکو سەرکردەکانیان هەفتا هەزار کەسن، وە هەریەکێ لەو سەرکردانە چەندان کەس شوێنکەوتەی بوون، ئەمەش وەکو ئەوە وایە پێغەمبەر پێمان بفەرمووێ: ئەوانەی ئەو جلەیان لەبەر دایە ژمارەیان هەفتا هەزارە چ جای خەڵکی تر[٥].

---

(١) WWW.QURAN-M.COM

(٢) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٧.

(٣) WWW.QURAN-M.COM

(٤) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٢٨).

(٥) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٧.

## پرسیارێکی تر لەبەرچی جولەکە شوێنکەوتەی دەجال دەبن؟

لەبەر ئەوەی ئەوان وای دەبینن کە دەجال دڵسۆزەو هەڵدەستێت بە گەڕاندنەوەی مەملەکەتی کوڕانی ئیسرائیل لە ئاوی نیل هەتا فوڕات[1].

بێجگە لە جوولەکەش دەجال هەر لە سەرەتای هاتنیەوە لە خاکی (خوراسان) کۆمەڵە خەڵکانێکی تریشی لەگەڵ دایە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: (الدَّجَّالُ خَارِجٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مِنْ أَرْضٍ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ مَعَهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ) [2].

واتە: دەجال لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە دێت لە خاکێك پێی دەگوترێت خوراسان، چەند کۆمەڵە قەومێکی لەگەڵ دایە دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانە[3].

وەکو باسمان کرد جولەکە چاوەڕێی دەجال دەکات، وادەزانن خوا پەیمانی پێداون و دەوڵەتی ئیسرائیل زیندوو دەکاتەوە، وە لەکیتابەکانی خۆیان ناویان ناوە (ئەلمیسیا)[4].

جوولەکە ئێستا ژمارەیان سی هەزار دەبێت لە ئێران، لە سێ شاردا نیشتەجێ بوون کە تاران و هەمەدان و ئەصفەهانە، خاکی ئێران بەلایانەوە خاکی پاشا کۆرشە کە کاتی خۆی ڕزگاری کردن و بابلی داگیر کرد، گوایە بنیامین برای یوسف و دانیاڵ پێغەمبەریش لەوێ نێژراون.

جا لەو کاتەوە کە کۆرش بابلی گرت و جوولەکە چوون بۆ ئێران زۆریان قایل نەبوون ئێران بەجێبهێڵن، هەر چەندە جولەکەکانی جیهان فشاری زۆریان خستە

---

(١) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٧.

(٢) صحيح: واه الترمذي وأحمد والحاكم عن أبي بكر.. وصححه الحاكم وأقره الذهبي ، وصححه أحمد شاكر في تعليقه على المسند (١٥٩/١-١٦٩) والألباني في الصحيحة (١٢٢/٤ رقم: ١٥٩١).

(٣) مەبەستیش بەو دەم و چاو قەڵغانیانە خەڵکی وڵاتانی مەنغۆلیاو چین و قەفقاو ئاسیاو ئەو ناوچانەیە کە لە کۆنەوە پێیان دەگوترا (تورك).

(٤) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٧

سەریان بۆ ئەوەی بچنە فەلەستین، ئەوان تەسلیم نەبوون و کەمیان لێ چوو بۆ ئیسرائیل.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت هەقی چیە بەسەر ئەم باسەوە، بۆ نالێت جوولەکەکانی نیوە دورگەی عەرەب، یان جوولەکەکانی ئەوروپا، یان جوولەکەکانی عێراق؟! شایانی باسە هەر لە سالآنی پەنجاکانەوە جوولەکە عێراقیەکان لە ئەنجامی فشاری جولەکەی جیهانیەوە کە هەر خۆیان بۆمبیان دەخستە ماڵەکانیانەوەو لێیان دەکوشتن، ناچاربوون بچن بۆ ئیسرائیل!

ئەصفەهان دەکەوێتە ناوەڕاستی ئێرانەوەو وادانێ لەو سی هەزار جوولەکەیەی ئێران دە هەزاریان لەو شارەدایە زۆر مەنطقیە کە تا کۆتایی بونەوەر ئەوەندە زۆر ببن کە حەفتا هەزاریان شوێن دەجال بکەوێت، ئینجا ئەو وەسفە وردەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باسی عەبای سەر شانیان دەکات، ئێستا بە فیعلی عادەتیانە ئەو عەباو شاڵە دەدەن بەشانیاندا .

بۆچی لە خاکی خوراسان و سنورەکانی (ئەفغانستان) دەردەچێت ؟

• خاکی خوراسان لەم ڕۆژگارەدا جولەکە بۆ مەسلەحەتی خۆی بەکاری دەهێنێ.

• ئەم خاکە لای جولەکەکان زۆر پیرۆزە.

• خاکی ئێران ئەمڕۆ لە ژێر دەسەلآتی شیعەی دوانزەییە کە پیسترن لە جولەکەو گاورەکان لە ڕووی عەقیدەو کردەوە.

• وە خاکی خوراسان و سنورەکانی چیای زۆر زۆرە، بۆیە دەجال لە نێو چیاکان دەردەچێت.

وە شوێنی هاتنی دەجال

سوپایەکی تۆکمە پێك دەهێنێت، خوێنێکی زۆری خەڵکی دەڕێژێت، خاکو وڵات داگیر دەکات، ئینجا دەست بە بانگەشەکردنی خۆی دەکات و دەڵێت: من خودام .

دەجال لە دەریاوە بۆ دەریا داگیر دەکات..

وە یەکەم هێرشی دەجال لە وڵاتێك دەبێت کە لە نێوان دوو دەریادایە..

سەید قوتب دەفەرموێ: لە نێوانی دەریای سپی و دەریای سورە.

وە دووەم هێرشی لە خاکی عێراق دەبێت لای ڕووباری فوڕات، هەتا ئەو جێگایەی کە خۆی مەبەستیەتی..

ئافرەتێکی تەبشیری ئەمریکی دەڵێت: هیچ ژیانلەبەرێك لە ئامادە باشی نییە کە هاموشۆ بە دەجال بکات تەنها گوێدرێژ نەبێت[١].

بۆیە ئەو دەجالەی کە جولەکەکان چاوەڕوانی دەکەن، سواری گوێدرێژ دەبێت.. پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (يَسْتَظِلُّ فِي ظِلِّ أُذُنِ حِمَارِ الدَّجَّالِ سَبْعُونَ أَلْفًا)[٢].

پێشەوا ئەبو توفەیل (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو: (إِنَّهُ يَجِيءُ عَلَى حِمَارٍ..)[٣].واتە: دەجال کە دێت لەسەر گوێدرێژێکە..

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: (وَلَا يُسَخَّرُ لَهُ مِنَ الدَّوَابِّ إِلَّا حِمَارٌ..)[٤].

واتە: هیچ ژیانلەبەرێك بۆی دەستەبەر نابێت تەنها گوێدرێژ نەبێت..

---

(١) المسيح الدجال، سعيد ايوب، لا ٣٠ .

(٢) أخرجه أبو نعيم ( ٢ / ٥٤٨ ) وابن أبي شيبة ( ٧ / ٤٩٥ ) عن حوط العبدي عن ابن مسعود به. قال ابن كثير : قال شيخنا الحافظ الذهبي: حوط مجهول والخبر منكر ..

(٣) صحيح: واه مسدد في مسنده، قال البوصيري في الإتحاف ( ٨ / ١٢٨ ): رواه مسدّد ورواته ثقات.

(٤) صحيح: أخرجه الحاكم في المستدرك (٤/ ٥٢٩) قال الحاكم (٤/ ٥٢٩): صحيح الإسناد ولم يخرجاه، وقال الذهبي في «تلخيصه»: «على شرط البخاري ومسلم «.

## شوێنکەوتووانی دەجال

وەکو باسمان کرد دەجال ئەو پادشایەیە کە جولەکە چاوەڕێی هاتنی دەکەن و پێیان وایە لەسەر دەستیدا حوکمی هەموو جیهان دەکەن و دەیان ساڵیشە زەمینە بۆ هاتنی ساز دەکەن.

زیاتر ئەوانەی کە شوێن دەجال دەکەون ئەمانەن:

### یەکەم: جولەکەکان:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیک (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ مِنْ يَهُودِيَّةِ أَصْبَهَانَ ، مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنَ الْيَهُودِ)[1].

واتە: دەجال لە گەڕەکی جولەکەکانی شاری ئەصفەهان دەردەچێت و هەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵ دایە.

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سەرەتای سەرهەڵدانی لە خاکی خوراسانەوە دەبێت و پاشان دێتە گەڕەکی جوولەکەکانی شاری ئەصفەهان و لەوێش هەفتا هەزار جوولەکە شوێنی دەکەون و دوا جاریش لە شوێنێکی سنوری نێوان عێراق و شام خۆی ئاشکرا دەکات و لافی خوایەتی لێ دەدات و بەڕاست و چەپدا خراپەکاری بڵاودەکاتەوە.

لە فەرموودەیەکی تر کە عوسمانی کوڕی ئەبولعاص (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وَأَكْثَرُ تَبَعِهِ الْيَهُودُ وَالنِّسَاءُ)[2].

واتە: زۆربەی شوێنکەوتەی دەجال جولەکەو ئافرەتن.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢١/ ٥٦) برقم: (١٣٣٤٤). قال شعيب الأرناؤوط: حديث حسن.

(٢) مسند الإمام أحمد (٦/ ٢٣٤٢) برقم: (١٨١٨٤).

**بۆچی زۆربەی شوێنکەوتووانی دەجال جوولەکەن؟**

**وەڵام:** بیروباوەڕی جوولەکە لە دەجالدا ئەوەیە کە ئەو مەسیحی چاوەڕوانکراوی جوولەکەیە!

جوولەکە باوەڕیان وایە کە خوای گەورە بەڵێنی پێداون بە پادشایەکی چاوەڕوانکراو لە نەوەی داود دێت و دەوڵەتیان بۆ دادەمەزرێنێت و لە کتێبەکانیان ناوی دەنێن: (المیسیاه).

یەکێك لە عیبادەتەکانی جولەکەش نوێژێکە داوا لە دەجال دەکەن تیایدا پەلە بکات لە هاتن. شەوی (الفصح)[1] یشیان تەرخان کردووە بە هەندێ پاڕانەوەی تایبەت لەو بارەوە.

لە تلمودا دەڵێت: کاتێك مەسیح دێت، زەوی نان و خوری و گەنم بەرهەم دێنێت، دانەیەکی بە قەد گورچیلەی گایەکی گەورەیە، لەو سەردەمەدا دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ جوولەکەو هەموو نەتەوەکان خزمەتی ئەو مەسیحە دەکەن و لە ژێر فەرمانیدا دەبن، لەو ڕۆژگارە هەموو جوولەکەیەك دوو هەزارو هەشت سەد کۆیلە خزمەتی دەکەن و سێ سەدو دە کارەکەریش لە ژێر دەسەڵاتیدا دەبێت، بەڵام مەسیح نایەت دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی خراپەکاران نەبێت و چاوەڕوانکردنی ئوممەتی جوولەکە بە هاتنی ئیسرائیل جێبەجێ دەبێت و ئەو ئوممەتە دەبێتە خاوەن دەسەڵات بەسەر ئوممەتەکانی تر لە کاتی هاتنیدا.

**دووەم: مونافیق و بێباوەڕەکانن:**

کەسێك پرسیار دەکات و دەڵێت: ئێستا کافر نیشتەجێیە لە مەککەو مەدینە ئەمە چۆنە؟

بەڵێ.. کوفر ڕوودەدات بە یەکێك لە هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام، وە مەسلەحەتیان هەیە لەمەککەو مەدینە لەبەر بازرگانی و منداڵ و نزیکەکانی،

---

(١) یەکێکە لە جەژنە مەزنەکانی جوولەکە.

بەرگی سێیەم

نایانەوێت جێگۆڕکێ بکەن، ئەوانە بۆ ئەوە نیشتەجێ نەبوونە کە مەککە بەگەورەو خۆشەویست بزانن، بەڵکو لەبەر خاتری بازرگانیەکانیتیان[1].

## سێیەم: نەزانەکان شوێنەکەوتەی دەجال دەبن:

بەتایبەتی ئەو نەزانانەی کە لەشار نیشتەجێ نەبوونە، وە داوای زانست دەکەن لەو کەسانەی کە نیشتەجێی شارن، وەکو باسمان کرد دەجال بەسەر زەویدا دەڕوات و دەڵێت: خەزێنەکەت دەربکە، فەرمان بە ئاسمان دەکات کە باران ببارێت، فەرمان بە زەوی دەکات کە ڕووەکی تیادا شین بێت، کاتێك دەشتەکیەکە ئەوە دەبینێت شەوقێکی بۆ دروست دەبێت و یەکسەر باوەڕی پێ دەهێنێت، یان جاری وا هەیە دەجال دەڵێت: ئایا ئەگەر دایك و باوکت بۆ زیندوو بکەمەوە باوەڕم پێ دەهێنیت و بەڕاستم دەزانیت، ئەمەش بەڕاستی گەورەترین ئاشوبە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ .. بەڕاستت دەزانم، ئینجا دوو شەیتان خۆیان دەهێننە سەر شێوەی دایك و باوکیان، کاتێ دەشتەکیەکە ئەوە دەبینێت یەکسەر دەڵێت: ئەوە خوامە، مادەم مردووی زیندوو کردەوە.. لە هەقیقەتیش مردووی زیندوو نەکردۆتەوە بەڵکو فەرمانی بە دوو شەیتان کردووە کە خۆیان بگۆڕن و شێوەیان بخەنە شێوەی دایك و باوکی، کاتێك دەشتەکیەکە ئەوە دەبینێت ئەو شەیتانانەی کە خۆیان کردووە بە دایك و باوکی دەڵێن کوڕم باوەڕی پێ بهێنە ئەوە خواتە ئەویش شوێن کەوتەی دەبێت.

---

(١) الرقائق للعريفي، د. محمد بن عبدالرحمن العريفي، لا ٣٨٨.

### چوارەم: لە شوێنکەوتووانی دەجال قەومێکن دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: (الدَّجَّالُ خَارِجٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مِنْ أَرْضٍ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ مَعَهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ)[1].

واتە: دەجال لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە دێت لە خاکێك پێی دەگوترێت خوراسان، چەند کۆمەڵە قەومێکی لەگەڵ دایە دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانە[2].

### پێنجەم: لە شوێکەوتووانی دەجال ئافرەتانن:

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (يَنْزِلُ الدَّجَّالُ فِي هَذِهِ السَّبَخَةِ بِمَرِّقَنَاةَ ، فَيَكُونُ أَكْثَرَ مَنْ يَخْرُجُ إِلَيْهِ النِّسَاءُ، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيَرْجِعُ إِلَى حَمِيمِهِ وَإِلَى أُمِّهِ وَابْنَتِهِ وَأُخْتِهِ وَعَمَّتِهِ ، فَيُوثِقُهَا رِبَاطًا ، مَخَافَةَ أَنْ تَخْرُجَ إِلَيْهِ ..)[3].

واتە: دەجال دێت لە کەلاوە چۆلەکەی لای (مەریقەنات)ی نزیك شاری مەدینە دادەبەزێت، بەشی زۆری ئەو خەڵکەی کە دەچنە دەرەوە بۆ لای و شوێنی دەکەون ئافرەتن، بەجۆرێك کە پیاو دەگەڕێتەوە بۆ لای خێزانی و کچی و خوشکی و پوری، توند دەیان بەستێتەوە لە مەترسی ئەوەی نەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال.

(مەریقەنات) لە کوێیە:

یەکەم: دەڵێن: لەسەر ڕێگای (ظهران)ە.

---

(١) صحيح: واه الترمذي وأحمد والحاكم عن أبي بكر. وصححه الحاكم وأقره الذهبي ، وصححه أحمد شاكر في تعليقه على المسند (١٥٩/١-١٦٩) والألباني في الصحيحة (١٢٢/٤ رقم: ١٥٩١).

(٢) مەبەستیش بەو دەم و چاو قەڵغانیانە خەڵکی وڵاتانی مەنغۆلیاو چین و قەفقاو ئاسیاو ئەو ناوچانەیە کە لە کۆنەوە پێیان دەگوترا (تورك).

(٣) مسند أحمد (١٩٠/٧) رقم : (٥٣٥٣) قال احمد شاكر: إسناد صحيح.

**دووەم:** دەڵێن: دۆڵێکە لە نزیك شاری مەدینە کە لە تائیفەوە بۆی دێت.
**سێیەم:** دۆڵێکە لە دەوروبەری (سنجار)، وە دانیشتوانەکانی عەرەبن[1].

لە فەرموودەیەکی ترکە پێشەوا عوسمانی کوری ئەبولعاص (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (وَأَكْثَرُ تَبَعِهِ الْيَهُودُ وَالنِّسَاءُ)[2]. واتە: زۆربەی شوێنکەوتەی دەجال جولەکەو ئافرەتن.

وە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە شوێن دەجال دەکەون (١٣) هەزارە[3].. ئەم ئافرەتانەش لە ڕووی تەمەنەوە زۆر هەرزەکارن، وە ئافرەت بۆیە بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی وەکو چەکێك بەکاریان بهێنن..

**ئەو هۆکارانە چین کە ئافرەتان شوێن دەجال دەکەون؟**

**یەکەم:** ژمارەی ئافرەتان گەلێك زۆرە ئەو کاتی سەد ئافرەت بەرامبەر دوو پیاو دەبێت، واتە: پەنجا ئافرەت بەرامبەر یەك پیاو، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین، کەواتە فێر دەبین لەو قسەیە کە ئەگەر هەزار کەس شوێنکەوتەی دەجال بن ئەوا بیست پیاویشیان لەگەڵە، وە شتێکی ئاساییە لەگەڵ هەر هەزار ئافرەت بیست پیاو لەپێشیانەوە بڕۆن، کەواتە زۆربەی شوێنکەوتووانی دەجال ئافرەتن.

**دووەم:** لە هۆکارەکانی شوێنکەوتنی زۆربەیان کە ئافرەتن: دەجال ئەگەر بەهەر جێگایەك بڕوات خەڵك بانگ دەکات بۆ ئەوەی فەرمانی پێ بکەن باران لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوەو زەویش سەوزایی بدات، وە شوانیش مەڕەکانی بلەوەڕێنێت نەکار لە برسان بمرێت، دایکیش دەبینێت منداڵەکانی لەبرسان دەمرێت، وە چیایەکی نانەو ڕووبارو ئاوی ساردە، وە دەڵێتە زەوی کەنزەکانت دەربخە، کاتێك ئافرەتیش ئەو کەنزە دەبینێت یەکسەر شوێنی دەکەوێ، ئەمەش یەکێکە لەو بابەتانەی کە زۆربەی شوێنکەوتوانی دەجال ئافرەتن.

---

(١) معجم البلدان، (٤/ ٤٠١).
(٢) مسند الإمام أحمد (٦/ ٢٣٤٢) برقم: (١٨١٨٤).
(٣) كنز العمال (٣٨٧٧٢) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە پیاو دەگەڕێتەوە بۆ لای خێزانی و کچی و خوشکی و پوری، توند دەیان بەستێتەوە لە مەترسی ئەوەی نەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال.

بەڵام ئەو کاتە مەسەلەکەی بۆ موسڵمانان ئاشکرا دەبێ کە دەگاتە نێوان عێراق و شام.

بەڵێ.. خەڵکی ئەو ناوچانەو جولەکەکانی ئەصفەهان ئەو کات دەست و دایەرەی دەجال دەبن و هەر لەسەرەتاوە کاری دەجال دەچەسپێنن، دواتر لە هەموو وڵاتانی جیهان و لە هەموو زمان و ڕەگەزەکان خەڵکانێکی زۆر شوێن دەجال دەکەون و باوەڕی پێ دەکەن، جگە لەمانەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژە بەوە دەکات کە بەتایبەت ئافرەت زۆر شوێنی دەکەوێت و زوو باوەڕی پێ دەهێنێت، هەروەکو لە فەرموودەی پێشتر ڕوونمان کردەوە.

دیارە هۆی ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو جادوو کارە سەرسوڕهێنەرانەی کە دەجال ئەنجامی دەدات، ئاشکراشە کە ئافرەتان زووتر باوەڕ بەو شتانە دەکەن و چاوبەستی لێ دەکرێت، بۆیە زیاتر شوێنکەوتوەکانی دەجال ئافرەت دەبن.

لەم فەرموودە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سەرەتای سەرهەڵدانی لە خاکی خوراسانەوە دەبێت و پاشان دێتە گەڕەکی جوولەکەکانی شاری ئەصفەهان و لەوێش هەفتا هەزار جوولەکە شوێنی دەکەون، دوا جاریش لە شوێنێکی سنوری نێوان عێراق و شام خۆی ئاشکرا دەکات و لافی خوایەتی لێ دەدات و بەڕاست و چەپدا خراپەکاری بڵاودەکاتەوە.

بەرگی سێیەم

## بەکار هێنانی چەک و فیتنەی دەجال

وەکو باسمان کرد دەجال گەورەترین فیتنەیە کە بەرۆکی مرۆڤایەتی دەگرێت لە ئادەمەوە تا هەستانی ڕۆژی دوایی، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە توانای ئەنجامدانی هەندێ کاری وای هەیە کە لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نیە لەو سەردەمەدا، وە ئەو توانایەشی بۆ ئەوە بەکاردەهێنێت کە خەڵکی قەناعەت پێ بکات کە خوایە، وە خەڵکێکی زۆریش فریوی پێ دەخۆن و شوێنی دەکەون، تەنانەت پیاوی وای پێ هەڵدەخەڵەتێت کە خۆی زۆر بە باوەڕدار دەزانێت دواتر شوێنی دەکەوێت، هەروەکو عیمرانی کوڕی حصین (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ سَمِعَ بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ مِنْهُ ثَلَاثًا يَقُولُهَا فَإِنَّ الرَّجُلَ يَأْتِيهِ يَتَّبِعُهُ وَهُوَ يَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ بِمَا يُبْعَثُ بِهِ مِنْ الشُّبُهَاتِ)[1].

واتە: هەر کەسێ بیستی دەجال هاتووە با خۆی لێ لادات، سوێند بەخوا پیاو دێت بۆ لای کە خۆی زۆر بە باوەڕدار دەزانێت، کەچی شوێنی دەکەوێت، بەهۆی ئەو کارە گوماناویانەی کە ئەنجامی دەدات و سەری پێ لە خەڵك دەشێوێنێت.

ئەو کەسەی ژیرانە چاو بداتە مەسەلەی دەجال یەقینێکی تەواوی لا پەیدا دەبێ کە بانگەوازەکەی بەتاڵە، سیفەتەکانی پەروەردگارێتی لێ بەدی نایەن، مرۆڤێکی کەنەفت و بەستەزمانە، سەرەڕای ئەو کارانەی لەسەر دەستیشی ڕوو دەدەن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ئەگەر لە کاتێکدا دەرکەوێت کە من لەناوتاندابم، ئەوە من لەبری هەموو موسڵمانان بەرەنگاری دەبمەوەو بەڵگەو نیشانە پوچەڵەکانی هەڵدەوەشێنمەوە، وە ئەگەر لە دوای منیش دەرکەوت ئەوە

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٤٤١) برقم: (١٩٩٨٢)، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم.

بەرگی سێیەم

هەر موسڵمانەو پارێزگاری لەخۆی دەکات، بە ئەندازەی عیلم و یەقینی بەخواو پەیامەکەی، لەبەرامبەری دەوەستێت.

واتە: ئەگەر تەواو خواناس و خواپەرست بێت و بەدین شارەزاو کار کردوو بێت، ئەوە هەڵناخەڵەتێت بە شوبهەکانی دەجال، ئەگەر نا ئەوە سەری لێ دەشێوێت و دەکەوێتە داویەوە.

پێشەوا حوزیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ الدَّجَّالَ يَخْرُجُ، وَإِنَّ مَعَهُ مَاءً وَنَارًا، فَأَمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ مَاءً، فَنَارٌ تُحْرِقُ، وَأَمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ نَارًا، فَمَاءٌ بَارِدٌ عَذْبٌ، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ، فَلْيَقَعْ فِي الَّذِي يَرَاهُ نَارًا، فَإِنَّهُ مَاءٌ عَذْبٌ طَيِّبٌ)[1].

واتە: دەجال کاتێك کە دەردەچێت، ئاو و ئاگری لەگەڵ دایە، جا ئەوەی کە خەڵك بە ئاوی دەبینن، لە ڕاستیدا ئاگرێکی سوتێنەرە، وە ئەوەشی کە خەڵك بە ئاگری دەبینن، لە ڕاستیدا ئاوێکی ساردو سازگارە، جا هەر کەسێکتان گەیشتنە ئەوە، با خۆی بخاتە ئەوەی کە بە ئاگری دەبینێت، چونکە ئاگرەکە ئاوێکی سازگارو پاکە.

لە ڕیوایەتێکی تر فەرموویەتی: چیایەکی نانی پێیە، خەڵکیش بە دوای نانەوە دەستیان ناکەوێت، مەگەر ئەوانەی شوێن دەجال بکەون، وە دوو ڕووباری لەگەڵە: ڕووبارێکیان ناوی بەهەشتەو ڕووبارێکی تری ناوی دۆزەخە، هەر کەسێك بچێتە ڕووبارە بەهەشتیەکە ئەوە دەچێتە دۆزەخ، وە هەر کەسێکیش بچێتە ڕووبارە دۆزەخیەکە دەچێتە بەهەشت[2]. لە ڕیوایەتی بوخاری لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە دەڵێت: چیایەك نانی لەگەڵە[3]، لە ڕیوایەتی پێشەوا موسلیم دەڵێت: چیایەك نان و گۆشت و ڕووبارێك لە ئاوی پێیە[4].

---

(١) صحيح مسلم (٢٢٥٠/٤)، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال وصفته وما معه، برقم: (٢٩٣٥).

(٢) صحيح: رواه الإمام أحمد في (مسنده) برقم: (١٤٩٩٧) قال الهيثمي: رواه احمد بإسنادين رجال أحدهما رجال الصحيح.

(٣) صحيح البخاري برقم: (٦٧٠٥)

(٤) صحيح مسلم برقم: (٢٩٣٩).

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: چیایەك لە گۆشتی گەرم کە هەرگیز سارد نابێتەوە، وە ڕووبارێك ئاوەکەی لەبەر دەڕوات، وە چیایەك هەموی لە باغ و باغاتێکی چڕوپڕ، وە چیایەك لە ئاگرو دووکەڵ، دەڵێت: ئەوە بەهەشتی منە وە ئەوەش ئاگرەکەمە، ئەوە خواردنەکەمە ئەوە خواردنەوەکەمە[1].

ئاگاداری/ ئایا ئەو بەهەشت و دۆزەخە ڕاستیە یان خەیاڵە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەچینە خزمەت هاوەڵێك کە پێشەوا موغەیرەی کوری شوعبەیە (ﷺ) دەڵێت: کەس هێندەی من پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەکردووە دەربارەی دەجال، ئەویش پێی فەرمووم: (أَيْ بُنَيَّ وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ؟ إِنَّهُ لَنْ يَضُرَّكَ، قَالَ قُلْتُ: إِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ مَعَهُ أَنْهَارَ الْمَاءِ وَجِبَالَ الْخُبْزِ، قَالَ: هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ ذَلِكَ)[2].

واتە: کوڕەکەم چی سەرقاڵ و ماندووت دەکات؟ دەجال زیانی بۆ تۆ نابێت، وتم: دەڵێن ڕووباری ئاوو کێوی نانی پێیە، فەرمووی: ئەو لەوە بێ بایەخترە لەلای خواوە.

کەواتە واتای ئەو بێبایەخیە ئەوە دەگەیەنێت تەنها خەیاڵیە نەك ڕاست بێت، بۆیە بە کارە سیحراویەکانی زۆربەی مرۆڤەکان لە خشتە دەبات..

پێشەوا قازی ئیبنو العەرەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەمە تاقیکردنەوەیەکی خوایە بۆ بەندەکانی، زۆر لەوە کەمترە کە ئێمە لێی بترسین[3].

تەنانەت لە (تلمود)یش دەڵێت: (لما يأتي المسيح تطرح الأرض فطيراً وملابس من الصوف وقمحاً حبة بقدر كلاوي الثيران الكبيرة وفي ذلك الزمن ترجع السلطة لليهود وتملأ الكنوز بيوتهم)[4].

---

(١) رواه نعيم في(الفتن) برقم: (١٥٢٧)

(٢) صحيح مسلم (٣/ ١٦٩٣) باب: جواز قوله لغير ابنه، برقم: (٢١٥٢).

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٢٢٥).

(٤) التلمود شريعة بني اسرائيل، لا ٢٦ .

بۆیە پیاوانی مەسیحی سەرسوڕمان دەبن بە هۆی کردارە سیحراویەکانی، وە لەو کاتەی دەجال دەڵێت: من مەسیحم، وە پیاوانی مەسیحیش بە هاتنەوەی عیسای تێدەگەن، بۆیە تووشی فیتنەی زۆر گەورە دەبنەوە.

دەجال کە دێت گەورەترین بازرگانی شەهواتە لە مێژووی مرۆڤایەتی، بۆیە ئامادەیە هەموو شتێك پێشکەش بکات تەنها بۆ ئەوەی بیپەرستن، چونکە دەجال گەورەترین دیکتاتۆرە لە مێژووی مرۆڤایەتی..

لەو کاتەدا سوپای ئیمان بە (الله أكبر ولا اله الا الله وسبحان الله) لەگەڵ خوێن و لاشەیان تێکەڵ دەبێت..

ئەی ئاویان لە کوێ دەست دەکەوێت کە بیخۆنەوە، پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (.. فيكون في الشام بقية المؤمنين والماء)[1]. واتە: ئەو کاتەی لە شام تەنیا بڕواداران و ئاو دەمێنێت ...

پێشەوا نەواسی کوری سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کە خێرایی ڕۆیشتنی دەجال لەسەر زەوی چۆنە؟ ئەویش فەرموی: (..كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فَيَأْتِي عَلَى الْقَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ، فَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ، وَالْأَرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ، أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرًا، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ، ثُمَّ يَأْتِي الْقَوْمَ، فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ، فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، وَيَمُرُّ بِالْخَرِبَةِ، فَيَقُولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ، ثُمَّ يَدْعُو رَجُلًا مُمْتَلِئًا شَبَابًا، فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الْغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ، يَضْحَكُ..)[2].

واتە: خێراییەکەی لەسەر زەوی وەك هەور وایە کە ڕەشەبا پاڵی پێوە بنێت، پاشان دەچێتە لای کۆمەڵێك بانگەوازیان دەکات بۆ لای خۆی، ئەوانیش باوەڕی

---

(١) صحيح: المستدرك، للحاكم ( ٤ / ٥٠٤ ) قال الحاكم: صحيح الإسناد.

(٢) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال (٢٢٥٠/٤)، ورقم الحديث: (٢٩٣٧).

بەرگی سێیەم

پێ دەهێنن و دەچن بەدەمیەوە، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەکات باران دەبارێت، وە فەرمان بە زەوی دەکات ئەویش سەوز دەبێت، مەڕو ماڵاتیشیان دەگەڕێتەوەو لە هەموو کات زیاتر پشتیان پان و بەرزەو گوانیشیان لە هەموو کات زیاتر پڕ شیرترەو ناو قەدیشیان لە هەموو کات پانترە لە تێریدا، پاشان بەلای کۆمەڵێکی تردا دەڕوات، بانگەوازی ئەوانیش دەکات بۆ لای خۆی، بەڵام بانگەوازەکەی ڕەت دەکەنەوەو باوەڕی پێ ناهێنن، ئەویش بەجێیان دەهێڵێت، لە دوای ئەو خاك و زەویەکەیان سوێرو پڕ خوێ دەبێت، هەرچی ماڵیان هەیە بەدەستیانەوە نامێنێت، وە بەلای کەلاوەی ڕوخاودا تێدەپەڕێت، پێی دەڵێت: کەنزو زێڕەکەت بهێنە دەرەوە، ئیتر هەرچی کەنزو زێڕی تێدایە وەکو مێش هەنگ شوێنی دەکەون، پاشان پیاوێکی گەنج و تێك سمڕاو بانگ دەکات، شمشێرێکی لێ دەدات و دەیکات بە دووکەرتەوەو هەر کەرتێکیان بە ئەندازەی تیر هاویشتنێك لە یەکتر دووردەخاتەوە، پاشان بانگی دەکات، کابرا بە ساغی دێتەوەو پێ دەکەنێت.

پێشەوا حوزیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَأْتِي الدَّجَّالُ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ رَجُلٌ يَوْمَئِذٍ هُوَ خَيْرُ النَّاسِ ، أَوْ مِنْ خَيْرِهِمْ - فَيَقُولُ : أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِي حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ أَتَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ ، فَيَقُولُونَ: لاَ، فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ ، فَيَقُولُ حِينَ يَحْيَا: وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً فِيكَ مِنِّي الآنَ ، قَالَ: فَيُرِيدُ قَتْلَهُ الثَّانِيَةَ فَلاَ يُسَلَّطُ عَلَيْهِ)[1].

واتە: دەجال دێت وەلێی حەڕام کراوە کە بچێتە ناو شاری مەدینەوە، لە هەندێك چۆڵەوانی دەرەوەی شاری مەدینە دادەبەزێت، پیاوێك لە شاری مەدینە بۆی دێتە دەرەوە لەو ڕۆژەدا باشترین کەسە، یان لە باشترین کەسانی ئەو ڕۆژەیە بە دەجال دەڵێت: شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی باس کردوین، دەجالیش بە خەڵکەکەی چوار دەوری دەڵێت: ئەگەر بینیتان ئەم پیاوەم کوشت و پاشان زیندووم کردەوە، ئیتر کەستان گومانی لەمن دەمێنێت؟

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: الفتن، باب: لا يدخل الدجال المدينة، (٧/ ١٥٠) برقم: (١٨٨٢).

ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، پاشان پیاوەکە دەکوژێت و زیندووی دەکاتەوە، ئەویش پێی دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ کاتێك هێندەی ئەمڕۆ بەرچاو ڕۆشن نەبووم کە تۆ دەجالی درۆزنیت، پاشان دەجال دەیەوێت پیاوەکە بکوژێت، بەڵام خوای گەورە زاڵی ناکات بەسەریدا.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فَيَتَوَجَّهُ قِبَلَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَتَلْقَاهُ الْمَسَالِحُ - مَسَالِحُ الدَّجَّالِ - فَيَقُولُونَ لَهُ: أَيْنَ تَعْمِدُ؟ فَيَقُولُ: أَعْمِدُ إِلَى هَذَا الَّذِي خَرَجَ، قَالَ: فَيَقُولُونَ لَهُ: أَوَ مَا تُؤْمِنُ بِرَبِّنَا؟ فَيَقُولُ: مَا بِرَبِّنَا خَفَاءٌ، فَيَقُولُونَ: اقْتُلُوهُ، فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَلَيْسَ قَدْ نَهَاكُمْ رَبُّكُمْ أَنْ تَقْتُلُوا أَحَدًا دُونَهُ، قَالَ: فَيَنْطَلِقُونَ بِهِ إِلَى الدَّجَّالِ، فَإِذَا رَآهُ الْمُؤْمِنُ، قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَذَا الدَّجَّالُ الَّذِي ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: فَيَأْمُرُ الدَّجَّالُ بِهِ فَيُشَبَّحُ، فَيَقُولُ: خُذُوهُ وَشُجُّوهُ، فَيُوسَعُ ظَهْرُهُ وَبَطْنُهُ ضَرْبًا، قَالَ: فَيَقُولُ: أَوَ مَا تُؤْمِنُ بِي؟ قَالَ: فَيَقُولُ: أَنْتَ الْمَسِيحُ الْكَذَّابُ، قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُؤْشَرُ بِالْمِئْشَارِ مِنْ مَفْرِقِهِ حَتَّى يُفَرَّقَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ يَمْشِي الدَّجَّالُ بَيْنَ الْقِطْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: قُمْ، فَيَسْتَوِي قَائِمًا، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: أَتُؤْمِنُ بِي؟ فَيَقُولُ: مَا ازْدَدْتُ فِيكَ إِلَّا بَصِيرَةً، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَا يَفْعَلُ بَعْدِي بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: فَيَأْخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ، فَيُجْعَلَ مَا بَيْنَ رَقَبَتِهِ إِلَى تَرْقُوَتِهِ نُحَاسًا، فَلَا يَسْتَطِيعُ إِلَيْهِ سَبِيلًا، قَالَ: فَيَأْخُذُ بِيَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ بِهِ، فَيَحْسِبُ النَّاسُ أَنَّمَا قَذَفَهُ إِلَى النَّارِ، وَإِنَّمَا أُلْقِيَ فِي الْجَنَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): هَذَا أَعْظَمُ النَّاسِ شَهَادَةً عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ)[1].

واتە: دەجال دەردەکەوێ پیاوێك لە بڕواداران بەرەو ڕووی دەچێ، چاودێرو نۆبەتداران (خەفەر)ی دەجال دەگرن و پێی دەڵێن: بۆ کوێ؟ دەڵێ: بۆ لای ئەو کەسەی دەرکەوتوە، جا پێی دەڵێن: ئەی بڕوا بە پەروەردگاری ئێمە ناهێنی؟ دەڵێ: پەروەردگاری ئێمە دیارەو پەنها نیە، دەڵێن: بیکوژن، هەندێك بە هەندێك دەڵێن: ئەدی دەجال نەهی لێ نەکردن کەس بێ پرسی ئەو نەکوژین؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: جا دەیبەنە لای دەجال، کە بڕوادارەکە چاوی بە

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب صفة الدجال، (٤/٢٢٥٦)، ورقم الحديث (٢٩٣٨).

دەجال دەکەوێ، دەڵێ: ئەی خەڵکینە ئەمە ئەو دەجالەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرموە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: جا دەجال فەرمان دەدا بیگرن و لەسەر زك ڕایکێشن، کە ڕایانکێشا تێر تێر لەبەرو پشتی ئەو پیاوە موسڵمانە دەدرێ، دەجال پێی دەڵێ: هێشتا بڕوام پێ ناهێنی، دەڵێ: تۆ مەسیحی درۆزنی، فەرموی: جا فەرمان دەدا بەمشار دابهێنرێ، لەتەپڵی سەریەوە تا ناولنگی لێك جودا دەکرێتەوە، فەرموی: دەجال بەنێوان هەردوو کەرتەکەیدا دەڕوا، ئینجا دەجال پێی دەڵێ: هەستە هەڵدەستێتەوە سەرپێ، فەرموی: ئینجا پێی دەڵێ: وام لێکردی و هێشتا بڕوام پێ ناهێنی؟ دەڵێ: بەوەی کردت لە دڵ ڕونی و یەقینێکی پتر بەوەی کە تۆ دەجالی چی دەکەم زێدە نەبوە، ئینجا دەڵێ: ئەی خەڵکینە لە پاش ئەوەی لەگەڵ منی کرد ناتوانێ هیچی تر بەخەڵکی بکا، فەرموی: دەجال دەیگرێ هەتا سەری ببڕێ، نێوان ژێر چەناگەو چاڵایی ملی دەکرێتە مس و ناتوانێ سەری ببڕێ، فەرموی: دەجال هەردوو دەستی و هەروو پێی دەگرێ و فڕێی دەدا، خەڵك وادەزانن هەڵیداوەتە نێو ئاگر، کەچی هەڵی داوەتە ناو بەهەشت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ئەم پیاوە مەزنترین شەهیدە لەلای پەروەردگاری جیهانیان.

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر گرنگی فێربوونی زانستی شەرعی، چونکە ئەو لاوە ئەگەر پێشتر شارەزایی نەبووایە بە سیفەتی دەجال، نەیدەزانی ئەوە دەجالە، بۆیە پێویستە لەسەر هەرکەسێك لە ڕووی ستەمکاراندا بوەستێت خۆی پڕ چەك بکات بە چەکی زانستی شەرعی ئەم لاوەش دڵنیا بوو لەوەی ئەو کەسە دەجالەو ئەو کوشتنە بە کەسی تر ناکات، چونکە لاوەکە فێرخوازێکی زانستی شەرعی بوو فەرموودەی خوێندبوویەوەو دەیزانی خۆی ئەو گەنجەیە کە باسکراوە.

پێشەوا ئەبو ئومامەی باهلی (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يَقُولَ لِأَعْرَابِيٍّ: أَرَأَيْتَ إِنْ بَعَثْتُ لَكَ أَبَاكَ وَأُمَّكَ، أَتَشْهَدُ أَنِّي رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَتَمَثَّلُ لَهُ شَيْطَانَانِ فِي صُورَةِ أَبِيهِ، وَأُمِّهِ، فَيَقُولَانِ: يَا بُنَيَّ، اتَّبِعْهُ، فَإِنَّهُ رَبُّكَ)[1].

---

(١) سنن ابن ماجة (٥/ ٢٠١) باب: فتنة الدجال، برقم: (٤٠٧٦).

واتە: یەکێکی تر لە فیتنەکانی دەجال ئەوەیە کە بە پیاوی دەشتەکی دەڵێت: ئەگەر بینیت باوکت و دایکت بۆ زیندوو بکەمەوە، باوەڕم پێ دەهێنیت کە من خوای تۆم؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، ئیتر دوو شەیتان خۆیان دەخەنە شێوەی باوك و دایکیەوەو پێی دەڵێن: کوڕم شوێنی بکەوە ئەوە خوای تۆیە.

لەم فەرمودانە بۆمان دەردەکەوێت کە ئاشوب و فیتنەی دەجال کە تا چ رادەیەك گەورەو ترسناکە، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیەشمان لە یاد نەچێت کە هیچ شتێك بەبێ ئیرادەو ئارەزووی خوا نابێت، ئەو ئاشوبانەش لەسەر دەستی دەجال ڕوودەدات هەمووی تاقیکردنەوەی خواییە بۆ بەندەکانی، مرۆڤی باوەڕدار دەبێت خوای ڕاستی خۆی بناسێت و بە جادووگەرێکی وەك دەجال فریو نەخوات و هەڵنەخەڵەتێت.

پرسیار: ئەگەر بگوترێت چۆن ئەم بەڵگانە لەسەر دەستی کەسێکی درۆزنی وەکو دەجال دەبێت؟ یان زیندووکردنەوەی مردوو بەڵگەیەکی ڕوونەو یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەران، چۆن دەجالێکی درۆزن بانگەشەی خوایەتی دەکات؟

وەڵامی ئەم پرسیارە پێشەوا (خەتابی) خۆی فەرمویەتی: ئەمەش دەبێتە تاقیکردنەوە بۆ بەندەکان، هەر چەندە ئەوەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن هیچ و پوچە، کۆرەیە، لە نێوچەوانی نوسراوە کافر، هەموو موسڵمانێك دەیخوێنێتەوە، وە بانگەشەکەی بەتاڵە چونکە نیشانەی کوفری پێوەیە، وە کەم و کورتی هەیە لە زاتی، دەجال پێی وایە خودایە با ئەوەی سەر دەم و چاوی لا ببات، بەڵام بەڵگەکانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) سەلامەتە لەم کەم و کوڕیانە کەواتە پێك ناچن[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: دەجال بەڵگەیەکی ڕوونە، بۆ کەسێك کە بیرو هۆشی هەبێت، چونکە لە چەند پارچەیەك لێکدراوە، وە کاریگەری دروستکراوەکانی دیارە، لەگەڵ بە دیارکەوتنی کۆرەیی یەکێك لە چاوەکانی، هەر کاتێك لەناو خەڵکی بانگەشەی خوایەتی کرد، ئەوە بزانە

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١١٠).

حاڵی خەڵکی لەو پەڕی خراپیە، چونکە دەجال ناتوانێت عەیبەکانی خۆی چاك بکاتەوە، بەڵام ئەوەندەی لەسەر ئێمە واجبە کە بڵێین: ئەی ئەو کەسەی کە بانگەشەی دروستکردنی ئاسمان و زەوی دەکەی خۆت چاککبکەوەو ڕێکبخە.

پێشەوا ئیبنو العەرەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو بەڵگانەی لەسەر دەستی دەجال ڕوودەدات، لە دابەزاندنی باران و دەرهێنانی خەزێنەی زەوی و هەبوونی بەهەشت و دۆزەخ و ڕۆیشتنی ئاو، ئەوە هەر هەموویان تاقیکردنەوەیە لەلایان خواوە بۆ ئێمە، وە تاقیکردنەوەیە تا ئەوانەی گومانیان هەیە جیاببنەوە لەگەڵ لە خواترسەکان[1]، هەروەکو پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهَا لَمْ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ أَعْظَمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا إِلَّا حَذَّرَ أُمَّتَهُ، وَأَنَا آخِرُ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَنْتُمْ آخِرُ الْأُمَمِ، وَهُوَ خَارِجٌ فِيكُمْ لَا مَحَالَةَ) [2]

واتە: ئەی خەڵکینە!

هەتا ئێستا هیچ فیتنەیەك نەبووە لەسەر ڕووی زەوی، لەو ڕۆژەوەی کە خوای گەورە نەوەی ئادەمی لەسەر زەوی بڵاوە پێ کردووە لە فیتنەی دەجال گەورەتر بێت، وە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە کە ئومەتەکەی لە دەجال ئاگادار نەکردبێت، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوەش کۆتایی ئومەتانن، بە دڵنیاییەوە لەناو ئێوەدا دەردەچێت.

دەجال کە دێت ئەوانەی کە شوێنی دەکەون هەفتا هەزار جوولەکەی لەگەڵە، لەگەڵ کۆمەڵێك جادووگەری بەتوانا.. کاری سەرسوڕهێنەر بۆ خەڵکی ئەنجام دەدەن هەتا گومڕایان بکەن.. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (الدجال أول من يتبعه سبعون ألفا من اليهود .. ومعه سحرة اليهود يعملون العجائب ويراها الناس فيضلونهم بها)[3].

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١١١).

(٢) صحيح الجامع الصغير (٦/٢٧٣) ورقمه (٧٧٥٢) واسناده صحيح.

(٣) تصريح الكشميري : (٢٢١/ ٤٨).

جا فیتنەیەك هێندە گەورە بێت کە هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) ئومەتەکانی خۆیان لێ ئاگادار کردبێتەوەو، ئێمەش دڵنیابین کە چار ناچارەو هەر لەناو ئێمەدا دەردەچێت، بۆیە پێویستە هەموو موسڵمانێك زانیاری تەواوی دەربارەی ئەو فیتنە گەورەیە هەبێت، تا لە کاتی هاتنیدا پێی هەڵنەخەڵتێت و بزانێت چۆن خۆی لێ دەپارێزێت.

# ئەو نیشانانەی کە لە پێش هاتنی دەجال دەردەچن

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی دەرچوونی بۆ ئاشکرا کردووین کە پێویستە موسڵمانان لە کاتی دەرچوونیدا تیایدا وشیاربن، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ما كان منذ كانت الدنيا رأس مائة سنة إلا كان عند رأس المائة أمر فإذا كان رأس مائة خرج الدجال)[١].

لەم فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێت کە لەگەڵ دروستبوونی دونیا لە هەر سەد ساڵێك خوای گەورە کەسێك دەنێرێت، تەنانەت هاتنی دەجالیش لەسەرووی ئەم سەد ساڵە دێت.. بەڵام چ کاتێك ئەوە خوای گەورە خۆی دەیزانێت.. بۆیە لە نێوان جەنگە گەورەکەو ئازادکردنی ڕۆما شەش ساڵە وە دەجال لە حەوتەمین ساڵ دەردەچێت[٢]..

**پێش هاتنی دەجال چەند نیشانەیەك ڕوودەدات کە گرنگترینیان ئەمانەن:**

**یەکەم:** هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی کە پێشتر لە باسی (موحەممەدی مەهدی) ئاماژەمان پێکرد هەتا ڕزگارکردنی شاری ئەستەنبۆڵ، دەکرێت بڵێین هەر هەمووی نیشانەن.

پێشەوا موعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (عُمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ، وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ، وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ)[٣].

---

(١) مرقاة الصعود إلى سنن أبي داود، جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي، (٤/ ١٣) تحقيق: محمد بن رياض الأحمد، دار الكتب العلمية.

(٢) رواه أبو داود (١١١/ ٣٤).

(٣) المستدرك (٤/ ٤٦٧) برقم: (٨٢٩٧). قال الإمام الحاكم: إسناده صحيح-

واتە: ئاوەدانکردنەوەی (بیت المقدس) کاول بوون و وێران بوونی مەدینەی بەدوادا دێت، دەرچونی جەنگە گەورەکەش ئازادکردنی (قوسطنطنية)ی بەدوادا دێت، ئازادکردنی (قوسطنطنية)یەش دەرچونی دەجالی بەدوادا دێت.

بەپێی ئەو فەرمودەیە دیارە (بیت المقدس) دەڕوخێنرێت، بۆیە دواتر ئاوەدان دەکرێتەوە، وە بەدوای سەر لەنوێ دروست کردنەوەشیدا وێرانبوونی شاری مەدینە دێت کە لەسەردەمی موحەممەدی مەهدی دا ڕوودەدات.

لەم فەرمودیە بۆمان بەدەردەکەوێت کە ڕاستەوخۆ دوای ئازادکردنی شاری ئەستەنبۆڵ دەجال دەردەچێت و ئاشکرا دەبێت.

### دووەم: سێ ساڵ گرانی ڕوودەدات لە پێش هاتنی دەجال:

پێشەوا ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (.. وَإِنَّ قَبْلَ خُرُوجِ الدَّجَّالِ ثَلَاثَ سَنَوَاتٍ شِدَادٍ، يُصِيبُ النَّاسَ فِيهَا جُوعٌ شَدِيدٌ، يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ فِي السَّنَةِ الْأُولَى أَنْ تَحْبِسَ ثُلُثَ مَطَرِهَا، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَ نَبَاتِهَا، ثُمَّ يَأْمُرُ السَّمَاءَ، فِي الثَّانِيَةِ فَتَحْبِسُ ثُلُثَيْ مَطَرِهَا، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَيْ نَبَاتِهَا، ثُمَّ يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ، فِي السَّنَةِ الثَّالِثَةِ، فَتَحْبِسُ مَطَرَهَا كُلَّهُ، فَلَا تُقْطِرُ قَطْرَةً، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ، فَتَحْبِسُ نَبَاتَهَا كُلَّهُ، فَلَا تُنْبِتُ خَضْرَاءَ، فَلَا تَبْقَى ذَاتُ ظِلْفٍ إِلَّا هَلَكَتْ، إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ، قِيلَ: فَمَا يُعِيشُ النَّاسُ فِي ذَلِكَ الزَّمَانِ؟ قَالَ التَّهْلِيلُ، وَالتَّكْبِيرُ، وَالتَّسْبِيحُ، وَالتَّحْمِيدُ، وَيُجْرَى ذَلِكَ عَلَيْهِمْ مُجْرَى الطَّعَامِ) [١].

واتە: .. وە لە پێش هاتنی دەجال سێ ساڵ نەهامەتی دووچاری خەڵك دەبێت کە برسیەتێکی زۆری تێدایە، ساڵی یەکەم خوای گەورە فەرمان بە ئاسمان دەکات کە سێیەکی بارانی ڕابگرێت و فەرمان بە زەویش دەکات کە سێیەکی ڕووەکی بگرێتەوە، پاشان لە ساڵی دووەم فەرمان بە ئاسمان دەکات دوو لەسەر سێی بارانی دەگرێتەوەو فەرمانیش بە زەوی دەکات دوو لەسەر سێی ڕووەکی

---

(١) سنن ابن ماجة (٥/ ٢٠١) باب: فتنة الدجال، برقم: (٤٠٧٦).

دەگرێتەوە، پاشان فەرمان بە ئاسمان دەکات لە ساڵی سێیەمدا هەموو بارانی دەگرێتەوە یەك دڵۆپی لێ نابارێت، وە فەرمان بە زەویش دەکات هەموو ڕووەکی دەگرێتەوەو هیچ سەوزاییەکی لێ ناڕوێت، ئیتر هەرچی ئاژەڵی سمدارە هەموو لەناو دەچێت مەگەر ئەوەی کە خوا نەیەوێت لەناو بچێت، گوتیان: ئەی خەڵکی لەو سەردەمەدا بە چی دەژین. فەرمووی: بە گوتنی: (لا إله إلا الله والله اكبر ولله الحمد) وەکو خۆراك پێی دەژین و شوێنی خۆراکیان بۆ دەگرێتەوە.

لەم فەرمودەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو گرانی و بێ بارانیە هەموو خاکی سەر زەوی بگرێتەوە.

## سێیەم: ئازادکردنی ئیستەخەر:

پێشەوا ڕاشدی کوڕی سەعد (ﷺ) دەڵێت: هەر کاتێك (ئیستەخەر)[1] ئازادکرا، بانگکەرێك هاوار دەکات و دەڵێت: دەجال پەیدا بوو، ئیتر (صعبی کوڕی جوثامة) چاوی پێکەوتن و گوتی: ئەگەر ئەو قسەتان نەکردایە، پێم دەوتن گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە دەیفەرموو: دەجال پەیدا نابێت تاکو خەڵکی بێ ئاگا نەبن لە یادی خواو تاکو پێشەوایان وازنەهێنن لە ناوهێنانی خوای گەورە لەسەر مینبەرەکانەوە[2].

---

(١) ئیستەخەر: شارێکە لە کۆنترین شارەکانی فارس، جێگای نیشتەجێبوونی پادشاکانی فارس بووەو گەنجینەی زۆری تێدابووە. مزگەوتێکی لێیە ناسراوە بە مزگەوتی سلێمان (سەلامی خوای لێ بێ). معجم البلدان (١/ ٢١١).

(٢) رواه عبدالله بن أحمد من رواية بقية عن صفوان بن عمرو وهو صحيح كما قال ابن معين وبقية رجاله ثقات.

### چوارەم: کەمبوونەوەی ژمارەی عەرەب:

پێشەوا ئوم شەرەیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە فەرموویەتی: (لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ فِي الْجِبَالِ قَالَتْ: أُمُّ شَرِيكٍ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئِذٍ ؟ قَالَ : هُمْ قَلِيلٌ)[١].

واتە: خەڵکی لە دەججال هەڵدێن بەرەو چیاکان، ئوم شەرەیك دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، عەرەبەکان لەو ڕۆژەدا لە کوێن؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوان کەمن.

### پێنجەم: بەهۆی توڕەبونێکەوە دەردەچێت:

دایکی موسڵمانان حەفصە (ڕەزای خوای لی بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّمَا يَخْرُجُ الدَّجَّالُ مِنْ غَضْبَةٍ يَغْضَبُهَا)[٢].

واتە: دەرچوونی دەجال بەهۆی توڕەبونێکەوە دەبێت کە توڕە دەبێت.

### شەشەم: ئازادکردنی دوورگەی عەرەبی:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە ڕۆژێك دێت دوورگەی عەرەبی دەکەوێتە دەست موسڵمانان.

پێشەوا نافیعی کوری عوتبە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ)[٣].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٦) باب: في بقية أحاديث الدجال، برقم: (٢٩٤٥).

(٢) مسند الإمام أحمد (٤٤/٢٥) برقم: (٢٦٤٢٥). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

واتە: غەزای دوورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات ، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات.

ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە بە ئازادکردنی ئەو سێ شوێنە، وە خاڵێکی گرنگ هەیە بۆ نیوە دوورگەی عەرەب و فارس کە دەفەرمووێ: خودا بۆتانی ئازاد دەکات (فیفتحها الله لکم)، چونکە ئەم دوانە لەسەر دەستی هاوەڵان دابووەو (خیطاب)ەکەش بۆ ئەوان بووە، بەڵام بۆ ئازادکردنی ڕۆم کە شاری (قسطنطنية) یە دەفەرمووێ: (فیفتحها الله) خوا ئازادی دەکات و وشەی (لکم) بەکار ناهێنێ، چونکە لە سەردەمی هاوەڵاندا نەبووە.

حەوتەم: فیتنەی ئەحلاس و دەهماء و دهیماء:

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانیشتبووین ئەویش باسی لە فیتنەکان کردو درێژەی بە باسەکەدا هەتا باسی فیتنەی ئەحلاسی[1] کرد، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فیتنەی ئەحلاس چیە؟ فەرموی: (هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ، ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ، دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي، وَلَيْسَ مِنِّي، وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِي الْمُتَّقُونَ، ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ، ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ، لَا تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا لَطَمَتْهُ لَطْمَةً، فَإِذَا قِيلَ: انْقَضَتْ، تَمَادَتْ يُصْبِحُ الرَّجُلُ

---

(١) (ئەحلاس) کۆی (حلس)ە کە بە واتای ئەو جلە دێ کە دەخرێتە سەر پشتی حوشتر، بۆیەش فیتنەکەی پێ چوێنراوە، چونکە ئەو جلە بە حوشترەوە دەنوسێ، فیتنەکەش ئاوا بە خەڵکەوە دەنوسێ. سەرچاوە: القيامه الصغرى (لا ٢٠٤).
پێشەوا (خەتابی) دەڵێت: واتە: ڕەنگە ئەو فیتنە لەبەر ڕەشی و تاریکی بە جلی حوشتر شوبهێنرابێ. سەرچاوە: القيامه الصغرى (لا ٢٠٤).
پێشەوا (حەرب)یش دەڵێت: واتە: لە دەست چوونی ماڵ و کەس و کار . سەرچاوە: القيامه الصغرى (لا ٢٠٥).

فِيهَا مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، حَتَّى يَصِيرَ النَّاسُ إِلَى فُسْطَاطَيْنِ، فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لَا نِفَاقَ فِيهِ وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لَا إِيمَانَ فِيهِ، فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ، مِنْ يَوْمِهِ، أَوْ مِنْ غَدِهِ)[1].

واتە: ڕاکردن و ئاوارەیی و سەرو ماڵ تیاچوونە، پاشان فیتنەی خۆش گوزەرانی[2] دێت کە هەڵگیرسانی دووکەڵەکەی لە ژێر پێی پیاوێکەوە دەبێت لە ئال و بەیتی من، لافی ئەوە لێ دەدات کە لە منە بەڵام لە من نیە، بەڵکو تەنها کەسانی لە خوا ترس و پارێزگار دۆستی منن، پاشان خەڵکی ئاشت دەبنەوەو ڕێك دەکەون لەسەر پیاوێك کە باری لارەو وەك پەراسوو خوارە، پاشان فیتنەی کارەساتە ڕەشەکان دێت کە کەس نامێنێت لەم ئومەتە کە لێدانی ئەو فیتنەیەی بەرنەکەوێت، هەر کە گوترا تەواو بوو درێژ دەبێتەوە، پیاو بە باوەڕداری ڕۆژ دەکاتەوەو بە بێباوەڕی خۆری لێ ئاوا دەبێت، هەتا وای لێدێت خەڵك دەبن بە دوو بەشەوە بەشێکی باوەڕدار کە هیچ نیفاقێکی تێدا نیە، وە بەشێکی مونافیق کە باوەڕداری تێدا نیە، هەر کاتێکیش ئەوە ڕوویدا ئیتر ئەمڕۆ سبەی چاوەڕێی دەجال بکەن.

ئەوەی ڕوویدا لە ساڵی (١٩٩٢)ع کە عێراق کوێتی داگیر کرد لەبەر بەرهەم و سامانەکەی خاکی کوێتەوە، ئەمەش لەلایان (صەدام حوسەین) یەکسەر سەرۆکی کوێت کە ناوی (ئەخنەس) بوو هەڵات بەرەو ئەمریکا بۆ ئەوەی هاوپەیمانی ببەستێت و بە هانای کوێتەوە بێت، لە دوای لێدانی کوێت و گەمارۆدانی ئەم شارە (صەدام) ویستی خەڵکی کوێت چۆك دابدات ئەمەش فیتنەی (سەراء)ە[3].

وە فیتنەی دوهەیما ئەو ئاشووب و تێکهەڵپڕژانەیە کە حوکمی برولیتاریا لە ڕووسیا ئەنجامیدا ، وە ئەو ئاشوبەش بڵاوبوویەوە هەتا سەری سەرمایەداری خوارد.

---

(١) صحيح: سنن أبي داود (٦/ ٢٩٤) باب: ذكر الفتن (٤٢٤٢). وقال شعيب الأرناؤوط: صحيح.

(٢) (السراء) بریتیە لەو نیعمەتەی خەڵکی تێدا شاد و ئاسوودە دەبن لەبەر زۆربوونی ماڵ و سامان و کەوتنە خۆشی، بۆیەش بەو فیتنەو ئاشوبە دانراوە، چونکە خەڵك بە هۆی ئەو خۆشیەی تێیدان تووشی گوناە و تاوان دەبن . سەرچاوە: القيامه الصغرى (لا ٢٠٥).

(٣) هرمجدون، أمين محمد، لا (١٩).

بەرگی سێیەم

تەنانەت هەندێك لە زانایانی سەردەم دەڵێن: فیتنەی دوهەیما ئەوەیە کە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت یەکسەر لە کار دەخرێت، وە خەڵکی سەد ساڵ دەچنە پاشەوە.. کارەبا نامێنیت پەیوەندیەکان نامێنێت، بە هێز بێهێز دەخوات بەبێ گومان[1].

## هەشتەم: ئازادکردنی شاری ئەستەمبۆڵ:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەڵێت: (فَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ مَعَ قِيَامِ السَّاعَةِ)[2]. واتە: ڕزگارکردنی ئەستەمبۆڵ لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دوایی دایە.

## نۆیەم: لە بیرکردن و باس نەکردنی دەجال:

پێشەوا صەعبی کوڕی جوثامة (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ يَخْرُجُ الدَّجَّالُ حَتَّى يَذْهَلَ النَّاسُ عَنْ ذِكْرِهِ، وَحَتَّى تَتْرُكَ الأَئِمَّةُ ذِكْرَهُ عَلَى الْمَنَابِرِ)[3].

واتە: دەججال دەرناکەوێت تاکو خەڵکی یادکردنەوەی فەرامۆش نەکەن، ئەگەر خەڵکی باسیان فەرامۆش کردو سیفەتەکانیان لە بیرچووو یەکتریان لێ وریا نەکردەوە (سەرەڕای زۆری پشێوی و تاقیکردنەوەکان) وە هەتا پێشەواکان وازی لێ دەهێنن لە باسکردنی لەسەر دوانگەکان ئەو کاتە دەجال دەردەچێت.

---

(١) العراق في أحاديث وآثار الفتن، لا ٧٦٧ ـ ٧٦٨ .

(٢) سنن الترمذي (٤/ ٨٠) باب: ما جاء في علامات خروج الدجال، برقم: (٢٢٣٩). حديث غريب.

(٣) ضعيف: مسند الإمام أحمد (٢٧/ ٢٢٥) برقم: (١٦٦٦٧). قال الأرناؤوط: إسناده ضعيف، وأخرجه ابن أبي عاصم في «الآحاد والمثاني» (٩٠٧) عن عبد الوهّاب بن نجدة، عن بقية بن الوليد، بهذا الإسناد، وأورده الهيثمي في «مجمع الزوائد» ٣٣٥/٧، وقال: رواه عبد الله بن أحمد من رواية بقية عن صفوان بن عمرو، وهي صحيحة كما قال ابن معين، وبقية رجاله ثقات!

دەیەم: کەمتەرخەمی زۆر لە خەڵکی هەیە:

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يخرج الدجال في نقص من الناس ..)[1].

واتە: دەجال دەردەچێت لە کاتێکدا کەمتەرخەمی لە خەڵکی هەیە، ئایین بە سوکی سەیر دەکرێت، وەپەیوەندی و نێوانی خەڵکی زۆر خراپ دەبێت.

یانزەهەم: ئایینی ئیسلام لای خەڵکی بە چاوێکی سوك سەیر دەکرێت، پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يخرج الدجال في .. خفة من الدين..)[2].

واتە: دەجال دەردەچێت لە کاتێکدا ئایین بە سوکی سەیر دەکرێت..

دوانزەهەم: نێوانی خەڵکی تێك دەچێت، پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يخرج الدجال في .. سوء ذات بين)[3].

واتە: دەجال دەردەچێت لە کاتێکدا .. نێوانی خەڵکی زۆر خراپ دەبێت..

سێزدەهەم: کافربوون بە خودا و قورئان، پێشەوا رافعی کوری خدیج (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يكون قوم من أمتي يكفرون بالله وبالقرآن.. ثم يخرج الدجال على أثر ذلك قريبا..)[4].

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) برقم: (٨٦١٢) صححه الحاكم وقال الذهبي : على شرط البخاري ومسلم.

(٢) صحيح: المستدرك، (٨٦١٢) صححه الحاكم وقال الذهبي : على شرط البخاري ومسلم.

(٣) المستدرك، (٨٦١٢) صححه الحاكم وقال الذهبي : على شرط البخاري ومسلم.

(٤) المعجم الكبير، (٤/ ٢٤٦) وإتحاف الخيرة المهرة (١/١٨٠) خلاصة حكم المحدث : ضعيف لضعف ابن لهيعة .

واتە: قەومێك لەم ئوممەتەی من پەیدا دەبن كافر دەبن بە خوای گەورەو قورئان.. لە پاشان دەجال دەردەچێت.

چواردەهەم: بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەكی نوێی تاعون، پێشەوا رافعی كوری خدیج (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (یكون قوم من أمتي يكفرون بالله وبالقرآن.. ثم يبعث الله عز وجل طاعونا.. ثم يخرج الدجال على أثر ذلك قريبا..)[1].

واتە: قەومێك لەم ئوممەتەی من پەیدا دەبن كافر دەبن بە خوای گەورەو بە قورئان.. پاشان خوای گەورە تاعونیان بۆ دەنێرێت و لە نێویاندا بڵاوی دەكاتەوە.. لە پاشان دەجال دەردەچێت.

زۆربەی وڵاتان كە تووشیان بە تووشی ڤایرۆسێك دەبێت، هەموو لە هەوڵی خۆ كەرەنتین كردن دان، دەیانەوێت خۆیان قاییم بكەن و نەهێڵن ئەم ڤایرۆسە بڵاوبێتەوە، وە خەڵكی لە ماڵەكانیان جێگیر دەبن وەكو چۆن دەرمانێك لە نێو شوشەدایە یان لە نێو دوورگەیەكی دوور لە خەڵكی بێت و داخراو بێت.. خەڵكی ئاوا لە یەكتری دووردەكەونەوە.. خوای گەورە جۆرە ڤایرۆسێكی ترسێنەریان بۆ دەنێرێت، تەنانەت جیاڕایی دەخرێتە نێو خێزانەكانیان، بۆیە لە دوای ئەو ترسە نازانرێ سەرچاوەی ئەو ڤایرۆسە لە كوێوە بۆی هاتووە، كە ئەمەش دەوری تاعونێكی گەورە لە خۆی بەدی دەكات، خوای گەورە جوندیەكی بچوكیان بۆ دەنێرێت بۆ ئەوەی لە ماڵەكانیان خۆیان كەرەنتین بكەن، چونكە سروشتی تاعون وایە تەنها بە كرەنتین ڕزگار دەبیت..

---

(١) المعجم الكبير، (٤/ ٢٤٦) وإتحاف الخيرة المهرة (١/١٨٠) خلاصة حكم المحدث : ضعيف لضعف ابن لهيعة .

هەر چەندە زانایانی فەرموودەناس دەفەرموون: ئەم فەرموودەیە بێ هێزە، بەڵام لە ڕاستی و واقیعی ژیان زۆر ئاشكراو ڕوونە. كە چۆن فەرموودە بێهێزەكانیش لەگەڵ واقیعی مرۆڤەكان دەڕوات..

پانزەهەم: خەڵکی حەز بە هاتنی دەجال دەکەن، پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يخرج الدجال حتى يكون شيء أحب إلى المؤمن من خروج نفسه)[1].

شانزەهەم: زانایانی ئیسلام کۆچی دوایی دەکەن و خەڵکی پشت لە شەریعەت دەکەن، پێشەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يخرج الدجال في .. وإدبار من العلم)[2].

واتە: دەجال لە کاتێکدا دەردەچێت کە خەڵکی پشتیان لە زانست کردووەو زانایان وەفاتیان کردووە.

حەڤدەهەم: سەرهەڵدانی جیاڕایی بەش بەش بوونی خەڵکی، پێشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو کە فەرموویەتی: (يخرج الأعور الدجال مسيح الضلالة قبل المشرق في زمن اختلاف من الناس وفرقة)[3].
واتە: دەجالی کوێری مەسیحی گومڕا لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت لەسەردەمێك کە جیاڕایی لە نێو خەڵکی هەیەو بوونەتە پارچە پارچە.

هەژدەهەم: وشکبوونەوەی دارخورماکانی (بیسان)..

نۆزدەهەم: وشکبوونی دەریاچەی (گبریە)..

بیست: وشکبوونی کانیاوی (زەغر)..

فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان بە جەماعەت لە ڕیزی ئافرەتاندا نوێژی دەکرد لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە

---

(١) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال برقم: (٣٨٨١٣).

(٢) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) برقم: (٨٦١٢) وصححه الحاكم وقال الذهبي: على شرط البخاري ومسلم.

(٣) رواه البزار، ورجاله رجال الصحيح غير علي بن المنذر وهو ثقة كما في المجمع (٧/ ٣٤٩).

بەرگی سێیەم

مزگەوت.. کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و پێدەکەنی و دەیفەرموو: با هەر یەکەتان لە شوێنی خۆی دانیشێت و هەڵنەستێت.. پاشان فەرمووی: دەزانن بۆچی کۆمکردونەتەوە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرموی: (إِنِّي وَاللهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلَا لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ، لِأَنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلًا نَصْرَانِيًّا، فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ، وَحَدَّثَنِي حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ، حَدَّثَنِي أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، مَعَ ثَلَاثِينَ رَجُلًا مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ، فَلَعِبَ بِهِمِ الْمَوْجُ شَهْرًا فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ أَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِي الْبَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، فَجَلَسُوا فِي أَقْرُبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ، مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقَالُوا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قَالُوا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: أَيُّهَا الْقَوْمُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلًا فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا، حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ، فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا، وَأَشَدُّهُ وِثَاقًا، مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالْحَدِيدِ، قُلْنَا: وَيْلَكَ مَا أَنْتَ؟ قَالَ: قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِي، فَأَخْبِرُونِي مَا أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ رَكِبْنَا فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، فَصَادَفْنَا الْبَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ فَلَعِبَ بِنَا الْمَوْجُ شَهْرًا، ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ، فَجَلَسْنَا فِي أَقْرُبِهَا، فَدَخَلْنَا الْجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ، لَا يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ، فَقُلْنَا: وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قُلْنَا: وَمَا الْجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالْأَشْوَاقِ، فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعًا، وَفَزِعْنَا مِنْهَا، وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا، هَلْ يُثْمِرُ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لَا تُثْمِرَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِيهَا مَاءٌ؟ قَالُوا: هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، قَالَ: أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ، قَالُوا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِي الْعَيْنِ مَاءٌ؟ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ الْعَيْنِ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، هِيَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ، وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَبِيِّ الْأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا: قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ، قَالَ: أَقَاتَلَهُ الْعَرَبُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ؟ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْعَرَبِ وَأَطَاعُوهُ، قَالَ لَهُمْ: قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، وَإِنِّي مُخْبِرُكُمْ عَنِّي، إِنِّي أَنَا الْمَسِيحُ، وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الْخُرُوجِ، فَأَخْرُجَ فَأَسِيرَ فِي الْأَرْضِ فَلَا أَدَعَ قَرْيَةً إِلَّا هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ،

فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ كِلْتَاهُمَا، كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً - أَوْ وَاحِدًا - مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتًا، يَصُدُّنِي عَنْهَا، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلَائِكَةً يَحْرُسُونَهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِي الْمِنْبَرِ: هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ - يَعْنِي الْمَدِينَةَ - أَلَا هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِي حَدِيثُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ، وَعَنِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ، أَلَا إِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّأْمِ، أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ، لَا بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، مَا هُوَ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ، قَالَتْ: فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ))[1].

واتە: سوێند بەخوا نە بۆ خۆشی و نە بۆ ترس کۆمنەکردونەتەوە، بەڵام (تەمیمی داری) پیاوێکی گاور بوو، هات و بەیعەتی پێ دام و موسڵمان بوو، وە قسەیەکی بۆ گێڕامەوە، لەگەڵ ئەوەی کەمن بۆم باس کردبوون دەربارەی مەسیحی دەجال وەك یەك وابوون، بۆی باس کردم کە سواری پاپۆڕێکی دەریایی بووە لەگەڵ (٣٠) پیاو لە خێلی (لخم) و (جزام)، پاشان بۆ ماوەی مانگێك شەپۆڵی دەریا هێناونی و بردوونی، پاشان لە نزیك دوورگەیەکەوە لە دەریادا لەنگەری پێ گرتوون، هەتا خۆرئاوابوون، ئینجا بە بەلەم لە پاپۆڕەکەدا دابەزیون و چونەتە دوورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ زۆر بەرەو پیریان هاتوە، پێش و پاشی لەبەر موو زۆری لێك جیا نەدەکرایەوە، گوتیان: نەگبەت تۆ چیت؟ گوتی: من (جساسەم) واتە: (هەواڵ بەر)، گوتمان: جەساسە چیە؟ گوتی: خەڵکینە ئێوە جارێك بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە لەو دەیرەدا (جێگایەکە قەشەکان تیایدا دادەبڕێن بۆ خواپەرستن) چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵتانە.. گوتی: کە ناوی پیاوی برد زۆر ترساین کە ئەم شتە شەیتان بێت، گوتی: ئێمەش بەپەلە ڕۆیشتین تا چوینە ناو دەیرەکە کە سەیر دەکەین گەورەترین زەلام کە تا ئێستا بینیبێتمان لە قەبارەدا وە بەتوندترین شێوە کۆت و زنجیر کرابوو، هەردوو دەستی بەسترابوو بە ملیەوە، لە هەردوو ئەژنۆیەوە هەتا هەردوو پاژنە پێی ئاسن بوو، گوتمان: ماڵ وێران تۆ کێی؟ گوتی: ئەوا ئێوە دەبینین، بەڵام پێم بڵێن ئێوە کێن؟ گوتیان: ئێمە خەڵکی عەرەبین، سواری پاپۆڕێکی دەریایی بووین، تووشی هەڵچونی شەپۆڵی دەریا بوین، یەك

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٤) باب: قصة الجساسة، برقم: (٢٩٤٢).

بەرگی سێیەم

مانگ شەپۆڵ یاری پێکردین، هەتا لەم دورگەیەی تۆ پاپۆرەکەمان لەنگەری گرت، ئێمەش سواری بەلەم بوین و هاتینە دوورگەکە، دەعبایەکی توکنی قژ درێژمان بینی، لەبەر موو زۆری پێش و پاشیمان بۆ جیا نەدەکرایەوە پێمان گوت: نەگبەت تۆ کێی؟ گوتی: من (جەساسەم)، گوتمان: (جەساسە) چیە؟ گوتی: جاریێ برۆن بۆ لای ئەو پیاوەی لەو دەیرەدایە چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، ئێمەش بەپەلە هاتین بۆ لای تۆو ترساین ئەو دەعبایە شەیتان بێت، گوتی: هەواڵی دارخورماکانی (بیسان)[1]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: پرسیاری دارخورماکانیتان لێ دەکەم، ئایا بەر دەگرێت؟ پێمان گوت: بەڵێ.. گوتی: هێندەی نەماوە بەر نەگرێت، گوتی: هەواڵی دەریاچەی (طبرية)[2]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ گوتمان: ئاوی زۆرە، گوتی: ئاوەکەی هێندەی نەماوە نەمێنێت، گوتی: هەواڵی کانیاوەکەی (زغر)[3]م پێ بڵێن؟ گوتمان: چ شتێك دەربارەی دەپرسیت؟ گوتی: ئایا کانیاوەکە ئاوی تێدایە؟ ئایا خەڵکەکەی بە ئاوەکە کشتوکاڵ دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ ئاوی زۆرەو خەڵکەکەشی کشتوکاڵی پێ دەکەن، گوتی: هەواڵی پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانم پێ بڵێن چی کرد؟ گوتمان: لە (مەککە)وە دەرچوەو لە (یثرب) واتە: (مەدینە) نیشتەجێ بووە، گوتی: عەرەبەکان شەڕیان لەگەڵ نەکرد؟ گوتمان: با، گوتی: ئەی چی لێکردن؟ ئێمەش پێمان گوت: زاڵ بوو بەسەر هەموو عەرەبەکانی چوار دەوریداو ئەوانیش گوێڕایەڵ و ملکەچی بوون، پێی گوتین: جا ئەوە بوو، گوتمان: بەڵێ.. گوتی: ئەگەر بە قسەی بکەن و شوێنی بکەون خێری خۆیانی تێدایە، منیش وا پێتان دەڵێم من کێم: من (مەسیح) م، وە هێندەم نەماوە کە ڕێم پێ بدرێت دەرچم، کە دەریش چووم دەگەڕێم بەسەر زەویدا، لە ماوەی چل شەودا هیچ گوندو ئاواییەك نامێنێت تێی نەچم، جگە لە

---

(١) (بیسان) : شارێکە لە فەلەستین.

(٢) (طبریە): دەریاچەیەکە و ئاوەکەی سازگارە و دەکەوێتە شاری فەلەستین و ئوردن.

(٣) (زغر): گوندێکە لە شام لە قەراغ دەریای مردوو. بەڵام (ابن الاثیر) دەڵێت: (زغر) لە شامە لە خاکی (البلقاء) بڕوانە: النهاية (٢/ ٣٠٤). هەندێکیش بە دەریای مردوو دەڵێن: (بحيرة زغر) لەبەر مێرگێکی نزیك لەو دەریایە.

(مەککە) و (طيبة) نەبێت، هەردووکیانم لێ قەدەغە کراوە، لەگەڵ ویستم بچمە یەکێکیانەوە، فریشتەیەك بەرەو ڕووم دێت شمشێرێکی لە ڕوومدا بەرزکردۆتەوە ناهێڵێت تێی بچم، وە لەسەر هەر ڕێگەیەکی فریشتەیەکی لێیە پاسەوانی دەکەن.

پاشان فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دارەکەی دەستی کێشای بە مینبەرەکەداو فەرمووی: (ئا ئەمە طيبەیە، ئا ئەمە طيبەیە، ئا ئەمە طيبەیە) واتە: شاری مەدینەیە ئایا منیش هەمان قسەم بۆ نەکردون؟ خەڵکەکەش گوتیان: بەڵێ.. ئەویش فەرموی: منیش قسەکەی تەمیمم بە دڵ بوو کە وەك قسەکەی من وابوو کە بۆم کردن دەربارەی دەجال و مەککەو مەدینە، ئەوە دەجالە لە دەریای شامە یان لە دەریای یەمەن، نەخێر.. بەڵکو وا لەڕووی خۆرهەڵات، ئەوا وا لەڕووی خۆرهەڵات، ئەوا وا لەڕووی خۆرهەڵات، (وە بەدەستی پیرۆزیشی ئیشارەتی بەرەو خۆرهەڵات کرد) (فاطمة) دەڵێت: ئەم فەرمودەیەم ئاوا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەبەر کردووە.

لەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە دەجال خۆی پرسیاری چەند نیشانەیەکی کردووە کە لە پێش هاتن و دەرچونیدا دەردەکەوێت، ئەویش وشك بوونی ئاوی دەریاچەی (طبرية)یە کە دەکەوێتە نێوان سوریا و فەلەستین و ئوردون، وە تا ئێستا هەواڵەکان باس لەوە دەکەن کە ئیسرائیل سەر گەرمی دروست کردنی چەند بەنداوێکە لەسەر ئەو ڕووبارانەی کە دەڕژێنە دەریاچەی (طبرية)یە بەمەبەستی گرتنەوەی ئاوەکەیو وشککردنی دەریاچەکە تا سوریا و ئوردونی لێ بێ بەش بکات و بیکاتە کارتێکی فشار لەسەریان، هەروەها بەرنەگرتنی دارخورماکانی (بیسان) کە دەجال کردویەتی بە نیشانەی هاتنی خۆی، ئەویش دەکەوێتە نێوان سنوری (ئوردون و فەلەستین)ەوە، وە (یاقوت الحموی) چەند سەدەیەك لەمەوبەر باس لەوە دەکات کە چەند جارێك بەلای ئەو شوێنە تێپەڕبووەو جگە لە دوو دارخورمای سیس و وشك بوو هیچی لێ نەماوە.

**بیست و یەك:** سەرهەڵدانی جەنگە گەورەکە لە نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان، ذي مخرم (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا، وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِهِمْ، فَتَسْلَمُونَ وَتَغْنَمُونَ، ثُمَّ تَنْزِلُونَ

بەرگی سێیەم

بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ، فَيَقُومُ رَجُلٌ مِنَ الرُّومِ، فَيَرْفَعُ الصَّلِيبَ، وَيَقُولُ: أَلَا غَلَبَ الصَّلِيبُ، فَيَقُومُ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَقْتُلُهُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَكُونُ الْمَلَاحِمُ، فَيَجْتَمِعُونَ إِلَيْكُمْ، فَيَأْتُونَكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةً، مَعَ كُلِّ غَايَةٍ عَشَرَةُ آلَافٍ)[١].

واتە: لەگەڵ ڕۆمدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن، ئێوەو ئەوان دەجەنگن لەگەڵ دوژمنێك کە لە پێش ئەوانەوەیە، پاشان سەردەکەون و دەستکەوتێکی باشتان دەبێت، پاشان لە مێرگێکدا دادەبەزن کە گردو تەپۆڵکەی زۆرە کە پێی دەڵێن: (مرج ذی تلول)، لەوێدا پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەستێت و خاچەکەی خۆیان بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: خاچەکەی ئێمە سەرکەوت، پیاوێکیش لە موسڵمانەکان هەڵدەستێت و دەیکوژێت، ئیتر ڕۆمەکان غەدر دەکەن و پەیمانی ئاشتیەکە دەشکێنن و جەنگە گەورەکان دەست پێدەکات، پاشان ڕۆمەکان کۆدەبنەوە بۆتان بەهەشتا ئالاوە، هەر ئالایەك (١٢) هەزار کەسی لەگەڵ دایە.

لەم فەرموودەیە چەند سوودێك وەردەگرین، لەوانە:

- موسڵمانەکان لەگەڵ ڕۆمەکان یەك دەگرن و بەسەر دوژمنێکدا دەدەن.
- ئەم شەڕە لە شام دەبێ.
- ئەو کەسەی کە خیانەت دەکات لە نەصرانیەکان و ڕۆمەکانن.

بیست و دوو: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین کە لە ئومەتەکەی کەسانێك پەیدا دەبن داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و ژمارەیان نزیکەی خۆی لە (٣٠) کەس دەدات.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ ثَلَاثِينَ دَجَّالاً كَذَّابًا)[٢].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی نزیکەی (٣٠) درۆزنی دەجال پەیدا دەبن.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٩١) برقم: (١٦٨٧٢). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ١١٧) برقم: (٥٩٨٥). وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

# ڕاستی سێگۆشەی بەرمۆداو پەیوەندی بە مەسیحی دەجال

ئەوانەی بانگەشەی دەرچوونی دەجال دەکەن لە سێگۆشەی بەرمۆدا سەهیۆنییە نورانییەکانن.. بۆیە تا ئێستاش لەگەڵی بێت هەندێك لە موسڵمانان وا دەزانن پەیوەندیەکی تۆکمە هەیە لە نێوان سێگۆشەی بەرمۆدا و دەجال... ئەمەش زۆر بە ڕاشکاوانە لە پرۆتۆکۆلاتی سەهیۆنیەکان ئاماژەی پێکراوە...

بۆیە دەرچوونی دەجال لە خاکی ئێرانە نەك سێگۆشەی بەرمۆدا..

خاوەنی پەرتوکی (اقترب خروج المسيح الدجال) دەڵێت: پرۆتۆکۆلات مێژوویەکی کۆنی هەیە، وە نوسەرەکەی مەسیحی دەجالە، وە بە یارمەتی شەیتانی گەورە ئەم پرۆتۆکۆلە نوسراوە، وە ئەوانەی پەیڕەوی دەکەن سەهیۆنی نورانییەکانن، بۆ ئەوەی ڕێگا خۆشبکەن بۆ دەرچوونی دەجال، وە عەرشی ئیبلیس لە سێگۆشەی بەرمۆدایە ، لە هەمان کات قەڵای دەجالیشە[1].

### شوێنی جوگرافی بەرمۆدا:

دەکەوێتە ڕۆژئاوای زەریای ئەتنلەنتی بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی فلۆریدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە وردییەکی زیاتریش ئەم ناوچەیە شێوەی سێ گۆشەیەك وەردەگرێت. درێژ دەبێتەوە لە کەنداوی مەکسیك لە ڕۆژئاوا، بۆ دوورگەی لیورد لە باشوور، ئینجا بەرمۆدا بریتیە لە کۆمەڵێك دوورگە (٣٠٠ دوورگە)ی بچووك کە شەست و پێنج هەزار کەسیان لەسەر نیشتەجێیە، ئینجا لە کەنداوی مەکسیك و دوورگەکانی باهاما.

---

(١) هلاك ودمار أمريكا المنتظر، هشام كمال عبدالحميد، لا ٢٢ .

### خاڵی دیارنەمان لە بەڕمۆدا:

لە شوێنێکی دیاریکراودا لە ڕۆژهەڵاتی زەریای ئەتلەنتی (دەریای سارجاسو) ئاوەکەی جیاواز دەبێتەوە لە ئاوەکانی تر بەوەی هەندێ تەن دەکەونە سەر دەریاکە پێیان دەوترێت (سارجاسم) بە بارستاییەکی زۆر دەکەونە سەر ئاوی دەریاکە بە شێوازێك کە دەبنە ڕێگر لە پێش کەشتیەکاندا دەریای (سارجاسوا) بە ئارامی ناسراوەو بە دەگمەن شەپۆلی باو ڕەشەبای تیا دروست دەبێت، ناویشی نراوە بە (بحر الرعب) واتە: دەریای سامناك و گۆڕستانی ئەتلەنتی، گەشتەکانی توێژینەوەیش ئاماژە دەکەن بۆ هەبوونی هەندێك کەشتی و بەلەم و کەشتی ژێر ئاو کە لە بنی دەریادا کەوتوون، مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ مەودای جیاجیا.

### سەرەتای دیاردەی دیارنەمان لە بەڕمۆدا:

لە ساڵی (١٨٥٠)ی عیسایی لە دەوروبەری ئەم ناوچەیە زیاتر لە پەنجا کەشتی دیار نەمان، کە هەندێ لە کەشتیوانەکان توانیان لە ساتە ترسناکەکاندا هەندێ نامە بنێرن کە واتاکانیان ڕوون نین و کەس نەیتوانیوە لێیان تێبگات، زۆربەی ئەو کەشتیانەش سەر بە ئەمریکان، کە یەکەمیان کەشتی (انسرجت)ە کە دیارنەماو (٣٤٠) سواربووی لەسەر بوو، ئینجا کەشتی ژێر دەریای (اسکوربیون) دیار نەما لە ساڵی (١٩٦٨)ی عیسایی نەوەدو نۆ کەشتیوانی لەسەر بوو.

### دیاردەی ونبوونی فڕۆکەکان :

چالاکی دیارنەمان گەیشتە ئاسمانی زەریای ئەتلەنتی، ئەم جارەیان فڕۆك هون دەبوون لەکاتی هەڵفڕیندا لە ئاسمانی ئەتلەنتی، یان بە وردی زیاتر لە ئاسمانی بەرمۆدا.

لە ساڵی (١٩٤٥)ی عیسایی پێنج فڕۆکە هەڵسان لە فلۆریدای ئەمریکییەوە پێنج فڕۆکەکەش بە نزیك یەکتردابوون لە ئاسمان بە شێوەی سێگۆشە، بەرەو لای

پاشماوەی کەشتیەك بەسەر ئاوی زەریاوە بوو، جا لەو کاتەی بنکە ئاسمانیەکە چاوەڕوانی نامەیەك بوو لە پۆلە فڕۆکەکانە بۆ دیاریکردنی بەندەری گەیشتن و ڕێنماییەکی نیشتنەوە، بنکەکە نامەیەکی سەیری پێگەیشت لەلایەن سەرکردەی پۆلەکە، دەیگوت: (سەرکردە (ملازم تشارلز تیلور) بانگ دەکات لە بنکە: ئێمە لە حاڵەتی نائاسایی داین، وا دیارە بەتەواوی لە هێڵی ڕێکردن دەرچووینە، ناتوانم زەوی ببینم، ناتوانم جێگەکە دیاری بکەم، باوەڕم وایە ئێمە لە ئاسمان ون بووینە، هەموو شتێك نامۆو لێڵە بە تەواوی، ناتوانم هیچ ئاراستەیەك دیاری بکەم تەنانەت زەریاش لە پێشماندا لە بارێکی نامۆدایە ناتوانم دیاری بکەم).

لە پاش ئەوەش ڕێگەکانی پەیوەندی لە نێوان بنکەو پۆلەکە پچڕان و لە پاش ئەوانیش فڕۆکەی تریش هەر ونبوون.

## لێکدانەوەی نهێنی بەرمۆدا:

بیردۆزی بوومەلەرزەو پەیوەندی بەوەی کە لە سێگۆشەی بەرمۆدەدا ڕوودەدات دەڵێت: ڕوودانی بومەلەرزە لە بنی دەریادا دەڵێن هەندێ شەپۆلی بەهێزو توندوتیژی لێ دەکەوێتەوە، دەبێتە مایەی نگرۆبوونی کەشتیەکان و ڕووکردنیان بە توندی بەرەو بنی دەریا لە چەند ساتێکی کەمدا، سەبارەت بە فڕۆکەکانیش، هەندێ لەرزەو تەوژم لە ئاسماندا دروست دەبێت، ئەمەش دەبێتە مایەی تێکچوونی هاوسەنگی فڕۆکەکەو کۆنترۆڵ نەکردنی فڕۆکەوانەکە بۆ فڕۆکەکەی.

بیردۆزەی ڕاکێشانی موگناتیسی و پەیوەندی بەوەی ڕوودەدات لە سێگۆشەی بەرمۆدا: لە ڕاستیدا دەزگاکانی پێواندن لە فڕۆکەکاندا لە کاتی تێپەڕبوونیان بەسەر سێگۆشەی بەرمۆدەدا تێکدەچن و بە شێوەیەکی نارێك و پێك دەبزوێن، بەهەمان شێوە قیبلە نامەی کەشتیەکان بە شێوەیەکی نارێك دەجولێتەوە، ئەوەش کە ئاماژە دەکات بۆ هێزو وزەیەکی موگناتیسی یان وزەیەکی ڕاکێشانی توندو سەیر.

# ئەو شوێنانەی کە دەجال ناتوانێت تێی بچێت

یەکەم: شاری مەدینە: دەجال ڕوو دەکاتە مەدینەی پیرۆزو ناتوانێ بچێتە ناوی، چونکە خودا مەککەو مەدینەی لە دەجال و لە تاعون پاککردۆتەوە، ئەرکی پاراستنەکەشی بە فریشتان سپاردووە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَأْتِي الْمَسِيحُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ وَهِمَّتُهُ الْمَدِينَةَ حَتَّى إِذَا جَاءَ دُبُرَ أُحُدٍ ضَرَبَتْ الْمَلَائِكَةُ وَجْهَهُ قِبَلَ الشَّامِ هُنَالِكَ يَهْلِكُ)[1].

واتە: دەجال لە ڕووی خۆرهەلاتەوە دێت و مەبەستی یەکەمی شاری مەدینەیە، هەتا کاتێك دەگاتە پشت کێوی (ئوحد) فریشتەکان ڕوویەڕووی دەبنەوە، ئەویش ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو ولاتی شام، لەویّ تیا دەچێت.

چەندان فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەن کە فریشتەکانی خوای پەروەردگار پاسەوانی شاری مەدینە دەکەن و ڕێ نادەن دەجال بچێتە ناوی، پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلَائِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ)[2].

واتە: ئەو ڕێگایانەی کە بۆ مەدینە دەچن فریشتەی لێیە نەتاعون و نەدەجال ناتوانن بچنە ئەو شارە.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ رُعْبُ الْمَسِيحِ، لَهَا يَوْمَئِذٍ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ، عَلَى كل باب ملكان)[3].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٤٥٧) برقم: (٩٨٩٧). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢) صحيح البخاري (٧/ ١٤٨) كتاب الفتن، باب: لا يدخل الجنة المدينة، برقم: (١٨٨٠).

(٣) صحيح البخاري (٧/ ١٤٧) كتاب الفتن، باب: لا يدخل الجنة المدينة، برقم: (١٨٧٩).

واتە: ترساندن و تۆقاندنی دەجال ناچێتە ناو مەدینە، لەو ڕۆژەدا حەوت دەرگای هەیە لەسەر هەر دەرگایەك دوو فریشتە وەستاون.

دووەم: شاری (مەککە) وەکو شاری (مەدینە) لەسەر دەجال قەدەغەکراوە کە ناتوانێت تێی بچێت، پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلَّا عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا، فَيَنْزِلُ بِالسِّبْخَةِ، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ)[1].

واتە: هیچ شارێك نامێنێت کە دەجال پێی تێ نەخات جگە لە مەککەو مەدینە، لەسەر هەر یەك لە ڕێگاکانی فریشتە ڕیزیان بەستوە، پاسەوانی دەکەن، تا دەجال ناچار دەبێت لە (سبخە) دابەزێت مەبەست پێی پارچە زەویەکە کە لماویەو لەبەر سوێری گیای تێدا سەوز نابێت ئیتر شاری مەدینەش سێ جار بە خەڵکەکەی ناویەوە ڕادەتەکێت و دەلەرزێت، هەرچی بێباوەڕو دووڕوو هەیە لە شارەکە دەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال.

پێگەی (الفتن والملاحم)، بە پشت بەستن بە سەرچاوە سەحیح و دروستەکانی (ئەهلی سوننەو جەماعەت)یش ئەوە چەسپاوە کە (مەسیحی دەجال) بە زەویدا دەگەڕێت، هەر چەندە کە ناتوانێت بچێتە ناو (مەککەی موکەڕەمە) یان (مەدینەی منەوەرە)، بەڵام ڕووداوەکان لە دەوری ئەو دوو شارە دەسوڕێنەوە کە ئەوەش لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بێت کە بیروڕای جولەکەکان وایە مەدینە دەکەوێتە چوارچێوەی مەملەکەتی ئیسرائیلەوە هەروەك بانگەشەی ئەوە دەکەن و باسی مێژووی تیرە جولەکەکانی ناوی دەکەن وەك بەنو قورەیزەو قەینوقاع و.. هتد[2].

لە ریوایەتێکی تر دەڵێت: (حَتَّى يَنْزِلَ عِنْدَ الظُّرَيْبِ الأَحْمَرِ ، عِنْدَ مُنْقَطَعِ السَّبَخَةِ ، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ ، فَلاَ يَبْقَى مُنَافِقٌ ، وَلاَ مُنَافِقَةٌ إِلاَّ خَرَجَ إِلَيْهِ)[3].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٥) باب: قصة الجساسة، برقم: (٢٩٤٣).

(٢) WWW.QURAN-M.COM

(٣) سنن ابن ماجة (٥/ ١٩٩) باب: فتنة الدجال وخروج عيسى ابن مريم، برقم: (٤٠٧٧).

واتە: لەلای (الظُّرَيْبِ الأَحْمَر) دادەبەزێت لەلای تەواوبوون زەوی شۆرەکات و مەدینە سێ جار دەلەرزێت و هەموو کافرو منافیق لێی دەردەچن (السَّبَخَة) زەوییەکی شۆرەکاتە، زۆربەی خاکی مەدینەش لەو جۆرەیە، بەڵام سەختترینی دەکەوێتە باکوورییەوە.

جگە لەشاری (مەککە) و (مەدینە)ش هەردوو مزگەوتی (بیت المقدس) و (مزگەوتی طور)ی لێ قەدەغەکراوە کە تێی بچێ، جەنادەی کوری ئەبی ئومەیە الازدی (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: من و پیاوێك لە (ئەنصار)یەکان چوین بۆ لای یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) پێمان گوت: فەرمودەیەکمان بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستبێتت باسی دەجالی تێدا بکات... لە فەرمودەکەدا دەفەرموێت: (وَإِنَّهُ يَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا يَبْلُغُ فِيهَا كُلَّ مَنْهَلٍ ، وَلاَ يَقْرَبُ أَرْبَعَةَ مَسَاجِدَ مَسْجِدَ الْحَرَامِ ، وَمَسْجِدَ الْمَدِينَةِ ، وَمَسْجِدَ الطُّورِ ، وَمَسْجِدَ الأَقْصَى ..)[1].

واتە: .. دەجال چل ڕۆژ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، تیایدا دەگاتە هەموو شوێنێك، بەڵام نزیکی چوار مزگەوت ناکەوێت: مزگەوتی کەعبەو مزگەوتی مەدینەو، مزگەوتی کێوی طورو مزگەوتی بیت المقدس.

بەڵام ئەوەی کە باس کراوە لە فەرمووودەکانی بوخاری و موسلیم کەوا پێغەمبەر(ﷺ) لە خەودا پیاوێکی دیووە کە چاو کوێری پرچ گرژ بووەو دەستی لەسەر شانی پیاوێك بووەو تەوافی لە دەوری بەیت کردووە جا پرسیاری دەربارەی کردووە؟ پێیان گوتووە ئەمە مەسیحی دەجالە.

ئەم جۆرە فەرموودانە وەڵامەکەی ئەوەیە کە قەدەغە کردنی دەجال لە مەککەو مەدینە لەو کاتەوەیە کە دەردەچێ لە کۆتایی بوونەوەر[2].

---

(١) صحيح:مسند الإمام أحمد (٥/ ٤٣٥) برقم: (٢٣٧٣٥). قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح.

(٢) فتح الباري (٦/ ٤٨٨ ـ ٤٨٩).

پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: یونس قسەی بۆ كردین، حەمماد (واتە: ئیبنو سەلەمە)ش قسەی بۆ ئەو كردووە، لەسەعیدی كوری جورەیرییەوە ئەویش لە عەبدوڵلای كوری شەقیقەوە ئەویش لە میحجەنی كوری ئەدرەعەوە، كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتاری بۆ خەڵكەكە خوێندەوەو فەرمووی: (يَوْمُ الْخَلاَصِ وَمَا يَوْمُ الْخَلاَصِ ، يَوْمُ الْخَلاَصِ وَمَا يَوْمُ الْخَلاَصِ ثَلاَثًا، فَقِيلَ لَهُ: وَمَا يَوْمُ الْخَلاَصِ؟ قَالَ : يَجِيءُ الدَّجَّالُ فَيَصْعَدُ أُحُدًا ، فَيَنْظُرُ إِلَى الْمَدِينَةَ، فَيَقُولُ لأَصْحَابِهِ: أَتَرَوْنَ هَذَا الْقَصْرَ الأَبْيَضَ ؟ هَذَا مَسْجِدُ أَحْمَدَ ثُمَّ يَأْتِي الْمَدِينَةَ ، فَيَجِدُ بِكُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلَكًا مُصْلِتًا، فَيَأْتِي سَبْخَةَ الْحَرْفِ ، فَيَضْرِبُ رُوَاقَهُ ، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ ، فَلاَ يَبْقَى مُنَافِقٌ ، وَلاَ مُنَافِقَةٌ ، وَلاَ فَاسِقٌ ، وَلاَ فَاسِقَةٌ ، إِلاَّ خَرَجَ إِلَيْهِ ، فَذَلِكَ يَوْمُ الْخَلاَصِ)[1].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) سێ جاران فەرمووی: دەزانن ڕۆژی (خەلاص) چیە؟ پێیان گوت: ڕۆژی (خەلاص) چیە؟ فەرمووی: دەجال دێت و دەچێتە سەر چیای ئوحد ئینجا لەوێوە دەڕوانێتە شاری مەددینەوە جا دەڵێتە هاوەڵەكانی: ئایا ئەو كۆشكە سپیە دەبینن ئەوە مزگەوتی (ئەحمەد)ە، پاشان دەچێتە شاری مەدینەو دەبینێ لەسەر هەر ڕێگایەك فریشتەیەكی لێیەو شمشێرێكی دەركێشراوی لە دەستە، ئینجا دەچێتە زەویەك كەوا خاكەكەی خوێواویەو بارو بارگەی لێ دەخات، پاشان مەدینە سێ جاران دەهەژێتەوە بەمە هیچ پیاو و ژنێكی دوو ڕوو فاسقی تێدا نامێنێتەوە هەمویان لەو شارە دەردەچن و دێنە لای ئەو، جا ئەمەیە ڕۆژی (خەلاص).

ڕاڤەی فەرمودەكە:

(**مُصْلِتًا**) واتە: شمشێرێكی هەڵكێشراوی لە دەستە. دەڵێن: (أصلت السيف) واتە: شمشێرەكەی لە كالآن هێنایە دەرەوە.

(**نَقْبٍ**) ڕێگایەكە لە نێوان دوو شاخاندا.

(**سَبْخَةَ**) ئەو خاكەیە كە خوێی بەسەردا زاڵەو هیچ شتێكی لێ ناڕوێت جگە لە هەندێ درەخت نەبێ.

---

(١) المستدرك (٥/ ٤) برقم: (٨٦٩٦). قال الإمام الحاكم: صَحِيحٌ عَلَىَ شَرَطِ مُسْلِمٍ ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

بەرگی سێیەم

(تَرْجُفُ) وشەی (الرجف) لە بنچینەدا بە واتای جوڵەو تەنگەتاوی دێ، واتە: دەلەرزێ و دەشڵەژێ.

ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پەرتوکی (فتح الباری) دەڵێت: مەبەست لە (الرجفه) واتە: بڵاوبونەوەی هاتنی دەجال و هیچ کەسێك توانای ئەوی نیە، ئەو کاتە هەرچی مونافیق و فاسیق هەیە خێرا دەچنە لای، ئەو کاتەش بە تەواوی بەدیار دەکەوێت لە کاتێکدا ئەو نکوڵی لە پیسی و نەگریسی خۆی دەکات.

(الجرف) دەوروبەری مەدینە، سێ میل دوورە، هەندێکیش دەڵێن: (جرف) دەکەوێتە نێوان (محجه الشام) تاکو (القصاصین)، (محجه الشام)یش ڕێگەی حاجیانی شامە لە لای (مخیض)ەوە دێت، تاکو (غرابات) و (غراب الضائلة) یان (جبل حبشی) هەندێك لەناوچەکانی (جرف)یش ئەمڕۆ دەناسرێت بە (حي الأزهري) بەڵام ئەو دەنگانەی هێناومانەوە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی (جرف) درێژ دەبێتەوە تاکو ناوچەی (مرقناه) کە بریتیە لەناوچەی (وادي الحمض) و (مجتمع الأسیال) دەگرێتەوە.

**ئاشکرابوونی موعجیزەیەك:**

ئیعجازی لەم فەرمودەیە ئەوەیە دەجال دەڵێت: (أَتَرَوْنَ هَذَا الْقَصْرَ الأَبْيَضَ؟ هَذَا مَسْجِدُ أَحْمَدَ) [1] واتە: ئەو کۆشکە سپیە، مزگەوتی پێغەمبەرە(ﷺ) پاشان لە وێنەی مزگەوتی پێغەمبەریش(ﷺ) ڕابمێنە کە لە ڕێگەی مانگە دەستکردەکانەوە وێنەی گیراوە، بێگومان وەسفی سپێتی بەڕاستی لێ هاتۆتەدی.

ئەمەش موعجیزەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دەسەلمێنێت کە ئەو مزگەوتە بەرز دەبێتەوەو سپیش دەکرێت بە گێچ یان مەڕمەڕ یان هاوشێوەکانی.. چونکە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بە دارو حەسیر دروستکرابوو، وە ئەوەی فەرمووی

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٥٨٦) برقم: (٨٦٣١). قال الإمام الحاكم: صَحِيحٌ عَلَىَ شَرَطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

هەمووی هاتە دی، ئەگەر لە دوورەوە سەیری مزگەوتەکە بکەین ئەوا لە مەسافەیەکی زۆر دوور ئەوە بەدی دەکەین کە سپییە..

پوختەی قسەکان ئەوەیە کە مەسیحی دەجال دادەبەزێت لە پشت کێوی ئوحد لەو زەوییە شۆرەکاتانەی لەو ناوچەن و هەر لەوێدا سەربازگەی خۆی دادەنێت لە کۆتایی (الصادقیە) لە باکووری (ثور)، هەر کەسێك بیانبینێت فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەخاتەوە یاد.

# ماوەی مانەوەی دەجال لەسەر زەوی

سەبارەت بە ماوەی مانەوەی دەجال لەسەر زەوی هەموو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕاستیە دوویات دەکەنەوە کە تەنها چل ڕۆژ یا چل شەو لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، بەڵام لەو ماوەیەدا هەموو سەر زەوی دەگەڕێت، هەروەکو فەرمودەکەی فاتیمەی کچی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) پێشتر باسمان کرد کە دەجال لەسەر زاری خۆی دەڵێ: (..فَأَسِيرَ فِي الْأَرْضِ فَلَا أَدَعَ قَرْيَةً إِلَّا هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً..)[١].

واتە: لەسەر زەویدا دەگەڕێم، هیچ گوندێك نامێنێت کە تێی نەچم، لە ماوەی چل شەودا.

لە فەرمودەیەکی تر دەفەرموێ: (وَإِنَّهُ يَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا يَبْلُغُ فِيهَا كُلَّ مَنْهَلٍ ..)[٢].

واتە: .. دەجال چل ڕۆژ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، تیایدا دەگاتە هەموو شوێنێك.

سەبارەت بەو چل شەو و ڕۆژە، پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت: (..قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا لَبْثُهُ فِي الْأَرْضِ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ فَذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ، أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلَاةُ يَوْمٍ؟ قَالَ: لَا، اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا إِسْرَاعُهُ فِي الْأَرْضِ؟ قَالَ: كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ..)[٣].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٢) باب: قصة الجساسة، برقم: (٢٩٤٢).

(٢) مسند الإمام أحمد (٥/ ٤٣٥) برقم: (٢٣٧٣٥). قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح.

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال ، برقم: (٢٩٣٧).

واتە: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! ماوەی چەند لەسەر زەوی دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژی یەکەمی وەکو ساڵێکەو ڕۆژی دووەمی وەکو مانگێکەو ڕۆژی سێیەمی وەکو هەفتەیەکەو باقی ڕۆژەکانی تری وەك ئەم ڕۆژانەی خۆتان وایە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! ئەو ڕۆژەی کە وەك ساڵێك وایە تەنها پێنج فەرزە نوێژی یەك ڕۆژی تێدا بکەین؟ فەرمووی: نەخێر لەسەر ڕۆژانی ئاسایی بیپێون(واتە: هەر ماوەی شەوو ڕۆژێکی ئاسایی پێنج فەرزی تێدا بکەن)، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! ئەی خێراییەکەی لەسەر زەوی چەندە؟ فەرمووی: وەك هەور کە ڕەشەبا پاڵی پێوە بنێت..).

لەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە لە سەرەتای هاتنی دەجال پێوانەی شەوو ڕۆژ لەسەر زەوی تێك دەچێت و لەسەر پێوانەی ئاسایی خۆی نامێنێت، بەڵام دواتر وەك خۆی لێ دێتەوە، ئەمەو لە فەرمودەکەدا هاتووە کە ڕۆژی یەکەم هێندەی ساڵێکی لێ دێت، وە ڕۆژی دووەم هێندەی مانگێگ وە ڕۆژی سێیەم هێندەی هەفتەیەك، دواتر شەوو ڕۆژ ئاسایی دەبێتەوەو وەکو خۆی لێ دێتەوە، بۆیە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ ئاماژەیەك بەوە نەکراوە کە ئەو ڕووداوە بەهۆی دەجالەوە ڕوو دەدات، یان دەجال وا دەکات کە پێوانەی شەو و ڕۆژ تێك بچێت، بەڵکو لەو کاتەدا کە دەجال دێت زەوی خۆی بەهۆی کارەساتێکەوە پێوانەی شەوو ڕۆژی تێدا تێکچووە، نەك کارێك بێت کە دەجال ئەنجامی بدات.

کەواتە بۆمان دەردەکەوێت ئەو ڕۆژەی کە هەڵدێت هەتا دەگاتە خۆرئاوابوون بە (٣٦٠) ڕۆژ دەگاتێ.

ڕۆژی یەکەم ٩٠٠٠ هەزار کاتژمێرە، ئەمڕۆ ئێمە لە دە سەعاتدا سێ چوار نوێژ دەکەین، بەڵام لەو سەردەمیدا ٩٠٠٠ کاتژمێرە لەنێوان ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوابوون[1].

---

(١) الرقائق العريفي، لا ٣٩٠.

چەند نوێژ بکەین؟ ئایا یەك نوێژ بکەین تەواو؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئەوەندە بەس نیە چۆن دەبێ چوار نوێژ بکەی؟

نوێژی بەیانی بکەی پاش چوار مانگی تر نوێژی نیوەڕۆ بکەی پاشان دانیشی سێ چوار مانگی تر پاشان نوێژی عەسر بکەی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بە پێی ئەندازەی نوێژەکان نوێژەکە بکەن، ئەمە چۆن؟

ئەگەر کەسێك پرسیار بکات و بڵێت ئەی لە نوێژی عیشا کابرا چۆن نوێژ بکات لە کاتێکدا لەوانەیە ڕۆژ بە ئاسمانەوە دیار بێت؟

وەڵامەکەی دەڵێین.. لە هەر بیست و چوار کاتژمێر پێنج نوێژ ئەنجام دەدەن، وە نوێژەکانیشیان لەگەڵ شاری مەککەی موککەڕەمە دەبێت... وە هەندێ لە زانایان دەڵێن: لەگەڵ نزیکترین وڵاتی دراوسێیەکی دەبێت.. ئێستا بە حوکمی ئەوەی کە ئیسلام فرەوان بووەو گەیشتۆتە قوتبی شیمالی و جنوبی، وە گەیشتۆتە هەندێك لە دەوڵەتەکانی باکوری سویدو باشوری دانیمارك، لە هەندێك لە شارەکان ڕۆژ نزیکەی سێ مانگ بە ئاسمانەوە دەمێنێتەوە، وە ڕۆژیش سێ مانگ دەمێنێتەوە، پاشان ڕۆژ دەگەڕێتەوە، وە ئاوا بەردەوام دەبێت هەتا دەگاتە باکوورو ڕۆژ ئاوا دەبێت، وە بەیانیەکەی ڕۆژ نابینێتەوە یاخود تیشکەکەی نابینرێت تەنها بە کەمی نەبێت، ئینجا شەو درێژ دەبێتەوە لای ئەوان[١].

دکتور محەممەد عورەیفی دەڵێت: پرسیارم لەچەند برایەکی ئەو شارە کردو گوتم: ئێوە لێرەدا سێ مانگ ڕۆژ نابینن، گوتیان سوێند بەخوا ئێمە سێ مانگە ڕۆژ نابینین، گوتم ئەی ئێوە چۆن دەخەون؟ چۆن دەژین؟ گوتیان.. خەڵك لێ ڕاهاتووە لەو شارە کە سەعات هەشت دێت ڕۆژ ئاوا دەبێت، باوکیان دەڵێت دەی منداڵینە کاتی نوستن هاتووە، نوستن بۆ ئێوە قوتابخانەیە، ڕۆژیش هەڵاتووە باوکیش هەڵدەستێ پەردەی ژوورەکانی دادەخات هەتا ڕووناکی نەیەتە ژوورەوە،

---

(١) الرقائق العريفي (٣٩٠).

ئینجا هەموویان دەخەون وەکو شەو.. پاش شەش حەوت سەعات هەڵدەستن دەی منداڵینە هەستن نوێژی بەیانی بکەن، ئەوانیش هەڵدەستن و نوێژی بەیانی دەکەن، وە لەسەعات حەوت بەرەو قوتابخانە دەچن، ئینجا دەرگاکانیان دەکەنەوەو ئەمە ڕۆژە کە شەویش دادێت بەهەمان شێوە دووبارە دەبێتەوە[1].

**ئاشکرابوونی موعجیزەیەك:**

زانایان دەڵێن: زەوی لەسەرەتای دروست بونی زۆر بە خێرایی دەسوڕایەوە کە شەوێك دوو سەعات و ڕۆژێکیش دوو سەعات بووەو ساڵێکیش (٢٢٠٠) ڕۆژ بووە، وردە وردە خاوبۆتەوە تاوەکو ئێستا کە ساڵێك (٣٦٥) ڕۆژە! جا دەڵێن بەردەوامیش خاو دەبێتەوە بە بڕێکی کەم کە لە سەد ساڵدا چرکەیەك کەمترە کە لە ملیۆنەهاو ملیارەها ساڵی تردا دەکاتە بڕێکی زۆر خاوبوونەوە، کە ئەگەر کار وا بڕوات پاش ملیارەها ساڵی تر زەوی دەوەستێ و بە پێچەوانەوە دەخولێتەوە، ئەو کاتەش خۆر لە خۆرئاواوە دەبینرێ کە هەڵدێ، کەواتە ئەم نیشانەیەی ڕۆژی دوایی لە عەقڵی زانست قبوڵەو دەگونجێ ببێ! ئەوان ملیارەها ساڵیان بۆ داناوە!

ئیسلامیش دەڵێ: هەرکاتێ خوا ویستی دەیهێنێ.. لە فەرمودەشدا لە باسی هاتنی دەجالدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بەوە کردووە کە دەجال (٤٠) ڕۆژ دەمێنێتەوەو ڕۆژێکی بە هێندەی ساڵێکەو ڕۆژێکی بە هێندەی مانگێکە و ڕۆژێکی بە هێندەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریش ئاساییە! ڕەنگە ئەوەش هەر بەهۆی خاوبوونەوەی زەویەوە بێت، بۆیە زانایان ئەمڕۆ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیانەوە ئەم قسەیەیان قبوڵە.

موسڵمان بوونی قوتابیەکی دکتۆرا[2]:

موسڵمانان لە بنکەی ئیسلامی لە (کییف) لە ئۆکرانیا ڕاهاتوون لە سەر ئەوەی کە هەرچەند ڕۆژێك و یەکێك لە ئۆکرانیەکان دێت لە مزگەوتدا موسڵمان

---

(١) الرقائق للعريفي، لا ٣٩٠ ـ ٣٩١.

(٢) سەرچاوە/http://www.arraid.org/index.php?r=1&lang=ar.

دەبێ.. بەڵام ئەمجارە هەروا ئاسایی و سادە نەبووە، گەنجێکی ئۆکرانی کە ناوی (دیمیتری بولیاکوف)ەو قوتابی دکتۆرایە لە بواری فیزیا، هاتە مزگەوت و لە تەنیشت ئیمامەوە دانیشت دوای نوێژ، یەکێ لە لاوە چالاکەکانی مەکتەبی ناساندنی ئیسلامی مەرکەزەکەشی لەگەڵدا بوو، ئیمام هەندێ قسەی کرد وەك پێشەکیەك و پاش ماوەیەکی کەم (دیمیتری) بە دوایدا شایەتمانی هێناو گوتی:
(أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).

بەڵێ .. دیمیتری باسی موسڵمان بوونەکەی بۆ ئامادەبووان کرد، کە لە ڕێی زانستی فیزیاوە موسڵمان بووە.. ناوبراو دەڵێت: لەگەڵ تیمێکی لێکۆڵینەوەی زانستی کاردەکەم لە بواری فیزیای بۆشایی (الفيزياء الفراغية)، بەسەر پەرشتی پرۆفیسۆر (نیکۆلای کوسینیکوف)، کە یەکێکە لە گەورە زاناکانی بواری فیزیا، لە لێکۆڵینەوەکەیاندا چەند نمونەیەکیان وەك زەوی دروستکردو تاقیکردنەوەیان لەسەر کرد، تاوەکو دیراسەی بیردۆزی تازەی خولانەوەی زەوی بکەن بەدەوری تەوەرەکەیدا، بیردۆزەکەی پرۆفیسۆر (کوسینیکوف) دادەنرێ بە تازەترین و بە جورئەترین بیردۆز لە تەفسیری دیاردەی خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا.

تیمەکەی هەستان بە دروستکردنی چەند تۆپێکی تایبەتی وەك زەوی کە ناوەوەی پڕ بوو لە کانزایەکی تواوە، کە لە بوارێکی موگناتیسی تایبەتدا دەخولانەوە..هەروەك زەوی کە بەهۆی بواری موگناتیسی خۆرەوە (کە پەیوەندی هەیە بە چڕی وزەی خۆرەوە) دەخولێتەوە .. کە ئاراستەی ( قوطبی شمالی ) دەوەستێتە سەر ئەو بوارە..

تێبینی کراوە کە خێرایی قوتبی موگناتیسی زەوی تا ساڵی ١٩٧٠ع بە خێرایی ١٠کم لە ساڵێکدا دەجوڵا، لەم ساڵانەی دواییدا ئەو خێراییەی گەیشتۆتە ٤٠ کم لە ساڵێکدا .. تەنانەت لە ژێر ئەو بوارە موگناتیسیە بەیەکجار لە ساڵی ٢٠٠١ع قوتبی موگناتیسی زەوی ٢٠٠کم خزاوە.. ئەمەش وا دەکات کە لە داهاتوودا هەردوو قوتبە موگناتیسیەکەی زەوی جێگۆڕکێ بکەن و بەمەش زەوی بە پێچەوانەوە بخولێتەوە، ئەمەش یانی هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە[1]..

---

(١) سەرچاوە/http://www.arraid.org/index.php?r=1&lang=ar.

بەڵێ.. دیمیتری ئەم تاقیکردنەوانەی بە چاوی خۆی بینی، وە کە زانی پێغەمبەر (ﷺ) باس لە ڕووداوی وا دەکات کە دەفەرموێ: هەرکەس پێش هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە تەوبە بکات خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێت.. یان کە دەفەرموێت: لە کۆتایی بونەوەر دەجال دێت و چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، درێژی یەکێ لە ڕۆژەکانی ساڵێك دەبێت و ڕۆژێکیشی درێژیەکەی مانگێك دەبێت و ڕۆژێکیشی درێژیەکەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریشی وەك ڕۆژی ئێستای لێدێتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی هاتنی دەجالی کرد بۆ هاوەڵان ئەوانیش پرسیان چەند دەمێنێتەوە؟

فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بەقەدەر ساڵێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر مانگێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر هەفتەیەکەو باقی ڕۆژەکانیشی وەك ڕۆژی ئاساییە، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژەی کە بەقەدەر ساڵێکە هەر نوێژی ڕۆژێکی تێدا بکەین؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر لەسەر ڕۆژی ئاسایی حسابی بۆ بکەن، واتە: (هەر بیست و چوار سەعات پێنج فەرز نوێژی تێدا بکەن)، دیارە ئەمەش پەیوەندی بە خاوبونەوەی زەوی یەوە هەیە، چونکە زانایان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە بۆیان دەرکەوت کە زەوی لە سەرەتاوە ئەوەندە خێرا سوڕاوەتەوە کە شەو و ڕۆژێك چوار سەعات بووە هەتا وردە وردە خاوبۆتەوە بە ملیار ساڵ تا گەیشتۆتە ئێستا کە شەو و ڕۆژێك بیست و چوار سەعاتەو بەردەوامیش لە خاوبوونەوەدایە، هەر چەند بڕەکەی زۆر کەمە ساڵانە، ئەگەر لە چوار سەعاتەوە بوویێت بە بیست و چوار سەعات ئاساییە کە ببێ بە حەوت بیست و چواری و ببێ بە سی بیست و چواری و ببێ بە سێ سەدو شەست و پێنج بیست و چواری، ئینجا بە پێچەوانەشەوە بخولێتەوەو خۆر لە خۆر ئاواوە ببینین کە هەڵدێت، بەڵام کەی و چۆن؟؟ ئەوە خوا دەزانێت ..

ئەمانە وای کرد کە دیمیتری بێتە بنکەی ئیسلامی کییف و لە مزگەوتەکەیدا لە ئۆکرانیا موسڵمانبوونی خۆی ڕابگەیەنێت.. ئێستاش کە بەردەوام دەبێت لە سەر ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەی، بە گوڕوتین و بیروبۆچونێکی ترەوە کاردەکات،

که گورِو تینی زانایەکی فیزیایی خواناسی موسڵمانە کە لە کارەکانیدا دەسەڵاتی خوای پەروەردگاری باڵادەست دەبینێت[١].

زاناکانیش لەکۆن و نوێ زۆر قسەیان دەربارەی ئەو مەسەلەیە کردووەو ڕاو بیروبۆچونی جیاوازیان بۆ لێکدانەوەی هەیە، بۆ نموونە: هەندێکیان پێیان وایە کە خوای گەورە هەر بە ڕاستی کات درێژ دەکات تا وای لێ دێت شەوو ڕۆژی یەکەم هێندەی ساڵێك بێت و شەوو ڕۆژی دووەم هێندەی مانگێك بێت و شەوو ڕۆژی سێیەم هێندەی هەفتەیەك بێت، وەك زانای گەورە ئیبنو مەلەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت.

بەڵام پێشەوا علی القاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم ڕایەی پێ دروست نیەو دەڵێت: ئەگەر وابوایە دەبوو لەو ڕۆژەدا کە هێندەی ساڵێکە تەنها پێنج فەرز نوێژی تێدا بکرایە، چونکە نوێژە فەرزەکان کاتی دیاری کراوی خۆیان هەیەو نابێت لەکاتی تردا بکرێن[٢].

هەندێکی تر پێیان وایە کە درێژبوونەوەی شەوو ڕۆژ لەو کات هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەجال چاوبەستی لە خەڵك دەکات و لە ڕێگەی سیحرەوە وایان لێ دەکات کە شەوو ڕۆژیان لێ تێك بچێت و نەتوانن لێکیان جیا بکەنەوە، ئەمەش ڕای (عبدالفتاح أبو غدە)یە کە لە پەراوێزەکەیدا بۆ کتێبی (التصریح بما تواتر فی نزول المسیح) دا دەری دەبڕێت [٣].

ئەمەش بۆچونێکی لاوازە، چونکە پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: زاناکان دەڵێن: ئەم فەرمودەیە ڕووداوێکی ڕاستیە نەك سیحرو خەیاڵ بەبەڵگەی ئەوەی کە جگە لەسێ ڕۆژی یەکەم ڕۆژەکانی تری وەك ڕۆژی ئاسایی خۆمانی لێ دێتەوە[٤].

---

(١) سەرچاوە/http://www.arraid.org/index.php?r=1&lang=ar.

(٢) المرقات شرح المشكاة، للعلامة علي القاري (١٩٥/٥).

(٣) التصريح بما تواتر في نزول المسيح للكشميري، تحقيق عبدالفتاح أبو غدة لا١١١.

(٤) شرح صحيح مسلم، للنووي (٦٥/١٨).

مامۆستا سەعید نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) هەوڵی داوە لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆ ئەو ڕووداوە بدۆزێتەوەو دەڵێت: دەجال یەکەم جار لە جەمسەری بەستەڵەکی باکووری زەویەوە دێت کە لەوێ شەش مانگ شەوەو شەش مانگیش ڕۆژە، دواتر کەمێك دێتە خوارەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە تیایدا مانگێك شەوەو مانگێك ڕۆژە دواتر بۆ ئەو ناوچانەی کە هەفتەیەك شەوەو هەفتەیەك ڕۆژە، پاشان دێتە ئەو ناوچانەی خۆمان کە شەوو ڕۆژیان تێدا وەك یەکە.

هەروەها دەڵێت: دەجال لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دێت، وە بە نیسبەت نیوە دوورگەی عەرەبیەوە ڕۆژهەڵات تا جەمسەری بەستەڵەکی باکوور هەمووی هەر ڕۆژهەڵاتەو شوێنی واش هەیە لەسەر ڕووی زەویە کە تا یەك ساڵ تیشکی خۆری بەر ناکەوێت، یاخود بە پێچەوانەوە بەردەوام هەر ڕۆژە، وە ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە دەجال دێت، یەکەم ڕۆژ لەو شوێنە دوورە بێت کە ڕۆژەکەی وردە وردە کەم دەبێتەوەو جاری وایە بە ئەندازەی مانگێکی لێ دێت، وە دوایی ڕۆژێك بە ئەندازەی هەفتەیەکە، لەبەر ئەوەیە کە ئەگەر لەو شوێنانەوە زیاتر بەرەو ئەملا هاتی و نزیك بویەوە ڕۆژ بە ئەندازەی هەفتەیەکی لێ دێت، وە پاشان ڕۆژەکان وەك ئێستای ئێرە ئاسایی دەبنەوە[1].

مامۆستا (هاوری) دەڵێت: پێمان وایە ئەو ڕاو بۆچونەش لاوازە، چونکە جیاوازی کات لەناوچە بەستەڵەکەکاندا ڕووداوێك نیە تایبەت بێت بەسەردەمی دەجالەوەو لە هیچ فەرمودەیەکیشدا ئاماژە بەوە نەکراوە کە دەجال لەوێوە دێت، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ هەوڵ بدەین لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆ ئەو دیاردەیە بدۆزینەوە دەبێت چاوێك بە ڕەوتی ڕووداوەکانی پێش هاتنی دەجال بخشێنینەوە، ئەو کاتە پێم وایە بتوانین تا ڕاددەیەکی زۆر هۆکاری ئەو دیاردەیەمان بۆ ڕوون بێتەوەو نهێنی ئەو ڕووداوەمان بۆ ئاشکرا بێت.

پێش ئەوەی بێینە سەر لێکدانەوەی ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرە پێویستە تێبینی دوو خاڵی گرنگ بکەین لەفەرمودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

---

(١) المكتوبات، بديع الزمان سعيد النورسي، (٤٣٢/١).

١) دیاردەکە لەسەرەتادا زەق و ئاشکراترە، بەڵام دواتر بەرەو تەنك بوونەوەو کەم بون دەچێت تا وای لێ دێت ئاسایی دەبێتەوەو شەو و ڕۆژ وەك جارانی لێ دێتەوە.

٢) کاتێك کە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) پرسیار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن لەو کاتەدا چۆن نوێژ بکەن ئایا هەر تەنها پێنج فەرزی نوێژی تێدا بکەن؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان دەفەرموێت: نەخێر بەڵکو (اقدروا لهُ قَدْرَهُ) واتە: ماوەی کاتی نوێژەکان لە ڕۆژێکی ئاساییدا بپێون و هەموو (٢٤) بیست و چوار سەعاتێك لەکاتی خۆیاندا دووبارەیان بکەنەوە، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت نەك تەنها شەوو ڕۆژ لە خەڵکی تێك دەچێت، بەڵکو کاتەکانی ناو شەوو ڕۆژیش کە بەهۆیانەوە نوێژەکان ئەنجام دەدرێن ئەوانیش تێك دەچن و ناتوانرێت لێك جیابکرێنەوە، کە ئەم خاڵەش گرنگی خۆی هەیە لە لێکدانەوەی ئەو دیاردەیە، جا لە ڕوانگەی زانستەوە تێکەڵبوونی کات بەشێوازێك کە خەڵکی نەتوانن کاتی نوێژەکان لە یەکتر جیابکەنەوە، بەهۆی یەکێك لە دوو هۆکارەکەوە دەبێت، یان ئەوەیە دەبێت زەوی لە خولانەوەی بەدەوری خۆیدا بوەستێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی نیوەی جیهان بەردەوام ڕۆژ بێت و نیوەکەی تریشی بەردەوام شەو بێت کە ئەمەش ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی ڕۆژی یەکەمساڵێك بێت و ڕۆژی دووەم مانگێك و ڕۆژی سێیەم هەفتەیەك، هەروەها فەرمان کردنی پێغەمبەریش (ﷺ) بە پێوانەی کاتی نوێژەکان لەسەر ڕۆژی ئاسایی ئەوە دەگەیەنێت کە کات نەوەستاوەو زەوی لە خولانەوەی خۆی نەکەوتووە، چونکە وەك پێشتر لە بۆچونەکەی (علی القاری)دا هاتبوو نوێژەکان خوای گەورە بەپێی کاتەکان فەرزی کردوون و دەبێت لە کردنیاندا پشت بە خۆرهەڵاتن و ئاوابونی خۆر ببەسترێت، جا ئەگەر زەوی لە خولانەوە وەستا کاتیش دەوەستێت و ناتوانرێت پێوانەی کاتیش بکرێت بۆ نوێژەکان، لەبەر ئەوە پێمان وایە ئەم بۆچونە هەڵەیەو زەوی لە خولانەوە ناکەوێت بەدەوری خۆیدا[1].

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی، هاوڕێ محمد ئەمین، ل١٩٧-١٩٨، چاپی پێنجەم ٢٠٠٥.

کەواتە دەبێت بچینە سەر هۆکاری دووەم کە پێمان وایە ئەمەیان واقعی تر زیاترە ڕاستی دەپێکێت، ئەویش ئەوەیە کە شەوو ڕۆژ لە ڕاستیدا هەروەك خۆی لەسەردەمی دەجالدا بەردەوام دەبێت هیچ گۆڕانکاریەکیان بەسەردا نایەت لە درێژبوونەوەو کورت بون، بەڵام هۆکارێکی تر ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی شەوو ڕۆژیان بۆ جیانەکرێتەوە، واتە: بەربەستێکی وا بێتە بەردەمیان کە نەتوانن بزانن ئایا شەوە یان ڕۆژە، بە واتایەکی تر خەڵکی سەر زەوی وەك ئەو کەسەیان لێ بێت کە لەبەندیخانەیەکی تاریکدا بەندکراوە نازانێت کەی ڕۆژ دەبێتەوەو کەی شەو دادێت، جا با بزانین چ بەبەرستێك هێندە گەورەیە بتوانێت بەری ڕووناکی لەهەموو خەڵکی سەر زەوی بگرێت بێ ئاگایان بکات لە هاتنی شەوو ڕۆژ.

پێم وایە ئەگەر کەمێك بە وردی و تێفکرینەوە سەرنجی ڕووداوەکانی پێش هاتنی دەجال بدەین، بەتایبەت ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیەی کە لەبەشەکانی پێشودا بەدرێژی باسمان لێ کرد، وە بەشێوەیەکی زانستیانە ئاکامی جەنگێکی لەو جۆرە هەڵبسەنگێنن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی دەفەرموێت: تەنانەت باڵندەش لە ئاسمانەوە لە ئاگری ئەو جەنگە ڕزگاری نابێت و دەکەوێتە خوارەوەو، کوشتارێکی هێندە گەورەی تێدا ڕوو دەدات کە دوای شەڕەکە تەنانەت کەس دەسکەوت کۆناکاتەوەو میراتیش بەش ناکرێت، وە ئەو جەنگە کە هەموو وڵاتانی خۆرئاوا بەشداری تێدا دەکەن دژی لەشکری ئیسلامی هەموو جۆرە چەکێکی کاولکاری تێدا بەکار دەهێنرێت، لە پێش هەمووشیاندا چەکی ئەتۆمی کە لای هەموان ئاشکرایە توانای کاولکاری ئەو چەکە تا چ ڕاددەیەکە، بەجۆرێك کە نەك تەنها مرۆڤ و گیانلەبەران دەکوژێت، بەڵکو لە کاتی تەقینەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو چەکە ژینگەی زەویش بە تەواوی تێك دەچێت، بۆیە پێم باشە بۆ زانینی ئاکامی جەنگێکی جیهانی لەو جۆرە کە هەموو جۆرە چەکێکی ئەتۆمی و هایدرۆجینی تێدا بەکاربێت بگەڕێینەوە بۆ لای زانایانی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕاددەیەك کاریگەری لەسەر ژینگەی زەوی دەبێت.

تیمێك لە زانایانی ئەمریکا بەسەر پەرشتی زانای پسپۆر (برایان تون) هەستان بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ئاکامەکانی جەنگێکی ئەتۆمیو کاریگەری بەکارهێنانی ئەو چەکانە لەسەر مرۆڤایەتی و ژینگەی زەوی، لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی بەشێوەیەکی زۆرو بەربڵاو دەبێتە هۆی ڕوودانی دیاردەیەك کە ناویان نا (زستانی ئەتۆمی) (NUCLEAR) کە بەشی زۆری جیهان دەگرێتەوە، ئەو زانایانە دەڵێن کە لە ئاکامی تەقاندنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو بۆمبە ئەتۆمیانە، بڕێکی ئێجگار گەورە لە خۆڵ و تەپ و تۆز و دوکەڵ و هەروەها تەنی تێشکاوی کە لەو بۆمبانە دەردەچێت بەرەو ئاسمان بەرزدەبێتەوەو لە شێوەی هەورێکی ئەستوری تاریکدا بەری ئاسمان دەگرێت و بۆ ماوەی چەندین مانگ سەر زەوی دەبێتە شەوەزەنگ و تاریکستان، هەروەها پلەی گەرما لە چینەکانی سەرەوەی هەوادا زۆر بەرز دەبێتەوە، چونکە ئەو هەورە ڕەشە تیشکی خۆر بۆ خۆی گل دەداتەوەو ناهێڵێت بگاتە سەر زەوی، وەبەپێچەوانەشەوە پلەی گەرمی لەسەر زەوی بەڕاددەیەك دادەبەزێت کە لە نیوەی سەرەوەی زەویدا دەگاتە (٢٥) پلە ژێر سفر، کە ئەمەش دەبێتە هۆی تیاچونی هەرچی ڕوەك و بەروبومی کشتوکاڵی هەیە لەسەر زەویداو، دواتریش تیاچوونی مەڕو ماڵات و ئاژەڵ، وەئەو خەڵکانەش کە لە سەرەتای تەقاندنەوەی بۆمبەکاندا نەمردون و ماون بەشی زۆریان بەهۆی ئەو سەرماو سۆڵەو قات و قڕیەو پیس بوونی ژینگەیەوە تیا دەچن و دەمرن[١].

بەڵێ.. ئەمە ئاکامی ئەو جەنگە جیهانیە گەورەیە دەبێت کە لە پێش هاتنی دەجالدا ڕوودەدات، دەجال وەك پێشتر لە فەرمودەکاندا باسمان کرد لە کۆتایی ئەو جەنگە دێت، کاتێك کە سەرتاپای زەوی شەوە زەنگەو خەڵکی شەوو ڕۆژیان بۆ لێك جیا نەکرێتەوەو ماڵ وێرانی و کاولکاری و قات و قڕی و سەرماو سۆڵەو دەردو نەخۆشی باڵی ڕەشی بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا کێشاوەو ئاسمان بارانی لێ نابارێت و زەوی گیای سەوز لێ سەوز نابێت و برسێتی بەجۆرێك

---

(١) حرب النجوم والحرب العالمية الثالثة، موسى زناد، ل١٣٣-١٣٥.

زۆر بۆ خەڵکی دەهێنێت کە لەپێناو بەدەست هێنانی نانێکدا هەموو جۆرە کارێکی ناشایستە دەکرێت، هەروەك لە ئینجیلی (بەرنابا)دا هاتوە کە ڕاسترینی ئینجیلەکانە کە ئەمڕۆ لەبەر دەستدا بێت و بۆ ماوەی چەندین سەدە بە نهێنی لە کتێبخانەکەی پاپادا شاردرابۆوە، تا خوای گەورە لەسەر دەستی یەکێك لە قەشەکانی خۆیاندا بەناوی (فرا مرینو) ئاشکرای کرد لەسەدەی شازدەی زایینیدا و دواتریش ئەو قەشەیە پاش خوێندنەوەی ئەو ئینجیلە موسڵمان بوو، لەو ئینجیلەدا هاتووە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت) باسی ڕۆژی دوایی بۆ قوتابیەکانی دەکات و پێیان دەڵێت: (قبل أن يأتي ذلك اليوم سيحلُّ بالعالم خرابٌ عظيم، وستنشُبُ حربٌ فتَّاكةٌ طاحة، فيقتلُ الأبُ إبنَهُ، ويقتلُ الإبنُ أباه، بسبب أحزاب الشعوب، ولذلك تنقرض المدن وتصير البلاد قفراً وتقع أوبنة فتاكة، حتى لا يعود يوجد من يحمل الموتى للمقابر بل تترك طعاما للحيوانات وسيرسل الله مجاعة على الذين يبقون على الأرض فيصر الخبز أعظم قيمة من الذهب، فيأكلون كل أنواع الأشياء النجسة، يا لشقاء ذلك الجيل الذي لا يكاد يسمع فيه أحد يقول (اخطأت فارحمني ياالله) بل يجدفون بأصوات مخوفة على المجيد المبارك الى الأبد...)[1].

واتە: پێش ئەوەی کۆتایی بوونەوەر بێت، جیهان کاولکاریەکی گەورەی بەسەردا دێت، وە جەنگێکی وێرانکەر هەڵدەگیرسێت، تیایدا باوك کوڕی خۆی دەکوژێت و کوڕیش باوکی خۆی دەکوژێت، بەهۆی بەش بەش بوونی گەلانی جیهان لە نێوان خۆیاندا، هەر بەو هۆیەوە شارەکان کاول دەبن و وڵاتەکان چۆل دەبن و چەندین نەخۆشی کوشندە بڵاودەبنەوەو تا وای لێ دێت کەس نامێنێت جەنازەی مردووەکان بەرێت بۆ گۆڕستان، بەڵکو بەجێ دەهێڵرێت و دەبنە خۆراکی گیانلەبەران، وە خوای گەورە برسیەتیەك دەنێرێت بۆ ئەوانەی کە ماون لەسەر زەوی تا وای لێدێت نان نرخی لە ئاڵتون زیاتر دەبێت، ئیتر هەرچی شتی پیس هەیە دەیخۆن، ئای لەنەگبەتی خەڵکی ئەو سەردەمە کە بەدەگمەن لە یەکێکیان دەبیستێت بڵێت (هەڵەم کردوە خوای گەورە لێم خۆش بە) بەڵکو قسەی ناشایستەو ترسناك بەخوا دەڵێن).

---

(١) انجيل برنابا (فصل ٥٣) ضاثي يةكةم ١٩٠٧.

بەرگی سێیەم

بەڵیٚ.. دەجال لەسەرەتای ئەو (زستانە ئەتۆمیە) دا دیٚت کە بەشی زۆری جیهانی کردووە بەشەوە زەنگ وە بۆ ماوەی یەك دانە ساڵ خەڵکی خۆری تێدا نابینن، پاشان وردە وردە ئەو دوکەڵ و هەورە ڕەشە دەڕەوێتەوە، تا دوای مانگێکی تر بۆ جاری دووەم خۆر دەبیننەوەو لە دوای هەفتەیەکی تریش بۆ جاری سێیەم، ئیتر دواتر ئاسمان ڕۆشن دەبێتەوەو خەڵکی دەتوانن شەوو ڕۆژ لێك جیابکەنەوە.

پێشمان باشە لێرەوە دیاردەیەکی هاوشێوە وە بیر موسڵمانان بخەینەوە، بە تایبەتی موسڵمانانی کوردستان و عێراق، ئەویش لە کۆتایی جەنگی کەنداودا بوو کاتێك کەبەشی زۆری بیرە نەوتەکانی عیراق لە ساڵی (١٩٩٠-١٩٩١)ع دا لەلایەن فڕۆکە جەنگیەکانی هاوپەیمانەکانەوە تەقێنرایەوەو سوتێنرا، هەموو لەبیرمانە کە چۆن دوکەڵێکی ڕەش بۆ ماوەی زیاتر لە هەفتەیەك ئاسمانی لێڵ و تاریك کردبوو، وەجار جارەش کە باران دەباری تەنها ڕەشاوێك بوو لە ئاسمان دەهاتە خواریٚ، جا ئەگەر تەقاندنەوەی چەند بیرە نەوتێك ئەو کاریگەریە گەورەی هەبێت، ئایا دەبێت تەقاندنەوەی سەدان بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی زەوی دووچاری چ کارەساتێك بکات؟

## ژمارەی ڕزگاربووانی دەجال چەندە؟

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت:

ئەبو نوعەیم لە وەرگێرانی حەسسانی کوری عەتیە کە یەکێکە لە تابیعیە متمانە پێکراوەکان لە کتێبی (الحليه) بە سەنەدێکی حەسەن دەڵێت: (لا ينجو من فتنة الدجال إلا اثنا عشر ألف رجل ، وسبعة آلاف امرأة)[1]..

واتە: ڕزگاریان نابێت لە فیتنەی دەجال تەنها دوانزە هەزار پیاو و حەوت هەزار ئافرەت.

---

(١) فتح الباري ، (١٣/٩٢)

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: (أَوَّلُ الْفِتَنِ قَتْلُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْهِ، وَآخِرُ الْفِتَنِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يَمُوتُ رَجُلٌ وَفِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ حُبِّ قَتْلِ عُثْمَانَ إِلَّا تَبِعَ الدَّجَّالَ إِنْ أَدْرَكَهُ، وَإِنْ لَمْ يُدْرِكْهُ آمَنَ بِهِ فِي قَبْرِهِ)[1].

واتە: یەکەم فیتنە شەهید کردنی عوسمانە، کۆتاییەکەشی دەرچوونی دەجالە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك نامرێت ئەگەر بە قەد تۆزقاڵێك حەز بکات بە کوشتنی عوسمان تەنها شوێن دەجال دەکەوێت ئەگەر پێی بگات، ئەگەر پێی نەگات ئەمین دەبێت لەناو گۆڕ.

## دایك و باوکی دەجال :

سیفاتەکانی دایك و باوکی دەجال لەم دوو فەرموودەیە زۆر ڕاشکاوانە باس کراوە، هەر چەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس ئەم فەرموودەیان بەبێهێز داناوە..

عبدالرحمانی کوری ئەبی بەکرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَمْكُثُ أَبُو الدَّجَّالِ وَأُمُّهُ ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَهُمَا وَلَدٌ ثُمَّ يُولَدُ لَهُمَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ . ثُمَّ نَعَتَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) أَبَوَيْهِ فَقَالَ: أَبُوهُ طِوَالٌ ضَرْبُ اللَّحْمِ كَأَنَّ أَنْفَهُ مِنْقَارٌ وَأُمُّهُ امْرَأَةٌ فِرْضَاخِيَّةٌ طَوِيلَةُ الْيَدَيْنِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ فَسَمِعْنَا بِمَوْلُودٍ فِي الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ فَذَهَبْتُ أَنَا وَالزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبَوَيْهِ فَإِذَا نَعْتُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِيهِمَا فَقُلْنَا هَلْ لَكُمَا وَلَدٌ فَقَالاَ مَكَثْنَا ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَنَا وَلَدٌ ثُمَّ وُلِدَ لَنَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ. قَالَ فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمَا فَإِذَا هُوَ مُنْجَدِلٌ فِي الشَّمْسِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ وَلَهُ هَمْهَمَةٌ فَكَشَفَ عَنْ رَأْسِهِ فَقَالَ مَا قُلْتُمَا قُلْنَا وَهَلْ سَمِعْتَ مَا قُلْنَا قَالَ نَعَمْ تَنَامُ عَيْنَاىَ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِى)[2].

---

(١) المجالسة وجواهر العلم، (٢/ ١٦٤)، برقم: (٢٨٦).

(٢) ضعيف: سنن الترمذي (٨/ ٤٨٠) كتاب: الفتن، باب: ما جاء في ذكر ابن صائد، برقم: (٢٤١٤). وإسناده ضعيف فيه علي بن زيد بن جدعان وهو ضعيف، وأورده ابن كثير في (النهاية) (١/ ١٢٧)، وقال: هو منكر جداً.

عبدالرحمانی کوری ئەبی بەکرە(ﷺ) دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی دایك و باوکی دەجالی کردو فەرموی: (يَمْكُثُ أَبَوَا الدَّجَّالِ ثَلاَثِينَ سَنَةً لاَ يُولَدُ لَهُمَا، ثُمَّ يُولَدُ لَهُمَا ابْنٌ مَسْرُورٌ مَخْتُونٌ ، أَقَلُّ شَيْءٍ نَفْعًا وَأَضَرُّهُ ، تَنَامُ عَيْنَاهُ ، وَلاَ يَنَامُ قَلْبُه)[1].

**بە کورتی و کوردی:**

دایك و باوکی دەجال سی ساڵ منداڵیان نابێت، دواتر خوای گەورە منداڵێکیان پێ دەبەخشێت کە کوڕە... سیفەتی ئەو منداڵە وایە چاوەکانی دەخەوێت بەڵام دڵی ناخەوێت.. باوکی بێ گۆشتەو دایکی قەڵەوە، وهەردوو دەستیشیان درێژە..

وای دەبینم ئەم دوو فەرموودەیە ئاماژە بەوە بکات کە هەوڵ بدەین لێکۆڵینەوەی زیاتر دەربارەی دایك و باوکی دەجال بکەین، لە چ کاتێك لە دایك بووە؟ ساڵی چەند لە دایك بووە؟ لە ساڵی چەند دایك و باوکی هاوسەرگیریان کردووە..

ئەم دوو فەرموودەیە ئەوەمان پێ دەڵێت: کە هەر کەسێك گوێی لە هاتنی دەجال بوو با بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، بۆ ئەوەی مرۆڤ بیری لێبکاتەوە.. کە فیتنەکەی زۆر مەترسیدارە.



---

(١) ضعيف: مسند الإمام أحمد (٣٤/ ١٥٠) برقم: (٢٠٥٢٠). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

## ئایا دەجال زیندووە؟ (ئیبنو صەیاد) کێیە؟ وە ئایا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)هەبووە؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو دوو پرسیارە بدەمەوە پێویستە زانیاریەکمان هەبێت بە حاڵی ئیبنو صیاد کە ئایا ئەم پیاوە دەجال بووە یان نا؟

ئەگەر (ئیبنو صیاد) دەجال نیە ئایا دەجال ئێستا هەیە پێش ئەوەی فیتنەکەی دەرکەوێ یاخود نا؟ پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە بزانین ئیبنو صیاد کێیە؟

ئیبنو صیاد پیاوێکە لە جولەکەکانی شاری مەدینە ناوی (صاف)ەو زۆربەی نیشانەکانی بە دەجال دەچوو، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ (مەدینە) هێشتا تەمەنی منداڵ بوو، خۆی ناوی (عەبدوڵلا) بوو باوکیشی ناوی (صیاد) یان (صائد) بوو[١].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە دواتر موسڵمان بووەو کوڕێکیشی بوە ناوی ناوە (عمارە) کە یەکێك بووە لە پیاوچاکانی (تابعین)[٢].

ئیبنو صیاد وەك پێشەوا زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: بە کوێری و خەتەنەکراوی لە دایك بووە[٣].. کابرایەکی جادووگەر بووەو هەندێ جار فاڵی دەگرتەوە، جاری وا هەبوو ڕاست دەردەچوو وە جاری واش هەبوو درۆ دەردەچوو، تا وا لەناو خەڵکدا بڵاوبویەوە کە گوایە دەجالە.

---

(١) فتح الباري (٣/٢٢٠).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم، ابن كثير، تحقيق د.طه زيني، (١٢٨/١).

(٣) تجريد أسماء الصحابة (٣١٩/١) رقم: (٣٣٦٦).

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: نابێت ناوی ئیبنو صەیاد بخرێتە ڕیزی هاوەڵان، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم پیاوە دەجال بێت ئەوە بێگومان هاوەڵ نیە، لەبەر ئەوەی بە کافری دەمرێ، وە ئەگەر دەجالیش نەبێ ئەوام ئەم پیاوە گەیشتۆتە پێغەمبەرو موسڵمان نەبووە[1].

پاش ئەوەی کە ئەم هەواڵە زۆر لەناو خەڵکدا بڵاوبۆوە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش ویستی خۆی بیبینێت و تاقی بکاتەوە بزانێت دەجالە یان نا، هەر بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند جارێك چووە بۆ لای (ئیبن و صیاد) و قسەی لەگەڵدا کردووە، هەروەکو عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە (أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ انْطَلَقَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي رَهْطٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ حَتَّى وَجَدَهُ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ، وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمَئِذٍ الْحُلُمَ، فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ظَهْرَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِابْنِ صَيَّادٍ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الْأُمِّيِّينَ، فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَرَفَضَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَقَالَ: آمَنْتُ بِاللهِ وَبِرُسُلِهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): مَاذَا تَرَى؟ قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): خُلِّطَ عَلَيْكَ الْأَمْرُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا، فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): اخْسَأْ، فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: ذَرْنِي، يَا رَسُولَ اللهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلَا خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ)[2].

واتە: پێشەوا عومەر لەگەڵ پێغەمبەرو(ﷺ) پۆلێك لە هاوەڵان چون بۆ لای (ئیبن و صیاد) بینیان لە نزیك بینایەکی بەرز لە گەڕەکی (مغالە) ی ئەنصارەکان لەگەڵ کۆمەڵە منداڵێك یاری دەکات، (ئیبن صیاد)یش نزیك بووەوە لە تەمەنی بالغ بوون، هەستی بەخۆی نەکرد هەتا پێغەمبەر(ﷺ) کێشای بەدەستیداو پێی فەرموو: (أتشهد أني رسول الله؟) واتە: ئایا شاهێدی دەدەیت

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة (٥/ ٤٩).

(٢) صحيح البخاري (٥/ ٢٧٦) باب: إذا أسلم الصبي، برقم: (١٣٥٤).

کە من پێغەمبەری خوام؟ ئەویش سەیرێکی کردو پێی گوت: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانی، پاشان بە پێغەمبەری (ﷺ) گوت: ئەی تۆ شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەریش(ﷺ) ڕەتی کردەوە پێی فەرموو: (أمنت بالله وبرسله) واتە: باوەڕم هەیە بە خواو پێغەمبەرەکانی، پاشان لە (ئیبن صیاد)ی پرسی: (ما ترى)؟ واتە: چی دەبینیت؟ ئەویش گوتی: ڕاستگۆیەك و درۆزنێك دێن بۆ لام، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: کارەکەت لێ تێکەڵ بووە، پاشان پێی فەرموو: شتێکی نهێنیم لێ شاردویتەوە بزانم دەیزانیت؟ (ئیبن صیاد)یش گوتی: (هو الدخ) واتە: (شتەکە دوخە) ئەویش پێی فەرموو: بەقەت لەوە زیاتر نابیت، پێشەوا عومەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەم بدە با لە ملی بدەم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ئەگەر دەجال بێت ئەوا ناتوانیت بیکوژیت، ئەگەر ئەویش نەبێت خێر لە کوشتنیدا نیە.

لە ریوایەتێکی تر هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: چی دەبینی؟ دەڵێت: عەرشێك و بارەگایەك دەبینم لەسەر ئاو، ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بارەگاو عەرشی شەیتان دەبینی لەسەر دەریادا، وەچیتر دەبینی؟ دەڵێ: درۆزنێك و ڕاستگۆیەك دەبینم، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لێی تێکەڵ بووە وازی لی بێنن[1].

پێشەوا ئەبو زەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ لای دایکی ئیبنو صەیادو فەرمووی: پرسیاری لێ بکە کە چەند لە سکی دابووە لەکاتی حەملیدا؟ دەڵێ: جا هاتمە لای و پرسیارم لێ کردو گوتی: دوانزە مانگ لە سکمدا بووە، دەڵێ: دیسان ناردمی بۆ لای کە پرسیاری لێ بکەم کاتێك کە لە دایك بوو گریانی چۆن بوو؟ دەڵێ: منیش گەڕامەوە لای و پرسیارم لێکردو گوتی: گریانی وەکو گریانی منداڵی یەك مانگە بوو، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی گوت: من نهێنیەکم لێ شاردییەوە، گوتی: سەرە لوتی مەڕێك و

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٤٩ ـ ٥٠).

دووکەڵە گەورەکە، دەڵێ کە ویستی بڵێ دووکەڵ: واتە: الدخان تەنیا گوتی: الدخ الدخ[١].

وە مەبەستیش بەم دووکەڵە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: [فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾][٢].

واتە: چاوەڕێ بە ڕۆژێك دێت ئاسمان دوکەڵێکی دیارو ئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت، خەڵکی دەگرێتەوەو دایان دەپۆشێت، ئەو دوکەڵە سزایەکی بە ئازارە.

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئیبن صەیاد یەکێك بووە لەسەر ڕێگای جادووکەران جا بە زمانی جنەکان وەڵامی دووکەڵەکەی داوەتەوە کە گوتویەتی الدخ، چونکە جنەکان ناوو قسە کورت دەکەنەوە، وە (الدخ) بە واتای الدخان واتە: دووکەڵ، جا کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) زانی کە ئەمە ئیبن و صەیادە پێی فەرموو: بێدەنگ بە تۆ قەدری خۆت نەزانیوە یاخود تۆ زیاتر ڕێزو دەسەڵاتت زیاد نابێت[٣].

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: چۆن داوای پێغەمبەرایەتی کردوە، پێغەمبەریش(ﷺ) وازی لێ هێناوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەوەیە: کەوا لەو ڕۆژگارەدا پەیماننامە لە نێوان پێغەمبەرو(ﷺ) جولەکەکاندا هەبوو.

پێشەوا ئەبوبەکرە (ﷺ) دەڵێت: گوێمان لێ بوو لە شاری مەدینە کە منداڵێکی جولەکە لە دایك بووە، دەڵێت: دوای ماوەیەك من و زوبەیری کوری عەوام ڕۆیشتینە لای دایك و باوکی، وە ئەو سیفەتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرموو بوو دەمانزانی.

---

(١) مسند الإمام أحمد، قال ابن حجر اسناده صحيح (فتح الباري) (١٣/ ٣٢٥).

(٢) سورة الدخان، الآية: (١٠-١١).

(٣) تفسير القرآن العظيم (٧/ ٢٣٤).

پێمان گوت: ئایا ئێوە منداڵتان هەیە؟

ئەوانیش گوتیان: نزیکەی سی ساڵ هیچ مناڵێکمان نەبوو، دواتر مناڵێکی کوێرمان بوو، زەرەری زیاترە لە سوود گەیاندنی، چاوەکانی دەخەوێت و دڵەکانی ناخەوێت..

دەڵێت: ئێمەش لەلای دەرچووین، ئەو مێرد مناڵەمان بینی لەسەر زەوی پاڵی داوەتەوە لەبەر تیشکی خۆر، ورتە ورتەکی دەکات لەبەر خۆی، گوێمان لێیەتی و هیچی لێ تێنەدەگەیشتین، کە ئێمەی بینی، گوتی:ئەوە چیتان دەگوت؟

گوتمان بۆ ئەوەی کە گوتمان گوێت لێ بوو؟

گوتی: بەڵێ.. چاوەکانم دەخەوێت، بەڵام دڵم ناخەوێت[١].

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: (انْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الْأَنْصَارِيُّ إِلَى النَّخْلِ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، النَّخْلَ طَفِقَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهُوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا، قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ ابْنُ صَيَّادٍ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشٍ فِي قَطِيفَةٍ، لَهُ فِيهَا زَمْزَمَةٌ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لِابْنِ صَيَّادٍ: يَا صَافِ - وَهُوَ اسْمُ ابْنِ صَيَّادٍ - هَذَا مُحَمَّدٌ فَثَارَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ)[٢].

واتە: لە دوای ئەوە جارێکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ (ئوبەی کوری کەعب) بە نهێنی رۆیشتن بۆ لای ئەو دارخورمایەی کە (ئیبن صیاد) ی لێ بوو بەمەبەستی ئەوەی کە گوێ لە (ئیبن صیاد) بگرێت پێش ئەوەی هەستی پێ بکات و بیبینێت، بینیان وا راکشاوە خۆی داپۆشیوە لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی دێت، لەو کاتەدا دایکی (ئیبن صیاد) پێغەمبەری (ﷺ) بینی کە لەپەنا دارخورماکاندا خۆی پەنهان کردبوو هاواری لە کورەکەی کردو

---

(١) حسن: سنن الترمذي، برقم: (٢٢٤٩). وقال الترمذي: هذا حديث حسن.

(٢) صحيح البخاري (٥/ ٢٧٧) باب: إذا أسلم الصبي، برقم: (١٣٥٥).

گوتی: ئەی صاف ئەوە محەممەدە(ﷺ)، (ئیبن صیاد)یش یەکسەر ڕاپەڕی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەگەر وازی لێ بهێنایە بۆمان ئاشکرا دەبوو دەجالە یان نا.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: زانایان دەڵێن: چیرۆکەکەی گرێ کوێرەی تێدایە، گرفتەکەش لەوەدایە، ئایا ئیبنو صەیاد هەمان مەسیحی دەجالی بەناوبانگە یان یەکێکی دیکەیە، گومانیش لەوەدا نیە کە یەکێکە لە دەجالەکان.. زانایان دەڵێن: ڕواڵەتی فەرمودەکان وا دەگەیەنێ کە ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نیگا نەکراوە، ئایا ئیبنو صەیاد دەجالە یان یەکێکی دیکەیە، بەڵکو سیفەتەکانی دەجالی بە سروش بۆ هاتووە[1].

(ئیبو صائید) ماوەیەك پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە، بانگەشەی موسڵمان بونیشی کرد، بەڵام خەڵك متمانەیان بە ئیسلامەکەی نەبو، هەر لێی بەگومان بوون، هەروەکو پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عومەر دوو جاران ئیبنو صائیدی دیوە، جا بە یەکێکی گوت کە لەگەڵی دابوو، ئایا دەڵێن: ئەوە هەوە، گوتی: نا بەخوای، دەڵێ: گوتم درۆت لەگەڵ کردم، سوێند بەخوا هەندێك لە ئێوە هەواڵی ئەوەتان پێدام کە ئیبنو صەیاد نامرێ هەتا ماڵ و منداڵی لە هەموتان پتر دەبێ، دەشڵێن: گوایە ئەمڕۆ وایە، پێشەوا ئیبنو عومەر(ﷺ) دەڵێ: جا پێکەوە ئاخافتین، پاشان جیابومەوە، پاشان جارێکی تر ئیبنو عومەر(ﷺ) دیتی، چاوی هەڕەمی وەرەمی هەڵێنا بوو دەرپەڕیبوو، دەڵێ: گوتم: کەی چاوت وای لێهاتووە؟ گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ چاوێك لەو دارەی دەست تۆ دەخولقێنی، دەڵێ: جا مشەیەکی وای لە لوتی هات هێندەی توندترین مشەی کەربوو کە من بیستم، دەڵێ: هاوەڵەکانم گوتیان: گوایە تا دار دەستەکەم شکاوە پێی لێیم داوە، کەچی بەخۆم، سوێند بەخوا دەخۆم هەر هەستم پێ نەکردوە.

---

(١) شرح النووي على مسلم: (٤٦/١٨).

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (لَقِيَ ابْنُ عُمَرَ ابْنَ صَائِدٍ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ لَهُ قَوْلًا أَغْضَبَهُ، فَانْتَفَخَ حَتَّى مَلأَ السِّكَّةَ، فَدَخَلَ ابْنُ عُمَرَ عَلَى حَفْصَةَ وَقَدْ بَلَغَهَا، فَقَالَتْ لَهُ: رَحِمَكَ اللهُ مَا أَرَدْتَ مِنِ ابْنِ صَائِدٍ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: إِنَّمَا يَخْرُجُ مِنْ غَضْبَةٍ يَغْضَبُهَا)[1].

واتە: پێشەوا ئیبنو عومەر(ﷺ) بە ئیبنو صائید دەگات و قسەیەکی وا بە ئیبنو صائید دەڵێ: توڕەی دەکا، ئەویش هێندە دەئاوسێ و با دەخوا تا ڕێگەکە پڕ دەکاتەوە، جا ئیبنو عومەر(ﷺ) دەچێتە لای (حەفصە) ئەمیش ئەو ڕوداوەی پێ گەیشتبۆوە، جا پێی دەڵێ: بەر میهری خوا کەوی، چیت لە ئیبنو صەیاد دەویست؟ ئەی نەتزانیوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: دەجال لە ئەنجامی توڕەبونێکەوە دەردەکەوێ.

(ئیبن صەیاد) کە گوێی لەوە دەبوو کە خەڵك دەربارەی باسی دەکەن زۆر ئازاری دەچەشت، وە زۆر دیفاعی لە خۆی دەکرد کە دەجال نیە، وە بەڵگەی بەوە دەهێنایەوە کە بۆ خۆی دەجال نیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دابوو لە سیفەتەکانی کە هیچی لەسەر ئەم جێ بەجێ ناکرێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: بۆ حەج و عەمرە کردن دەرچوین، ئیبن و صائیدیشمان لەگەڵ بوو، جا لەشوێنێك بارگەمان خست، خەڵکەکە پەرت بوون و هەر ئەمن و ئەوماینەوە، جا زۆر لێی ترسام بەهۆی ئەو شتانەی لەبارەی دەگوترا، دەڵێ: جا شتومەکی خۆی هێنا و لەگەڵ شتومەکی منی دانا، منیش گوتم: دونیا زۆر گەرمە، ئەگەر بیانبەی لە سێبەری ئەو دارەیان دانێی، دەڵێ: ئەویش بردنی، دەڵێ: بزنەکانمان هاتن بۆ لامان و ئەویش چوو بادیەکی گەورە شیری هێناو گوتی: فەرمو ئەبو سەعید بیخۆوە، گوتم: زۆر گەرمایەو شیریش گەرمە، مەبەستیشم هەر ئەوەبوو حەزم نەدەکرد لە دەستی وەرگرم و بیخۆمەوە. جا گوتی: ئەبو سەعید هێندەی نەماوە لەبەر ئەو قسانەی خەڵك پێمی دەڵێن: گوریسێك ببەم و لەو دارە خۆمی پێ هەڵواسم،

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٤٦) باب: ذكر ابن صياد، برقم: (٢٩٣٢).

ئەی ئەبو سەعید ئەو فەرمودانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کێ بزرن کە لە ئێوەی گەلی ئەنصارییان گوم بون، ئەی تۆ لە هەموو خەڵکی شارەزاتر نی لە فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەدی نەیفەرمووە: دەجال کافرە، وامنیش موسڵمانم؟ ئەدی نەیفەرمووە: نەزۆکەو منداڵی نابێ، وامنیش منداڵەکانم لە مەدینە جێهێشتووە، ئەدی نەیفەرمووە: نەدەچێتە مەدینەو نە مەککە، وامنیش لە مەدینەدا ڕاهاتووم و دەچمە مەککە؟ ئەو بەڵگانەی ئیبنو صەیاد هێنایەوە، وە لەرزەکەوتن و کاریگەرییان لە دەرونی ئەبو سەعید نەما، پاش ئەوەی ئیبنو صەیاد بەردەوام بوو گوتی: سوێند بەخوا من دەزانم ئێستا لە کوێیەو باوکو دایکیشی دەناسم.

دەڵێ: پێشیان گوت: پێت خۆشە تۆ ئەو پیاوە بیت؟ گوتی: ئەگەر بمدرێتێ پێم ناخۆش نابێ[1].

پێشەوا شیبلی کوری عوروە (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) لە باوکیەوە دەڵێت: ئەو کاتەی کە شاری ئەصبەهانمان ئازاد کرد، لە نێوان ئێمە جولەکەکان فەرسەخێك بوو، منیش چومە لایان بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی خۆم جێ بەجێ بکەم، ئێوارەم بەسەردا هات، هاورێیەکی جولەکەم هەبوو، پێم گوت: ئەمشەو لەلات بمێنمەوە؟

گوتی: بەڵێ..

ئەو شەوی لەلای مامەوە لەسەربانی خانووەکەی، ئەو شەوی گوێم لە جولەکەکان بوو دەفیان لێدەدا و ڕەقصیان دەکرد، بە هاورێکەم گوت:

ئەوە ئێوە چی دەکەن؟

ئەویش گوتی: ئەو پادشایەی ئێمە کە بەسەر عەرەبەکان زاڵ دەبێت بەیانی دێت.

دەڵێت: منیش نوێی بەیانیم کرد، وە لەسەربانی خانووەکە دانیشتم هەتا ڕۆژ هەڵات، تۆزوخۆڵێکم بینی یەکێك پێشوازی لێدەکرا لەلای عەسکەرە

---

(١) صحيح مسلم (٢٢٤٢/٤)، برقم: (٢٤٢٧).

جولەکەکانەوە، پیاوێکم بەدی کرد لەناو قوبەی رەیحان، وە جولەکەکان لە دەوروبەری بوون، دەفیان لێدەدا و ڕەقصیان دەکرد، بینیم کە ئیبنو صەیاد بوو[1].

زۆرێك لە هاوەڵان مەسەلەی (ئیبن صیاد)یان لا ببووە گرفت، بە دەجالی تێدەگەیشتن، پێغەمبەریش(ﷺ) لەسەرەتادا لە ئاست مەسەلەکە وەستا بوو تا دواتر بۆی ڕوون بویەوە کە دەجال نیە، بەڵکو لە پێڕی ئەو فاڵچیو جادوگەرانە بووە کە پەیوەندیان بە شەیتانەوە هەیە، هەر بۆیەش دەچوو تا تاقی بکاتەوە.

لەم فەرمایشتانە بۆمان دەردەکەوێت کەوا پێغەمبەر(ﷺ) لەم مەسەلەیەدا وەستاوەو لەلایەن پەروەردگاریشەوە وەحی بۆ نەهاتووە کە ئایا دەجالە یان نا؟!

### کاتی مردنی ئیبنو صەیاد:

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: لە ڕۆژی (حەڕڕە) ئیبنو صیادمان ون کردووە[2].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم گێڕانەوەی بە ڕاست داناوە، وە ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێ: لە مەدینە مردووەو لەسەر ڕوویان هەڵداوەتەوە نوێژیان لەسەر کردووە، بە بێهێز دادەنێت[3].

### قسەو بۆچوونی زانایان دەربارەی ئیبن صەیاد:

پێشەوا قورتبی دەڵێ: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئیبن صیاد دەجالی گەورەیە بە بەڵگەی ئەو فەرموودانەی کە باس کران، وە ئەمەش هیچ شتێکی ئەو تۆی نیە کە لەو کات لەو دوورگەیە بێ و لە کاتێکی تردا لە نێو هاوەڵان بێت[4].

---

(١) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١٩٩ ـ ٢٠٠.

(٢) صحيح: سنن ابي داود (١١/ ٤٧٦). وإسناده صحيح، وصحح الحافظ في (الفتح) (١٣/ ٢٧٦).

(٣) فتح الباري (١٣/ ٣٢٨).

(٤) التذكرة (لا ٧٠٢).

بەڵام ژمارەیەك لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێ) بە دڵنیاییەوە دەیان گوت: (ئیبن صیاد)دەجالە، لەوانەش (پێشەوا عومەرو عەبدوڵلای کوری و[1] جابری کوری عەبدوڵلاو[2] ئەبو زەری غەفاری).

هەروەها پێشەوایان (نەوەوی و قورتبی و شەوکانی) لەسەر ئەو ڕایەن کە (ئیبن صیاد) دەجال بووە، بەڵام پێشەوایان بەیهەقی و ئیبن و کثیرو ئیبنو تەیمیە (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت) پێیان وایە کە (ئیبن صیاد) جادووگەرێکی بچووك بووە نەك دەجالی گەورە.

وە ئەو لایەنەی کە بە دەجالی گەورەی دەزانن ئەو فەرمودانەی پێشتر بەبەڵگە دەهێننەوەو دەڵێن: کە پێشەوا عومەر(ﷺ) لەبەردەم پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێندی خواردووە کە (ئیبن صیاد) دەجالی گەورەیەو پێغەمبەریش(ﷺ) لە سوێندەکەی عومەر بێ دەنگ بووە[3]..

بەڵام ئەو لایەنەی کە بەجادوگەرێکی بچوکی دەزانن و پێیان وا نیە کە دەجالی گەورە بێت، فەرمودەکەی (فاتیمەی کچی قەیس) بە بەڵگە دەهێننەوەو دەڵێن: لەو فەرمودەیەدا بە ئاشکرا هاتووە کە دەجال کۆت و زنجیر کراوە لە یەکێك لە دورگەکانی خۆرهەڵات، لەبەر ئەوە ناگونجێت کە (ئیبن صیاد) کە لەو کاتەدا منداڵ بووەو لەشاری مەدینە ژیاوەو لە هەمان کاتدا ئەو دەجالە بێت کە لە دوورگەکە بینراوە..

پاشان کۆمەڵە بەڵگەیەکی تر دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە (ئیبن صیاد) دەجالی گەورە نیە، بۆ نموونە دەڵێن: لە فەرمودە هاتووە کە دەجال کافرە بەڵام (ئیبن صیاد) لە دواییدا موسڵمان بووە، هەروەها دەجال منداڵی نابێت، بەڵام ئیبن صیاد کورێکی هەبووە بەناوی (عمارە)، وە دەجال (مەککە) و (مەدینە)ی لێ قەدەغە

---

(١) صحيح: سنن أبي داود، كتاب: الملاحم، باب: في خبر ابن صياد، برقم (٤٣٣٢). واسناده صحيح وصححه الحافظ في (الفتح) (٢/ ٢٧٤).

(٢) صحيح البخاري، كتاب: الفتن، برقم: (٧٣٥٥).

(٣) صحيح البخاري (٢٢٣/١٣- مع الفتح)... وصحيح مسلم (٥٢/١٨-٥٣- مع شرح النووي).

کراوەو ناتوانێت تێی بچێت، بەڵام (ئیبن صیاد) لە مەدینە لە دایك بووەو چوەتە شاری (مەککە)، وە (ئیبن صیاد) خۆی لە دوای موسڵمان بوونی زۆری پێ ناخۆش بووە کە خەڵك گومانی دەجالیان پێ دەبرد، پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێ) دەیگێڕێتەوە کە (ئیبن صیاد) ئەو نمونانەی سەرەوەی بە بەڵگە دەهێنایەوە کە دەجال نیە، بەڵام دەیگوت: سوێند بەخوا من دەجال دەناسم و شوێنی لە دایك بوونەکەشی دەزانم و دەشزانم ئێستا لە کوێیە، بۆیە (ئەبو سەعید) دەڵێت: پێم گوت: دەگ ئەمرۆ داماو بیت و خێر لە خۆت نەبینیت[١].

بۆیە زۆرێك لە هاوەڵان مەسەلەی (ئیبن صیاد) ببووە گرفت، بە دەجالی تێدەگەیشتن وە پێغەمبەریش لەسەرەتادا لە ئاست مەسەلەکە وەستا بوو تا دواتر بۆی ڕوون بویەوە کە دەجال نیە، بەڵکو لە پێڕی ئەو فاڵچیو جادوگەرانە بووە کە پەیوەندیان بە شەیتانەوە هەیە، هەر بۆیەش دەچوو تا تاقی بکاتەوە.

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: زانایان ڕاجیان دەربارەی ئەوەی کە ئایا ئیبن صیاد دەجالە یاخود نا .. وە کارەکەی زۆر ئاڵۆزە، تا ئەوەی کە زۆر قسەی دەربارە گوتراوە، وە ئەوەی دیارە لە گشت فەرموودەکان دەربارەی ئیبن صیاد ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو دڵ بووە لە ئیبن صیاد کە دەجالە یان نا؟

وە ئەم دوو دڵیەش وەڵام دراوەتەوە بە دوو وەڵام:

**یەکەم:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو دڵ بووە لێی کە خوای گەورە زانیاری پێ بدات دەربارەی کە ئیبن صیاد دەجالە یاخود نا، جا کاتێ زانی سوێند خواردنەکەی عومەری قەدەغە نەکرد لێی.

**دووەم:** لە نێو عەرەبەکان زۆر جار هەواڵی بە وشەی گوماناوی بەکار دێت هەر چەند لە ڕاستیدا هەواڵەکە جێگای گومانیش نەبێت[٢].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٤٢) باب: ذكر ابن صياد، برقم: (٢٩٢٧).

(٢) المسيح الدجال ويأجوج ومأجوج، د. حامد بن أحمد الطاهر البسيوني (لا ٣٤ ـ ٣٥).

وە ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیبن و صیاد دەجالە ئەوەیە کە عبدالرزاق بە ئیسنادێکی دروست دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەر(ﷺ) کە دەڵێ: (لَقِيتُ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمًا وَمَعَهُ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَإِذَا عَيْنُهُ قَدْ طَفَتْ، وَكَانَتْ عَيْنُهُ خَارِجَةً كَعَيْنِ الْجَمَلِ، فَلَمَّا رَأَيْتُهَا، قُلْتُ: يَابْنَ الصَّيَّادِ، أَنْشُدُكَ اللَّهَ مَتَى طَفَتْ عَيْنُكَ؟ فَقَالَ: لَا أَدْرِي وَالرَّحْمَنِ، قُلْتُ: كَذَبْتَ لَا تَدْرِي وَهِيَ فِي رَأْسِكَ، فَنَخَرَ ثَلَاثًا)[1].

واتە: ڕۆژێك گەیشتمە ئیبن صەیاد کە پیاوێکی جولەکەشی لەگەڵدا بوو دیتم چاوی ڕاکشا بوو وەکو گوێدرێژ جا کاتێ بینیم گوتم: توخوا ئەی ئیبن و صەیاد کەی چاوت وا ڕاکشاوە؟ گوتی: نازانم سوێند بەخوا گوتم: درۆ دەکەی ئەوە لەسەرتەوەیە، گوتی: جا دەستی پێدا هێناو سێ جار فنەفنی کرد.

پێشەوا نەززالی کوری سەبرە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: وتاری هەینیمان لەلای عەلی کوری ئەبی تالیبمان (ﷺ) کرد کە لەسەر مینبەر بوو، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە!

پرسیارم لێ بکەن، پێش ئەوەی ونم بکەن، سێ جاران ئەو وتەیەی دووبارە کردەوە..

پێشەوا ئەصبەغی کوری نوباتە گوتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان دەجال کێیە؟

فەرمووی: ئەی ئەصبەغ دەججال صافی کوری صەیادە، هاوار بۆ ئەوەی کە بە ڕاستی دەزانێت و بڕوای پێدەکات، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە بە درۆزنی دەزانێت[2].

ئەوەی زیاتر دیارە لە قسەکەی شەوکانی ئەوەیە کە ئەویش لەگەڵ ئەو بۆچوونەیە کە دەڵێن ئیبن صیاد دەجالی گەورەیە.

---

(١) شرح السنة، للبغوي (١٥/ ٧٣) برقم: (٤٢٧١).

(٢) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ٢٠٠.

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: چیرۆکی ئیبن و صیاد لای هەندێك لە هاوەڵان ئاڵۆز بووە، بۆیە وا گومانیان دەبرد کە دەجالە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ هەواڵی ڕوونی دەربارەی نەگوتبوو، تاکو دوایی بۆی ڕوون بۆوە کە ئیبن صیاد دەجالی گەورە نیە بەڵکو تەنیا یەکێکە لەو جادوگەرو دۆستە شەیتانەکانی بۆیە دەچووە لای تاکو تاقی بکاتەوە[١].

ڕای پەسند:

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: مەبەست ئەوەیە کە ئیبن صیاد ئەو دەجالە نیە کە لە کۆتای بونەوەر دەردەچێ لەبەر فەرموودەکەی فاتیمەی کچی قەیس کە ئەم فەرموودەیە ئەم بابەتە یەکلایی دەکاتەوە[٢].

پوختەی ئەم بابەتەی (ئیبن صیاد) بە درێژایی مێژوو لەلایەن زانایانی ئیسلام لێکدانەوەو بۆچونی جیاوازیان لەسەر بووە کە ناتوانین هەمووی لێرەدا باس بکەین، بەڵام بەبۆچونی خۆم کە وتەی (شیخ الإسلام) پەسەند دەکەم کەوا (ئیبنو صەیاد) دەجال نیە بەپێی ئەم بەڵگانەی کەوا لە پێشەوە باسمان لێوەی کرد.



---

(١) الفرقان بين اولياء الرحمن والشيطان (لا ٧٧).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم: (١/ ٧٠).

## چۆنیەتی خۆپاراستن لە هاتنی دەجال

پێشتر باسمان لەوە کرد کە بەر لەدەرکەوتنی دەجال موسڵمانان هێزێکی گەورەیان هەیەو شەڕی گەورە گەورە دەکەن و تێیدا سەرکەوتوودەبن، جا دەجال دێت تا ئەو هێزە ئیسلامیە لەناو ببات کە بەهێزترین دەوڵەتی ئەو سەردەمی دووچاری شکست کردوە کە ڕۆمەکانن، لەو کاتی موسڵمانان شاری ئەستەمبۆڵیان وەدەست هێناوەتەوەو ڕزگاریان کردوە، کە شەیتان لەناویاندا هاوار دەکات کە گوایە دەجال بۆتە جێنشین بەسەر ماڵ و منداڵیانەوەو چۆتە نێویان، ئینجا موسڵمانەکان غەنیمەت جێ دەهێڵن و بەرەو هەوارگەی خۆیان دەکەونە ڕێ، پاشان دەجال دەردەکەوێ، بۆیە پێغەمبەر خوا (ﷺ) ئامۆژگاری و ڕێنماییمان دەکات سەبارەت بە ڕزگاربونمان لە ئاشوبی (دەجال) لەم ڕێنماییانەش:

**یەکەم:** پەیوەست بوون بە ئیسلامەوەو خۆ چەکدارکردن بە چەکی باوەڕو ناسینی خوای پەروەردگار بە تەواوەتی تا گومڕا نەبین، وەدەبێ ئەوەش بزانین کە دەجال مرۆڤێکە دەخواو دەخواتەوەو پاشەڕۆی هەیەو خوای گەورەش پاکو بێگەردە لەم عەیبانە، هەروەها دەجال چاوی سەقەت و کوێرەو ئەگەر خوا بوایە هەڵبەتە پێش هەموو شتێك چاوی خۆی چاك دەکردەوەو نەیدەهێشت خودی خۆی عەیب داربێت، وە بزانین کە هیچ کەسێك خوای گەورە نابینێت تا نەمرێت، بەڵام دەجال بەکافرو موسڵمانەوە دەیبینن.

**دووەم:** دوعاو پاڕانەوە لە ئاشوبی دەجال بە تایبەتی لە کاتی نوێژ، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)[1].

---

(١) صحيح مسلم (١/ ٤١٢) باب: ما يستعاذ منه في الصلاة: برقم: (٥٨٨).

بەرگی سێیەم

واتە: کە یەکێکتان شایەتمانی هێنا لە نوێژدا (واتە لە تەحیات دا) با دوعا بکات و پەنا بەخوا بگرێت لەچوار شت: بڵێت خوای گەورە پەنا بەتۆ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە لە سزای گۆڕ، وە لەفیتنەو ئاشوبی زیندووبوونەوەو مردن، وە لە خراپەی فیتنەی مەسیحی دەجال.

(فتنه المحيا) ئەوەی کە مرۆڤ تووشی دەبێت لە حاڵەتی ژیانیدا لە خۆشەویستی دونیاو ئارەزووەکانی، یان بە واتای تووشبوون دێت بە کارەسات و ئارام نەگرتن، تاقیکردنەوەی مردنیش ئەوەیە کە لەسەرەمەرگدا تووشی مرۆڤ دەبێت، یان مەبەست لە تاقیکردنەوەی گۆڕە، واتە: پرسیاری دوو فریشتەکە، واتە: پەنا بگریتە خوا لە خراپی پرسیارو سزا کە لە گۆڕدا دەکرێت.

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ئەم دوعایە بکات لە دوای شایەتمانی تەحیات و هەوڵ بدات لەبیری نەچێت، چونکە پیاوچاکانی پێشین زۆر پەیوەست بوون پێوەی، تەنانەت پیاو چاکێکی تابیعی وەکو پێشەوا طاوس (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەگەر کوڕەکەی لە نوێژدا ئەو دوعایەی لەبیر بکردایە، ئەوا نوێژەکەی دووبارە دەکردەوە[١].

پێشەوا سەفارینی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێت: ئەوەی پێویستە بۆ هەموو زانایەك و وتاربێژێك کەوا فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی دەجال بڵاوبکەنەوە لە نێو منداڵان و ئافرەتان و پیاوان.

**سێیەم:** لەبەر کردنی (دە) ئایەتی یەکەمی سەرەتای سورەتی (الکهف) و خوێندنی ئەو ئایەتانە لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی دەجالدا، پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ، فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ)[٢].

---

(١) صحيح مسلم (٨٩/٥ - مع شرح النووي).

(٢) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (٢٢٥٢/٤)، ورقمه (٣٩٣٧).

واتە: هەر کەسێکتان گەیشت بە دەجال با سەرەتاکانی سورەتی (الکهف)ی بەسەردا بخوێنێت.

پێشەوا ئەبو دەرداء (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ)[١].

واتە: هەر کەسێك دە ئایەتی یەکەمی سورەتی (الکهف) لەبەر بکات، لە فیتنەی دەجال پارێزراو دەبێت.

جا لە هەندێك فەرمودەدا هاتووە کە لەسەرەتای سورەتی (الکهف)ەو لە هەندێکیش کۆتاییەکانی.

ڕەنگە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: بۆ سەرەتاکان و کۆتاییەکانی سورەتی (الکهف) مایەی دەربازبون لە دەستی دەجال؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا: هەندێك دەڵێن: چونکە خوای گەورە لە پێشەوەی ئەم سورەتە ڕایگەیاندوە، کە خودا ئەو کۆمەڵە گەنجەی لە دەست ئەو ستەمکارە لەسنور بەدەرە دەرباز کرد، کە هەوڵیدا لەناویان ببات، بۆیە دەگونجیٚ هەرکەسێکی ئەو ئایەتانە بخوێنیٚ و لەحاڵەتێکی وەکو ئەوان دابیٚ، خوای گەورە وەکو ئەوان ڕزگاری دەکات[٢].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: هۆکاری ئەمە ئەوەیە کەوا لە سەرەتای سورەتی (الکهف) ئایەتی سەیرو واتای ورد هەیە، جا هەر کەسێك لێیان ڕامێنیٚ ئەوا هەرگیز دەسخەڕۆی فیتنەی دەجال نابێت[٣].

هەروەها گوتراوە: چونکە نیشانەو سەراساوی سەرسوڕهێنەر لەسەرەتاکانی سورەتی (الکهف)دا هەن، هەر کەسێکی بیانخوێنیٚ، دڵی جێگیر دەبیٚ و بە

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال: (١/٥٥٥)، برقم: (٨٠٩).

(٢) القيامة الصغرى، لا ٢٤٧ .

(٣) صحيح مسلم (١٨/ ٦٥) مع شرح النووي.

دەجال تاقی ناکرێتەوەو سەریشی ناسوڕمێ بەوان، ئەم شتانەی دەجال هێناونی و پێیان ناخافڵێ و کاری تێناکەن.

**چوارەم:** هەڵهاتن و دوور کەوتنەوە لە دەجال، ئەگەر توانرا پەنا ببرێتە بەر شاری (مەککە) و (مەدینە) چونکە دەجال ناتوانێت بچێتە ئەم جێگایانە، هەروەکو عیمرانی کوری حصین (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ سَمِعَ بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ عَنْهُ، فَوَاللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَأْتِيهِ وَهُوَ يَحْسِبُ أَنَّهُ مُؤْمِنٌ فَيَتَّبِعُهُ، مِمَّا يَبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ)[١].

واتە: هەر کەس هەواڵی هاتنی دەجالی بیست با خۆی لێ لابدات و دوور کەوێتەوە لێی، چونکە سوێند بەخوای گەورە پیاوی وا دێتە لای خۆی زۆر بە باوەڕدار دەزانێت کەچی شوێنی دەکەوێت، بەهۆی ئەو کارە گومانیاویانەی کە ئەنجامی دەدات.

واتای فەرموودەکە: هەر کەسێك هەواڵی دەجال ببیستێت کە سەری هەڵداوە لە جێگایەك با لێی دوور کەوێتەوەو نزیکی نەبێتەوە، چونکە کەسی وا هەیە دێتە لای دەجال گومان دەبات کە بیروباوەڕی بەهێز بێت کەچی دەبێتە یەکێك لە شوێنکەوتووانی بە هۆی ئەو دیاردانەی کە لە دەجالی دەبینێت وەکو جادووو زیندووکردنەوەی مردووو شتی تر.

هیچیشی تێدا نیە ئەگەر ئەو کەسانەی توانای بەرگری کردنی دەجالیان نیە هەڵبێن، ئوم شورەیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ فِي الْجِبَالِ)[٢].

واتە: خەڵکی لەدەست دەجال بۆ کێوەکان و چیاکان هەڵدێن.

---

(١) صحيح: سنن أبي داود (٤/ ١١٦) باب: خروج الدجال، برقم: (٤٣١٩) قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٢) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب في بقية من أحاديث الجال: (٢٢٦٦/٤)، ورقم: الحديث: (٢٩٤٤).

## باشە بۆچی خەڵکی هەڵدێن بەرەو چیاکان؟

فیترەتی ئینسان وایە ئەگەر بیەوێت لە جێگایەك جێگیر بێت و قایم و توند بێ بەزۆری وایە کە چیاکان باشترین جێگان، چونکە دەتوانێت لەناو چیاکان یان لەسەرەوە خانوو دروست بکەیت، هەتا دوژمن دەستی نەتگاتێ، چونکە دەتوانیت لەناو چیاکاندا زاڵبیت بەسەر دوژمن، ئەگەر تۆ لە جێگایەکی بڵند بیت دوژمنیش بەرەو ڕووت بێت دەتوانیت ڕووبەڕووی ببیتەوە[1].

**پێنجەم: هاوارکردنی خوا:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (فَمَنِ ابْتُلِيَ بِنَارِهِ، فَلْيَسْتَغِثْ بِاللَّهِ).

واتە: هەر کەسێك تاقیکرایەوە بە ئاگر با هاواری خوا بکات، وەکو باسمان کرد دەجال بەهەشت و ئاگری لایە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە هەرکەسێك کە ئاگری بینی با چاوەکانی خۆی بنوقێنێ و سەری خۆی نقوم بکات چونکە ئەوە ئاوێکی ساردە.

**شەشەم: ناسینی ناو و سیفاتەکانی خوا:** یەکێك لە هۆکارەکانی خۆپاراستن لە دەجال ناسینی ناوو سیفاتەکانی خوایە، کەسێك پرسیار دەکات و دەڵێت: چۆن یەکێك لە هۆکارەکانی دەرباز بوون لە دەجال ناسینی ناو و سیفاتە؟

لەبەر ئەوەی دەجال کوێرەیە، تۆش صیفاتی خوا دەناسی، ئەویش بانگەشەی خوایەتی دەکات، لێرەدا تەتبیقاتی سیفاتی خوا دەناسیت.

**حەوتەم: پەنابردنە بەر یەکێك لە دوو حەرەمەکان:** چونکە دەجال ناچێتە مەککەو مەدینە.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ

---

(١) الرقائق للعريفي، لا ٣٩٢.

بەشی سێیەم

أَنْقَابِهَا إِلَّا عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا، فَيَنْزِلُ بِالسِّبْخَةِ، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ)[1].

واتە: هیچ شارێك نامێنێت کە دەجال پێی تێ نەخات جگە لە مەککەو مەدینە، لەسەر هەر یەك لە ڕێگاکانی فریشتە ڕیزیان بەستوە، پاسەوانی دەکەن، تا دەجال ناچار دەبێت لە (سبخە) دابەزێت مەبەست پێی پارچە زەویەکە کە لماویەو لەبەر سوێری گیای تێدا سەوز نابێت ئیتر شاری مەدینەش سێ جار بە خەڵکەکەی ناویەوە ڕادەتەکێت و دەلەرزێت، هەرچی بێباوەڕو دووڕوو هەیە لە شارەکە دەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال.

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٦٥) باب: قصة الجساسة، برقم: (٢٩٤٣).

# ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکری ئیسلامی لەگەڵ دەجال

وەکو باسمان کرد لە پێش هاتنی دەجال موسڵمانان لە ژێر ئاڵای (محەممەدی مەهدی) دا کۆ دەبنەوەو لەشکرێکی ئیسلامی توندو تۆڵ و بەهێز پێك دەهێنن و چەند جەنگێکی سەرکەوتوو ئەنجام دەدەن و ناوچەیەکی بەرفراوان لە عێراق و حیجازو شام دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، دواتریش لە دوای جەنگە گەورەکەی کە ڕۆمی تێدا دەشکێت موسڵمانان دەتوانن شاری ئەستەمبۆڵیش ئازاد بکەن، بەڵام لەو کاتەدا دەجال خۆی و لەشکرەکەی پەیدا دەبێت، سەرەتا لە خوراسانەوە دەردەچێت و بەرەو ئەصفەهان دێت، پاشان لە ئەصفەهان تەواوی هێزەکانی خۆی کۆدەکاتەوە بە مەبەستی پەلاماردانی لەشکرەکەی محەممەدی مەهدی و ڕووخاندنی ئەو خیلافەتە ئیسلامیە کە تازە دروست بووە.

موسڵمانانیش کە هەواڵی دەرچونی دەجال دەبیستن دیارە زۆر شپرزە دەبن بە تایبەت کە دەزانن دەجال کێیەو لە فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەموو شتێك دەربارەی دەزانن، هەر بۆیە هێزە ڕزگارەکانی ئەستەمبۆڵ بە پەلەو بێ دواکەوتن بەرەو ناوچەکانی سەرکردایەتی لە وڵاتی شام دەکشێنەوەو دواتر سەرجەم هێزەکانی لەشکری ئیسلامی لەوێ کۆدەبنەوە.

پاشان سوپاکەی دەجال لە شاری (ئەصفەهان)ەوە بەڕێ دەکەون، وە ئەو خەڵکەش کە دێتە ڕێیان دەبن بە دوو بەشەوە، یان ئەوەیە باوەڕی پێ دەکەن و شوێنی دەکەون، یان ئەوەیە بەرەو لوتکەی چیاکان هەڵدێن.

بۆیە لەو سەردەك دوو هێزی زۆر گەورە دروست دەبن:

بەرگی سێیەم

## هـێزی ئیسلام:

ئەو هێزەیە کە باوەڕ لە دڵیاندا هەڵدەقوڵێت، بەبێ ئەوەی دوو ڕوویەکیان لەگەڵ بێت، بە شێوازێك کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوا بە دەست بهێنن.. کۆبونەوەیەکی ئایدیلۆژی.

لەو سەردەم موسڵمانەکان لە سێ وڵات دەبن: وڵاتێکیان پێی دەگوترێ بە گەیشتنی هەردوو ڕووبارەکە، وڵاتی حیرڕە، وڵاتی شام[1] واتە: موسڵمانەکان لە سێ ناوچەی سەرەکی دەبن کە نزیکە لە ململانێیان لەگەڵ کوفر: بە یەك گەیشتنی هەردوو ڕووبارەکە کە دەکەوێتە نێوان خەلیجی فارس و دەریای سوور واتە: دوورگەی عەرەبی، وە حیرڕە دەکەوێتە نەیسابوری ئێران و بەشێکی عێراق، وە شام کە ئوردن و سوریاو فەڵەستین دەگرێتەوە.. ئەمجا هێزی ئیسلام ڕووبەڕووی جەنگێکی گەورە دەبنەوە لەگەڵ دەجال و شەڕێکی جیهانی ڕوودەدات کە پێی دەوترێت: (الملحمة الكبرى).. لە دواییدا وڵاتی هیندستان ئازاد دەکرێت.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی ئازادکردنی وڵاتی هیندستانی پێ ڕاگەیاندووین، دەفەرموێ: (عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللَّهُ مِنَ النَّارِ، عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ، وَعِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[2].

واتە: دوو کۆمەڵ لە ئومەتەکەم خودای گەورە لە ئاگر پارێزراوی کردوون، کۆمەڵێك کە غەزای هیند دەکەن، وە کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا دەبن.

لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: (يفتح الله عليهم، حتى يأتوا بملوكهم مغللين بالسلاسل، يغفر الله ذنوبهم، فينصرفون حين ينصرفون فيجدون ابن مريم بالشام)[3].

---

(١) رواه الحاكم (٤/ ٤٧٨) والطبراني (٧/ ٢٤٢).

(٢) سنن النسائي (٦/ ٤٢) باب: غزوة الهند، برقم: (٣١٧٥).

(٣) الفتن، نعيم بن حماد (٣٩٧١٩)..

بۆیە وڵاتی هیندستان بۆ جاری دووەم ئازاد دەکرێت.. لەسەردەستی عیسای کوڕی مەریەم.

## هێزی دەجال:

ئەم هێزە پێکهاتووە لە جوولەکەو بەشێکی مونافیقەکان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (یخرج الدجال عدو الله ومعه جنود من الیهود)[١].

واتە: دوژمنی خوا دەجال دەردەچێت، وە کۆمەڵێك سەربازی جوولەکەی لەگەڵدایە.

جا ئەو سەربازانە چەکی کیمیاویان پێیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: (الدَّجَّالُ خَارِجٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مِنْ أَرْضٍ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ مَعَهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ)[٢].

واتە: دەجال لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە دێت لە خاکێك پێی دەگوترێت خوراسان، چەند کۆمەڵە قەومێکی لەگەڵ دایە دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانە.

مەبەستیش بەو دەم و چاو قەڵغانیانە ئەو قیناعەیە کە مرۆڤ دەپارێزێت لە چەکی کیمیاوی.. هەر چەندە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا شیکردنەوەی تریش هەڵدەگرێت هەروەکوو لە ڕابردوودا باسمان کرد..

ماوەیەك پێش ئێستا سەرچاوەیەکی زانستی ڕۆژئاوا ئەوەی دووپات کردەوە کە ئیسرائیل هەڵدەستێ بە دروستکردنی چەکی کیمیاوی و بەکتریا، ئەمەش بۆ بەربەرچ دانەوەی وڵاتی ئێران ئەگەر دەست هەڵنەگرێت لە هەڕەشەکانی[٣].. جگە لەوەش دەجال هێزێکی تریشی لەگەڵە ئەویش جادووگەرەکانن، پێغەمبەری

---

(١) موسوعة أطراف الحديث النبوي، (١١/ ٢٩٧) برقم: (٣٩٦٨٧) .

(٢) صحيح: رواه الترمذي وأحمد والحاكم عن أبي بكر. وصححه الحاكم وأقره الذهبي ، وصححه أحمد شاكر في تعليقه على المسند (١/١٥٩-١٦٩) والألباني في الصحيحة (١٢٢/٤ رقم: ١٥٩١).

(٣) جريدة صوت العرب، القاهرية (١٩٨٠/١٠/١٩)

بەرگی سێیەم

خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الدجال أول من يتبعه سبعون ألفا من اليهود .. ومعه سحرة اليهود يعملون العجائب ويراها الناس فيضلونهم بها)[1].

ئەمەو دەجال دەیەوێت پێش هەموو شوێنێك پەلاماری خاکی حیجاز بە تایبەتی (مەککەو مەدینە) بدات هەتا بە نیازی گڵاوی خۆی ئیسلام لە بنچینەوە ڕیشە کێش بکات و لەسەرچاوەکەیەوە وشکی بکات، بەڵام کاتێك دەگاتە ئەو خاکە پیرۆزەو دڵنیا دەبێت کە پەلەماردان و کاولکردنی ئەو دوو شارە لە تواناو دەسەڵاتی ئەودا نیەو خوای گەورە فریشتەکانی خۆی لە چوار دەوری ئەو دوو شارە داناوەو پاسەوانی دەکەن، هەروەکو پێشتر باسمان لێوەی کرد، جا بەناچاری ڕووی خۆی و سوپاکەی بەرەو وڵاتی شام وەردەچەخێنێت بە مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەو لەشکرە ئیسلامیەی کە لەوێ کۆبونەتەوە، پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَأْتِي الْمَسِيحُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، وَهِمَّتُهُ الْمَدِينَةُ حَتَّى يَنْزِلَ دُبُرَ أُحُدٍ، ثُمَّ تَصْرِفُ الْمَلَائِكَةُ وَجْهَهُ قِبَلَ الشَّامِ، وَهُنَالِكَ يَهْلِكُ)[2].

واتە: دەجال لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە دێت و مەبەستی یەکەمی شاری مەدینەیە، هەتا کاتێك دەگاتە پشت کێوی (ئوحد) فریشتەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەویش ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو شام، لەوێ تیا دەچێت، لەوێ تیا دەچێت.

بەڵێ... دەجال بەخۆی و سوپاکەیەوە ڕوو دەکاتە شام و لەگەڵ لەشکری ئیسلامیدا ڕوو بەڕووی یەك دەبنەوە، پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالًا، يَا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتُوا)[3].

واتە: دەجال لە ڕێگەیەکی نێوان شام و عێراق دەردەچێت، بەڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆتان ڕاگرن.

---

(١) تصريح الكشميري : (٤٨/ ٢٢١).

(٢) صحيح:مسند الإمام أحمد (١٥/ ٥٥٢) برقم: (٩٨٩٦). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٧).

بەڵێ.. لەو ڕۆژەدا تەنها لەشکری ئیسلامیە غیرەتی ڕووبەڕووبوونەوەی هەبێت لەگەڵ دەجالدا، هەر چەندە دەشزانن کە لەناوبردنی دەجال لە توانای ئەواندا نیە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوامان لێ دەکات خۆڕاگر بین، پاراستنی ئیسلام و بەرزکردنەوەی ئاڵای جیهادیش باجی خۆی دەوێت، بۆیە بە هەر نرخێك بێت ڕووبەڕووبوونەوە پێویستە، دەبێت بۆ دەجال بسەلمێنرێت کە تەنها ئیسلامە لە ڕوویدا دەوەستێت، وە هەر تەنها ئیسلامیشە کە فێڵ و جادوەکانی دەجال کاریان تێ ناکات و ناتوانێت لە خشتەیان بەرێت، لەو ڕۆژەدا خەڵکی دەبن بە سێ بەشەوە، ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: (تَفْتَرِقُونَ أَيُّهَا النَّاسُ لِخُرُوجِهِ ثَلَاثَ فِرَقٍ، فِرْقَةٌ تَتْبَعُهُ، وَفِرْقَةٌ تَلْحَقُ بِأَرْضِ آبَائِهَا بِمَنَابِتِ الشِّيحِ، وَفِرْقَةٌ تَأْخُذُ شَطَّ الْفُرَاتِ، يُقَاتِلُهُمْ وَيُقَاتِلُونَهُ، حَتَّى يَجْتَمِعَ الْمُؤْمِنُونَ بِغَرْبِ الشَّامِ، فَيَبْعَثُونَ إِلَيْهِ طَلِيعَةً مِنْهُمْ، فَارِسٌ عَلَى فَرَسٍ أَشْقَرَ أَوْ أَبْلَقَ، فَيُقْتَلُونَ فَلَا يَرْجِعُ مِنْهُمْ بَشَرٌ)[1].

واتە: لەکاتی دەرچونی دەجالدا خەڵکی دەبن بەسێ بەشەوە، بەشێکی شوێنی دەکەون، وەبەشێکی هەڵدێن بۆ ناوچەیەك کە گیاو لەوەڕگای تێدا بێت، وە بەشێکیشی کەناری عێراق دەگرن، دەجال شەڕیان لەگەڵ دەکات و ئەوانیش شەڕی لەگەڵ دەکەن، تا وای لێ دێت باوەڕداران لە گوندەکانی شام کۆدەبنەوەو هێزێکی گەورە ئاراستەی دەجال دەکەن، سوارێکیان تێدایە ئەسپەکەی ڕەش و سپیە، ئەو هێزە هەر هەمویان دەکوژرێن و یەك کەسیشیان لێ ناگەڕێتەوە.

بەڵێ... ئەوانە خۆیان شەهیدی هەڵدەبژێرن و ڕووبەڕووی هێزێك دەبنەوە کە دەزانن توانایان نیە بەسەریان.

پاشان (محەممەدی مەهدی) تەواوی هێزەکانی خۆی لەناو شاری (قودس) کۆدەکاتەوە چونکە دڵنیایە کە ئەو شارە وەکو مەککەو مەدینەیە بە دەقی فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارێزراوە لە دەجال، دەجالیش بەخۆی و سوپاکەیەوە گەمارۆی ئەو شارە دەدات و تەواوی ڕێگاکان دەگرێت هەتا

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٥٤١) برقم: (٨٥١٩). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

هیچ خواردن و یارمەتیەك نەگاتە دەستی موسڵمانان لەو شارەدا، بەو شێوەیە موسڵمانان بەگەمارۆکراوی دەمێننەوە هەتا وای لێ دێت برسێتی زۆریان بۆ دەهێنێت و بێ هێزو لاوازیان دەکات و نزیك فەوتان دەبنەوە بۆیە بڕیار دەدەن هەموو یەك دەست دەمەو بەیان هەڵمەت بەرنە سەر سوپاکەی دەجال، یان ئەوەیە خوای گەورە سەریان دەخات، یان وەکو برا موجاهیدەکانی پێشویان بە پلەی شەهادەت دەگەن.

پێشەوا حوزەیفەی یەمانی (ﷺ) سەبارەت بەو موسڵمانانەی گەمارۆ دراون دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..فَيَقُولُ بَعْضُ الْمُؤْمِنِينَ لِبَعْضٍ: مَا تَنْتَظِرُونَ أَنْ تَلْحَقُوا بِإِخْوَانِكُمْ فِي مَرْضَاةِ رَبِّكُمْ، مَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَضْلُ طَعَامٍ فَلْيَغْدُ بِهِ عَلَى أَخِيهِ، وَصَلُّوا حِينَ يَنْفَجِرُ الْفَجْرُ، وَعَجِّلُوا الصَّلَاةَ، ثُمَّ أَقْبِلُوا عَلَى عَدُوِّكُمْ)[(١)].

واتە: ..باوەڕدارەکان بەیەکتر دەڵێن چاوەڕێی چی دەکەن؟ با ئێمەش بە براکانی پێشومان بگەین و ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنین، هەر کەس کەمێك خۆراکی پێ ماوە با بەشی براکەی لێ بدات، لەگەڵ بەیانیدا نوێژەکانتان بکەن و پەلەی تێدا بکەن، پاشان هەڵمەت بەرنە سەر دوژمنەکانتان..

بەڵێ.. دوا بڕیار بڕیاری شەڕەو مەبەستیش تەنها بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوایەو خوای گەورەش وای ڕەخساندووە ئەو ڕۆژە کۆتایی چل ڕۆژەکەی دەسەڵات دارێتی دەجال دەبێت.

بەرگی سێیەم

---

(١) صحيح: المستدرك (٤/ ٥٣٦) برقم: (٨٥٠٧). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

## تیاچوونی دەجال

دەمەو بەیان لەشکری ئیسلامی گەمارۆ دراو لەناو شاری (قودس)دا خۆیان دەبەستن و پەیمانی مردن بەخوای خۆیان دەدەن پاشان ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن بۆ نوێژی بەیانی، قامەت دەکرێت (محەممەدی مەهدی) پێشەواو سەرکردەیان پێش دەکەوێت بۆ ئیمامەت کردن، ئا لەو کاتە پیرۆزەدا خوای گەورە دەروی خێری خۆی دەکاتەوەو بە هانای ئەو کۆمەڵە باوەڕدارانەوە دەچێت و سەربازێکی تایبەتی خۆی دادەبەزێنێتە سەر زەوی کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵە بۆ ئەو ڕۆژەی هەڵگرتووە، ئەو سەربازەش ئەو پێغەمبەرە خوا ویستەیە کە دەجال بە درۆو بوهتان ناوەکەی دزیوە بۆ خۆی و لاف و گەزافی خوایەتی پێ لێ دەدات لەسەر زەوی، ئەو پێغەمبەرەی کە هەر لەسەرەتاوە جولەکە پیلانی کوشتنیان داڕشت، بەڵام خوای گەورە پاراستی و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و دواتریش بەوەوە نەوەستان و ئاینەکەیان گۆڕی و لە ڕێگەی جولەکەیەکی داخ لە دڵەوە بەناوی (پۆلص) کە بە درۆ خۆی کرد بەمەسیحی ئینجیلیان شێواندو چەند ئینجیلێکی ساختەیان دروست کرد کە تیایدا (عیسا) بە خواو کوری خوا ناو دەبات و لە ڕێگەی (قسطنطین)ی پاشای ڕۆمەوە سەپاندیان بەسەر خەڵکیداو بە درێژایی چەندین سەدە خەڵکانێکی بێ شوماریان پێ گومڕاو سەر لێ شێواو کردو ئەمجارەشیان لە ڕێگەی دەجالەوە کەسایەتی ئەو پێغەمبەرە بۆ خۆیان دەدزن و لە پەنا ناوی پیرۆزی (مەسیح) دا هەرچی خوا پێی ناخۆشە ئەنجامی دەدەن، بەڵام خوای گەورە ئیرادەی وا دەبێت کە بۆ دواجار زەوی لە خراپەو فەسادی جولەکە پاك بکاتەوەو پەردە لەسەر گەورەترین درۆو بوختان لە مێژوودا هەڵماڵێت و ڕاستیەکان بۆ هەموو جیهان ڕوون بکاتەوە، ئەویش بە دابەزاندنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کەوا بۆ جاری دووەم لەسەر زەوی هەتا کۆتایی بەم گاڵتە جاڕیە بهێنێت و بەدەستی خۆی ئەو جادووکەرە بکوژێت کە بەناوی مەسیحەوە لافی خوایەتی لێ دەدات و بە هەموو خەڵکی جیهان بسەلمێنێت کە پێغەمبەر عیسا

(سەلامی خوای لێبێ) بەندەو پێغەمبەری خوایەو هەرگیز لە غەیری بەندایەتی کردن بۆ خوا هیچ بانگەشەیەکی تری نەکردووە[١].

بەڵێ... لەبەرە بەیانی ئەو ڕۆژەدا پێش ئەوەی موسڵمانان نوێژ دابەستن پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دادەبەزێتە ناو لەشکری موسڵمانان و بۆ جاری دووەم دەگەڕێتەوە سەر زەوی، پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەو ڕۆژەدا دەبێتە گەورەترین موژدەی خێر بۆ ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە تاکە کۆمەڵ بوون لەسەر زەویدا ملیان بۆ دەجال شۆڕ نەکردو لە ڕوویدا وەستان و پێیان دەگوت تۆ مەسیحی جادووگەری نەك مەسیحی ڕاستی، ئای دەبێت چ ساتە وەختێکی خۆش و پڕ بەرەکەت بێت کاتێك کە ئەو موسڵمانە برسی و هیلاك و ئابڵوقە دراوانە بە چاوی خۆیان دەبینن پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەکو پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە ناویان و دەبێت چ گڕو تینێك بە ئیمانی ئەو کۆمەڵە موجاهیدە ببەخشێت کاتێك کە بەچاوی خۆیان دەبینن فەرمودەو بەڵێنەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێتە دیو بە بینینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) شاد دەبن[٢].

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموی: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ؟)[٣].

واتە: دەبێت لەو کاتەدا کەیف و حاڵتان چۆن بێت کە (عیسای کوری مەریەم) لەناوتاندا دابەزێت و پێشەواو سەرکردەشتان لە خۆتانە.

بەڵێ.. پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە کاتێکدا دادەبەزێت کە (محەممەدی مەهدی) پێشەوای موسڵمانانەو وەستاوە پێش نوێژی بۆ لەشکرەکەی بکات.

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی، هاورێ محمد ئەمین، لا ٢١٣-٢١٤، چاپی پێنجەم ٢٠٠٥.

(٢) سەرچاوەی پێشوو لا ٢١٤-٢١٥..

(٣) صحيح مسلم(٤/٢٢٢١) كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، برقم: (٢٨٩٧).

**دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:**

لەوانەیە کەسانێك پرسیارێك بکەن و بڵێن: چۆن پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای محەممەدی مەهدی نوێژ دەکات لە نوێژی بەیانی؟

ئایا دەکرێت پێغەمبەرێك لە مەقامێکی بەرز بێت نوێژ لە دوای کەسێك بکات کە پێغەمبەر نەبێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم گومانە چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** نوێژکردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای محەممەدی مەهدی بە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جێگیر بووە، هەروەکو هەواڵی داوە پێمان ئەمەش لە ڕێگای وەحیەوە..

**دووەم:** تا گومان دروست نەبێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ئایینێکی نوێی هێنا بێت، یان بە جێگرەوە هاتبێت.. ئەگەر عیسای کوڕی مەریەم پێش بکەوێت ئەوا ئیشکال دروست دەبێت و لەوانەیە بوترێت: بە ئایینێکی نوێوە هاتووە یان وەکو جێگرەوە[1]..

**سێیەم:** هیچ گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کاملترە لە محەممەدی مەهدی، چونکە پێغەمبەری خودایە..تەنانەت لە شەرعیش دروستە پێش نوێژی کردنی مەفضول بەسەر فاضل[2].

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە غەزای تەبوك لە دوای پێشەوا عبدالرحمانی کوڕی عەوف نوێژی کردووە[3].. هەروەها لە کاتی نەخۆش کەوتنی نوێژی لە دوای پێشەوا ئەبوبەکر کردووە[4].

---

(١) رحلة الى الدار الآخرة، لا ٢٦٥.

(٢) الإذاعة لأشراط الساعة، لا ١٣٥.

(٣) رواه الشافعي في مسنده (١/ ٢٨ ـ ٢٩).

(٤) رواه الترمذي، كتاب: الصلاة برقم: (٣٦٢).

پێشەوا ئەبو حەسەنی ئەبدی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە دڵنیاییی مەهدی لەم ئوممەتە دێت و عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لەسەر بێ) لە دوای نوێژ دەکات[1].

پێشەوا ئیبنو جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێش نوێژی بکات، ئەو کات ئیشکال دروست دەبوو، لەوانەیە بیانگوتبا جێگرەوەیە یان شەرعێکی نوێ دەست پێدەکات، بۆیە دەبێتە مەئموم تا تۆزی ئەم گومانە نەمێنێت[2].

پێشەوا سیوتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە دڵنیایی نوێژی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای مەهدی دەبێت، کە ئەمە بە چەندین فەرموودەی ڕاست و دروست هاتووە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی.

ئینجا فریشتەکانی خودا پارێزگاری لە بەیتولمەقدیس دەکەن، پێشەوا کەعبی ئەحبار (ﷺ) دەڵێت: پیاوێك لە بەنی هاشم لە بەیتولمەقدیس دادەبەزێت ئەوانەی پارێزگاری لێدەکەن شەست و چوار هەزار کەسن، لەسەر هەر ڕێگایەکی بەیتولمەقدیس دوانزە هەزار فریشتەی لێیە[3].

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..وَإِمَامُهُمْ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَبَيْنَمَا إِمَامُهُمْ قَدْ تَقَدَّمَ يُصَلِّي بِهِمُ الصُّبْحَ، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِمْ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ الصُّبْحَ، فَرَجَعَ ذَلِكَ الْإِمَامُ يَنْكُصُ، يَمْشِي الْقَهْقَرَى، لِيَتَقَدَّمَ عِيسَى يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَيَضَعُ عِيسَى يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: تَقَدَّمْ فَصَلِّ، فَإِنَّهَا لَكَ أُقِيمَتْ، فَيُصَلِّي بِهِمْ إِمَامُهُمْ، فَإِذَا انْصَرَفَ، قَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ: افْتَحُوا الْبَابَ، فَيُفْتَحُ، وَوَرَاءَهُ الدَّجَّالُ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفَ يَهُودِيٍّ، كُلُّهُمْ ذُو سَيْفٍ مُحَلًّى وَسَاجٍ، فَإِذَا نَظَرَ إِلَيْهِ الدَّجَّالُ ذَابَ، كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ، وَيَنْطَلِقُ هَارِبًا، وَيَقُولُ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ: إِنَّ لِي فِيكَ ضَرْبَةً، لَنْ

---

(١) فتح المنعم (١/ ٣٢٩).

(٢) فتح الباري (٦/ ٤٩٤).

(٣) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ١١٢ .

تَسْبِقَنِي بِهَا، فَيُدْرِكُهُ عِنْدَ بَابِ اللُّدِّ الشَّرْقِيِّ، فَيَقْتُلُهُ، فَيَهْزِمُ اللَّهُ الْيَهُودَ، فَلَا يَبْقَى شَيْءٌ مِمَّا خَلَقَ اللَّهُ يَتَوَارَى بِهِ يَهُودِيٌّ إِلَّا أَنْطَقَ اللَّهُ ذَلِكَ الشَّيْءَ، لَا حَجَرَ، وَلَا شَجَرَ، وَلَا حَائِطَ، وَلَا دَابَّةَ، إِلَّا الْغَرْقَدَةَ، فَإِنَّهَا مِنْ شَجَرِهِمْ، لَا تَنْطِقُ، إِلَّا قَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ الْمُسْلِمَ هَذَا يَهُودِيٌّ، فَتَعَالَ اقْتُلْهُ..)[١].

واتە: .. پێشەواکەیان کابرایەکی پیاو چاکە، کاتێك کە پێش دەکەوێت بۆ ئەوەی پێش نوێژیان بۆ بکات بۆ نوێژی بەیانی، لەو بەرەبەیانیەدا عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) لەناویاندا دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکانیش دەکشێتەوە، دوا بەدوا دێتە دواوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێش بکەوێت و پێش نوێژیان بۆ بکات[٢]، پێغەمبەر عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) دەستی دەخاتە نێوان هەردوو شانیەوە پێی دەڵێت: خۆت پێش بکەوەو پێش نوێژیەکەمان بۆ بکە، چونکە قامەتەکە بۆ تۆ کراوە، پاشان پێشەواکەیان پێش نوێژیان بۆ دەکات، کاتێك کە لێ دەبنەوەو دەڕوات، پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەڵێت: دەرگای شارم بۆ بکەنەوە، ئەوانیش بۆی دەکەنەوە، کە سەیر دەکەن دەجال لە دوای دەرگاکە وەستاوەو هەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدایە[٣].

---

(١) ضعيف: سنن ابن ماجة (٥/ ١٩٧) كتاب: الفتن، باب: فتنة الدجال وخروج الدجال، برقم: (٤٠٧٦). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٢) شێخ ناصر لە (صحيح الجامع: (٦/٢٧٥) دا دەڵێ: کورتکردنەوەی تێدایەو مەبەست ئەوەیە بۆ بەیتولمقدیس بەڕێ دەکەوێ کە موسڵمانانی تێدا گەمارۆ دراون.

(٣) جوولەکە ئێستا ژمارەیان سی هەزار دەبێت لە ئێرانداو، لە سێ شاردا نیشتەجێ بوون کە تاران و هەمەدان و ئەسفەهانە، هەرچەند جولەکەکانی جیهان فشاری زۆری خستە سەریان بۆ ئەوەی بچنە فەلەستین ، ئەوان تەسلیم نەبوون و کەمیان لێ چوو بۆ ئیسرائیل .

ئەصفەهان دەکەوێتە ناوەڕاستی ئێرانەوەو وادانێ لەو سی هەزار جوولەکەیەی ئێران دە هەزاریان لەو شارەدایە زۆر (منگقیە) تا قیامەت ئەوەندە زۆر ببن کە هەفتا هەزاریان شوێن دەجال بکەوێت، ئینجا ئەو وەسفە وردەی حەزرەت کە باسی عەبای سەر شانیان دەکات، ئێستا بە فیعلی عادەتیانە ئەو عەباو شاڵە ئەدەن بەشانیاندا ..

هەر هەموویان خاوەنی شمشێری ڕازاوەو قەڵغانن، پاشان كە دەجال چاوی بە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەكەوێت دەتوێتەوە هەروەكو چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، پاشان هەڵدێت، ئەویش لە ئاستی دەرگای (لد)[١] ی خۆرهەڵات دەیگرێتەوەو دەیكوژێت ئەنجا خوای گەورە جولەكە دەبەزێنێت، بە جۆرێك كە هیچ دروست كراوێكی خوا نامێنێت جولەكە خۆی لە پەنادا حەشار بدات و خوای گەورەش نەیهێنێتە قسە كردن، نەبەردو نەدارو نە ئاژەڵ جگە لە داری تورترِك[٢] كە لە داری جولەكەیەو قسە ناكات، دەڵێت: ئەی بەندەی موسڵمانی خوا، ئا ئەمە جولەكەیە وەرە بیكوژە.

وە ئەگەر وازی لێ هێنابایە، هەر لەوێ دەتوایەوەو لەناو دەچوو، بەڵام ویستی خوای گەورە وایە كە دەبێت بە دەستی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) بكوژرێت و دواتر خوێنەكەییان پێشان دەدات بە نێزەكەیەوە، تاكو بۆیان دەربكەوێت كە ئەو كەسەی لافی ئەوەی لێ دەدا كە خوای خەڵكییە! جگە لە دروستكراوێكی بێهێزی خوا چیدیكە نەبوو..

ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژی هەینی ڕوودەدات لە بەرەبەیان لە كاتی نوێژی بەیانی[٣].

بۆیە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) وازی لە دەجال نەهێناوە تا كوشتویەتی و لێی نەگەڕاوە بۆ خۆی بمرێ، تاكو كۆتایی بە ئەفسانەی ئەو دروستكراوەو ئاشوبەكەی بێنێ، چونكە ئەگەر خەڵك كوشتن و مردنی ببینن، دەزانن باوەڕ دێنن كە بەندەیەكی لاوازی بێ دەسەڵاتەو بانگەشەی پوچ و بەتاڵ و درۆیە.

---

(١) (اللد) شارێكی ناسراوە لە فەلەستین لە نزیك شاری (الرملە)، هەندێكیش دەڵێن: شوێنێكە لە دیمەشقی سوریای ئێستا. معجم البلدان (٥/ ١٦٧).

(٢) (توترِك): جۆرە دارێكی دڕكاوی ناسراوە لە بەیتولمەقدیس و هەرلەوێ جولەكە دەكوژرێن. (النووی فی شرحە علی مسلم) (١٨/٤٥).

(٣) عقد الدرر في أخبار المهدي المنتظر، لا ١٦٣.

جا لە هەمووی سەیرتر دەرگای (لد) جێگایەکی ناسراوە لە فەلەستین؟ ئێستا سەربازگەی ئیسرائیلی لێیە[١].

بەڵام پرسیارێك بۆچی دەجال هەردێت بەرەو دەرگای (اللد) لود؟

لە وەڵامی ئەوە پرسیارە دەڵێم: چونکە جولەکەکان لەبەر دەرگاکە خۆیان توندوتۆڵ کردووە بۆ جەنگ.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ، فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللهِ هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي، فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ، إِلَّا الْغَرْقَدَ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ)[٢].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا موسڵمانان شەڕی جولەکەکان دەکەن و دەیانکوژن، تا وای لێ دێ جولەکە لەپەنای بەردو داران خۆ حەشار دەدەن، بەردو دارەکەش دەڵێ: ئەی موسڵمان ئەی بەندەی خوا، ئەوە جولەکەیە لە پشتم جا وەرە بیکوژە، جگە لە داری توترك چونکە لە درەختی جولەکەکانە.

شیخ حەمود تویجەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: قسەکردنی گیاندارو بێ گیان و شیراك و فەخذ وەکو دارو بەردی یەهودیەکان قسە دەکەن.. ئەمەش حەقیقەتە مەجازی تێدا نیە[٣].

وە لە دوای ساڵی (١٩٦٧) تا ئێستا زیاتر لە (١٠) بلیۆن درەختیان لە داری غەرقەد (توترك) ڕواندووە، ئەگەر سەیری دەستەواژەی ئەم فەرموودەیە بکەین، پێغەمبەری نازدارمان وشەیەك بەکار دەهێنێت کە ئەویش (يُقَاتِلَ) بە کاری ڕانەبردوو، وە ڕانەبردووش بۆ نوێبوونەوەو بەردەوامیە، واتە: ئەوان بەردەوام شەڕ بە موسڵمانان دەفرۆشن.

---

(١) الرقائق للعريفي، لا٣٩٨.

(٢) صحيح البخاري، كتاب الجهاد، باب قتال اليهود فتح الباري: (١٠٣/٦) ومسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، برقم: (٤٩٢٢) (٢٢٣٩/٤).

(٣) إتحاف الجماعة، (١/ ٤١١).

بەندە دوای توێژینەوەیەکی چڕوپڕ وای بۆ دەچێت کە ئەم فەرمووده ئاماژەیە بۆ ساڵانی ڕابردووی (١٩٤٨ - ١٩٦٧ - ١٩٧٣).. وە تەنها جەنگی کۆتایی ماوە لە نێوان موسڵمانان و جولەکەکان هەتا ئازادکردنی بەیت ولمقەدیس، ئەو کات دارو بەرد بۆمان دێنە وەڵام، ئەگەر سەیری مێژوو بکەین لە کاتی خوێندنەوەماندا ئەوەمان بۆ بە دەردەکەوێت کە چۆن و بە بەردەوامی شەڕیان بە موسڵمانان فرۆشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هیچیاندا سەرکەوتوو نەبوون، بە نمونە: شەری فەڵەستین زۆر دژایەتیان لەگەڵدا کرا تەنانەت زۆربەی عەرەبەکان پشتی ئیسرائیلیان گرت، بەڵام خوای گەورە سەرکەوتنی بە موسڵمانان بەخشی، وە کۆتایی هاتنیان لەسەر دەستی موسڵمانان دەبێت، دوای وردبوونەوەیەکی زۆرم لەسەر ئەو فەرموودە: بەندە وای بۆ دەچێت کە خاکی بەیتولمەقدیس بە دارو بەردەکانیەوە ڕقیان لە جولەکە دەبێتەوە لەسەر ئەو کارانەی کە ئەنجامیانداوە لەگەڵ موسڵمانان، ئەمەش شتێکی سەیر نییە چونکە لەو سەردەم دارو بەرد دێتە وەڵام بۆ بڕوادارانی ڕاستەقینە، وە جێگای سەر سوڕمان نییە کە دارو بەرد بۆ موسڵمانان بێتە قسەکردن، ئەگەر نمونەیەکی قورئان بهێنینەوە خوای گەورە دەربارەی گەلی فیرعەون دەفەرموێت: [فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ][1]. واتە: جا نە ئاسمان و نە زەوی نەگریا بۆیان وە مۆڵەتیشیان پێ نەدرا.

یان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أحد جبل يحبنا ونحبه)[2]. واتە: ئوحد چیایەکە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت؟

مادام.. ئاسمان و زەوی بگری، وە چیاکان خۆشیان بوێت یان ڕقیان لێی بێت، کەواتە سەرسوڕمان نییە کە دارو بەرد ڕقیان لە جولەکە ببێتەوەو ببنە بەڵگە بۆ موسڵمانان.

---

(١) سورة الدخان، الآية: (٢٩).

(٢) صحيح البخاري، برقم: (٤١٦٠).

لە کۆتایی بونەوەر بە نیسبەت موسڵمانانیش هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان جولەکەو صەهیۆنیەت، چونکە زۆربەی جولەکە باوەڕیان وایە کە گەلێکی هەڵبژێردراون لەسەر ئاستی بونەوەر.

تەنانەت تیودور هرتزل لە کۆنگرەیەکی صەهیۆنی لە شاری بال لە سویسرا لە ساڵی ١٨٩٧ع گوتی: گەڕانەوە بۆ صەهیۆنیەت پێویستره بە پێش بخرێت لە گەڕانەوەی جولەکەکان.

ئیزمار کە یەکەم سەرۆکی دامەزرێنەری صەهیۆنەتە دەڵێت: جولەکەو صەهیۆنیەت دوو شتی لە یەکتری بەستراوەن، ناکرێ لەناوبردنی صەهیۆنیەت بەبێ لەناوبردنی جولەکە بێت[1].

پێشەوا نەهیکی کوڕی صورەیم (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَزَالُونَ تُقَاتِلُونَ الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُقَاتِلَ بَقِيَّتُكُمُ الدَّجَّالَ بِالْأُرْدُنِّ عَلَى النَّهَرِ أَنْتُمْ شَرْقِيُّهُ وَهُمْ غَرْبِيُّهُ)[2].

واتە: شەڕ لەگەڵ هاوبەش پەیداکارەکان دەکەن، پاشماوەتانیش لەگەڵ دەجالدا شەڕ دەکەن لەسەر ڕووباری ئوردن، ئێوە لە ڕۆژ هەڵاتەکەی و ئەوان لە ڕۆژئاواکەی.

نوهەیك دەڵێت: لەو کاتەدا نەمدەزانی ئوردن لە کوێیە.

مەبەستیش لەو دەریا جیاکەرەوەیە لە نێوان فەلەستینی داگیرکراوو ئوردندا.

بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە بەشێك لە موسڵمانان شەڕ لەگەڵ دەجالدا دەکەن لە ڕۆژهەڵاتی ئوردن، لە کاتێکدا زۆربەی موسڵمانان لەو سەردەم لە بەیت و لمەقدیسن.

دکتۆر محەمەد عورەیفی (خوای گەورە بیپارێزێ) دەڵێت: ڕاپۆرتێکی وەرگێڕدراوم خوێندەوە یەکێ لە گۆڤارەکانی جولەکەکان کە لە تەلئەبیب

---

(١) المهدي، عادل زکي، لا ١٦٠.

(٢) مسند الشاميين، للطبراني (١/ ٣٦٨) برقم: (٦٣٨).

دەردەچێت، سەربازیەکان لەو ڕاپۆرتە دەیانگوت: زۆربەی سەربازە جولەکەکان حاڵەتی خۆیان جێبەجێ دەکەن لەناو دەبابە وە دەیخەنە ناو کیسێکەوە، لە ترسی ئەوەی یەکێك نەیەت بیانکوژێت، لەگەڵ ئەوەشدا فەلەستینیەکان چەکیان بەردە، هەروەکو بەچاوی خۆمان دەیبینین، برایەکانیشمان دێن بەرامبەریان رادەوەستن و دەجەنگن لە پێناو خوا، ئەمەش یەکێکە لە موژدەکان، کە ئەم چەکانە هەمووی لەناو دەچن و هیچ ئاسەوارێکیشیان نامێنێ، زۆر کەس لەوانەیە ڕەخنەمان لێ بگرێت و پێمان بڵێت ئەمە چۆن دەبێت؟

ئەگەر تۆ بتەوێت نەفت لە ژێر زەویەوە دەربێنیت پێویستە بگەیتە جێگای مەبەست، پێنج هەتا بیست هەزار مەتر پێویست دەکات بۆ ئەوەی نەفتەکە دەربێنیت، وە دەبێت ئامێرێکی دیاریکراویشت هەبێ هەتا دەست بە دەرهێنانی نەفتەکە بکەیت، ئێمە وادابنێین ئەو نەفتە ناگەڕێتەوە لە پاش پێنج هەزار مەتر، بەڵکو پێویست بەوە دەکات لە پاش پێنج سەد هەزار مەتر (٥٠٠کم) دەری بێنیت، ئایا دەگەیتە نیو ملیۆن مەتر.

خوای گەورە لە توانایدا هەیە هەموو چەکەکان لە کار بخات، پێغەمبەریش ئاگاداری کردووینەتەوە کە چەکەکان هەمووی لەکار دەخرێن و شیرو تیرو ئەسپ لەو سەردەمی دێتە ئاراوە، کافرەکانیش ناتوانن خۆیان پارێزگاری بکەن لە سەردەمی دەجالیش بێباوەڕەکان هیچیان نیە خۆیانی تێدا بشارنەوە تەنها بەرد نەبێ، پێغەمبەریش نەیفەرموو: (يختبئون وراء أسلحتهم) بەڵکو فەرمووی: (وراء الحجر والشجر)[1].

لە ڕیوایەتێکی تر پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ، يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ، إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (ﷺ)، فَأَمَّهُمْ، فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ اللهِ، ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ، فَلَوْ تَرَكَهُ لَانْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ، وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللهُ بِيَدِهِ، فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِي حَرْبَتِهِ)[2].

---

(١) الرقائق، للعريفي، لا ٤٠٢.

(٢) صحيح مسلم (٢٢٢١/٤) باب: في فتح القسطنطنية، برقم: (٢٨٩٧).

واتە: لە کاتێکدا کە لەشکری ئیسلامی سەر گەرمی خۆ سازا کردنن بۆ شەڕ ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن و قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، پێغەمبەر عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) لەناویاندا دادەبەزێت و پێشیان دەکەوێت بۆ جەنگ، کاتێك کە دوژمنی خوا دەیبینێت (مەبەستی پێی دەجالە) دەتوێتەوە هەروەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، ئەگەر لێی بگەڕایە بە تەواوی دەتوایەوە تا لەناو دەچوو، بەڵام خوای گەورە بە دەستی ئەو دەیکوژێت و پاشان خوێنەکەشیان پیشان دەدات.

بەم جۆرە درۆو بوختانی دەجال ئاشکرا دەبێت کە خوا نەبوەو بەڵکو لەبەر چاوی هەمویاندا دەکوژرێت و وەك باقی مرۆڤەکانی تر خوێنی لێ دەڕژێت و دەمرێت، وە جولەکەکان هەتا هەتایە خۆیان و نیازە گڵاوەکانیان لە گۆڕ دەنرێن و زەویان لێ پاك دەکرێتەوەو لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەڵدەدرێتەوە کە تیایدا ئیسلام سەروەرەو پێغەمبەر عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) پێشەواو ڕابەرە[1].

ئەوەی ئەمرۆ لەم شارستانیەتەی سەر زەوی دەبینین وەکو دەبابەو تەیارەو کارەبا.. هتد، هەموو کاتێکی دیاریکراوی هەیە و کۆتایی پێ دێت، هەر چەندە بە هێزیش بن، بۆیە ژیانی پێشوو دێتە ئاراوە کە شمشێرو تیروکەوان و ڕمە.. هتد، تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەی سەردەمی یەئجوج و مەئجوج ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەوان تیرەکانیان بەرەو ئاسمان هەڵدەدەن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ أَنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِي ذَرَارِيهِمْ، فَرَفَضُوا مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَيَقْبِلُونَ، فَيَبْعَثُونَ عَشَرَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): إِنِّي لَأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ، وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ، وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ، هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ يَوْمَئِذٍ)[2].

واتە: لە کاتێکدا ئەمانە لەم حاڵە دەبن گوێیان لێدەبێت وە بەڵایەکی لەوە گەورەتر دامێن گیریان بووە کاتێ بانگکەر دێتە لایان و هاواری لێدەکات دەجال لە دوای

---

(١) الرقائق، للعريفي، لا ٣٩٩.

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٣) باب: إقبال الروم وكثرة القتل، برقم: (٢٨٩٩).

خۆیانەوە بەربۆتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە، ئەوانیش چیان پێیە هەر هەمووی فڕێ دەدەن و ڕوو دەکەنە ماڵەوە، دە سوار چاك لە پێش خۆیانەوە دەنێرن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: من زۆر چاك ناوی خۆیان و باوکیان و ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم ئەوان لەو ڕۆژەدا چاکترین سواری سەر زەوین..

پاشان بەرەو چیای ئیلیا دەچن لە (بەیتولمەقدیس)، موسڵمانەکان گەمارۆیەکی زۆر دەدرێن، وە ئەم عیصابەیەی موسڵمانان لە (بیتولمقەدیس) دەبێت، دەیانەوێ لە شام بەرەو (بیتولمقدیس) بڕۆن، بەڵام محەممەدی مەهدی دەڵێت: بۆچی چاوەڕوانی ئەم طاغیە دەکەن لە کوشتنی، ئەوانیش پشت بەخوا دەبەستن و دەرگایان بۆ والا دەکرێ و نەخشەی چۆنیەتی کوشتنی دەجال دەکێشن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: کە بەیانی دێت عیسای کوڕی مەریەمیان لەگەڵە، عیسا دەبێتە مەئموم و لەدوای مەهدی نوێژ دەکات، کاتێ مهدی دەڵێت: سمع الله لمن حمده، مەئموومەکان دەڵێن: ربنا ولك الحمد، تەنها عیسای کوڕی مەریەم دەڵێت: (سمع الله لمن حمده قتل الله المسیح الدجال وظهر المسلمون).

پێشەوا ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: دەجال لە کاتێك دێ بۆ نێو خەڵك کە ئایین زۆر بێهێز بووەو خەڵك پشتی لە زانستی شەرعی کردووە پاشان عیسای کوری مەریەم دێتە خوارەوە لە ئاسمان و لەبەرە بەیاندا بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی خەڵکینە چ شتێك ڕێگاتان لێ دەگرێت لەوەی کە دەرچن بۆ لەناوبردنی ئەو دەجالە درۆزنە، جا خەڵك دەڵێن: ئەمە پیاوێکی جنە جا بۆی دەردەچن کە دەبینن ئەوە پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەمە.

جا قامەتی نوێژ دەکرێ و پێی دەگوترێ پێش کەوە ئەی پێغەمبەری خوا! ئەویش دەڵێت: با پێشەواکەتان پێش بکەوێ، جا نوێژیان پێ دەکات وە کاتێ کە نوێژی بەیانی کرا بۆی دەردەچن، دەڵێ: کاتێ کە دەجال دەبینێ دەتوێتەوە[1].

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢٤/ ٨٥ ـ ٨٦).

بەرگی سێیەم

## کۆتایی بابەت سەبارەت بە دەجال

پێش کۆتایی هێنان سەبارەت بە هاتنی دەجال پێنج ئامۆژگاری گرنگ فێردەبین:

**یەکەم:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا هُوَ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ عِنْدِي مِنَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ؟ قَالَ: قُلْنَا: بَلَى، فَقَالَ: الشِّرْكُ الْخَفِيُّ، أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ يُصَلِّي، فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ، لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ رَجُلٍ)[١].

ئەمیش شیرکی بچوکە کە ڕیایە، پیاو هەڵدەستێت نوێژێکی جوان دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی ببینێت و سەیری بکات.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الأَئِمَّةُ الْمُضِلُّونَ)[٢].

واتە: ترسناکترە لە دەجال، ئەمەش ئاشوبی پێشەوا گومڕاکانە کە زەرەریان زیاترە لە زەرەری دەجال.

ئەمڕۆ چەندین فەتوا دەردەچێت کە حەرام حەڵاڵ دەکرێت و حەڵاڵ حەرام دەکرێ و خەڵکی بە بیدعەچی دادەنێن، جا موشکیلەکە ئەوەیە ئەو کەسەی کە حەرامی حەڵاڵ کردووەو حەڵاڵی حەرام کردووە پێشەوایانی ئیسلامن، بۆچی ناونراون پێشەوا؟ چونکە پێشەنگە بۆ خەڵکی خەڵکی بەدواییدا دەکەوێ ئەوانەش پێشەوا گومڕاکانن کە ئەمەش ترسناکترین حاڵەتە.

بۆیە هاوبەش بڕیاردان مەسەلەیەکی ترسناکە، ئەویش بریتیە لەوەی مرۆڤ کردەوەیەکی چاکە بکات مەبەستی تەماشکردن و سوپاسکردنی خەڵکی بێت،

---

(١) سنن ابن ماجة (٢/ ١٤٠٦) باب: الرياء والسمعة، برقم: (٤٢٠٤). قال الألباني: إسناده حسن.

(٢) مسند الإمام أحمد (٦/ ٤٤١) برقم: (٢٧٥٢٥) قال شعيب الأرناؤوط: صحيح لغيره.

ئەوە هاوبەش دانانی نادیارە کە کردەوەی مرۆڤ پوچەڵ دەکاتەوە، وە لە ڕۆژی دوایی پێیان دەوترێ: بچنە لای ئەوانەی کە کارەکانتان بۆ ئاراستە دەکردن..

**سێیەم:** پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّامِ وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالًا، يَا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتُوا)[1].

واتە: دەجال لە ڕێگەیەکی نێوان شام و عێراق دەردەچێت، بەڕاست و چەپدا خراپەکاری دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆتان ڕاگرن.

ئەمەش واتای ئەوە دەدات کە پێویست ناکات ڕەشبین بین لەکاتی هاتنی ئاشوب.

**چوارەم:** شەڕو کوشتاری کۆتایی بونەوەر بە چەکی سپیە، مەبەست لە چەکی سپی چیە؟ شیرو تیرە[2].

**سەرنج:** لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: لەبەرگی دووەم ئاماژە بەوە دەکەیت کە لە کۆتایی بونەوەر ژیان وەکو خۆی ئاسایی ببێتەوەو ئەلیکترۆنیات هەمووی لەناو بچێت و چەك و تیرو ڕم ببێتە ئاراوە، وە لەبەرگی سێیەم باسی چەکی کیمایی و چەکی لێزەری بکەی؟ چۆن بتوانین جەمع و تەوفیق لە نێوان هەردوولا بکەین؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم: بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ئایا ژیان وەکو سەردەمانی کۆن دەبێت یان سەردەمی چەکی پێشکەوتوو ئەوە خوای گەورە خۆی زاناترە..

بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر نەگەیشتە دەرەنجامێکی یەکلاکەرەوە چونکە هەردوو حاڵەتەکان واریدە.. زانایانی سەردەم دەڵێن: چەکە پێشکەوتووەکان و ئەلیکترۆنیات هەموویان لەناو دەچن ، و فەرموودەکانیش ئەوە دەسەلمێنن کە شیرو تیرو ڕم دێتە کایەوە..

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٧).

(٢) الرقائق للعريفي، لا ٤٠١.

لە کاتێکدا فەرموودەی تر باسی قیناع دەکات لە کاتێکدا لە جەنگی جیهانی سێیەم بەکار دێت، کە ئەوەش ئاماژەیە بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.. هتد.

کەواتە: بڕیاری یەکلایی لەو بابەتەدا کەمێك ئەستەمە، خودای گەورە شارەزاترە لەسەر ئەم ڕووداوانەی کە ڕوودەدەن.

ئەگەر سەرنج بدەینە ژیانی ئەمڕۆ دەبینین بێباوەڕەکان لە کۆتایی ئەم سەردەمە دەیانەوێت زاڵ بن بەسەر موسڵمانەکان لە پێشکەوتنی چەك و کوشتار وەکو دەبابەو صەواریخ و...، بەڵام ئەگەر بێباوەڕەکان هەرچەندە بگەنە پێشکەوتن بەڵام موسڵمانەکە زیاتر خۆڕاگرتر دەبێت، باشترین بەڵگەشمان ئەگەر جولەکەکان لەبەرامبەر فەلەستینەکان بوەستن زۆر دەترسن، لە کاتێکدا فەلەستینیەکان تەنها بەردیان پێیە ئینجا ئەوان دڵە ڕاوکێیان زیاترە.

# دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)

لە دوای دەرچوونی دەجال خوای گەورە پێغەمبەر عیسا دەنێرێ، جا دادەبەزێتە سەر زەوی، لەلای منارە سپیەکەی ڕۆژهەڵاتی سوریا دادەبەزێ لە شام، کە خۆی داپۆشیوە بە دوو بەرگی بۆیە کراودا، دەستەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە ، دەم و چاوی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ دەتکێ، وە هاتنە خوارەوەکەشی لە نێو ئەو کۆمەڵە موسڵمانەدایە کە لەسەر هەق و باوەڕ شەڕ دەکەن، جا کۆدەبنەوە بۆ شەڕی دەجال..

سەبارەت بە شوێن و چۆنیەتی دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..إِذْ بَعَثَ اللهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فَلَا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدّ، فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ..)[١].

واتە: لەو کاتەدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دەنێرێت، ئەو لەلای منارە سپیەکەی خۆرهەڵاتی دیمشق دادەبەزێت، دوو پۆشاکی لەبەردایە کە بە زەعفەران ڕەنگ کراوە، هەردوو شانی خستۆتە سەر باڵی دوو فریشتە، کە سەری دادەنەوێت ئاوی لێ دەتکێت، کە بەرزیشی دەکاتەوە، وەك دەنکە مرواری پیایدا شۆڕ دەبێتەوە، هیچ کافرێك نیە بۆنی هەناسەی بکات و نەمرێت، وە هەناسەکەشی هەتا چاوی بڕ دەکات دەڕوات،

---

(١) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال وصفته، برقم: (٢٩٣٧).

شوێن دەجال دەکەوێت، هەتا لە دەرگای (لد)[1] کە شوێنێکە لە نێوان دیمەشق و (بیت المقدس) دەیگرێت و دەیکوژێت، پاشان خەڵکانێك دێن بۆ لای پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلەو پایەی بەهەشت دەکات.

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونەکە کە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) لە دیمەشقی پایتەختی سوریا دادەبەزێت.

**ڕووداوی موعجیزەیەك:**

ئەو منارە سپیەش کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی دەکات لە سەردەمی خۆیدا نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ وەکو هاتنە دی موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو منارەیە دروست کراوەو دەکەوێتە تەنیشت مزگەوتی (ئومەوی) لە دیمشق.

پێشەوا ئیبنو کەثیر دەڵێ: لەسەردەمی مندا لە ساڵی ٧٤١کۆچی موسڵمانان ئەو منارەیان نوژەن کردەوە لەبەردی سپیدا، وە نۆژەنکردنەوەکەش لەسەر سەرمایەی گاورەکان بوو کە ئاگریان تێبەردابوو، بۆیە ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە خوای گەورە ویستی وابوو کە ئەم منارە چاك بکرێتەوە بە پارەی گاورەکان تاکو عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دادەبەزێ، جا بەرزا دەکوژێت و صەلیبەکان دەشکێنێ و سەرانە لەکەس وەرناگرێت[2].

دکتور محەممەد عورەیفی (خوای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت: لە ساڵی (١٤١٢ ك ـ ١٩٩٢ ع) سەردانی دیمەشقم کردو چوومە لای منارە سپیەکە لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شارە، لەوێش هەر بەو منارە دەناسرێت کە پێغەمبەر عیسا

---

(١) جێگەیەکی ناسراوە لە فەلەستینی ئەمڕۆ جولەکەکان بنکەیەکی سەربازییان تێدا دروست کردووە. (معجم البلدان (٥/ ١٥)).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٤٥).

(سەلامی خوای لێ بێ) دادەبەزێت، بۆیە وێنەم گرت، جێگەکەشی دەکەوێتە دەروازەی بازاڕێك نەك لەسەر مزگەوتێك بێت!! ئەو گەڕەکەش کە منارەکەی تێدایە زۆربەی دانیشتووانی گاورن، ئیتر ئایا عیسا لەسەر ئەم منارەیە دادەبەزێت، یان لەسەر منارەیەکی تر، خوای گەورە چاکتر دەزانێت.

دەگێڕنەوە کە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر یەکێك لە منارەکانی (مزگەوتی ئومەوی) دەبێت.. خوای گەورەش زاناترە[١].

منیش لێرەدا بە دڵنیایی هیچ بۆچوونێك هەڵنابژێرم لە خۆمەوە.

هەروەها لە نزیك شاری (قودس)یشەوە شارێك هەیە بەناوی (اللد) کە هەندێك لە زانایان پێیان وایە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەوێ دەجال دەکوژێت، بەڵام فەرمودە (صەحیح)ەکان زیاتر ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو ڕووداوە لە شاری (دیمشق)دا ڕوو دەدات.

لە ریوایەتێکی تردا ئەم باسە بە وردی هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يَأْتِي سِبَاخَ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَهَا، فَتَنْتَفِضُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا نَفْضَةً أَوْ نَفْضَتَيْنِ، وَهِيَ الزَّلْزَلَةُ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ مُنَافِقٍ وَمُنَافِقَةٍ، ثُمَّ يُوَلِّي الدَّجَّالُ قِبَلَ الشَّامِ، حَتَّى يَأْتِيَ بَعْضَ جِبَالِ الشَّامِ فَيُحَاصِرَهُمْ، وَبَقِيَّةُ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُعْتَصِمُونَ بِذِرْوَةِ جَبَلٍ مِنْ جِبَالِ الشَّامِ، فَيُحَاصِرُهُمُ الدَّجَّالُ نَازِلًا بِأَصْلِهِ، حَتَّى إِذَا طَالَ عَلَيْهِمُ الْبَلَاءُ، قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ـ مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ، حَتَّى مَتَى أَنْتُمْ هَكَذَا وَعَدُوُّ اللَّهِ نَازِلٌ بِأَرْضِكُمْ هَكَذَا، هَلْ أَنْتُمْ إِلَّا بَيْنَ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ، بَيْنَ أَنْ يَسْتَشْهِدَكُمُ اللَّهُ أَوْ يُظْهِرَكُمْ، فَيُبَايِعُونَ عَلَى الْمَوْتِ بَيْعَةً يَعْلَمُ اللَّهُ أَنَّهَا الصِّدْقُ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ تَأْخُذُهُمْ ظُلْمَةٌ لَا يُبْصِرُ امْرُؤٌ فِيهَا كَفَّهُ، قَالَ: فَيَنْزِلُ ابْنُ مَرْيَمَ فَيَحْسِرُ عَنِ أَبْصَارِهِمْ، وَبَيْنَ أَظْهُرِهِمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ لَأْمَتُهُ يَقُولُونَ: مَنْ أَنْتَ يَا عَبْدَ اللَّهِ؟ فَيَقُولُ: أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، وَرُوحُهُ، وَكَلِمَتُهُ، عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ، اخْتَارُوا بَيْنَ إِحْدَى ثَلَاثٍ: بَيْنَ أَنْ يَبْعَثَ اللَّهُ عَلَى الدَّجَّالِ وَجُنُودِهِ عَذَابًا مِنَ السَّمَاءِ، أَوْ يَخْسِفَ بِهِمُ الْأَرْضَ، أَوْ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ سِلَاحَكُمْ، وَيَكُفَّ سِلَاحَهُمْ عَنْكُمْ، فَيَقُولُونَ: هَذِهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَشْفَى لِصُدُورِنَا وَلِأَنْفُسِنَا، فَيَوْمَئِذٍ تَرَى الْيَهُودِيَّ الْعَظِيمَ الطَّوِيلَ، الْأَكُولَ

بەرگی سێیەم

---

(١) نهاية العالم، (لا ٤١٨).

الشَّرُوبَ، لَا تُقِلُّ يَدُهُ سَيْفَهُ مِنَ الرِّعْدَةِ، فَيَقُومُونَ إِلَيْهِمْ فيُسَلَّطُونَ عَلَيْهِمْ، وَيَذُوبُ الدَّجَّالُ حِينَ يَرَى ابْنَ مَرْيَمَ كَمَا يَذُوبُ الرَّصَاصُ، حَتَّى يَأْتِيَهُ أَوْ يُدْرِكَهُ عِيسَى فَيَقْتُلَهُ)[1].

واته: دێته لای زەویەکی شۆرەکات لە لای مەدینە، قەدەغەیە لەسەری بچێته ژوورەوە، ئینجا مەدینە جارێك یان دووجار دەلەرزێتەوەو هەموو مونافیقێکی پیاوو ژن دەردەکات لە خۆی، دەجال ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو شام تاکو دەگاتە هەندێ لە چیاکانی شام و ئابلۆقەیان دەدات و پاشماوەی موسڵمانانیش لە لوتکەی شاخێکن لە شاخەکانی شام، دەجال گەمارۆیان دەدات و لە خوارەوەی چیاکە دادەبەزێت، کاتێك کارەساتی موسڵمانان سەخت دەبێتەوە، پیاوێك لە موسڵمانان دەڵێت: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان تاکو کەی بەم شێوە دەمێننەوە؟! دوژمنی خوا ئاوها لە خاکتاندایە؟ ئایا ئێوە لە نێوان دوو چاکەدا نین؟ شەهیدی و سەرکەوتن، ئیتر بەیعەت دەدەن لەسەر مردن، خواش دەزانێت ئەوان ڕاست دەکەن، ئینجا تاریکیەکیان بەسەردا دێت دەستی خۆیان نابینن، لەو کاتەدا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دادەبەزێت و دەبینن پیاوێك لە نێویاندایە جلی شەڕی پۆشیوە، دەڵێن: تۆ کێی ئەی بەندەی خوا؟ دەفەرموێت: من بەندەو پێغەمبەری خوام، عیسای کوری مەریەمم، یەکێك لە سێ شت هەڵبژێرن: خوای گەورە سزایەك بنێرێتە سەر دەجال و سەربازەکانی لە ئاسمانەوە، یان لەناخی زەویاندا ببات، یان چەکەکانی ئێوە زاڵ بکات بەسەریان و چەکەکانی ئەوان ڕاوەستێنێت لە دژی ئەوان، دەڵێن: ئەمەیان ئەی پێغەمبەری خوا خۆشترە بەلامانەوە، لەو ڕۆژەدا جوولەکەیەکی کەتەی بالا بەرزی بخور دەبینی، دەستی شمشێرەکەی هەڵناگرێت لە لەرزۆکیدا، موسڵمانان بۆیان دەچن و خوای گەورە زاڵیان دەکات بەسەریانداو دەجال کاتێك عیسای کوری مەریەم دەبینێت دەتوێتەوە، وەکو چۆن قورقوشم دەتوێتەوە، تاکو پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێی دەگات و دەیکوژێت.

---

(١) جامع معمر بن راشد (١١/ ٣٩٧) برقم: (٢٠٨٣٤). قال ابن كثير: قال شيخنا الذهبي هذا حديث قوي الإسناد.

بەرگی سێیەم

هەر چەندە بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو چەکەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێیەتی لە دوو چەك تێپەڕ ناکات:

**یەکەم:** ئەگەر تەکنەلۆژیا بە تەواوەتی لە کار بخرێت ئەوە چەکەکەی شمشێری ڕاستەقینەیە.

**دووەم:** ئەگەر تەکنەلۆژیا لە کار نەخرا بە تەواوەتی ئەوە جۆرە چەکێکی لایە وەکو دەمانچەی لێزەریە، چەکێکە لەلایەن خوداوە پێی بەخشراوەو لە هەموو چەکەکانی سەردەم پێشکەوتووترە لەو سەردەم.

هەر چەندە ڕای دووەمم زیاتر بەلاوە پەسند ترە، (الله) سبحانه وتعالی لە هەموو لایەکمان شارەزاترە.

خوای پەروەردگار لە قورئان ئەم ڕاستیەمان زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی بۆ دوویات دەکاتەوە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بە دەستی جولەکەکان نەکوژراوە، وەکو ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن و گاورەکانیش پێی هەڵخەڵەتاون و باوەڕیان پێ کردووە، بەڵکو خوای گەورە پاراستویەتی لە دەستی جولەکەو هەڵیکێشاوە بۆ ئاسمان وەکو دەفەرموێت: [وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾][1].

لەم ئایەتە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) نەمردووەو نەکوژراوە بەڵکو خوای گەورە بە تواناو دەسەڵاتی خۆی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان و لە کۆتایی بونەوەریش جارێکی تر دای دەبەزێنێتەوە سەر زەوی.هەروەك چەندین فەرموودەی دروستی متەواتیری لەسەر هاتووە.

---

(١) سورة النساء، الآية: (١٥٧-١٥٨).

پێشەوا ئیبنو جەریری تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ڕاسترین وتە ئەوەیە کە ئەهلی کیتاب بڕوا دێنن بە پێغەمبەر عیسا بەر لە مردنی واتە: کاتێك دادەبەزێ بۆ سەر زەوی[1].

ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە ئەهلی کیتاب لە کۆتایی بونەوەر بڕوا دێنن بە پێغەمبەر عیسا کە ئەمەش لە کاتی هاتنە خوارەوەی ڕوودەدات بەر لە مردنی.

خوای گەورە ئاگاداری کردوینەتەوە کە عیسای بەرزکردووەتەوە بۆ ئاسمان پاش ئەوە خەوی پێ بردووەتەوەو ڕزگاری کردووە لە دەستی ئەو جوولەکانەی دەیانویست ئازاری پێ بگەیەنن لەوانەی کە لە پاشملە بوختانیان پێکرد لەلای یەکێك لە پادشا بێباوەڕەکانی ئەو ڕۆژگارە.

ئەو پادشایە فەرمانی کرد بە کوشتن و لە خاچدانی، بۆیە ئابڵوقە درا لە (بیت المقدس) و کاتێك چوونە شوێنەکەی، خوای گەورە شێوەی عیسای خستە سەر شێوەی لاوێك لەو هاوەڵانەی کە لەلای بوون و عیسا لە درزێکی دیوارەکەوە بەزرکرایەوە بۆ ئاسمان و ئامادەبووەکان تەماشایان دەکرد.

پیاوانی پادشا چوونە ژوورەوە ئەو لاوەیان بینی کە ڕوواڵەتی عیسای بەسەردا درابوو، ئەوانیش بردیانەوە وایان زانی عیسایەو لە خاچیانداو درکیان بەسەریدا چەقاند وەکو سوکایەتیەك، ئیتر زۆربەی ئەو گاورانەی کە ئەم ڕووداوەیان نەبینیبوو بەو هۆیەوە کەوتنە ناو زەلکاوی گومڕایی، لێرەدا ئەوانیش بوون بە (٣) بەشەوە:

بەشی یەکەم: گوتیان خوا لەناو ئێمەیە، پاشان بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان، ئەوانەی ئەو بیروباوەڕەیان هەیە یەعقوبیەکانن.

بەشی دووەم: گوتیان بەندەو نێردراوی خوا لەناو ئێمەیە، پاشان خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان، ئەوانەی ئەو بیروباوەڕەیان هەیە موسڵمانەکانن.

بەشی سێیەم: گوتیان کوڕی خوا لەناو ئێمەیە، پاشان خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان، ئەوانەی ئەو بیروباوەڕەیان هەیە نەسطوریەکانن.

---

(١) جامع البيان (١/ ١٨).

بەشی سێیەم

خوای گەورەش دەفەرموێت: [وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ]. واتە: لە پاش دابەزاندنی بۆ سەر زەوی لە کۆتایی دونیا و لە پێش هەڵسانی بوونەوەر، چونکە ئەو کاتە دادەبەزێت و بەراز دەکوژێت و خاچ دەشکێنێت و سەرانە لادەبات و جگە لە ئیسلام ئایینی تر وەرناگرێت.

[قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ] واتە: لە پاش دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە کۆتایی بونەوەردا، کەس نامێنێت لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان باوەڕ نەهێنێت بە عیسا لە پاش دابەزینی و پێش مردنی، چونکە عیسا جگە لە ئیسلام ئایینی تر قەبوڵ ناکات، هەرچی بێباوەڕیش هەیە بەبۆنکردنی هەناسەی پێغەمبەر عیسا دەمرن.

هەروەها گوتراوە: [قَبۡلَ مَوۡتِهِۦ] واتە: پێش مردنی ئەو کەسە لە ئەهلی کیتاب، هەر کەسێك لەوانە لە کاتی سەرەمەرگدا بۆی دەردەکەوێت کە عیسا بەندەیەکی پێغەمبەرو ئادەمیزاد بوو، ئەگەرچی ئەو باوەڕە کەڵك و سوودی نییە بۆی، چونکە تەوبەکردن لە کاتی گیانکێشاندا وەرگیراو نییە.

پرسیار: جیاوازی چییە لە نێوان ژیانی پێغەمبەر عیساو ژیانی پێغەمبەرانی تر؟ ئایا پێغەمبەران زیندوونین بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): (الأنبياء أحياء من قبورهم)[1]. واتە: پێغەمبەران زیندوون لە گۆڕەکانیاندا.

وەڵام: ژیانی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئێستا ژیانێکی ڕاستەقینەیەو لە ئاسمانە بە جەستەو بە گیان، ژیانی پێغەمبەران ژیانێکی بەرزەخییە لە جۆرێکی تایبەت، بەڵام عیسا نەمردووە تاکو بچێتە ژیانی بەرزەخ و گۆڕەوە، ئەو لە لای خوایە بە جەستەو بە گیانەوە.

سەبارەت بە پێغەمبەرانی تریش،حاڵەتی سەرەمەرگیان بینیووەو گیانیان لە لاشەیان جیابووەتەوە، ژیانێکی تایبەتیان هەیە لە گۆڕەکانیاندا[2].

---

(١) صحيح: قال الحافظ في الفتح (٦/ ٤٨٧) أخرجه البيهقي في كتاب حياة الأنبياء في قبورهم وصصحه.

(٢) فتح الباري (٦/ ٤٨٧).

خوای گەورە دەفەرموێ: [وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾][1].

لێرەدا بۆمان بەدیار دەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) نیشانەیە بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی.

وە ئەوەی بەڵگەشە لەسەر ئەمە خوێندنەوەی ئەم ئایەتەیە بە قیرائەتێکی تر [وَإِنَّهُۥ لَعَلَمٞ لِّلسَّاعَةِ]. بە فەتحەی عەین و لامەکە (واتە: نیشانەی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی، وە ئەم جۆرە خوێندنەوەش گێڕدراوەتەوە لە ئیبنو عەباس و موجاهید (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)[2].

پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ئیبنو عەبباس (ﷺ) لە تەفسیری ئەم ئایەتە [وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ]. دەفەرموێ: ئەمە هاتنی عیسای کوری مەریەمە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی[3].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ڕاستیەکەی ئەوەیە کەوا وشەی[وَإِنَّهُۥ] ڕاناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر عیسا لەبەر ئەوەی دەقی ئایەتەکە دەربارەی ئەوە[4].

هەروەها دەفەرموێت: [وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا ﴿١٥٩﴾][5].

واتە: کەسانێك هەن لە ئەهلی کیتاب مەبەست پێیان جولەکەو گاورە کە لە پێش مردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) باوەڕی پێ دەهێنن.

---

(١) سورة الزخرف، الآية: (٦١).

(٢) تفسير جامع لأحكام القرآن، للقرطبي (١٦/ ١٠٥).

(٣) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٣٢٩) برقم: (٢٩٢١) قال أحمد شاكر: إسناده صحيح.

(٤) تفسير القرآن العظيم (٧/ ٢٢٢).

(٥) سورة النساء، الآية: (١٦١).

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی بەشێکی زۆر لەو گاورانەی کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بە خواو کوڕی خوا تێ دەگەن، لە کاتی هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بۆ جاری دووەم لە کۆتایی بونەوەر، لەم بیروباوەڕە پوچەڵەی خۆیان پەشیمان دەبنەوەو باوەڕی پێ دەهێنن کە بەندەی خوایە.

خوای پەروەدگار منەت بەسەر پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەکات و دەفەرموێ: [إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾][1].

هەمومان دەزانین کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لە تەمەنی (٣٣) ساڵی هەڵکێشراوە بۆ ئاسمان و پیرنەبوە، بەڵکو ئەو ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە جاری دووەمی دابەزینی بۆ سەر زەوی پیر دەبێت، بۆیە قسە کردنیشی لە پیریدا وەکو قسەکردنی لەسەر بێشکەیە، خوای گەورە بە یەکێ لە موعجیزەکانی لە قەڵەم دەدات.

لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە درێژی باسی لێوە کراوە هەروەکو نەواسی کوڕی سەمعان (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ)[2].

واتە: عیسای کوری مەریەم دادەبەزێتە سەر زەوی لە ئاستی منارە سپیەکەی خۆرهەڵاتی دیمەشق.

---

(١) سورة المائدة، الآية: (١٠).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال وصفته، برقم: (٢٩٣٧).

لە ئینجیلی (بەرنابا)شدا هاتووە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بە قوتابیەکانی دەفەرموێت: (الحق أقول لكم متكلما من القلب، إني أقشعر لأن العالم سيدعوني إلها، وعلى أن أقدم لأجل هذا حسابا، لعمرالله الذي نفسي واقفة في حضرته، إني رجل فانٍ كسائر الناس، على أني وإن أقامني الله نبيا على بيت إسرائيل لأجل صحة الضعفاء وإصلاح الخطاة خادم الله، وأنتم شهداء على هذا، كيف أني أنكر على هؤلاء الأشرار الذين بعد إنصرافي من العالم سيبطلون حق إنجيلي بعمل الشيطان، ولكني سأعود قبل النهاية، وسيأتي معي أخنوخ وإلياء، ونشهد على الأشرار الذين ستكون آخرتهم ملعونة)[١].

واتە: بەڕاستی پێتان دەڵێم لەناخی دڵمەوە، لەرزم لێ دێت و مووچڕك بە گیانماندا دێت، لەبەر ئەوەی کە خەڵکی بە خوا ناوم دەبەن، وە لەسەر ئەوە دووچاری لێپرسینەوە دەبم لە بەردەم خوادا، سوێند بەو خوایەی کە گیانم وەستاوە لە خزمەتیدا من پیاوێکم وەك ئەو هەموو خەڵکەی تر، دەفەوتێم و نامێنم، من هەر چەندە کە خوای گەورە بە پێغەمبەر ناردوومی بۆ ماڵی ئیسرائیل، لە پێناو لەش ساغی نەخۆش و لاوازەکان و ڕاست کردنەوەی تاوان کاران بەڵام من خزمەت کارو بەندەی خودام، وە ئێوەش شایەتن کەمن چۆن بەرەنگاری ئەو تاوانبارانە دەبمەوە کە لە دوای ڕۆیشتنم لە جیهان ئینجیلە ڕاستەکەم بەتاڵ دەکەنەوەو دەیگۆڕن بەکاری شەیتان، بەڵام من لە پێش کۆتایی بونەوەر دەگەڕێمەوە، ئەخنوخ و ئیلیاش لەگەڵ خۆم دەهێنم، وە شایەتی دەدەین لەسەر ئەو تاوانبارانەی کە دووچاری کۆتاییەکی نەفرەت لێ کراو دەبن.

بەڵێ... پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە کۆتاییدا دێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەو تاوانبارانە ڕیسوا کات کە ئینجیلەکەیان گۆڕیوە، چونکە پێغەمبەرعیسایان (سەلامی خوای لێبێ) بە خوا ناو بردوە، وە شایەت بێت لەسەر ئەو کۆتاییە نەفرەت لێکراوەی کە دووچاری دەبن[٢].

---

(١) إنجيل برنابا (الفصل ٥٢).

(٢) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی، هاوڕێ محمد ئەمین، لا ٢١٨-٢٢٠، چاپی پێنجەم ٢٠٠٥.

پێشەوا حوزەیفەی کوری ئوسەید (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (حَتَّى يَأْتِيَ الْمَدِينَةَ، فَيَغْلِبُ عَلَى خَارِجِهَا وَيَمْنَعُ دَاخَلَهَا، ثُمَّ جَبَلَ إِيلِيَاءَ فَيُحَاصِرُ عِصَابَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَيَقُولُ لَهُمُ الَّذِينَ عَلَيْهِمْ مَا تَنْتَظِرُونَ بِهَذَا الطَّاغِيَةِ أَنْ تُقَاتِلُوهُ حَتَّى تَلْحَقُوا بِاللَّهِ أَوْ يُفْتَحَ لَكُمْ، فَيَأْتَمِرُونَ أَنْ يُقَاتِلُوهُ إِذَا أَصْبَحُوا، فَيُصْبِحُونَ وَمَعَهُمْ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ)[1].

واتە: تاکو دێتە لای مەدینەو زاڵ دەبێتە سەر ئەوانەی لێی دەردەچن و ڕێگەش دەگرێت لەوانەی دەیانەوێت بچنە ژوورەوە، ئینجا دەچێتە کێوی (ایلیاء) لە لای (بیت المقدس) و لەوێ ئابلۆقەی کۆمەڵێك لە موسڵمانان دەدات و موسڵمانان تووشی سەختی و نارەحەتیەکی زۆر دەبنەوە، پێیان دەڵێت: چاوەڕوانی چین لەو ستەمکارە ئەگەر شەڕی لەگەڵدا بکەن و بگەنە خوای خۆتان، یان سەر بکەون، ئیتر بڕیاری شەڕکردن دەدەن، جا کە ڕۆژ دەبێتەوە دەبینن عیسای کوری مەریەمیان لەگەڵدایە.

## بۆچی عیسای کوری مەریەم دادەبەزێت ؟

ئەوەندەی بۆی بچم لەبەر چەند هۆکارێك ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە دادەبەزێت، لەوانە:

- بەرپەرچدانەوەیەك بۆ جولەکەکان کە دەڵێن: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کوژراوە.
- چەسپاندنێك بۆ ئەوەی بزانرێ کە عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوایە، وە لە داهاتووش دەمرێت.
- تا بزانرێ ئێمە لە پێشترین بە عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) .
- بەتاڵکردنەوەی ئایینی گاوریەتی، چونکە لەگەڵ دابەزینی خاچ دەشکێنێت و بەرازیش دەکوژێت.

---

(١) المستدرك (٤/ ٥٧٤) برقم: (٨٦١٢). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

## واتای وشەی (المسیح) پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باس لە بیست و سێ قسەو بۆچوون دەکات دەربارەی هاتنی واتای ئەم ناوەو لێ وەرگیرانی، وە خاوەنی (القاموس) دەیگەیەنێتە پەنجا بۆچوون و وتە دەربارەی هاتنی ئەم ناوە واتە: مەسیح کە لە ئەسڵدا واتای چیە؟

پێشەوا ئیبنو ئەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەسیح: بەو کەسە دەگوترێت کە لا ڕویەکی داپۆشرابێ، نەچاوی هەبێ نەبرۆ.

لێرەدا (مەسیح) بە واتای بەرکار (مفعول) هاتووە، وشەی (المسیح) لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی (فعیل)ە لە (مسح)ەوە هاتووە واتە: (سڕین) و (دەست پێداهێنان)، وە یەکێك لە داتاشراوەکانیشی (ساح) بە واتای گەڕان و سیاحەت دێت[1].

زانایان دەڵێن: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) پێی دەگوترێت (مسیح) لەبەر ئەوەی دەستی دەهێنا بەهەر نەخۆشێکدا چاك دەبۆوە، یان لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا زۆر سیاحەت و گەڕانی دەکردو لە شوێنێکدا جێگیر نەدەبوو.

وە پێغەمبەریش (ﷺ) هەردوو (مەسیح)ەکەی بەوە لە یەك جیاکردۆتەوە کە بە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەڵێت: (مەسیحی هیدایەت)، وە بە دەجالیش دەڵێت: (مەسیحی گومڕایی)[2].

لە ڕاستیدا وشەی (مەسیح) لە بنچینەدا شۆرەتی پێغەمبەر عیسایە (سەلامی خوای لێ بێت)، بەڵام دەجال چونکە لە کاتی هاتنیدا خۆی وابەخەڵك دەناسێنێت کە گوایە مەسیحی چاوەڕوان کراوەو هاتۆتە سەر زەوی، بۆیە بەویش دەگوترێت (مەسیح)، بەڵام مەسیحی درۆو گومڕایی، نەك (مەسیحە) ڕاستیەکە کە عیسایە (سەلامی خوای لێ بێ).

---

(١) التذکرة في أحوال الموتى (للقرطبي) لا ٦٧٩.

(٢) فتح الباري (١٣/ ١٢٩).

# فەرموودەکان دەربارەی هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر (عیسا) متەواتیرن

لە پێشتردا هەندێك لەو فەرمووداتەم باس کرد کە دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسا لە کۆتایی بوونەوەر، بەڵام من هەموو فەرموودەکانم باس نەکردووە لە ترسی زۆر درێژبوونەوەی باسەکە، هەروەك ئەم فەرمودانەی دەربارەی هاتوون زۆرو زەوندن لە هەر یەك لە کیتابەکانی (صیحاح و سوننەن و مەسانیدەکان) و چەندین کیتابی تری فەرموودە، کە ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر چەسپاوی هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا لە کۆتایی بونەوەر، وە هیچ بەڵگەیەك نیە کەسێك کە ڕەتیان کاتەوە ئەم فەرموودانە یان بڵێ ئەمانە فەرموودەی ئاحادن و بەڵگەی دڵنیاکەر یان هاتنە خوارەوەی بنچینەیەك نیە لەبیروباوەڕی موسڵمانان کەوا پێویستە بڕوایان پێی هەبێ لەبەر ئەوەی کاتێك فەرموودە دەرچوو کە ڕاستە ئەوا پێویستە بڕوامان پێی هەبێ، بۆیە بۆمان نیە ڕەتی بکەینەوە لەبەر ئەوەی زانایان دەڵێن ڕێژەی ئەو فەرموودانەی باس لە هاتنە خوارەوەی عیسا دەکەن لە کۆتایی بونەوەر گەیشتۆتە پلەی متەواتیر.

هەواڵەکان لە ڕێگەی زۆرێك لەو هاوەڵانەی پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دابەزینی عیسای پێ ڕاگەیاندووین، (تواتر) بوونی ئەو هەواڵە باسکراوە لە لایەن: پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەبو حەسەنی ئەشعەری و پێشەوا تەبەری و ئیبنو کەثیرو سەفارینی و شەوکانیش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە هاتووە دەربارەی دەجال و مەسیح.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی فەرموودەکانی دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەم فەرموودانە متەواتیرن لە ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئاماژەیان تێدایە بۆ شێوەی

دابەزین و شوێنێکە لە شام[١]، بەڵکو لە دیمەشق لەلای منارەی ڕۆژ هەڵات و ئەو ڕووداوەش لە کاتی نوێکردنی بەیانی دەبێت، بەراز دەکوژێت و خاچ دەشکێنێت و سەرانە لادەبات، جگە لە ئیسلام هیچ ئاینێکی تر قبوڵ ناکات وەکو لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە، ئەوەش هەواڵدانە لەلایەن پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوەو شەریعەت دانان و ڕەزامەندی پاساو بۆ هێناوەشە بۆی لەو سەردەمەدا، چونکە گومانەکانیان نامێنێت و هەموویان دەچنە ئاینی ئیسلامەوە، وەکو پەیڕەوکردن لە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) و لەسەر دەستی ئەو، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: [وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ][٢]. ئەم ئایەتەش هاوشێوەی فەرموودەی خوای مەزنە [وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ][٣] هەروەها بە (عَلَمًا)یش خوێنراوەتەوە، واتە: نیشانەو بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، چونکە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەکەوێتە دوای دەرکەوتنی دەجال، کە لەسەر دەستی ئەو دەکوژرێت، هەر لەو ڕۆژگارەی ئەویشدا خوای گەورە یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت، لەناویشیان دەبات بە پیرۆزی و پاڕانەوەی نزای پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)[٤].

ئوممەتی ئیسلامیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، کەسیش لەو مەسەلە ناکۆکی نەکردووە، مەگەر کەسێك هیچ بایەخێك بۆ قسەکانی دانەنرێت.

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم، لابن كثير (١/ ١٤٨).

(٢) سورة النساء، الآية: (١٦١).

(٣) سورة الزخرف، الآية: (٦١).

(٤) البداية والنهاية (٩/ ١٧٩).

## ئەو بەڵگانەی لەبارەی پێغەمبەر عیساوە هاتوون

هیچ گومان لەوەدا نیە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) لە کۆتایی بونەوەر دادەبەزیٚ، بەڵگەکانیش لەم بابەتە بە متەواتیر لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتوون.

خوای پەروەدگار دەفەرمویٚ: [وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾][1].

واتە: کەسانێك هەن لە ئەهلی کیتاب مەبەست پێیان جولەکەو گاورە لە پێش مردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) باوەڕی پیٚ دەهێنن.

خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: [وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾].

لەم ئایەتە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) نەمردووەو نەکوژراوە بەڵکو خوای گەورە بە تواناو دەسەڵاتی خۆی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان و لە کۆتایی بونەوەریش جارێکی تر دای دەبەزێنێتەوە سەر زەوی وەکو دەفەرموی: [وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾][2].

لێرەدا بۆمان بەدیار دەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) نیشانەیە بۆ هاتنی قیامەت.

---

(١) سورة النساء، الآية: (١٦١).

(٢) سورة الزخرف، الآية: (٦١).

ئەم ئایەتە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەو قسەیە نابەجێیە کە دەڵێن: ئێمە عیسای مەسیحی پێغەمبەری خوامان کوشت.. ئەوان عیسایان نەکوشتووەو هەڵیشیان نەواسیوە، بەڵکو لە کاتی هێرشکردنە سەر عیسا بۆ کوشتنی لێیان تێکچوو، خوای گەورە یەکێکی تر (یهوذا)ی بردۆتە سەر شێوەی عیسا و لە جیاتی ئەو لە سێدارەیانداوە، خوای گەورە عیسای بۆ لای خۆی بەرز کردۆتەوە، ئەوەش بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە چونکە زۆر دەسەڵاتدارو کاربەجێ و لێزانە..

چیرۆکی ئەم بابەتەشمان لە ساڵی (١٩٧٢)ع ەوە دەست پێ دەکات کاتێك کە یەکێك لە دەستنوسەکانی (نەجع حەممادی) بە زمانی قیبتی دۆزرایەوە، ئەم دەستنوسە بە شێوەی کەشکۆڵێك لەسەر گەڵای بەڕەدی نوسراوە، واتە: مێژووەکەی بۆ سەدەی دووەمی عیسایی دەگەڕێتەوە، شتێکی زانراویشە کە بەڕەدی ڕووەکێکە لە کەناری ڕووباری نیل دەڕوێ و بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سیقانە بە کاردێت و دەبێتە گەڵا و وەك پەڕاو بۆ لەسەر نووسین بەکاردێت، شایەنی باسە میسریە کۆنەکان یەکەم کەس بوون نوسینیان لەسەر ئەم گەڵایە کردووە..

ڕۆژنامەی (واشنتون تایمز) لە ژمارەی (٤/٧/ ٢٠٠٦)دا، لە بابەتێکدا باس لەوە دەکات کە زانایان لە کۆمەڵەی جوگرافیای نێو دەوڵەتی پەردەیان لەسەر یەکێك لە دەستنوسە کۆنەکان لاداوە کە لە (ئەلمنیا) ی وڵاتی میسر دۆزراوەتەوەو چەندین ساڵە لە گەنجینەی بانکێکدا پارێزراوە تا وای لێهات دەستنوسەکە مۆرانە لێیبداو بخورێ و هەڵوەرێ، ئەوانیش بە هەوڵێکی زۆر کۆیان کردەوەو بۆیان دەرکەوت کە ئەوە ئینجیلی یەهوزایەو مێژووەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی سێیەمی عیسایی، ئەم ئینجیلە بە یەهوزا ناو دەبرێ، یەهوزاش یەکێك بووە لە قوتابیەکانی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)، مێژووی قیبتی باسی یەهوزا دەکات و بەو پیاوەی لە قەڵەم دەدا کە خیانەتی لە پێغەمبەر عیسا کردووە، لە ماوەی (١٥) ساڵدا توانرا ئەو ئینجیلە چاك و نۆژەن بکرێتەوەو لە کۆتایی ساڵ ی (٢٠٠٥)ع لە زمانی قیبتیەوە تەرجەمەی زمانی ئینگلیزی کرا، لە ساڵی (٢٠٠٦)ع وەرگێڕانی ئەم

بەشی سێیەم

ئینجیلە لە بازاڕەکان دەفرۆشرا، ئەم ئینجیلە وەك ڕۆژنامەی واشنتۆن تایمز باس دەکات ڕاستەوخۆ لە کۆتاییەکەیدا باسی کۆتایی هاتنی پێغەمبەر عیسا دەکات و وەك لە دەقە ئینگلیزیەکەیدا هاتووەو دەڵێ: ئەم دەقە واتای وایە کە پێغەمبەر عیسا لە کۆتایی (ئینجیلی یەهوزا) دا قسە لەگەڵ یەهوزا دەکات و بە یەهوزا دەڵێت: ئەی یەهوزا تۆ لە مەودوا لە تەواوی شوێنکەوتەو یاوەرانی من جیا دەبیت، تۆ دەبیتە ئەو پیاوەی کە قوربانی دەدەی لەبەر ئەوەی لەمن دەچیت، هەڵوێستەیەك دەکەین و سەرنج دەدەینە وشەی (یلبیسنی) کە وەرگێر لە نوسینیدا دەستەوسانە، لە قورئانیش هاتووە کە دەفەرموێت: [وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ] واتە: لێمان تێکدان، (یەهوزا) بە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) چواند بۆ ئەوەی لە جیاتی ئەو لە سێدارەی بدەن، بەم شێوەیە ڕاستیەکە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە خاچ نەدراوە، بەڵکو ئەو کەسەی لە خاچ دراوە یەهوزای قوتابیەتی، جا ئایا خوای گەورە یەهوزای قوتابی بە عیسا چواند لەبەر ئەوەی ناپاکی لەگەڵدا کرد یان یەهوزا بۆ خۆی لە پێناو ڕزگاربوونی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) قوربانی بە گیانی خۆیدا، قورئان ڕاشکاوانە ئەوەی باس نەکردووە، وە گاورەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە یەهوزا خیانەتی لە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) کردووە، پاشان دوای ئەوە خۆی لە خاچ داوە.

ئینجیلی یەهوزاش بانگەشەی ئەوە دەکات کە یەهوزا بۆتە قوربانی لەلایەن یەهوزای خاوەن ئەم ئینجیلە لە پێناو پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)، خوای گەورەو پاشان باوەڕداران گەواهی لەسەر ئەوە دەدەن کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) نەکوژراوەو لە خاچ نەدراوە[1].

خوای گەورە دەفەرموێ: [وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾].

---

(١) www.quran-m.com

واتە: کەسانێك هەن لە ئەهلی کیتاب مەبەست پێیان جولەکەو گاورە کە لە پێش مردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) باوەڕی پێ دەهێنن.

پێشەوا جابری کوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، قَالَ : فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ : تَعَالَ صَلِّ بِنَا ، فَيَقُولُ: لاَ ، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أَمِيرٌ ، لِيُكْرِمَ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ)[(١)].

واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئوممەتی من لەسەر هەق شەڕ دەکەن و سەردەکەون هەتا ڕۆژی دوایی، فەرموی: پاشان عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکان پێی دەڵێت: فەرموو پێش نوێژیمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێت: نەخێر ئێوە پێشەواکانتان لە خۆتان دەبێت، ڕێزێکە خوا لەم ئومەتەی ناوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ؟)[(٢)].

واتە: دەبێت چۆن بێت کاتێك کە کوڕی مەریەم لەناوتاندا دادەبەزێت و بەوەی خۆتان پێشەوایەتیتان دەکات.

پێشەوا محەممەدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەهدی لەم ئومەتەیەو پێش نوێژی بۆ عیسای کوڕی مەریەم دەکات[(٣)].

پێشەوا سوبوکی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە دڵنیایی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خودایە بەڵام بە یەکێك لە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەژمار دەکرێت، وە لە بەشی هاوەڵان، چونکە چەندین

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٧/٤) ورقمه (١٥٦).

(٢) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٢٢٢١/٤) ورقم الحديث: (٢٨٩٧).

(٣) صحيح: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) عزاه د. عبدالعليم البستوي إلى ابن ابي شيبة في (مصنفه) وقال: إسناده صحيح، رجاله كلهم ثقات. المهدي المنتظر لا ٢٢٠.

جار کۆبووەتەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا زیندووبووەو بڕوای پێ هێناوە، وە کۆبونەوەکانی لە شەوی ئیسڕاء بە تەنها نەبووە[١].

پێشەوا زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) هەم پێغەمبەرەو هەم سەحابەیە، چونکە پێغەمبەری (ﷺ) بینیوەو کۆتا هاوەڵیشە کە وەفات دەکات[٢].

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلاً فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)[٣].

واتە: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە نزیك بووە (عیسای کوڕی مەریەم) تان وەکو فەرمانڕەوایەکی دادگەر تێدا دابەزێ، جا خاچ دەشکێنێو بەراز دەکوژێ و شەڕ کۆتا دێنێ و ماڵ زۆر دەبێ تا یەکێك نابێ وەریگرێ، هەتا وای لێ دێ تاکە سوژدەیەك چاکتر دەبێ لە دونیا و ئەوی تێی دایە.

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بۆ ئەوە دێت تا شەریعەتی قورئان بکاتە فەرمانڕەوا.

پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..إِذْ بَعَثَ اللهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فَلَا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدّ، فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ..)[٤].

---

(١) نزول عيسى بن مريم آخر الزمان، للسيوطي، (لا ٤١ ـ ٤٢).

(٢) نزول عيسى بن مريم آخر الزمان، (لا ٤٣).

(٣) صحيح البخاري (٤/ ٢٠٥) كتاب: الأنبياء، باب نزول عيسى بن مريم، برقم:(٣٤٤٨).

(٤) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال وصفته، برقم: (٢٩٣٧).

واتە: لەو کاتەدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت، ئەو لەلای منارە سپیەکەی خۆرهەڵاتی دیمشق دادەبەزێت، دوو پۆشاکی لەبەردایە کە بە زەعفەران ڕەنگ کراوە، هەردوو شانی خستۆتە سەر باڵی دوو فریشتە، کە سەری دادەنەوێت ئاوی لێ دەتکێت، کە بەرزیشی دەکاتەوە، وەك دەنکە مرواری پیایدا شۆڕ دەبێتەوە، هیچ کافرێك نیە بۆنی هەناسەی بکات و نەمرێت، وە هەناسەکەشی هەتا چاوی بڕ دەکات دەڕوات، شوێن دەجال دەکەوێت، هەتا لە دەرگای (لد) کە شوێنێکە لە نێوان دیمەشق و (بیت المقدس) دەیگرێت و دەیکوژێت، پاشان خەڵکانێك دێن بۆ لای پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) کە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلەو پایەی بەهەشت دەکات.

## حیکمەت لە هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا چییە؟

هەرکەسێك وردبێتەوە لەم فەرمودانەی پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا بۆی دەردەکەوێت کە ئەم فەرمودانە زۆر بەڕوونی باسی هاتنی پێغەمبەر عیسا دەکەن، چۆن دادەبەزیٚ و

لە کوێوە دێت و چی دەکات و کەی دەمرێت و چەندێك دەمێنێتەوەو پاشان کیٚ نوێژی لەسەر دەکات و لەکوێدا دەنێژرێت؟

زانایان چەند قسەیەکیان فەرمووە دەربارەی هۆیەکانی هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا لە کۆتایی بونەوەر کە ئەمانەن:

١) ئەو مەسیحەی وەعدە بێتەوە ناو خەڵکی ناوی عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لێبیٚ) کوڕی خەڵکی تر نیە، نە (وەك عیسا وایە) نە (ئاوێنەی عیسایە) نە (مەسیحی مەوعودە).

٢) پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، واتە: تەنیا هەر ئەوەندە بەس نییە کە پێغەمبەرە، بەڵکو دەبیٚ لە ئاسمانیشەوە بێتە خوارەوە.

٣) لە تەنیشت منارەیەکی سپییەوە و لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشقدا دادەبەزیٚ و دوو پەشتەماڵی زەردی پۆشیوەو هەردوو دەستی ناوەتە سەر باڵی دوو مەلائیکەو بەشێوەی موعجیزە دەردەکەوێت و دێتە ناو خەڵکی.

٤) هەرچی کافر هەیە لە سەردەمی ئەودا دەمرێت و گیانی دەردەچێت.

٥) خۆی دەبێتە حاکم و دادگەری بەرپا دەکات، نەك یەکێك بێت و بخورێت بەسەریدا، و حوکمی بکات.

٦) دەست دەداتە خاچ شکاندن و جگە لە خوا دوای ئەوە کەس پەرستراوێکی تر ناپەرستێت.

٧) فەرمان دەکات بە کوشتنی بەرازو هەموویان لەناو دەبات و پاش ئەوە کەس ئیتر گۆشتی بەراز ناخوات.

٨) هەموو خەڵکی کۆدەکاتەوە لەسەر دینی ئیسلام و دوای ئەوە جگە لە ئیسلام ئاینێکی تر نامێنێ و شەڕی لەسەر بکرێ.

٩) دەجال دەکوژێت لە شوێنێکدا کە پێی دەوترێت (لد) و لەبەر دەرگای ئەو شارەدا دەیکوژێت.

١٠) لەسەردەمی ئەودا پارە ئەوەندە زۆر دەبێت هەژار نامێنێت و کەس نامێنێ سواڵ بکات، و دەست لە خەڵکی پان بکاتەوە لەبەر ئەوەی بەرەکەت و خێر لەسەردەمی ئەودا زۆر دادەبەزێت.

١١) لەسەردەمی ئەودا خەڵك عیبادەت سەر عیبادەتکردن و ئەویان پێ باشترە لەهەموو شتێکی تری دونیایی.

١٢) ئەمن و ئاسایش دونیا دەگرێت و وای لێدێت شێر لەگەڵ حوشتر دەلەوەڕێن و منداڵان یاری بە مار دەکەن و نایانگەزن و زیانیان پێ ناگەیەنن.

١٣) ئینجا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەچێت بۆ مەککەو حەج دەکات ئیتر بە (افراد) بێت یان بە (تمتع) یان بە (قیران).

١٤) چل ساڵ ئەمێنێتەوە لەناو خەڵداو پاش ئەو چل ساڵە وەفات ئەکات.

١٥) موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن و کفن و دفنی دەکەن.

١٦) لە ڕەوزەی پێغەمبەردا (ﷺ) و لەتەنیشت ئەودا دەفن دەکرێت.

١٧) جیهاد ڕادەگەیەنێت و جگە لە ئیسلام قبووڵی ناکات لە کەس هیچ دینێکی تری هەبێت.

**١٨) پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کە دێتەوە باسی ئیلهام و وەحی تازە ناکات، و سنوری خۆی نەفامێت.**

**شاعیر مەولەوی سەبارەت بە پێغەمبەر عیسی دەڵێت:**

نەما ئیحـــتاج ئەهلـــی زەمــــانە
(حـــق) (نبیًّ) ێ تر بکا رەوانــــە
مەعلوم بوو لەلای هەرکەســێ بیناس
(محـــمد) بێ شـــك (ختم الانبیا)س
لە ئەمری عیســــا هیچ پەشـێو نەبی
بەر لە موحــــەممەد بووگە بە (نبــی)
کە هــاتە خوارێ هیچ شوبهـــەی نییە
هەر تابعی شەرع موحـــــــەممەدیە
شەرعی خۆی مەنسوخ، تـــازەی بۆ نایە
خـــەلیفەی جـــەناب ڕەســولوڵایە
هیچ دینێ قــبووڵ ناکا لە هـــیچ کەس
ئیللا ئەم دینی ئیســــلامـــە کە هەس
ئەهلی کیتاب گشـــت پێی تێرن ئیمــان
صــــەلیب دەشکێنێ لادەبــا خوگان
وەك عەصری ئەو خۆش کەس نایشنەوێ
دەڵێـن ژن تێـری و (وەلـــد)ی دەوێ
وەختی کە دەمرێ بە ئەمـــری بێچوون
دەکرێ لە خدمەت حــەضرەتدا مەدفون
بووبەکرو عـــومــــەر دەکەونە ئەبەین

بەرگی سێیەم

(طـــوبى للشــيخين بيـــن النبييـــن)
چ فەزڵێکە خـــوا داگییە بەم خــــــاکە
ئەصڵە بۆ ئەم گشت گەوهـــــەری پاکە
ئاسمان لە ڕوتبەی عولوی چی کەم بوو
نەبوو بە مەدفەن بۆ عیســـــا ئەم بوو[1]

## شێوەو ڕوخساری پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی پێغەمبەر عیسای کردووە (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو هەلومەرجانەشی ڕوونکردووەتەوە کە تێیدا دادەبەزێت، بۆ ئەوەی مەسەلەکە ئاشکرا بێت و لە کەس تێك نەچێت.

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) پیاوێکە:

- باڵا مامناوەندییە.
- ڕەنگی پێستی بەلای سوورو سپیدا دەڕوانێت.
- ناوشانی پانە.
- قژی داهێنراوو خاوە، دەڵێی ئاوی لێ دەتکێت ئەگەر تەڕیش نەبێت.
- لە نێو هاوەڵاندا زیاتر عوروەی کوری مەسعودی سەقەفی دەچێت.

پێشەوا ئیبنو عەبباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (رَأَيْتُ عِيسَى وَمُوسَى وَإِبْرَاهِيمَ ، فَأَمَّا عِيسَى فَأَحْمَرُ جَعْدٌ عَرِيضُ الصَّدْرِ..)[2].

واتە: عیساو موساو ئیبراهیمم بینی، عیسا سور کارێکی قژ لول و سنگ پان بوو.

---

(١) عەقیدەی مەرضیة، مەلا عبدالكريمي مودەڕریس، (لا٤٠٥ ـ ٤٠٦ ـ ٤٠٧).

(٢) صحيح البخاري (١٢/ ١٤٨) باب: واذكر في الكتاب مريم، برقم: (٣٤٣٨).

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ وَإِنَّهُ نَازِلٌ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ رَجُلًا مَرْبُوعًا إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَصَّرَانِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ..)[1].

واتە: لە نێوان من و عیسادا هیچ پێغەمبەرێك نیە، ئەگەر بینیتان بیناسنەوە، پیاوێکی چوار شانەی باڵا مام ناوەندیە، سورو سپیە، لە نێوان دوو بەرگی سووری زەرد باودا دادەبەزێت، سەری دەڵێی ئاوی لێ دەتکێت، هەر چەندە تەڕیش نیە..

لە ڕیوایەتێکی تر پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أَرَانِي لَيْلَةً عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَرَأَيْتُ رَجُلًا آدَمَ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، لَهُ لِمَّةٌ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ اللِّمَمِ، قَدْ رَجَّلَهَا فَهِيَ تَقْطُرُ مَاءً، مُتَّكِئًا عَلَى رَجُلَيْنِ - أَوْ عَلَى عَوَاتِقِ رَجُلَيْنِ - يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَسَأَلْتُ مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: هَذَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ..)[2].

واتە: شەوێکیان لە خەونمدا لە ئاستی کەعبە بووم، پیاوێکم بینی ڕەنگ خاکی، بەڵام جوانترین ڕەنگ، خاکیەکی کە لە پیاودا هەبێت، قژە لاجانێکی هەبوو، جوانترین قژە لاجان کە تۆ بینیبێتت، خاوی کردبۆوەو بەری دابۆوە، دەتگوت ئاوی لێ دەتکێت، شانی دادابوە سەر دوو پیاو، یان خۆی دابوو بەسەر شانی دوو پیاودا تەوافی دەکرد بە دەوری ماڵی بەیت، پرسیارم کرد ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە مەسیحی کوری مەریەمە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي الْحِجْرِ وَقُرَيْشٌ تَسْأَلُنِي عَنْ مَسْرَايَ، فَسَأَلَتْنِي عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لَمْ أُثْبِتْهَا، فَكُرِبْتُ كُرْبَةً مَا كُرِبْتُ مِثْلَهُ قَطُّ، قَالَ: فَرَفَعَهُ اللهُ لِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، مَا يَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلَّا أَنْبَأْتُهُمْ بِهِ، وَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، فَإِذَا مُوسَى قَائِمٌ يُصَلِّي، فَإِذَا رَجُلٌ ضَرْبٌ، جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، وَإِذَا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَائِمٌ يُصَلِّي، أَقْرَبُ

---

(١) مسند الإمام أحمد (١٥٤/١٥) برقم: (٩٢٦٨). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٢) صحيح البخاري (٤٤٢/١٩) باب: الجعد، برقم: (٥٩٠٢).

النَّاسِ بِهِ شَبَهًا عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ، وَإِذَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَائِمٌ يُصَلِّي، أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ صَاحِبُكُمْ - يَعْنِي نَفْسَهُ - فَحَانَتِ الصَّلَاةُ فَأَمَمْتُهُمْ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلَاةِ قَالَ قَائِلٌ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا مَالِكٌ صَاحِبُ النَّارِ، فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ، فَبَدَأَنِي بِالسَّلَامِ)[1].

واتە: لە حیجردا بووم لەلای کەعبە، خەڵکی قورەیش پرسیاری شەوڕەوەکەیان لێدەکردم، پرسیاری هەندێ شوێنیان لێکردم لە بیت المقدس نەمزانی، بۆیە زۆر خەمبار بووم، دەفەرموێت: ئینجا خوای گەورە بۆی بەرزکردمەوە، تەمشام دەکرد، پرسیاری هەرچیان لێکردم وەڵامم دەدانەوە، ئینجا لە شەوڕەوەکەمدا لە نێو هەندێك لە پێغەمبەراندا بووم، موسام (سەلامی خوای لێ بێت) بینیراوەستا بوو نوێژی دەکرد، ئینجا پیاوێکی قژ لوولم بینی دەتوت یەکێکە لە پیاوانی هۆزی شەنوئە، جا بینیم عیسای کوڕی مەریەم ڕاوەستاوە نوێژ دەکات، کەسێك زۆر لە ئەو بچێت عورووەی کوری مەسعودی سەقەفیە[2]، ئینجا ئیبراهیمم بینی ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، زیاتر کەسێك لە ئەو بچێت هاوەڵەکەتانە (واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)) جا کاتی نوێژ هات و منیش پێش نوێژیم بۆ کردن، کاتێك نوێژەکە تەواو بووکەسێك وتی: ئەی محەممەد ئەوە مالیکی دۆزەخەوانە سڵاوی لێ بکە، ئاوڕم لێدایەوە، پێشم کەوت بە سەلامکردن.

پرسیار: لەوانەیە گرفتێك لەلای کەسێك دروست بێت چۆن عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) کۆدەبێتەوە لەگەڵ دەجال عیسا ببینێت دەتوێتەوە وەکو قورقوشم؟

بەڵکو چۆن دەجال لە لای کەعبەدا دەبێت و چوونە ژوورەوەی مەککەی لەسەر قەدەغەیە؟

وەڵام: ئەوە خەونە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینیویەتی و ڕووداوێکی واقیعی نییە ڕوویدابێت.

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١٥٦) باب: ذكر المسيح عيسى ابن مريم، برقم: (١٧٢).

(٢) ئەم هاوەڵە یەکێکە لە هاوەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەدەستی بێ باوەڕەکانی شاری (گائف) شەهید کرا.

## ئایا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دوای دابەزینی بۆ سەر زەوی وەحی بۆ دێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ.. بە بەڵگەی پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ..)[1].

واتە: پاشان کۆمەڵە خەڵکێك دێن بۆ لای عیسای کوری مەریەم کە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلە و پایەیان بۆ دەکات لە بەهەشتدا، ئا لەو کات و حاڵەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)، کە کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم هێناوەتە دەر، کەس تواناو دەسەڵاتی کوشتار و شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا.

لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە لە دوای هاتنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) وەحی دێت لە ڕێگای جبریلەوە (سەلامی خوای لەسەر).. وە ئەوەی دەوترێ کە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جبریل نایەتە سەر زەوی ئەمە هیچ ئەسڵ و ئەساس و بنچینەیەکی نییە.. بە بەڵگەی ئەوەی کە لە شەوانی قەدر و قەدەغەکردنی دەجال لە هەردوو شاری مەککەو مەدینە لەسەر زەوی دەبێت.

### دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

هەندێك کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە وەحیەکە وەحی حەقیقی نییە، بەڵکو وەحی ئیلهامە ؟

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال: (٢٢٥٤/٤)، برقم: (٢٩٣٧).

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین: ئەو وتەیە هیچ ئەسڵێکی نییە کە دەڵێن: وەحی ئیلهامە، بەڵکو وەحی حەقیقیە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەم:** پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ..)[١].

واتە: ئا لەو کات و حاڵەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر عیسا، کە کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم هێناوەتە دەر، کەس تواناو دەسەڵاتی کوشتار و شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا، بۆیە هەتا زووە بەندەکانم سەرخە بۆ کێوی (طور).

فەرموودەکە پێشەوا موسلیم ریوایەتی کردووەو فەرموودەکەش زۆر ڕاشکاوانە باسی وەحی حەقیقی دەکات نەك ئیلهام بێت.

**دووەم:** ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە وەحیەکە ئیلهامیە ئەوە زۆر بەهەڵەداچوون، چونکە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێغەمبەرە، بۆیە هیچ ڕێگریەك نییە کە وەحی بۆ دابەزێت.. ئەگەر وا گومان ببەیت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کاتەکەی بەسەر چووەو سیفەتی پێغەمبەرایەتی نەماوە ئەو وتەیە کوفرە، چونکە پێغەمبەران هەرگیزاو هەرگیز دوای مردنیشیان سیفەتی پێغەمبەرایەتیان بەسەر ناچێت.. وە ئەگەر وا گومان ببرێت کە ئەو سیفەتە تایبەتە بە پێغەمبەری ئێمە محەممەد(ﷺ) ئەمەش وتەیەکە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

وە هەر کەسێکیش وشەی (وەحی) تەئویل بکات بە وەحی ئیلهام، ئەوە وا دیارە زۆر نەشارەزایە لە زانستی ئصولی، چونکە زانایان یاسایەکیان هەیەو دەڵێن: (التأويل صرف اللفظ عن ظاهره لدليل، فإن لم يكن لدليل فلعب لا تأويل). کەواتە بە پێی ئەم یاسایە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو جۆرە کەسانەی ئەو بانگەشەیە دروست دەکەن دەیانەوێت فەرموودە وەکو یاری مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال: (٢٢٥٤/٤)، برقم: (٢٩٣٧).

**دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:**

ئەگەر بوترێت: پێغەمبەرمان محەممەد (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا نَبِيَّ بَعْدِي)[1]. واتە: لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نایەت.. کەواتە پێغەمبەر عیسا نایەت و وەحیش نایەت؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێین: مرۆڤ ئەگەر گەیشتە حاڵەتی نەخوێنەواری هەمیشە ئەو پرسیارانەی بە خەیاڵ دێت.. لە کاتێکدا ئەم فەرموودەیە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) نایەت.. بەڵکو مەبەست ئەوەیە شەرعێکی نوێگاری ناهێنێت تا شەریعەتی پێغەمبەرمان محەممەد (ﷺ) نەسخ بکاتەوە..

ئایا تۆ تەنها چوارچێوەو ڕووی فەرموودەکە وەردەگریت، چونکە هەر کەسێك ئەو پرسیارە بکات دەکەوێتە ژێر دوو فەرمان:

یان ئەوەتا دەڵێت: عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دانابەزێت.

یان ئەوەتا دەڵێت: دان بە دانانی پێغەمبەرایەتی عیسا دانانێت..

لە کاتێکدا ڕەتکردنەوەی هەردووکیشیان کوفرە[2].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٨٧٠) باب: من فضائل علي بن أبي طالب، برقم: (٢٤٠٤).

(٢) نزول عيسى بن مريم آخر الزمان، (لا ٥٣ ـ ٥٤) .

## ئایا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) حوکم بە چی دەکات؟

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە پاش هاتنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی هیچ ئاین و شەریعەتێکی نوێ لەگەڵ خۆی ناهێنیت، بەڵکو حوکم بەشەریعەتی ئیسلام دەکات و دەبێتە یەکێك لە شوێن کەوتوانی پێغەمبەر(ﷺ) هەر بۆیە لەکاتی دابەزینی نوێژ لە دوای (محەممەدی مەهدی)یەوە دەکات و ڕازی نیە پێش بکەوێت، پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، قَالَ : فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ : تَعَالَ صَلِّ بِنَا ، فَيَقُولُ: لاَ، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أَمِيرٌ ، لِيُكْرِمَ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ)[1].

واتە: کۆمەڵێك هەر دەمێنن لە ئومەتی من لەسەر هەق شەڕ دەکەن و سەردەکەون هەتا ڕۆژی دوایی، فەرموی: پاشان عیسای کوری مەریەم دادەبەزێت، پێشەوای موسڵمانەکان پێی دەڵێت: فەرموو پێش نوێژیمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێت: نەخێر ئێوە پێشەواکانتان لە خۆتان دەبێت، ڕێزێکە خوا لەم ئومەتەی ناوە.

پێشەوا قورتبی دەڵێ: هەندێ کەس بۆ چوونیان وایە کە بە هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیسا واجباتی شەرعی نامێنێ تاکو هاتنی ئەو نەبێتە پێغەمبەرێکی تر بۆ خەڵکی ئەو سەردەم و هەر بە فەرمانی خوایی فەرمانیان پێدەکات کە ئەمەش واتای ئەوەیە کە پێغەمبەر عیسا نێردراوێکی ترە دوای موحەمەد(ﷺ) کە ئەمەش کارێکی ڕەتکراوەو دوورە لە ڕاستی.

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٧/٤) ورقمه (١٥٦).

بەرگی سێیەم

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ؟)[1].

واتە: دەبێت چۆن بێت کاتێك کە کوری مەریەم لەناوتاندا دادەبەزێت و بەوەی خۆتان پێشەوایەتیتان دەکات.

لەم فەرمودەیەدا مەبەست ئەوە نیە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لە نوێژدا پێشیان دەکەوێ، چونکە ئەم فەرمودانەی کە پێشتر باسمان کرد وادەگەیەنێ کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێش نوێژی ڕەت دەکاتەوەو ئەو پێشەوایە پێش دەخات کە قامەتی نوێژەکەی بۆ کراوە.

وە نوێژکردنی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە پشت مەهدیەوە بە واتای ئەوە نییە مەهدی لە عیسا (سەلامی خوا لێ بێت) چاکترە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی کرد لە پشت ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) لەو نەخۆشیەی کە تیایدا کۆچی دوایی کرد، هەروەها نوێژی کردووە لە پشت عبدالرحمانی کوری عەوفەوە(ﷺ)، پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) نوێژ دەکات لە پشت پیاوێك لە ئوممەتی پێغەمبەر محەممەد (ﷺ) بۆ ئەوەی ئاشکرای بکات کە شوێنکەوتووی ئیسلامەو بە شەرعەکەی حوکم دەکات، لە دوای ئەوەش مەهدی شوێنکەوتووی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەبێت و یەکێك دەبێت لە سەربازەکانی.

لەوانەیە کەسانێك پرسیار بکەن و بڵێن: ئایا دروستە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) پێش نوێژی بۆ موسڵمانان بکات؟

لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر... هەرگیز.. لەبەر ئەوەی ئەگەر پێش نوێژیان بۆ بکات ئەوە کارێکی ناڕاست ڕوویداوە، بەڵام لە دوای پیاوێکی ئاسایی ئوممەتی پێغەمبەر محەممەد(ﷺ) نوێژ دەکات ئەوەش ئەدەب و ڕێزی پێغەمبەر عیسا دەگەیەنێت (سەلامی خوای لێ بێ).. ئەوەبوو ئەو هەموو ژاوە ژاوە گەورەیەی

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٢٢٢١/٤) ورقم الحديث: (٢٨٩٧).

بەرگی سێیەم

خرایە سەر گوایە عیسا خودایە یان کوڕی خودایە، بۆیە دەبوو وەڵامێکی کردەیی بداتەوە چونکە زۆر جار خەڵکی باوەڕ بە شتێك ناکەن هەتا بە چاوی خۆیان نەبینن.. بۆیە درێژترین تەمەنی دەبێت لەسەر زەوی.

لەم فەرمودانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت سەرکەوتوو سەرفرازن، پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کردون کە چۆن دەبن، هەروەها مەدحیشی کردون.

**ئەم کۆمەڵانە ئەم مەرجانەیان تێدا هاتوەتە دی:**

١) ئەو کۆمەڵانە کوشتار دەکەن بۆ سەرخستنی دین بەبەڵگەی (يقاتلون)، هەروەکو لە فەرمودەکاندا هاتووە (ظاهرين على من ناوأهم) وەکو ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: دوژمنانیان هەڵدەستن بۆیان و لەوەدان کە فرسەتیان لێبهێنن، ئامادەباشی جەنگکردنن لەگەڵیاندا.

٢) ئەوانە چەند کۆمەڵێکن کە بەردەوام هەبوون و هەر دەشبن و دەمێنن بەبەڵگەی (لا تزال طائفة من أمتي).

٣) ئەو کۆمەڵانە بەردەوام لەسەر هەقن چونکە شوێنکەوتەی سەلەفی صالحن، کەواتە شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت دەبن.

٤) بێگومان ئەوانەش کۆمەڵانی سەرکەوتو دەبن، ئەوەش دەبێ بزانین کە ئەو کۆمەڵانە بەردەوام سەرکەوتوو سەرفرازن، بەوەی کە شوێنکەوتوی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبن، نابڕێنەوەو کۆتاییان پێ نایەت هەتا ڕۆژی دوایی، پێویستە ئەوەش بزانین کە هیچ کۆمەڵێك ناتوانێت خۆی لەو کۆمەڵانە دابنێت کە سەرکەوتوو سەرفرازن، ئەگەرچی خێرو چاکەش هەیە بیکەن تاوەکو جیهادی کوشتار لە پێناوی خواو سەرکەوتنی دینی خوادا دەکەن.

پێشەوا وەلیدی کوری موسلیم(ﷺ) دەڵێت: (تَدْرِي مَا أَمَّكُمْ مِنْكُمْ؟ قُلْتُ: تُخْبِرُنِي، قَالَ: فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ))[1].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب فتح القسطنطنية، (٤/٢٢٢١) ورقم الحديث: (٢٨٩٧).

واتە: ئایا دەزانیت بەوەی خۆتان پێشەوایەتیتان دەکات مەبەستی پێ چیە؟ ئەویش گوتی: پێشەوایەتیتان دەکات بە قورئانەکەی خوای گەورەو بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

وە هۆی پێش نەکەوتنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بۆ پێشنوێژی ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) حوکم بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات، ئەمیش وەکو موسڵمانێك لە ئومەتی ئیسلام کار دەکات نەك وەك پێغەمبەرێك کە بەرنامەو شەریعەتی تازەی لەگەڵ خۆی هێنا بێت.

چونکە شەریعەتی قورئانی پیرۆز شەریعەتەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوە، خوای گەورەش بەڵێن و پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە، کە ئەگەر موحەممەد (ﷺ) ڕەوانە کراو ئەوان لە ژیاندا بون، هەموو باوەڕی پێ بێنن و شوێنی بکەون، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾][١].

واتە: کاتێك خودا بەڵێنی پتەوی لە پێغەمبەران وەرگرت کە کتێب و داناییمان بە ئێوەدا، پاشان پێغەمبەرێك هاتە لاتان، ئەمەی لاتانە بەڕاست دادەنێ و دەیسەلمێنێ، دەبێ بڕوای پێ بێنن و یارمەتی بدەن، جا پێیان گوت: ئایا بڕواتان بەوە هەیەو پەیمان و بەڵێنی پتەوتان لەسەر گرێدراوە، گوتیان: بەڵێ بڕوامان هەیە، جا خودا پێی فەرموون: دە لەسەر ئەم بەڵێنە شایەدبن، منیش لەگەڵ ئێوەدا شایەدم، کەوایە هەرکەسێکی لەداهاتوودا لە بەڵێنی پتەوی خۆی ڕوو وەربگێڕێ، ئەوانە فاسیق و لە دین دەرچوون.

---

(١) سورة آل عمران، الآية: (٨١-٨٢).

جا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەبێتە شوێنکەوتەی پێغەمبەرو(ﷺ) شەریعەتی قورئان دەکاتە فەرمان ڕەوا، هەر بۆیە لە دوای ئەو پیاوە صالحەدا نوێژ دەکات ئەمەش شانازیەکی گەورەیە بۆ ئەم ئوممەتە، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: پیاوی وا لە ئێمەدا هەیە عیسای کوڕی مەریەم نوێژی لە دوای دەکات.

لە میانەی وەڵامدانەوەی ئەوان کەسانێك دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەدرۆ دەخەنەوە، وا هەڵدەبەستن ئەگەر دابەزینەکەی هەق بوایە پێچەوانەی ئەم فەمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبوو کە دەفەرموێ: چ پێغەمبەرێك لە پاش من نیەو دابەزینیشی مایەی سڕینەوەی شەرعی پێغەمبەرە(ﷺ).

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەم بەڵگە هێنانەوەیە گەندەڵ و (فاسید)ە، چونکە مەبەست لە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ئەوە نیە کە وەکو پێغەمبەرێك بەشەرعێکی نوێ دابەزێ کە شەرعی ئێمە بسڕێتەوە، نە لەم فەرمودانەو نە لە هی دیکەش شتێك بەو واتایە نیە، بەڵکو وا بەڕاستی هاتوە کە وەك فەرمانڕەوایەکی دادوەر دادەبەزێ، بەشەرعی ئێمە حوکم دەکات، ئەو شتانەش لە شەرعی ئێمەدا زیندو دەکاتەوە کە خەڵکی وازیان لێ هێناوە[1].

پێشەوا سەفارینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئوممەت یەکدەنگن لەسەر دابەزینی، کەسیش لە شەرعزانان لەم بارەوە ناکۆکی نەکردووە، بەڵکو فەیلەسوف و مولحیدەکان نکوڵیان کردووە لەو مەسەلە، لە ناکۆکی ئەوان هیچ بایەخێکی نیە، ئینجا یەکدەنگیش دامەزراوە لەلایەن ئوممەتی ئیسلام کە عیسا دادەبەزێت و بە شەریعەتی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) حوکم دەکات، نەك بە شەریعەتێکی تر، ئەگەر چی بەخۆی شەریعەتێکی بووەو بەوە ناسراوە[2].

پێشەوا صدیق حسن خان (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەکان سەبارەت بە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) زۆرن.

---

(١) شرح النووي على مسلم: (٧٦/١٨).

(٢) لوامع الأنوار البهية (١/ ٩٤ ـ ٩٥).

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بیست و نۆ فەرموودەی لەوانە باسکردووە لە نێوان صەحیح و حەسەن و زەعیف، هەندێکیان لەگەڵ فەرموودەکانی دەجالدا باسکراون، هەندێکیشیان لەگەڵ فەرموودەکانی مەهدیدا، بێجگە لە ئەو شوێنەوارانەی لە هاوەڵانەوە پێمان گەیشتوون و حوکمی فەرموودەیان هەیە، چونکە ئەوە مەسەلەیەك نییە هاوەڵان لە خۆیانەوە قسەی تێدا بکەن، ئینجا فەرموودەکانی باسکردو وتی: تێکڕای ئەوانەی باسمان کردن گەیشتوونەتە ئاستی (متەواتیر) ئەوەش شاراوە نییە بەلای کەسێکەوە شارەزای هەبێت[1].

مامۆستا ئەحمەد شاکر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە کۆتایی بونەوەر مەسەلەیەك نییە هیچ ناکۆکی لەسەر بووبێت لەلایەن هاوەڵانەوە، بەهۆی ئەو هەواڵە ڕاستانەی کە لە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتووەتە دەستمان، ئەوەش مەسەلەیەکی یەکجار ئاشکرایە لە ئاییندا، باوەڕ پێ نەکەری بێباوەڕە[2].

مامۆستا محەممەد ناصرالدین ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەکانی دەجال و دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) متەواتیرن، پێویستە باوەڕمان پێیان هەبێت، بەوەش فریو مەخۆ هەندێك دەڵێن ئەوانە فەرموودەی ئاحادن، چونکە ئەو جۆرە کەسانە نەفامن لەم زانستەدا، کەسیان تێدا نییە بە دوای ڕێگاکانیدا ڕۆیشتبن، چونکە ئەگەر ئەوەیان کردبا دەیانزانی فەرموودەکانی متەواتیرن وەکو سەرانی ئەم زانستە شایەتیان داوە، وەکو پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی و کەسانی تر، جێگەی داخیشە بەڕاستی هەندێك بەبێ شەرمانە لە مەسەلەیەکدا قسە دەکەن کەپسپۆڕی خۆیان نییە، بە تایبەتی کاتێك بوارەکەی بواری ئایین و باوەڕ بێت[3].

---

(١) الإذاعة لما كان ويكون بين يدي الساعة، (لا ١٦٠).

(٢) جامع البيان (٦/ ٣٦٠) تعليق الشيخ أحمد شاكر.

(٣) شرح العقيدة الطحاوية، تحقيق الألباني (٥٦٥).

**پرسیار:** ئایا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) هەژمار دەکرێت؟

**وەڵام:** پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) یەکێکە لە پێغەمبەرانی (أولو العزم) پلەو پایەی بەرزیشی لەلای خوا هەیە، بەشێکیشی هەیە لە هاوەڵێتی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە لە شەوی میعراجدا چاوی پێکەوت و باوەڕی پێی هەبووو لەسەر ئەوەش لە دونیا دەردەچێت (سەلامی خوای لێ بێت).

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ينزل عيسى بن مريم، فإذا رفع من الركوع قال: سمع الله لمن حمده، قتل الله الدجال وأظهر المؤمنين)[١].

واتە: عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دێتە خوارەوە، کاتێك لە رکوع هەڵدەستێتەوە دەڵێت: سمع الله لمن حمده، ئینجا خوای گەورە دەجال دەکوژێت و بە بڕواداارانی نیشان دەدات.

مەبەست لەم فەرمووده ئەوەیە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە نوێژدا دەڵێت: (سمع الله لمن حمده) ئەم زیکرەی نوێژەش تایبەتە بە ئوممەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: (يهبط عيسى بن مريم، فيصلي الصلوات ويجمع الجمع)[٢].

واتە: عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دادەبەزێت هەموو نوێژەکانیش دەکات، وە وتاری هەینیش ئەنجام دەدات.

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە کاتی دابەزینی کار بە شەرعی ئێمە دەکات و هەر پێنج نوێژەکە ئەنجام دەدات

---

(١) أخرجه الهيثمي في (موارد الظمآن إلى زوائد ابن حبان) (٧/ ٣٤٩). وقال البزار رجاله رجال الصحيح.

(٢) أورده المتقي في (كنز العمال) (٧/ ٢٦٧).

و وە نوێژی هەینیش لە هیچ ئوممەتێك نەبووە جگە لە ئوممەتی پێغەمبەری خوا محەممەد (ﷺ).

پێشەوا ئیبنو عەبباس (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (كيف تهلك أمة أنا في أولها وعيسى بن مريم في آخرها، والمهدي من أهل بيتي في وسطها)[1].

واتە: چۆن ئەم ئوممەتە لەناو دەچێت من لەسەرەتاکەی بم و عیسای کوڕی مەریەم لە کۆتاییەکەی بێت و مەهدی لە ئال و بەیتی من لە ناوەڕاستەکەی بێت.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ئیش بە چ مەزهەبێکی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات؟

لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێم: هەر کەسێك ئەو پرسیارە بکات من سەرسوڕمان دەبم چونکە لەو سەردەم کەس بە خەیاڵی ئەوە نایەت کە لەسەر چ مەزهەبێکە، چونکە موسڵمانان لەو سەردەم یەکگرن و یەك دەستن، وە موجتەهیدەکانی ئەو سەردەمە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن، تەنانەت هەر یەك لە هاوەڵان و تابیعی و تابیعی تابیعی مەزهەبێکی سەربەخۆیە، بەڵام چوار مەزهەب لە هەموویان ناودارترن ئەوانیش پێشەوایان (مالیك و ئەبو حەنیفەو شافیعی و حەنبەلی)ە، (ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت)، ئەگینا مەزهەبی (سوفیانی کوڕی عویینە) و مەزهەبی (سوفیانی سەوری)و مەزهەبی (لەیسی کوڕی سەعد)و مەزهەبی (ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویە)ی و مەزهەبی (ئیبنو جەریر) هەیە.. هتد.

## وەفاتکردنی محەممەدی مەهدی

دواتر محەممەدی مەهدی وەفات دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن..

پێشەوا سولەیمانی کوڕی عیسا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێم گەیشتووە کە مەهدی چواردە ساڵ لە بەیت و المقدیس دەمێنێتەوە، پاشان

(١) أخرجه المتقي الهندي في (كنز العمال) (٧/ ٣٠٣).

بەرگی سێیەم

وەفات دەکات، لە دواییدا پیاوێك دێت پێی دەڵێن: (ئەلمەنصور) ئەویش بیست و یەك ساڵ لە بەیتوالمەقدیس دەمێنێتەوە[1].

پێشەوا زوهری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو کاتەی کە محەممەدی مەهدی وەفاتی کرد فیتنەیەکی زۆر دروست دەبێت، دواتر پیاوێك لە بەنی مەخزوم دەسەڵات دەگرێتە دەست[2].

پێشەوا کەعب (ﷺ) دەڵێت: لە پاش وەفاتکردنی مەهدی پیاوێك دێت لە خەڵکی یەمەنە لە قەحتان.. ئا ئەو پیاوە شاری ڕۆم ئازاد دەکات[3].

پێشەوا أرطاة (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێم گەیشتووە کە محەممەدی مەهدی چل ساڵ دەژی، پاشان لەسەر جێگاکەی وەفات دەکات، دواتر پیاوێك لە قەحتان دەردەچێت و هەردوو گوێچکەکانی کونە، بیست ساڵان دەمێنێتەوە دواتر بە چەك دەیکوژن[4].

ئایا لە دوای وەفاتی محەممەدی مەهدی (ئەلمەنصور دەسەڵات دەگرێتە دەست یان پیاوەکەی بەنی مەخزوم یان قەحتانی)؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارە پێشەوا کەعب (ﷺ) دەڵێت: یەکەمجار قەحتانی دەسەڵات دەگرێتە دەست لە پاشان پیاوە بەنی مەخزومیەکە بۆ ماوەیەك لە پاشان (ئەلمەنصور) دەسەڵات دەگرێتە دەست.

---

(١) ضعيف جدا: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١١٣٣). بسند ضعيف جدا.

(٢) ضعيف: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١٣٣٥). وفيه الوليد، مدلس، وشيخه مجهول.

(٣) ضعيف: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (١١٩٠). بسند ضعيف .

(٤) صحيح: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (٢٦٤). بسند صحيح .

## بیروباوەڕی گاورەکان و جولەکەکان
## لە مەڕ دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)

گاورەکان باوەڕیان وایە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) کوڕی خوایە (خوای گەورەش لەوە مەزنترە کوڕی هەبێت)، و وا دەزانن کوژراوەو لە خاچدراوەو بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان لە پاش سێ ڕۆژ لە کوژران و لە خاچدانی لە ئاسمان بە تەنیشت باوکیەوە (پەروەردگار) دانیشتووەو لە کۆتایی بونەوەردا دادەبەزێت[1].

خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان یەکدەنگن لەسەر جێگیرکردنی دوو مەسیح :

١- مەسیحێکی ڕێنموونی لە نەوەی (داود)ە (سەلامی خوای لێ بێت)، کە ئەوەش پێغەمبەر عیسایە (سەلامی خوای لێ بێت).

٢- مەسیحێکی گومڕاش، کە دەڵێن لە نەوەی یوسفە (سەلامی خوای لێ بێت) کە ئەویش مەسیحی دەجالە.

بیروباوەڕی گاورەکان جیاوازە لە بیروباوەڕی موسڵمانان دەربارەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)، لە چەند مەسەلەیەکدا:

١- گاورەکان باوەڕیان وایە عیسا کوڕی خوایە، ئەوەش قسەیەکی پووچەڵە، ڕاستیش ئەوەیە ئادەمیزادو بەندەو پێغەمبەرە.

---

(١) الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح، ابن تیمیة (٢/ ١٨٧).

بەرگی سێیەم

٢- گاورەکان باوەڕیان وایە کە جوولەکەکان هەڵساون بە کوشتن و لە خاچدانی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)، ئەوەش قسەیەکی پوچەڵە، ڕاستیش ئەوەیە نە کوشتویانەو نە لەخاچیان داوە.

٣- گاورەکان باوەڕیان وایە کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) پاش لە خاچدانی بە سێ ڕۆژ بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان و ئەوەش قسەیەکی بەتاڵە، بەڵکو خوای گەورە بەرزی کردووەتەوە بۆ ئاسمان بێ ئەوەی لە خاچدرابێت یان کوژرابێت[١].

بۆیە هەر سێ ئوممەتی (ئیسلام و جولەکەو گاور) لە چاوەڕوانی دەرچوونی دەجالن لە کۆتایی بونەوەر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو ئوممەتەکان ئاگادارکراونەتەوە بە دەرچوونی دەجال، بۆیە:

موسڵمانەکان لە چاوەڕوانی دابەزینی پێغەمبەر عیسادان (سەلامی خوای لێ بێ) لە ئاسمانەوە، بۆ ئەوەی صەلیب بشکێنێت و بەراز بکوژێت.

جولەکەکان لە چاوەڕوانی دەرچوونی کەسێکن لە نەوەی داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) هەر کاتێك هەردوو لێوەکانی جولا بە دۆعا و پاڕانەوە هەموو ئوممەتەکانی تر دەمرن، ئەوە ئەو مەسیحە چاوەڕوانکراوەیە لای جولەکەکان کە بە دەجال ناسراوە، بەڵام لە ڕاستیدا مەسیحی هیدایەت عیسای کوری مەریەمە (سەلامی خوای لێ بێ)[٢].

لە تلمود[٣] گەورەترین خاڵی سەرەکی لە عەقیدەی جولەکەکان لە جیهانی

---

(١) الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح، ابن تيمية (٢/ ١٨٧).

(٢) إغاثة اللهفان (٢/ ٤٦٢).

(٣) تلمود: دووەم گتێبی پیرۆزە لای جولەکەکان، کتێبی یەکەمیان تەوراتە یان (العهد القديم) کە خوای گەورە دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێ) بەڵام زاناکانی جولەکە هەستان بە دەستکاری کردنیان بە پێی سەردەم.
تلمود دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: یەکەمیان: مەتن، دووەمیان: مەشنا کە لەلایەن بەشێك لە زانایانی جولەکە نوسراوەتەوە کە لە فەڵەستین دەژیان لە نێوان سەدەی یەکەم تا کۆتایی سەدەی هەشتەم. سەرچاوە/ المسيح الدجال منبع الكفر والضلال، لا ١٢.

دونیا عەقیدەی مەسیحی دەجاله(مسیا) که له کۆتایی بونەوەر دەردەکەوێت، وه جولەکە دەست بەسەر هەموو دونیادا دەگرێت.

زۆربەی ئەو زانایانەی که تلمودیان نوسیەوه له تائیفەی فەریسیەکان بوو که له توندترین تائیفەی جولەکەکانن له بوختان کردن و ستەمکردن، له کاتێکدا عیسای کوری مەریەمیان به درۆ خستەوەو که له پێشتردا پێغەمبەران موژدەی هاتنیان دابوو، وه بڕوایان به مەسیحی دەجال (مسیا) هەیە که له ئاخیر زەمان دەردەچێت.

ڕێنماییەکان له تلمود و تەوراتی دەستکاری کراو زۆره سەبارەت به هەواڵەکانی (مسیا) که حوکمی هەموو جیهان دەگێڕێت، وه له نەوەی داود پێغەمبەره (سەلامی خوای لێ بێ) کۆمەڵێك بابەتی سەیرو سەرمەرەی تێدایە، وه شوێنکەوتووان و سەرکەوتووانی جولەکەکانن، وه لەگەڵ هاتنی (مسیا) جولەکەکان دەبنه گەورەی خەڵکی، وه هەڵدەستن به دروستکردنی دەوڵەتێك له جیهان[1].



### (مسیا) دەجال دەرناچێت ئیلا دەبێت جولەکەکان هەموویان کۆببنەوە:

له هەموو وڵاتێکی سەر زەویەوه بەرەو خاکی پیرۆزی فەلەستین دەبێ کۆببنەوە، ئەوه ئەو کارەیەکه جولەکەکان هەوڵی بۆ دەدەن، که دەیانەوێت دەوڵەتێکی ئیسرائیلی بخەنه سەر پێیەکانیان، وه ئێستا کار بۆ ئەوه دەکرێت که جولەکەکانی یەکێتی سۆڤیەتی و یان ئەوانەی لەوێ ماون بۆ ئەوەی له (الضفة الغربية) نیشتەجێ بن که ئەوان ناویان ناوه (يهودا والسامره)، سەرەتای ئەوەش چەندین جار دووپات کراوەتەوه که لەلایەن بن جۆریۆن وه کۆتایی هاتووه به ئیسحاق شامیر.

هەندێك له زانایانی جولەکە دەڵێن: کەی جولەکەکان کۆبوونەوە ئەو کات مەسیحی چاوەڕوانکراوی جولەکەکان دەردەچێت، بۆیە پێویست به دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیلی ناکات هەتا مەسیحی دەجال دەردەچێت.

---

(١) المسيح الدجال منبع الكفر والضلال، لا ١٣.

وە دەرچوونی دەجالیش لە کاتێکدا دەبێت سەروەت و سامانی هەموو جیهان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی، وە ئەمڕۆش دەستیان گرتوە بەسەر هەموو ماڵ و دارایی جیهانی ئەمەش بە واسیتەی ڕیباو غەش و فێڵ و وەسائیلی شەرعی و غەیری شەرعی، تەنانەت ئەو خەزێنە گەورانەی جیهان هەموو لە ژێر دەستی جولەکەکانە.

# گەڕانەوەی خۆشی و ئاساییش و خێرو بەرەکەت لەسەردەمی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)



پاش ئەو هەموو ناخۆشی و نەهامەتی و شەڕو کاولکاری و برسێتیەی دوو چاری مرۆڤایەتی بە گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی دەبێت لە پاش جەنگە جیهانییە گەورەکەو لە سەردەمی دەجالدا، وە پاش ئەوەی کە دەسەڵاتی کوفری جیهانی ڕیشە کێش دەکرێت و دەجالی جادووگەر بە دەستی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەکوژرێت، ئیسلام وەکو دەسەڵات و حوکم دەگێڕدرێتەوە گۆڕەپانی ژیان و موسڵمانان دەبنە هێزی یەکەم لەسەر زەوی ئیتر خوای گەورە دەرگای ڕەحم و بەرەکەتی خۆی واڵا دەکات و خۆش گوزەرانی و ئاساییش و دادوەری بەجۆرێك باڵ بەسەر زەویدا دەکێشێت کە لە مێژوودا مرۆڤایەتی شتی وای بەخۆوە نەبینوە.

پێشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (طوبى لعيشٍ بعدَ المسيحِ يُؤذنُ للسماءِ في القِطَر، ويؤذنُ للأرض في النبات، حتى لو بُذِرَتْ حبَّةٌ على الصفا لَنَبَتَ، وحتَّى يمرَّ الرجلُ على الأسدِ فلا يضُرهُ، ويطأ على الحيَّةِ فلا يَضُّرهُ ولا تشاحَ ولا تحاسد ولا تباغض)[1].

واتە: ئافەرین و خۆشی بۆ ژیانێك کە لە دوای مەسیح دێت، فەرمان دەدرێت بە ئاسمان کە ببارێت، وە فەرمان دەدرێت بە زەوی کە سەوز بێت، تەنانەت ئەگەر دەنکە تۆوێك لەسەر بەردی ڕەق بچێنرێت دەڕوێت، وە پیاو بەلای شێردا بڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت، وە پێی بنێت بەسەر ماردا زیانی پێ ناگەیەنێت، نەناکۆکی دەمێنێت، نەحەسودی، نە ڕق و قینە.

---

(١) صحيح، رواه أبوبكر الأنباري والديلمي والضياء، (٥٥٩/٤) برقم: (١٩٢٦).

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:
(..فَيَكُونُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ فِي أُمَّتِي حَكَمًا عَدْلًا، وَإِمَامًا مُقْسِطًا، يَدُقُّ الصَّلِيبَ، وَيَذْبَحُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَتْرُكُ الصَّدَقَةَ، فَلَا يُسْعَى عَلَى شَاةٍ، وَلَا بَعِيرٍ، وَتُرْفَعُ الشَّحْنَاءُ، وَالتَّبَاغُضُ، وَتُنْزَعُ حُمَةُ كُلِّ ذَاتِ حُمَةٍ، حَتَّى يُدْخِلَ الْوَلِيدُ يَدَهُ فِي فِي الْحَيَّةِ، فَلَا تَضُرَّهُ، وَتُفِرَّ الْوَلِيدَةُ الْأَسَدَ، فَلَا يَضُرُّهَا، وَيَكُونَ الذِّئْبُ فِي الْغَنَمِ كَأَنَّهُ كَلْبُهَا، وَتُمْلَأُ الْأَرْضُ مِنَ السِّلْمِ كَمَا يُمْلَأُ الْإِنَاءُ مِنَ الْمَاءِ، وَتَكُونُ الْكَلِمَةُ وَاحِدَةً، فَلَا يُعْبَدُ إِلَّا اللَّهُ، وَتَضَعُ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا، وَتُسْلَبُ قُرَيْشٌ مُلْكَهَا، وَتَكُونُ الْأَرْضُ كَفَاثُورِ الْفِضَّةِ، تُنْبِتُ نَبَاتَهَا بِعَهْدِ آدَمَ حَتَّى يَجْتَمِعَ النَّفَرُ عَلَى الْقِطْفِ مِنَ الْعِنَبِ فَيُشْبِعَهُمْ، وَيَجْتَمِعَ النَّفَرُ عَلَى الرُّمَّانَةِ فَتُشْبِعَهُمْ، وَيَكُونَ الثَّوْرُ بِكَذَا وَكَذَا مِنَ الْمَالِ، وَتَكُونَ الْفَرَسُ بِالدُّرَيْهِمَاتِ..)[1].

واتە: عیسای کوڕی مەریەم لە ئومەتەکەمدا دەبێتە حاکمێکی دادپەروەرو پێشەوایەکی ڕێك و ڕاست، خاچ دەشکێنێت و بەراز سەر دەبڕێت و لەناوی دەبات، سەرانە لادەبات و پارە بەخشین واز لێ دێنێت (ئەمەش ئاماژەیە بۆ پارە زۆر بوون و دەوڵەمەندی خەڵکی دەست لە مەڕو ماڵات و وڵاغ هەڵدەگرێت، ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەوەندە زۆر دەبێت خەڵك پێویستی پێ نامێنێت)، وە دووبەرەکی و ڕق و کینە هەڵدەگیرێت، تەنانەت منداڵ دەست دەخاتە ناو دەمی مارەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، منداڵ ئازاری شێر دەدات کەچی زیانی پێ ناگەیەنێت، وە گورگ لەناو ڕانە مەڕدا وەکو سەگی پاراستنی لێ دێت، وە زەوی پڕ دەبێت لە ئاشتیو ئارامی، هەروەك چۆن جام پڕ دەبێت لە ئاو، وە خەڵکی هەموو یەك قسە دەبن و غەیری خوا کەسی تر ناپەرسترێت، وە جەنگ و کوشتار کۆتایی پێ دێت و نامێنێت، وە (قوڕەیش) دەسەڵاتی لێ دەستێندرێتەوە، وە زەوی وەکو دەفری زیوی لێ دێت، وەکو سەردەمی ئادەم ڕووەکی لێ دەڕوێت، بە جۆرێك کە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر گۆڵە ترێ یەك کۆدەبنەوەو تێریان دەکات، وە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر هەنارێك کۆدەبنەوەو تێریان دەکات، وە نرخی گایەك بەوەندەو بەوەندە دەبێت، وە نرخی ئەسپ دەبێتە چەند دیرهەمێك.

---

(١) ضعيف: سنن ابن ماجة (٢/ ٢٠٠) كتاب: الفتن باب: فتنة الدجال، برقم: (٤٠٧٧). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

پێشەوا نەواسی کوری سەمعان(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ مَطَرًا لَا يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلَا وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الْأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلْأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ، وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا، وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ، حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الْإِبِلِ لَتَكْفِي الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ لَتَكْفِي الْقَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنَمِ لَتَكْفِي الْفَخِذَ مِنَ النَّاسِ..)[١].

واتە: لە پاشان خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت تا ئەوەی نە کەلاوەو نە خانووی نامێنێ کە ئەم بارانەی بەر نەکەوێ وە زەوی وەکو ئاوێنە ڕۆشن و پاك دەبێتەوە، پاشان فەرمان بە زەوی دەکرێ کەوا شینایيت دەرخەو بەرەکەت بڕوێنە، جا لەو سەردەمدا کۆمەڵێك خەڵك تاکە هەنارێك دەخۆن (ئارەزووی خواردنیان نامێنێ لە خۆشی) وە لە ژێر سێبەرەکەیدا دادەنیشن، وە خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە شیری ئاژەڵەوە تا ئەوەی بادیە شیرێکی وشتر بەشی کۆمەڵێك لە خەڵك دەکات وە بادیە شیرێك لە شیری مانگا بەشی هۆزێك لە خەڵك دەکات، وە بادیە شیرێك لە شیری مەڕو بزن بەشی کۆمەڵێك لە خەڵکی دەکات.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: خوای گەورە لەو سەردەمیدا دەجال لە نێو دەبات و هێمن و ئاسایش بەر قەرار دەبێت و هێمنی و ئاشتی زەوی دادەپۆشێ تا ئەوەی دڕندە لەگەڵ وشترو چێڵ دەلەوەڕێن وە گورگ لەگەڵ بزن و مەڕ ئاو دەخۆنەوەو منداڵان یاری بە مار دەکەن و زیانیان پێ ناگەیەنێت[٢].

پێشەوا موسلیم ئەم زیادەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: خەڵکی واز دەهێنن لە ماڵ و سامان دڵیان لەسەری دەڕوات تا ئەوەی کە زەکاتیش وەرنا گرن[٣].

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٥٠) باب: ذكر الدجال، برقم: (٢٩٣٧).

(٢) مسند الإمام أحمد (٢/ ٤٠٦).

(٣) صحيح مسلم (٢/ ١٩٠) مع شرح النووي.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەو سەردەمی خەڵك خۆیان بە دوور دەگرن لە ئاژەڵ داری و وشتر بەخێوکردندا لەبەر زۆری ماڵ و سامان و هیوا کورت بونەوەو پێویست نەبوونی و زانینی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: واتە: کەس زەکاتەکەی لێ وەرناگرێ لەبەر ئەوەی کەس نیە زەکاتی لا پێویست بێ، بەڵام پێشەوا نەوەوی ئەم قسەیەی بە دوور داناوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..وَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلَّا الْإِسْلَامَ..)[1].

واتە: لەسەردەمی عیسادا خوای گەورە هەموو ئاینەکان لەناو دەبات تەنها ئیسلام نەبێت.

بۆیە ئێمە وەکو موسڵمانێك لەسەرمان پێویستە باوەڕی تەواومان بە بەڵێن و موژدەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەبێت کە چۆنی باسکردووە ئاوا دێتە دی، وە دڵنیاشین کە تەنها ئیسلام ڕزگارکەری مرۆڤایەتیە تەنها لە سایەی ئیسلامیشدا ئاشتیو ئاساییش و دادپەروەری دەگەڕێتەوە سەر زەوی، وە داواکارین لە خوای پەروەدگار کە لەو کۆمەڵە موجاهیدانەمان بگێڕێت کە دەربارەیان دەفەرموێت: (عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللَّهُ مِنَ النَّارِ، عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ، وَعِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[2].

واتە: دوو کۆمەڵ لە ئومەتەکەم خوای گەورە لە ئاگر پاراستونی، کۆمەڵێك غەزای هیندیستان دەکەن، وە کۆمەڵێك لەگەڵ عیسای کوری مەریەم دا دەبن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلاً فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ

---

(١) صحيح: سنن ابو داود (٦/ ٣٧٦) كتاب: باب: خروج الدجال، برقم: (٤٣٢٤). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٢) سنن النسائي (٦/ ٤٢) باب: غزوة الهند، برقم: (٣١٧٥).

الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)[1].

واتە: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە نزیك بووە (عیسای کوڕی مەریەم)تان وەکو فەرمانڕەوایەکی دادگەر تێدا دابەزێ، جا خاچ دەشکێنێو بەراز دەکوژێ و شەڕ کۆتا دێنێ و ماڵ زۆر دەبێ تا یەکێك نابێ وەریگرێ، هەتا وای لێ دێ تاکە سوژدەیەك چاکتر دەبێ لە دونیا و ئەوەی تێی دایە.

(يَكْسِرَ الصَّلِيبَ) خاچی گاورەکان دەشکێنێت، ئەو خاچەی کە ئەوان دەڵێن عیسای لەسەر کوژراوە، کە هێماو سونبولی ئەوانە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دیشکێنێت.

(وَيَقْتُلَ الْخِنْزِير) بەراز ئاژەڵێکی ناسراوە[2]، خواردنی گۆشتەکەی لە ئیسلامدا

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ٢٠٥) كتاب: الأنبياء، باب نزول عيسى بن مريم، برقم: (٣٤٤٨).

(٢) بەراز ئاژەڵێکی تەمبەڵە، ڕووەکە ئاژەڵ و لاك و زبڵ دەخوات، هەروەها پیسایی خۆی و پیسایی ئاژەڵەکانی تر دەخوات، کوشتنی بەرازیش لەلایەن عیساوە بە واتای ئەوە نییە کە بەراز بەبێ حیکمەت دروست کراوە، چونکە هەموو ئاژەڵێك خوای گەورە دروستی کردووە بۆ خواردن پیس نییە، چونکە خوای گەورە سەگ و گورگ و مێشوولەو مێشی دروست کردووە نەك بۆ ئەوەی گۆشتیان بخورێت، بەڵام خواردنی گۆشتەکەی حەرام کردووە لە ئیسلامدا.

لەلای جوولەکەکان:

لە تەوراتدا هاتووە: بەراز لەبەر ئەوەی بە سمی دەدڕێت، بەڵام کاوێژ ناکات بۆیە گڵاوە بۆ ئێوە، لە گۆشتەکەی مەخۆنە دەست بەلاشەیەوە مەدەن.

لەلای گاورەکانیش:

لە ئینجیلدا هاتووە: (بوتروس گوتی) نەخێر ئەی پەروەردگار، چونکە من هەرگیز شتی پیس و گڵاوم نەخواردووە، هەروەها وتم: نەخێر پەروەردگارم چونکە هەرگیز شتی پیس و گڵاو نەچووەتە نێو دەمم.

ئەو گاورانەش کە باوەڕیان هەیە بە هاتنە خوارەوەی مەسیح جارێکی تر، لە ڕۆژی حەوتەمدا گۆشتی بەراز ناخۆن. بە هەمان شێوە هندۆسییەکان خواردنی گۆشتی بەراز بە قەدەغە دەزانن و هیندیەکانی کۆمەڵی عالیایش هەر خواردنی بە عەیبە شورەیی دەزانن، تەنها کۆمەڵە نزم و بێ بایەخەکان گۆشتی بەراز دەخۆن.

بەرگی سێیەم

حەرامە، بۆیە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمان دەکات بە لەناوبردنی بۆ زیاتر جەختکردنەوە لەسەر قەدەغە بوونی.

بۆیە لەلای هەر یەکێکیان سوژدەیەك لە دونیا خۆشەویستر دەبێ، چونکە گەلێك ئارەزووی خێرو چاکە دەکەن بەدیتنی پێغەمبەر عیسا.

---

زەردەشتیەکانیش بە هەمان شێوە خۆیان لە خواردنی گۆشتی بەراز بە دوور دەگرن، بووزیەکانیش هەرگیز دەست بە بەرازەوە نادەن.

لە کتێبی (مناسك الحج الصيني)دا پەندێك هەیە دەڵێ: (پیاوی بەرێز گۆشتی بەرازو سەگ ناخوات).

لە بیست ساڵی کۆتاییدا توێژەرەوەکان هەڵساون بە دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان هەڵسوکەوتی مرۆڤ و بیرکردنەوەی لە نێوان ئەو شتانەی کە دەیخوات، بەوەش گەیشتن کە ئێمە هەڵسوکەوتەکانمان دەگۆڕین و بە پێی گۆڕینی ژەمەکانی خواردنمان، ئەوەشیان تێبینی کرد کە ئەوان خواردنی نا تەندروستی دەخۆن زیاتر سەرپێچی دەکەن لەو کەسانەی کە ئەو جۆرە خواردنانە ناخۆن، هەروەها لە ناوەندەکانی چاودێری هەرزەکاران بینیان کە پتر خواردنی سەوزەو میوە گوێڕایەڵیان زیاد دەکات بۆ یاساکان.

بەراز دەژی شتە پیسەکان دەخوات، وێڕای ئەوەش کە ئاژەڵێکە گوێ نادات بە کردەوەی نێرەکانی تر لەگەڵ بەرازە مێینەکەدا، واتە: ئاژەڵێکی زۆر بێ غیرەتە، بە پێچەوانەی ئەو ئاژەڵانەی کە بەرگری دەکەن لە مێینەکانیان، بۆیە خواردنی گۆشتی بەراز کاریگەری هەیە لە لاوازکردنی غیرەتی پیاو بەسەر هاوسەرو خوشكە دایکیداو مەسەلەکە بەبێ بایەخ وەردەگرێت.

خوای گەورەش بەرازی وەسفکردووە بەوەی کە (رجس)ە، واتە: پیسە گڵاوە، بەراز هەڵدەستێت بە گواستنەوەی زۆرێك لە زیندەوەرە وردەکان چونکە بەراز تووش دەبێت بە ژمارەیەکی زۆر لە نەخۆشیە پەتاییەکان کە دەگاتە (٤٥٠) نەخۆشی، هەروەها ڕۆڵی گوێزەرەوە دەبینێت بۆ زیاتر لە (٧٥) نەخۆشی پەتایی بۆ مرۆڤەکان، ئەمە جگە لە نەخۆشییە ئاساییەکان کە خواردنی گۆشتەکەی دەبێتە هۆکاری وەکو (تليف الكبد) و (تصلب الشرايين) و (العقم) و وێڕای ئەوەش کە خواردنی گۆشتەکەی دەبێتە مایەی تووشبوون بە سڕبوونی هەست و بێ غیرەتی لەسەر ئافرەتە مەحرەمەکان.

زیاتر لە (١٦) نەخۆشیش لەبەرازەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لە ڕێگەی خواردنی گۆشت و بەرهەمەکانی، گرنگترین ئەو نەخۆشیانە: (الحويصلات الخنزيرية) و (الحمى المتموجة) و (الدورة الكبدية) و (السل) و نەخۆشی تر.

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (وَاللهِ، لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ، وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ، وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا، وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ)[1].

واتە: سوێند بەخوا کوڕی مەریەم وەك فەرمانڕەوایەکی دادوەر دادەبەزێ، جا خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە هەڵدەگرێ و حوشتری نێرو مێ واز لێ دەهێندرێ و کەس ئیشی پێ ناکا، دوژمنایەتی و ڕق و کینە و ئیرەیی (حەسودی) بەرامبەر یەکتر نامێنێ، خەڵك بانگ دەکرێ ماڵی پێ بدەن هیچ کەس قبوڵی ناکات.

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) سەرجەم ئایینەکان لە نێو دەبات، بێجگە لە ئیسلام چی دی لەکەس قبوڵ ناکا، لەبەر ئەوە خاچ دەشکێنێ کە ڕەمزی نەصرانیەتی شێوێندراوە، بەراز دەکوژێ کە ئیسلام حەرامی کردووە، سەرانە هەڵدەگرێ، باجی سەر لە جولەکەو دیانەکان وەرناگرێ، لە موسڵمان بوون هیچی تر قبوڵ ناکات.

وەرنەگرتنی سەرانەش بە نەسخ ناژمێردرێ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕایگەیاندووە تاکو دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) سەرانە قبوڵ دەکرێ، پاشان قبوڵ ناکرێ.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (ويضع الجزية) واتە: چی دی قبوڵی ناکاو لە موسڵمان بوون بترازێ چیدی لە بێ بڕوایان قبوڵ ناکاو، ئەوی سەرانەشی بداتێ وازی لێ ناهێنێ، لە ئیسلامەتی یا کوشتار بترازێ چی دی قبوڵ ناکا.

جا لەوانەیە بگوترێت: ئەمە پێچەوانەی حوکمی شەرعە لەم ڕۆژگارەدا، چونکە ئەگەر گاور و جولەکەکان سەرانەیان دا واجبە لێی قبوڵ بکرێ و کوشتنی دروست نیەو نابێ بۆ موسڵمانبوونی زۆری لێ بکرێ؟

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب نزول عيسى: (١٣٥/٤) ورقمه (١٥٥).

بەرگی سێیەم

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین: ئەم حوکمە تا ڕۆژی دوایی بەردەوام نیە، بەڵکو لە سەردەمی پێش پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) وابەستەیە، پێغەمبەریش(ﷺ) لە فەرمایشتەکانیدا نەسخی ئەو حوکمەی پێ ڕاگەیاندوین، بۆیە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) نیە کە حوکمەکە لادەباو هەڵیدەگرێ، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) سڕینەوەکەی ڕون کردۆتەوە، ئەگینا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) هەر بەشەرعی ئێمە حوکم دەکات[1].

## قودس دەبێتە پایتەخت

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی حەواله(ﷺ) دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پیرۆزی لەسەر سەری دانام، لە پاشان فەرمووی: ئەی کوڕی حەواله!

(إذا رأيت الخلافة نزلت الأرض المقدسة، فقد دنت الزلازل والبلابل والأمور العظام، والساعة يومئذ أقرب من الناس)[2].

واتە: هەر کاتێك خیلافەت لەسەر خاکی قودس بینی، ئەو کات بزانە نزیکە بومەلەرزەو زۆربوونی غەم و پەژارە.. ڕۆژی دوایی لەو ڕۆژیدا نزیکترینە لە خەڵکی.

ئەم فەرموودە بەڵگەیەکی ڕوونە کە خیلافەی ئیسلام لەسەردەمی محەممەدی مەهدی و پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە قودس دەبێت، وە بنچینەکەی خاکی فەڵەستینە، وە مەقەڕەکەی مزگەوتی ئەقصایە هەروەکو لە ئایەتی دووی سوڕەتی ئیسراء هاتووە.

---

(١) شرح النووي مسلم : (١٩٠/٢).

(٢) جامع الأصول (١٠/ ٤٠٢) قال صاحب في التهذيب: والإسناد لا بأس به. وقال الحاكم في (المستدرك): صحيح الإسناد.

## پێغەمبەرمان محەممەد(ﷺ) داوامان لێ دەکات سڵاو بەپێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بگەیەنین

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يُوشِكُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ أَنْ يَنْزِلَ حَكَمًا قِسْطًا، وَإِمَامًا عَدْلاً، فَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ، وَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَتَكُونَ الدَّعْوَةُ وَاحِدَةً ، فَأَقْرِئُوهُ، أَوْ أَقْرِئْهُ السَّلاَمَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَأُحَدِّثُهُ فَيُصَدِّقُنِي، فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ ، قَالَ: أَقْرِئُوهُ مِنِّي السَّلاَمَ)[1].

واتە: نزیکە مەسیح عیسای کوری مەریەم دابەزێتە ناوتان وەکو فەرمانڕەوایەکی دادپەروەرو پێشەوایەکی ڕاست، بەراز بکوژێت و خاچ بشکێنێت و بانگەواز ببێتە یەك بانگەوازو سەلامی پێغەمبەری خوای پێ بگەیەنە.. جا کاتێك ئەبو هورەیرە گەیشتە سەرەمەرگ فەرمووی: سەلامی منی پێ بگەیەنن.

لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتووە لە پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وَاللَّهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَإِنْ عَجِلَ بِي مَوْتٌ، وَلَمْ أَلْقَهُ، فَمَنْ لَقِيَهُ مِنْكُمْ فَلْيُقْرِئْهُ مِنِّيَ السَّلَامَ)[2].

واتە: هیوادارم ئەگەر خوا تەمەنم بدات چاوم بە عیسا بکەوێت، ئەگەر پێش ئەو بمرم و کەسێکتان بینیتان سەلامی منی پێ بگەیەنن.

لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتووە لە پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيَهْبِطَنَّ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلًا، وَإِمَامًا مُقْسِطًا وَلَيَسْلُكَنَّ

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٣٩٤) برقم: (٩١١٠). قال شعيب الأرناؤوط: المرفوع منه صحيح وهذا إسناد حسن.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٣٩٩) برقم: (٧٠٧١). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

فَجًّا حَاجًّا، أَوْ مُعْتَمِرًا أَوْ بِنِيَّتِهِمَا وَلَيَأْتِيَنَّ قَبْرِي حَتَّى يُسَلِّمَ وَلَأَرُدَّنَ عَلَيْهِ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَيْ بَنِي أَخِي إِنْ رَأَيْتُمُوهُ فَقُولُوا: أَبُو هُرَيْرَةَ يُقْرِئُكَ السَّلَامَ)[1].

واتە: عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) دادەبەزیٚت وەکو فەرمانڕەوایەکی مافپەروەرو پیٚشەوایەکی ڕاست و ڕیٚگەیەکیش دەگریٚت بۆ حەج یان عومرە، یان بە نیەتی هەردووکیانەوەو دیٚتە لای گۆڕەکەشم و سەلامم لیٚ دەکات و سەلامەکەی وەڵام دەدەمەوە، ئەبو هوریرە فەرمووی: ئەی برازاکانم ئەگەر بینیتان بڵیٚن: ئەبو هوریرە سەلامتان لیٚ دەکات.

پیٚشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەڵیٚت: (والذي نفسي بيده لينزلن عيسى بن مريم ثم لئن قام على قبري وقال: يا محمد لأجيبنّه)[2].

واتە: سویٚند بەوەی گیانی منی بە دەستە عیسای کوڕی مەڕیەم بە دڵنیایی دادەبەزیٚت لە پاشان کە لەسەر گۆڕەکەم ڕادەوستیٚت و دەڵیٚت: ئەی محەممەد، بە دڵنیایی وەڵامی دەدەمەوە.



---

(١) صحيح: المستدرك (٢/ ٦٥١) برقم: (٤١٦٢). قال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ.

(٢) أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) وعزاه لأبو يعلى وقال: رجاله رجال الصحيح.

# ماوەی مانەوەی پێغەمبەر عیساو حەجکردن و وەفاتکردنی

پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە پاش گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی بۆ جاری دووەم بۆ ماوەی چل ساڵ حوکم بە ئیسلام دەکات، پاشان وەفات دەکات، پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يُتَوَفَّى، وَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ)[1].

واتە: چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، پاشان وەفات دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتە: [وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ]. دەڵێت: دەرچوونی عیسا، چل ساڵ لەسەر زەویدا دەمێنێتەوە، ئەو چڵ ساڵە وەکو چوار ساڵە، حەج و عومرەیش دەکات.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُهِلَّنَّ ابْنُ مَرْيَمَ بِفَجِّ الرَّوْحَاءِ، حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، أَوْ لَيَثْنِيَنَّهُمَا)[2].

واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، لە (فج الروحاء)[3]دا کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە عیسای کوری مەریەم تەهلیلە دەکات بۆ حەج یان بۆ عەمرە یان هەردووکیان پێکەوە دەکات[4].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٥/ ١٥٤) برقم: (٩٢٧٠). قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٢) صحيح مسلم (٢/ ٩١٥) كتاب: الحج باب: إهلال النبي(صل الله عليه وسلم) برقم: (١٢٥٢).

(٣) (فج الروحاء): جێگەیەکە لەنێوان مەدینەو دۆڵی زەردی ڕێگەی مەککەو نزیکەی چل یان سی و شەش میل لە مەدینەوە دوورە. (لوامع الأنوار البهية (١١٣/٢).

(٤) رواه عبد بن حميد، وله حكم المرفوع لأن مثله لا يقال بالرأي.

کەواتە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە دوای پێشەوای موسڵمانانەوە نوێژ دەکات و حەج و عەمرەی بەیت دەکات و لەگەڵ لەشکری ئیسلامیدا جیهاد دەکات و حوکمیش بە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات.

لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە لە نزیکی دوایی هاتنی ئەم جیهانەدا، دەبێ بەحەکیمێکی دادپەروەر و رازی نابێ و ماوەی هیچ کەسێك نادات کە هیچ ئاینێکی تر بگرێتە گەردەن بێجگە لە ئایینی ئیسلام، هەروەکو لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەمرێت و لای پێغەمبەر یان لە (بیت المقدس) دەنێژرێت[١]... بە پێی ئەم ڕیوایەتانە دەبێ بەلاشە و بە گیان لە ئاسمان بێت تا کاتی هاتنە خوارەوەی، وە بۆ خوا ئەوە هیچی تێناچێت.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ﷺ) دەڵێت: (مكتوب في التوراة صفة محمد، وصفة عيسى بن مريم ، يدفن معه)[٢].

واتە: لە تەورات سیفەتی محەممەد نوسراوە، وە سیفەتی عیسای کوڕی مەریەم نوسراوە، کە لەگەڵ محەممەد ئەنێژرێت.

پێشەوا سەعیدی کوڕی موسەییەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

جێگای گۆڕێك ماوە کە هی پێغەمبەر عیسایە (سەلامی خوای لێ بێ)[٣].

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

دوای ئەوەی خوای گەورە ڕوحی پێغەمبەر عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) کێشا، لە حوجرەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنێژرێت[٤].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ٢٥٥).

(٢) صحيح: رواه البخاري في «التاريخ الكبير» (٢٢٩/٦) ، والترمذي في السنن برقم: (٣٦١٧) وقال: هذا حديث صحيح الإسناد.

(٣) فتح الباري (٦٦/٧) .

(٤) التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة (لا ١٣١).

لە ریوایەتی پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە عەبدوڵڵای کوری عەمر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: خوای گەورە عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) دەنێرێ.. لە پاشان حەوت ساڵ لە نێو خەڵکیدا دەمێنێتەوەو لە نێوان دوو کەسدا ڕق و کینەو دوژمنداری نامێنێ، پاشان خوای گەورە بایەکی فێنك دەنێرێ لەلای شامەوە جا یەك کەس لە زەوی نامێنێ کە تۆزقاڵێ بڕوای هەبێ ئیلا گیانی بەم بایە دەردەچێ[1].

ئەم دوو فەرمودەیە هەردووکیان صەحیحن، بەڵام لە چۆنیەتی جەمع و تەوفیقی ئەم دوو فەرموودەیە ئەوەیە کە حەوت ساڵەکە مەبەستی بە کاتی مانەوەی بێ لەسەر زەوی لەو کاتەی کە دێتە خوارەوە، وە ریوایەتەکەی تر واتای وایە کاتێ کە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان تەمەنی سی و سێ ساڵ بوو جا لەگەڵ ئەم هەفتەی کۆتایی ژیانی گەڕانەوەی دەبێتە چل ساڵ و وەفات دەکات[2].

پێشەوا سیوطي (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کە دابەزی لە ئاسمانەوە هاوسەرگیری پێك دەهێنێت و دوو منداڵی دەبێت، یەکیان ناو دەنێت محەممەد ئەوی تریان ناو دەنێت ئەبا موسا، وە ماویە چل و پێنج ساڵ دەمێنێتەوە لەسەر زەوی، وە لە تەنیشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنێژرێت[3].

پێشەوا مەیانیشی لە باوکی حەفصەوە دەڵێت: لە پاش کوشتنی دەجال ئافرەتێکی عەرەب دەخوازێت[4]..

هەندێکیش دەڵێن: لە (بیت و المقدس) دەنێژرێت لەلای پێغەمبەران[5].

---

(١) صحيح مسلم (١٨/ ٧٥ ــ ٧٦) مع شرح النووي.

(٢) النهاية (١/ ١٤٦).

(٣) الحاوي، للسيوطي (٢/ ٣٦٥).

(٤) الدار الآخرة، الشيخ محمد متولي الشعراوي، لا ٢٧٨ .

(٥) التذكرة، للقرطبي (٢/ ٤١١).

# یەئجووج و مەئجووج کێن؟

## پێشەکی ڕەگ و ڕیشەی هەردوو یەئجووج و مەئجووج:

زانایانی زمان بیروڕایی جیاوازو هەمە جۆریان دەربارەی وشەکانی (یەئجووج و مەئجووج) هەیە کە ئایا دەرهاوێژراوی وشەو چاوگێکن، یان دوو ناوی بیانین (واتە غەیری عەرەبین)؟! کۆمەڵێك لە زاناکان ڕایان وایە کە دەرهاوێژراون، وەك (ابن منظور)یش لە (لسان العرب)دا ڕاکانیانی هێناوەو، گووتویەتی: (وشەی یەئجووج، وەك وشە عەرەبیەکانی تر لە زمانی عەرەبدا دەرهاوێژراوەو لە (اجت النار) و (الماء الاجاج)ەوە واتە: (پەرەسندنی ئاگرەکە) و ئاوێکی سوێرەوە) وەرگیراوە کە سوێری ئاوەکە لە ڕاددەیەکی وەها توندا بێت کە خەریکە شت بسووتێنێت، وشەی (یەئجووج)یش لەسەر کێشی (وزن)ی (یفعول)ەو، وشەی (مەئجووج) یش: (مفعول)ەو وەك ئەوەی لەتین سەندنی کڵپەی ئاگرەوە بێت، دەشێت کە وشەی (مەئجووج)یش: (مفعول)ەو وەك ئەوەی لەتین سەندنی کڵپەی ئاگرەوە بێت، دەشێت کە وشەی (یەئجووج) بکەر (فعل) بێت هەروەها دەشێت (مەئجووج) یش هەروابێت.. ئەمە ئەگەر هەردوو ناوەکە (عەرەبی) بن ئەوا دەرهاویشتن و وردرکنەوەیان ئاوا دەبێت، دەنا گەر ناوی بیانی غەیرە عەرەبی بن، ئەوا لە زمانی عەرەبی دەرهاناوێژرێن و ڕەگ و ڕیشەی زمانەوانییان بۆ دانانرێت[1].

راغیبی ئەصفهانی دەربارەی وشەی (أج) گوتوویەتی: (ملح أجاج) واتە: خوێ یەك کە زۆر سوێرو گەرم بێت، وشەی (یأجوج ومأجوج)یش لەو واتایانەوە کە بە (ئاگری هەڵگیرساوو پەرەسەندوو) و (ئاوی شەپۆڵی توند)شوبهێنراون، ئەوەش بەهۆی زۆریی جم و جۆڵ و لاسارییانەوە)[2].

---

(١) لسان العرب، ابن منظور (٢/ ٢٠٧).

(٢) المفردات، لا١٠.

## شێوەو سیفاتی یەئجوج و مەئجوج :

یەئجوج و مەئجوج هاو شێوەی نەوەی پێك چویان لە تورکانن کە دەربڕینی قسەکانیان زۆر ڕوون نیەو کورتە بالآن و لووت بچووکن چاویان بچووکە پرچیان گرژەو شێوەی دەم و چاویان پانە هەر دەڵێی پێستەی دەباغ کراوەن واتە: موویان کەمە لە دەم و چاو وەکو تورکەکان[1].

پێشەوا ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە ئیبنو حەرملەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەداو یەکێ لە پەنجەکانی بەستابوو چونکە دوو پشك پێوەی دابوو، جا دەیفەرموو: ئێوە دەڵێن: دوژمنمان نیە وە ئێوە بەردەوام شەڕتانە لەگەڵ دوژمندا تاکو یەئجوج و مەئجوج دێن: کە دەم و چاو پانن چاویان بچووکە پرچیان لەسەریان خڕ دەکەنەوە بەسەر هەموو گردو بەرزاییەك دەکەون دەم و چاویان هەر دەڵێی پیستەی دەباغ کراوەو موویان کەمە[2].

خوای پەروەردگار دەربارەی (یەئجوج و مأجوج) دەفەرموی: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾]. واتە: تا گەیشتە نێوان دوو بەربەستەکە، ئا لەوێ گەلێکی دۆزییەوە کە لە هیچ قسەیەك نەدە گەیشتن.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەچەند تایبەتمەندیەکی گرنگی یەئجوج و مەئجووج دراوە، یەکەمین تایبەتمەندیی ئەم گەلانە ئەوەیە کە لە هیچ شتێك ناگەن، واتە: گەلێکی سەرەڕۆو لە قسە نەگەیشتوون، ئەم دەستەواژەی «سەر زەوی»یە، خراپەکاری لەسەرتاپای جیهان دەگەیەنێت، ئەمەش بۆ نانەوەی خراپەکاری لە شوێنێکدا پێویستە ڕەگ و ڕیشەیەکی فەلسەفی و بیروباوەڕێکی گومڕاکەر بوونی هەبێت، ئینجا بۆ هێنانە جێی ئەم سیستەمە خراپەکاریە لەسەرتاپای جیهاندا، دەبێت واتایەکی فەلسەفی گومڕای

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٥٣).

(٢) مسند الإمام أحمد (٢٧١/٥) قال الهيثمي في مجمع الزوائد (٨/ ٦) ورجالهما رجال الصحيح.

مەزن هەبێت، کە کاریگەریی لەسەر سەراپای جیهان هەبێت و سەرجەمی مرۆڤەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

## دەنگۆو ئەفسانەکانی (یەئجوج و مەئجوج) :

هەندێك لە مێژوونووسان و خاوەنانی تەفسیر چەندین هەواڵ و سەرگوزەشتەی سەیرو سەمەرەیان دەربارەی (یەئجووج ومەئجووج) هێناوەو تیایاندا دەربارەی ڕەگەزو ڕەچەڵەك و ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان دواون و، باسی ڕەنگ و ڕوخسارو سیفەت و کاروبار و شتەکانی تریان کردووە.. هەموو ئەو هەواڵ و سەرگوزەشتەو ڕیوایەتەشیان لە دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکانەوە وەرگرتووە بۆیە وتەو ڕاڤەی ئەو مێژوو نووس و خاوەن تەفسیرانە لە ئەفسانەو خەیاڵات و پڕوپاگەندە بەدەرنین.

گرنگ ئەوەیە لەسەرچاوەیەکی ڕاست و دروست و پەسند کراوەوە وەرنەگیراون، چونکە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) نەگێڕاوەنەتەوە، ئیمەش هیچ هەواڵ و سەرگوزەشتیەك و، هیچ وتەیەك پەسند ناکەین ئەگەر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بە ئێمە نەگەیانرابێت لێرەشدا کورتەی ئەو وتە پوچەڵانەیان دیاری دەکەین:

١) هەندێك لە مێژوونووسان و خاوەن تەفسیرەکان وای لەقەڵەم دەدەن گوایە (یەئجووج و مەئجووج) لەوەچەی ئادەمن بەڵام نەك لە (حەوا)وە، بۆیە دەبنە برایانی منداڵەکانی ئادەم لە باوکەوە، هەروەها وای باس دەکەن گوایە (ئادەم) ژنێکی تری جگە لە (حەوا) هەبووە.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پاش هێنانەوەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: پێشەوا (نەوەوی) لە ڕاڤەی موسلیمدا لە هەندێك خەڵکیەوە دەگێڕێتەوە کە یەئجوج و مەئجوج لە تۆ (منی)ێك بەدیهێنراون کە لە ئادەمەوە دەرچووە، جا لەگەڵ خۆڵ تێکەڵ بوەو ئەوانی لێ بەدیهێنراون، کەواتە یەئجوج مەئجوج تەنها لە ئادەم کەوتونەتەوە لە حەوا نین[1].

---

(١) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، (٣٢٤/٤).

جا (ئیبنو کەثیر) ئەم وتەی ڕەت کردۆتەوەو دەڵێ: ئەمەش وتەیەکی زۆر نامۆیە، پاشان هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی یان نەقڵی لەبارەوە نیە، دروست نیە لێرەدا پشت بەو شتانە ببەسترێ کە هەندێك لە کتێبەکان دەیگێڕنەوەو لە قسە هەڵبەستراوەکانی خۆیاندا هەیە.

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە یەئجوج و مەئجوج لەنەوەی ئادەمن (سەلامی خوای لێبێت)، هەروەکو (ئیبنو کثیر) لە تەفسیرەکەی ئاماژەی پێ دەکات و فەرمودەی ژمارە (١)یش بەبەڵگەی ڕاستی بۆچونەکەی دەهێنێتەوە کە خوای گەورە فەرمان بە ئادەم دەکات لە هەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ جیا بکاتەوە بۆ دۆزەخ، دواتریش پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵخۆشی هاوەڵانی دەداتەوە بەوەی لە ئومەتەکەی یەك پیاو لە یەئجوج و مەئجوج هەزار.

٢) گوایە (یەئجووج و مەئجووج) لە تۆوی ئادەمن و کاتێك ئادەم لەسەر خۆڵەکە خەوتووە، خەوی جنسی (ئیحتیلام)ی بینیوەو ئاوی هاتۆتەوەو، ئاوی تۆوەکەی تێکەڵی خۆڵەکە بووە، ئیدی (یەئجووج و مەئجووج)یش لەو ئاوی (مەنی)یەی کە تێکەڵی خۆڵەکە بووە دروست بوون.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پاش هێنانەوەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: پێشەوا (نەوەوی) لە ڕاڤەی موسلیمدا لە هەندێك خەڵکیەوە دەگێڕتەوە کە یەئجوج و مەئجوج لە تۆ (منی)ێك بەدیهێنراون کە لە ئادەمەوە دەرچووە، جا لەگەڵ خۆڵ تێکەڵ بوەو ئەوانی لێ بەدیهێنراون، کەواتە یەئجوج مەئجوج تەنها لە ئادەم کەوتونەتەوە لە حەوا نین.

جا (ئیبنو کەثیر) ئەم وتەی ڕەت کردۆتەوەو دەڵێ: ئەمەش وتەیەکی زۆر نامۆیە، پاشان هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی یان نەقڵی لەبارەوە نیە، دروست نیە لێرەدا پشت بەو شتانە ببەسترێ کە هەندێك لە کتێبەکان دەیگێڕنەوەو لە قسە هەڵبەستراوەکانی خۆیاندا هەیە[1].

---

(١) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، (٣٢٤/٤).

بەڕگی سێیەم

٣) هەندێكی تر وای لەقەڵەم دەدەن گوایە ئەوان واتە: (یەئجووج و مەئجووج) كوڕانی (یافث)ی كوڕی (نوح) بوون كە دوای لافاوەكە بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتووە، بۆ ئەمەش پشت بەو فەرمودەیە دەبەستن كە پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ولد لنوح سام وحام ويافث فولد لسام العرب وفارس والروم والخير فيهم وولد ليافث يأجوج ومأجوج والترك والصقالبة..)[1].

واتە: كورەكانی نوح سیانن، سام و حام و یافث ، سام عەرەب و فارس و ڕۆمی لێ بووە، وە حامیش قبط و بەربەرو سودانی لێ بووە، وە یافثیش یەئجوج و مەئجوج و تورك و صەقالبەی لێ بووە.

بەڵام زاناكانی فەرمودەناس پشت بەم فەرمودەیە نابەستن چونكە دەڵێن (ضعیف)ە.

٤) هەندێكی تریان وای دادەنێن گوایە (یەئجوج و مەئجوج) بیست و دوو تیرە بوون و كاتێك (ذوالقرنین)یش بەربەستەكەی بنیات ناوە لەدوای خۆیەوە بیست و یەك تیرەی داناوەو، ئەوانیش بە تورك ناوبراون، چونكە لە دەرەوەی بەربەستەكە تەرك كراون، واتە: (فەرامۆش كراون) و (ذوالقرنین) بەتەنیا خستوونیە ئەولاوە[2].

٥) هەندێكی تر لە مێژوونووسەكان دەڵێن: هەر تیرەیەك لەو تیرانەی بە چوارسەد هەزار كەس داناوەو، گوایە هەر پیاوێك لەوان لە ژیانیدا هەزار كەسی لە منداڵانی خۆی بینیوە كە هەموویان چەكی هەڵگرتووە.

٦) هەندێكی تریان وای بۆ دەچن گوایە مرۆڤەكانی (یەئجووج و مەئجووج) لە درێژی باڵاو كورتە باڵاییدا جیاوازبوون، تیایاندا بووە كە باڵای بە قەد سنەوبەرەكانی لوبنان بووە، هەندێكیشیان باڵای بەقەد چوار باڵ بووە، هەندێكی



---

(١) مسند البزار (١٤/ ٢٤٥) برقم: (٧٢٢٠). وَهَذَا الْحَدِيثُ لا نَعْلَمُ رَوَاهُ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلاَّ أَبُو هُرَيرة(ﷺ) بهذ الإسناد.

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ٢٦٦).

تریشیان درێژیی باڵای سێ بست بووە، گوایە تیاشیان دابووە کە باڵای بستێك بووە، هەندێکیشیان بەقەد کەوانەی نێوان دوو پەنجەی مرۆڤ بوون، یان گوایە هەندێکیان دوو گوێچکەی درێژی وەك دوو گوێچکەی فیلیان هەبووە کە گوێچکەی یەکەمی لەژێر خۆیدا ڕاخستووەو گوێچکەی دووەمیشی لەسەرەوە بەخۆی داداوەو لەخۆی ئالآندووە.

٧) هەندێکی تریش دەڵێن: (یەئجووج و مەئجووج) بەلای هەر گیاندارێکی وەکو فیل و حوشترو بەرازدا ڕۆیشتبێت خێرا خواردوویانەو، هەر کەسیش لەخۆیان مردبێت خواردوویانە.

٨) هەندێکی تریان ئیددیعای ئەوەیان کردووە کە گوایە چڕنووکیان لەسەر نینۆکەکانیان هەبووەو، کەڵبەکانیشیان وەك کەڵبەی ئاژەڵە دڕندەکان بووە، قژێکی هێندە درێژیشیان هەبووە کە سەراپای جەستەیانی داپۆشیوەو لەگەرماو سەرما پاراستوونی. هەروەها گوایە لەنێو بەرەڵلاییەکی بڵاوو باوی جنسیدا ژیاون و، وەك ئاژەڵان لەو کارانەدا خەریکی یەکتربوون و، ئافرەتیان ڕێگەی لە هیچ پیاوێك نەگرتووە کە نیازی داوێن پیسی لەگەڵیدا هەبوو بێت، هیچ پیاوێکیش تاکە ئافرەتێکی دیاریکراوی نەبووە.

٩) هەندێکی تریش لە مێژوونووسان دەڵێن: لە نێو خەڵکی (یەئجوج و مەئجوج) کەسانی واهەبوون کە ڕۆشتنیان وەك ڕۆشتنی گورگ بووەو، هەندێکیشیان ڕۆیشتنیان بە بازدان بووەو، هەندێکی دیکەیان تەنها بە ورتەورت قسەی کردووە، یان گوایە هەندێکیان چوار چاویان هەبووەو، هەندێکی تریان یەك قاچیان هەبووەو، هەندێکی تریشیان لە شلەمەنیدا تەنها خوێنیان خواردۆتەوە[1].

دیارە ئێمە هیچ هەواڵ و سەرگوزەشتەو وتەیەك لەوانە پەسند ناکەین و، ڕێگە بە کەسیش نادەین کە لە ئێمەوە ئەو جۆرە شتانە وەرگرێت، یان لە کەسانی

---

(١) الدر المنثور، للسيوطي، (٥/ ٤٥٤ ـ ٤٦٤).. البداية والنهاية، ابن كثير، (٢/ ١٠٩ ـ ١١٣).. ذوالقرنين، محمد خير يوسف (٢٤ ـ ٣٠٨).. وقصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٠ـ٤٢٢).

ترەوە، چونکە ئێمە بۆیە دیارییان دەکەین تاکو خەڵکی لێ ئاگادار بکەینەوەو، هەتا هیچ کەسێکیش لە کتێبە کۆنەکانەوە نەیانخوێنێتەوەو، بڕوای پێ نەکات.

١٠) هەندێك لە زاناکانی ئەم سەردەمەش پێیان وایە کە مەبەست لە یەئجوج و مەئجوج ئەم میللەتانەیە کە ئەمڕۆ دانیشتووی وڵاتی چین و یابان و مەنغۆلیان، وەپێشیان وایە ئەو بەربەستەی کە کاتی خۆی (ذو القرنين) لەبەردەمیاندا دروستی کردووە هەر دەکەوێتە ئەو ناوچانەوە تەنانەت سید قطب (ڕەحمەتی خوایلێبێت) لە تەفسیرەکەیدا وای بۆ دەچێت کە یەئجوج و مەئجوج ئەو مەغۆل و تەتەرانە بن کە کاتی خۆی هێرشیان کردە سەر نیشیمانی ئیسلام و تەخت و تاراجیان تێکدا بەسەر یەکدا[1].

پێشەوا قورطبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە هاوچەرخی ئەو هێرشەی مەغۆل و تەتار بووە لە تەفسیرەکەیدا هەر بۆچونێکی لەو جۆرەی هەیە[2].

بەڵام ئەو بۆچونەش پێچەوانەی ئەو ڕاستیەیە کە یەئجوج و مەئجوج لە کۆتایی بونەوەر لەسەر دەستی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) دێنە سەر زەوی و بە پیرۆزی دوعای ئەویش خوای گەورە لەناویان دەبات و فڕێیان دەداتە دەریاوە.

بێگومان (یەئجووج و مەئجووج) لەنەوەکانی ئادەمن، واتە: مرۆڤ و ئادەمیزادی ئاسایی و خولقێنراوی وەك ئێمە بوون، تەنەکانی لاشەیان و ڕوخسارو شێوەیان لەجەستەو ڕوخسارو ڕەنگی ئێمە چووەو لە هیچ شتێکدا لێمان جودانیین تەنها بەم ژمارە زۆرو گەورەیەو، بەو بڵاوبوونەوە بەربڵاوەو بەو داگیرکارییە هەمەلایەنەو، بەو شێواندن و کاولکاری و وێرانکارییە نەبێت[3].

---

(١) في ظلال القرآن، سيد قطب، (٤/٢٢٩٣-٢٢٩٤).

(٢) أحكام القرآن، للإمام القرطبي، (١١/٥٨).

(٣) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٣).

١١) هەندێکی تریش لە زانایان دەڵێن مەبەست لە یأجوج و مأجوج جەنگی جیهانی یەکەم و دووهەمە، کە ئەمەش دەقدەکەیەتی کەوا باسی لێوە دەکەن:

دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجووج و ئەو سیستەمە کاولکارییەی بە پشت بەستن بە بناغەیەکی فەلسەفیی گومڕاکەر دەیهێنێت، ئاماژەیە بە کاولکارییەکی گەورە کە ستەمگەراییی بۆ سەرجەم جیهان دەهێنێت (خوداش باشتری لێ دەزانێت).

کاولکارییەکی وا کە سەرتاپای جیهان دەگرێتەوە، ئەگەرێکی بەهێز هەیە هێما بێت بۆ جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی. چونکە ئەوە ڕوونە کە جەنگە جیهانییەکان لە سایەی ئایدۆلۆژیا گومڕاکەرەکانی وەك داروینیزم، ماتەریالیزم، کۆمۆنیزم و فاشیزم ڕوویان داوەو هەر لە ژێر کاریگەریی ئەو ئایدۆلۆژیا گومڕاکەرانەشدا کاولکارییان بەسەر جیهاندا هێناوە، ئەو یەئجوج و مەئجووجەی کۆتایی بونەوەر بریتیە لە کۆمۆنیست و فاشیستەکان.

خوێن ڕێژترین سەرکردەکانی جیهان تەعالیمەکانی بیردۆزی پەرەسەندیان بۆ خۆیان کردووەتە ڕێ پیشاندەرو بە تەوژمەکانی کۆمۆنیزم کۆمەڵیان بەرەو مەرگە سات و کاولکاری ئاراستە کردووە.

ئەم جەنگانە کە پشت ئەستوور بوون بەم بنەما فەلسەفییە گومڕایانەوە، کوشتاریی گەلێك موسڵمانیان لێکەوتووەتەوە و وەك لە ئایەتەکەشدا ئاماژەی پێدراوە لە سەرتاپای جیهاندا ڕوویان داوەو بە مەرگی ٢٥٠-٣٠٠ ملیۆن کەس کۆتاییان پێهاتووە[1].

ئەو ئایەتانەی تر کە پێناسەی یەئجووج و مەئجووج دەکەن، بەم جۆرەن:

- [قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾].

واتە: گوتی: ئەو (توانا و دەسەڵات)ەی خودا پێی بەخشیوم ، بۆ من چاکترە (لە پارە و سامان). جا ئێوە بەهێزی بازوو یارمەتیم بدەن تا بەربەستێکی بەهێز لە نێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەم.

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٠).

- [ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾].

واتە: پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵکەڵەی بکەن). تا نێوانی هەردوو کێوەکە ڕاست بوو، وتی: فووی پێدا بکەن. (ئەمەی کرد) تا کردی بە گڕ. (ئینجا) گوتی: (دەی)مسی تواوەم بۆ بێنن تابیکەم بەسەریدا.

- [فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾].

واتە: (ئیتر) نە توانییان بەسەریدا سەربکەون و نەلەتواناشیان کونی بکەن.

- [حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾].

واتە: تا ئەو کاتەی بەربەستەکەی (زولقەرنەین لەسەر یەئجوج و مەئجوج) دەکرێتەوە، (ئیتر) ئەوان لە بەرزاییەکانەوە پەیدا دەبن و زۆر دەبن.

لە ئایەتەکان باس لە چڕی بەکارهێنانی مس و ئاسن کراوە، هەر وەك دەشزانرێت لە جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم دا، ئاسن و مس بەکارهێنراوە. تانك و هۆکارەکانی گواستنەوەو ماتۆڕو فڕۆکە، لە کوتلە گەلێك پێك دێن کە ئاسن و مسێکی زۆریان تێدا بەکاردەهێنرێت، ئا لەم ڕووەوە بارودۆخەکە لەگەڵ ئایەتەکاندا یەك دێتەوە.

لە ئایەتەکاندا ئاماژە بە سیستەمی بەربەست کراوە، ئەم ڕوون کردنەوەیە دوور نیە ئاماژە بێت بۆ ئەو هێڵە بەرگرییانەی لە دەورانی دوو جەنگە جیهانییەکەدا دروست کراون. وەکوو دەزانرێت لە یەکەم جەنگی جیهانیدا، چەندین هێڵی گەورەی وەك هێڵی گەورەی بەرگریی فەڕەنسی و هی ئەڵمانی دروست کراوەو لە سنوورەکاندا تانکەکان پارێزراون و بەربەستی وا قەبە و پتەو بیناکراوە کە تەنها لە ڕێی تونێڵەکانەوە ڕێی چوونە ژوورەوەیان هەبووە، کە مەبەست لێیان ڕێگری کردن لە داگیرکاریی دەرەکیو بێکاریگەرکردنی دوژمن بووە.

بەرگی سێیەم

وەك لە ئایەتەکانیشدا ئاماژەی پێدراوە، یەکێکی تر لە تایبەتمەندییە دیارەکانی یەئجوج و مەئجوج، تێپەڕبوونیانە بەسەر بەرزاییەکانەوە.. هەر بەڕاستیش لە دوو جەنگە جیهانییەکەدا چەندین تێپەڕینی سوپاکان بەسەر چیاکانەوە ڕووی داوە، سەربازی زۆرێك لە وڵاتان بەسەر چیاکانەوە دابەزیونەو چوونەتە شارەکانەوەو دەستیان گەیشتووەتە ملیۆنان کەسی بێ تاوان.

بە سەرنج دان لە هێماکانی وەك کاریگەری کردنە سەر گشت جیهان بە پشت بەستن بە فەلسەفەیەکی گومڕا، هێنانە ئارای کەشێکی ئاژاوە گێڕی و کاولکاری بە پشت بەستن بە دوو ئایدۆلۆژیای خوێناوی وەك کۆمۆنیزم و فاشیزم، بەکارهێنانی ئاسن و پۆڵاو بیناکردنی بەربەست بە ئامانجی خۆپارێزی، ئەگەری ئەوەی کە ئەو یەئجوج و مەئجوجەی لە قورئاندا هەواڵیان لەبارەوە دراوە ئاماژەبن بۆ جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی گەلێك بەهێزە.

لە ئەنجامی ئەم جەنگانەداکە بە پشت بەستن بە فەلسەفەی داروینیزم و کۆمۆنیزم هەڵگیرسێنراون، گەورەترین قەتل و عامی مێژوو ڕوویداوە، مەزنترین کاولکاری لە ئەم سەر بۆ ئەو سەری جیهان ڕووی داوە. ئەو کاولکارییەی یەئجووج و مەئجووج لە ئاخیر زەماندا دەینێنەوە، تا ڕاددەیەکی زۆر لەم ڕوونکردنەوانە دەچن[1].

## ئاماژەکان لە فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)

پێغەمبەرمان (ﷺ) ئاماژەی بەوە داوە کە ئەو گەلە مرۆڤەی «یەئجوج و مەئجوج»یان پێ دەوترێت، یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی. دەرکەوتنی گەلانی یەئجوج و مەئجووج لە کۆتایی بونەوەر، بە ماوەیەکی کەم بەر لە دەرکەوتنی (موحەممەدی مەهدی)، بە ڕوودانی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی هاتووەتە جێ (خودا باشتری لێ دەزانێت).

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢١).

بەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: (موحەممەدی مەهدی) هەر وەك زولقەرنەین و سولەیمان، فەرمان ڕەوایی بەسەر جیهاندا دەکات، بۆمان دەردەکەوێت ئەو چیرۆکی زولقەرنەینەی کە باس لە گەلانی یەئجوج و مەئجوج دەکات، وەیەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی.

لە قورئاندا ئاماژە بەوە دراوە کە یەئجوج و مەئجوج جولآنەوەیەکی گەورەی خوێناوی و دژ بەخودان، لە هەموو سەردەمێکدا جوولآنەوەی کاولکاری و دژ بەخودا هەبووە، وەلێ کاولکاریی گەورەو جیهانی لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا ڕووی داوە.

پێغەمبەرمان(ﷺ) لەم فەرموودەیەی خوارەوەیدا بە لێکچواندن، ئەو نەبوونیە ڕوون دەکاتەوە کە لەو قۆناغی کاولکارییەوە دێتە ئاراوە:

- (... گەلانی یەئجووج و مەئجووج لەسەر بەرزایی وەکوو کێو و گرد تێپەڕدەبن و دەڕژێنە نێو خەڵکیەوە. لەبەر ئەوەی هەر چییەك هەیە دەیخۆن و دەیخۆنەوە، دەریاچەکانیش وشك دەبن. لە ئەنجامیشدا قاتوو قڕییەکی گەورە سەر هەڵدەدات.

- یەئجووج و مەئجووج ... هێرش دەکەنە سەر خەڵکی، چی ئاو هەیە دەیخۆنەوە، خەڵکی دەکەونە هەڵاتن لە دەستیان...

- یەئجووج و مەئجووج سەرهەڵدەدەن ، وەك ئەوەی کە خودا فەرمویەتی: لە گشت بەرزاییەکەوە دەڕژێن، زاڵ دەبن بەسەر مرۆڤایەتیدا، موسڵمانان لە دەستیان هەڵدێن و دەکشێنەوە نێو شارو قەڵاکانیان، تەنانەت ئاژەڵەکانیشیان دەبەنە لای خۆیان[1].

یەئجووج و مەئجووج ئاوی سەر زەوی دەخۆنەوە کەبەسەر ڕووبارێکدا دەدەن، وشکو برینگی دەکەن، ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا تێدەپەڕن دەڵێن: سەردەمانێك ئێرە ئاوی لێ بوو.

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٢).

کەس نامێنێتەوە پەنای نەبردبێتە بەر پەناگەکان، وتەبێژەکەیان دەڵێت: لە دەست خەڵکی سەر زەوی ڕزگارمان بوو، ئینجا سرەی خەڵکی ئاسمانە.

پێدەچێت ئەم فەرموودانە هێما بن بۆ ئەو قاتو قڕی و نەهامەتییەی خەڵکی لە دەورانی جەنگە جیهانییەکاندا تووشی بوونە (خوای پەروەردگاریش باشتری لێ دەزانێت).

جەنگەکان گەیشتوونەتە شارەکان، خەڵکی لە پەناگەکاندا خۆیان حەشارداوە، تووشی بۆردومانی زەمینی و ئاسمانی بوونەوە، لەم فەرموودانەشدا باس لە پەرێشانی و نەبوونیەکانی ئەو سەردەمانە کراوە.

پێغەمبەرمان(ﷺ) لە فەرمودەیەکی تریدا باس لەوە دەکات کە یەئجووج و مەئجووج کۆمەڵگەیەکی پێکهاتووە لەنەتەوەی جۆراو جۆر:

- یەئجوج و مەئجوج لە بیست هۆز پێك هاتوون...

لەم ڕوانگەیەشەوە دەشێ یەئجووج و مەئجووج هێمابن بۆ هاوپەیمانێتەکانی نێوان ئەو ژمارە زۆرەی وڵاتانی فاشیست و کۆمۆنیست بێت لە کاتی جەنگە جیهانییەکاندا (خودا ڕاستیەکەی دەزانێت)[1].

لە چەند فەرمودەیەکی تری پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوە دەردەکەوێت کە یەئجووج و مەئجووج بڵاوکەرەوەی فەسادو کۆمەڵە مرۆڤێکی دانەر بە خودان، هەروەکوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمایشتێکی ئەفەرمووی: خودا لە شەوی میعراجدا ناردمیە لای یەئجووج و مەئجووج. بانگم کردن بۆ سەر ئیسلامەتی، ڕەتیان کردەوە. هەر بۆیە ئەوان لەگەڵ ئەوانەی لە نەوەی ئادەم و ئیبلیسن و لە خودا یاخین، دەچنە دۆزەخەوە.

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٣).

# (ذو القرنين) کێیە؟

زانایانی تەفسیرو مێژوونووسان بەدرێژی لە کەسێتی (ذو القرنين) یان کۆڵیوەتەوەو هەوڵیانداوە دەستنیشانی بکەن و ئەو کات و شوێنەش دیاری بکەن کە تیایدا ژیاوەو، ئەو کارانەشی ڕوونکەنەوە کە ئەنجامی داون..

## ئایا کەسێتییەکەی بە وردی دیاری دەکرێت؟!

گەر ئەم پرسیارە بخەینە ڕوو کە: ئایا دەشێت بە وردی کەسێتی(ذو القرنين) دیاری بکرێت؟ ئەوا بێگومان وەڵامەکەشی بەنەخێر دەبێت.. چونکە بۆ کەسێك کە ڕێز لە زانست و بیروڕای خۆی بگرێت، ناشێت کەوا کەسێتی (ذو القرنين) دیاری بکات.

لەبەر ئەوە وتەی زانایان لەم ڕووەوە، تەنها لە ڕوانگەی بۆچوون دایە، نەك لە ڕوانگەی وردبینی و دڵنیابوون.. بۆ نموونە زانایەك هاتووەو هەندێك زانیاری لەوەو پێشی لەسەر (ذو القرنين) خوێندۆتەوەو سەرنجی لەو بەڵگانە داوە، کە خاوەنەکانیان بەڕای خۆی خستۆتە ڕوو، ئینجا چاوی پێداخشاندوون و لێی کۆڵیوەتەوە، پاشان لەگەڵ ئەو بەڵگانەی کەسانی تر بەراوردی کردوون، ئیدی لەوانەیە لەمەوە ئەنجامێکی دەرهێنابێت و لەو ئەنجامەدا وتەیەك لە وتەکانی زانایانی تری بەڕاستتر دانابێت و چەند بەڵگەیەکیشی لەنێو بەڵگەکاندا پەسند کردبێت.

- ڕای (سید قطب) لەم بارەیەوە:

باشترین بیروڕا بۆ دەستنیشانکردنی کەسێتی (ذوالقرنين) و کارەکانی بیروڕای پێشەوا (سید قطب)ە ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ـ لەم بارەیەوە گوتویەتی: دەقی قورئان هیچ شتێکی لەسەر کەسێتی (ذوالقرنين) دیاری نەکردووە، ئەمەش شێوازێکی

بەرگی سێیەم

ڕێکخستنی قورئانە لە چیرۆکەکاندا، چونکە تۆماری مێژوویی بەمەبەست نەگیراوە، بەڵکو ئەوەی جێی مەبەستە پەند بە سوودی لێ بینراوە لە چیرۆکەکەدا، مێژووی تۆمارکراویش پادشایەکی ناساندووە کە ناوی (ئەسکەندەری ذوالقرنین) بووە، بەڵام بە بەڵگە سەلمێنراوە ئەو (ذوالقرنین)ە نیە، کە لە قورئاندا ناوی هاتووە، چونکە (ئەسکەندەری ئەگریکی) بتپەرست بووەو، ئەم پیاوەش کە خودا ناوی هێناوە باوەڕی بەخودا هەبووەو، لەم بارەیەوە (أبو الريحان البيروني المنجم) لە پەرتوکی (الاثار الباقية عن القرون الخالية) دا گوتویەتی: ئەو (ذوالقرنين) ەی کە لە قورئاندا ناوبراوە لە هۆزی (حیمیەر) بووە، ئەمەش بەبەڵگەی پیتەکانی ناوەکەی، چونکە لە پێش ناوەکانی (حیمیرەکانەوە) نازناوی (ذو) هەبووە یان (ذي) وەك (ذي نواس) و (ذي يزن)، ناویشی (ئەبوبەکری کوڕی ئەفەریقش) بووەو بەسوپاو لەشکرەکانیەوە بەرەو کەناری (دەریای سپی ناوەڕاست) ڕۆشتووەو بە وڵاتانی (تونس) و (مەراکیش) و وڵاتانی تردا تێپەڕیوەو شارێکی بەناوی (ئەفریقیە) دروست کردووەو، ئیدی هەموو کیشوەری ئەفریقیا بەم ناوەوە ناونراوە، خۆیشی بۆیە بە (ذوالقرنین) ناو براوە، چونکە بەهەردوو مەوقیعی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی گەیشتووە). لەوانەیە ئەم وتەیەی (أبو الريحان البيروني) ڕاست بێت، بەڵام ئێمە هۆو ئامرازەکانی ساغکردنەوەو سەلماندنی ئەو وتەیەمان نیە[1].

### ناسراوترین وتە دەربارەی دەستنیشانکردنی کەسێتی (ذوالقرنین):

لەنێو وتەی زانایاندا ناسراوترینی هەموویان دەربارەی دەستنیشانکردنی کەسێتی (ذوالقرنین) چوار ووتە هەیە، کە گوتراوە (گوایە هاوچەرخی ئیبراهیم) بووە، یان (گوایە ئەسکەندەری مەکدۆنی بووە)، یان (گوایە لە هۆزی حیمیەر بووە) یاخود بەڕای ڕاسترینیان (کۆرشی فارس) بووە[2].

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٣).

(٢) قصص السابقين في القرآن، د. صلاح عبدالفتاح الخالدي، (٢/ ٣٦٨).

**وتەی یەکەم:** (گوایە هاوچەرخی ئیبراهیم) بووە ـ سەلامی خودای لێ بێت:

لە وتەی یەکەمدا ناوی دیاری نەکراوە، بەڵام ئەو سەردەمە دیاری کراوە کە تیایدا ژیاوەو کە گوایە هاوچەرخی (ئیبراهیم) بووەو گوایە لە (فەلەستین) پێی گەیشتووەو، هەروەها لەماڵی خوداش (بیت الله الحرام) لە مەککەدا بەدیداری گەیشتووە، لەو زانایانەی کە ئەم وتەیە بەڕاستتر دەزانن، مامۆستا (محمد خیر رمضان یوسف)ە، کە لەکتێبەکەی خۆی: (ذوالقرنين القائد الفاتح والحاكم الصالح) دا ئاماژەی پێداوەو دەڵێ: ئەمە پیاوێکی ترەو لەسەردەمەکانی ڕابردوودا و لە پێش (توبەع)و (ئەسکەندەر)و (کۆرش)یشدا بوە، بێگومان ئەو لەسەردەمی پێغەمبەر (ئیبراهیم) دابووە[1].

**وتەی دووەم:** گوایە (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووە:

وتەی دووەم لەمەڕ ئەوەی، کە گوایە (ذوالقرنین)، (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووەو ئەو کابرایە، کە لە (مەکدۆنیا) ساڵی (٥٦ پێش زایین) لەدایك بوویێت و باوکیشی (فیلیپ)ی پادشای مەکدۆنیا بووەو، گوایە (ئەسکەندەر)ی کوڕی، لەلای فەیلەسووفی ناوداری یۆنانی (ئەرەستۆ) ئیمانی هێناوەو، (ئەرەستۆ)ش لەسەر لۆژیکی فەلسەفەی یۆنانی پەروەردەی کردووە، ئینجا باوکی مردووەو ئەویش لەو کاتەدا لەتەمەنی بیست ساڵیدا بووەو، لە دوای باوکی پادشایەتی لە ساڵی (٣٣٦ پ.ز) دا گرتۆتە دەست و دوای دوو ساڵ بەرەو جەنگی فارسەکان کەوتۆتە ڕێ و لەو جەنگەدا سەرکەوتووەو بەسەر پادشای فارس (دارا) لە ساڵی (٣٣٣. پ. ز)دا زاڵ بووە، ئینجا فەتحی وڵاتی (شام)و (عێراق)ی تەواویکردوە، پاشان بەرەو فەتحی وڵاتی هیندیستانیش ڕۆشتووە. ئیدی لە نزیکەی دەساڵدا زۆربەی وڵاتە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی فەتح کردووە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ (یۆنان) و لەڕێگادا بەشاری (بابل)ی (عێراق)دا تێپەڕیوە تاکو نەختێك بحەوێتەوە، بەڵام لەوێدا تووشی نەخۆشیەکی توندو کاریگەر بووەو بۆ

---

(١) قصص السابقين في القرآن، (٢/ ٣٧١).

ماوەی یازدە ڕۆژ لەزروتای قورسی گرتووەو، هەر لەوێ لە ساڵی (٣٢٣. ز) دا مردووە، تەمەنیشی کەمتر لە سی و سێ ساڵ بووە[1].

بۆیەش نازناوی (ذوالقرنین) ی پێدراوە چونکە وولاتانی فارسەکانی فەتح کردوەو، وەك ئەوە وابووە کە هەردوو کیشوەری ئەو سەردەمەی (یۆنان) و (فارس) ی پێکەوە بەستبێتەوە کە بێگومان دوو دەوڵەتی گەورەی ئەو سەردەمە بوون.

جا ئەوانەی کە ڕایان وایە گوایە ئەو (ذوالقرنین)ەی لە قورئاندا ناوی هاتووە (ئەسکەندەری مەکدۆنی)یە، چەند کەسێك لە جمهورو زانایانی تەفسیرو مێژوونووسەکانن وەك: (مەسعودی) و (مەقریزی) و (ثعلبي) و (إدریسی) و (رازی) و (أبو حیان) و (نەسفی) و (ئەبو مسعود) و (ئالوسی) و (قاسمی) و (محمد فرید وجدی)..

ئەمەش سەرەڕایی شکۆمەندی و زانستی خاوەنەکانیان، (بیروڕایەکی ناڕاستە)، چونکە وەك زانایانی فەرمووده لەسەری کۆك و هاوڕان (ئەسکەندەری مەکدۆنی) کابرایەکی کافربووەو شەرکی بۆ خودا داناوەو لەو بتپەرستانە بووە، کە خواوەندەکانی یۆنانیان پەرستووە، هەروەها لە گوناهە گەورەکانی وەك بەدڕەفتاری و ئارەزوو پەرستی و مەی خواردنەوەی ئەنجام داوەو زیادەڕەویشی تێدا کردون، تەنانەت دوای شەوێك مردووە، کە بە (مەی خواردنەوەو سەرخۆشی و بە ئازاردانی سەرخۆشانیەی کەسانی ترەوە) بەسەر بردووە.. بەڵام بێگومان (ذوالقرنین) وەك قورئانیش پێی ناساندووین، پیاوێکی باوەڕدارو دادپەروەرو چاکە خواز بووە.

**وتەی سێیەم : گوایە لەهۆزی (حیمیەر) بووە:-**

وتەی سێیەم ئەوەیە گوایە (ذوالقرنین) پادشایەکی عەرەب بووە لە پادشاکانی (حیمیەر)و ناوە قورسەکەشی (ذي مراثد بن الحارث بن الرائش) بووەو، گوتراویشە ئەو پادشای (حیمیەر) (أبوبکر یاخود ابوبکری عمیر بن افریقش الحمیری)

---

(١) ذوالقرنين القائد الفاتح والحاكم الصالح، لا ٢٤٨.

بووەو، ماوەی پادشایەتیەکەی لە نێوان ساڵانی (٣٠٠ ـ ٣٢٠)ی زاینییدا بووە، لەوانەی ئەم وتەیەیان دەربڕیوە: (وەهبی کوری منبە) لە (تابیعین) و (کعب الاحبار)ەو، هەروەها لەزانا هاوچەرخەکانیش (محمد راغب الطباخ)ە کەلەم بارەیەوە کتێبێکی داناوە[1].

٤- ڕای ڕاسترین ئەوەیە، کە (کۆرشی فارس) بوو بێت:-

**وتەی چوارەم:** ئەوەی گوایە (ذوالقرنین) پادشای فارس (کۆرش) بێت، کە هەردوو مەملەکەتی (لیدیا) و (میدیا)ی یەکخستەووەو کردوونی بەیەك، هەر بۆیەش نازناوی (ذوالقرنین) ی بۆ دانراوە، (٣٠) ساڵیش حوکمی تێدا کردووە لەماوەی نێوان ساڵانی (٥٥٩ ـ ٥٢٩/ پ.ز).

لەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە مامۆستا (ابو الکلام ازاد)ە، کە لە کتێی (یسألونك عن ذی القرنین)دا ئاماژەی بۆ کردووە.

بەڵگەکانی (ابو الکلام ازاد) لەسەر ئەوەی کە (کۆرشی فارس) بووە:

(ابو الکلام ازاد) یەکێکە لە زانایانی نیمچە دورگەی هیندەوەو، لەسەرەتای سەدەی بیستەمی زاینیدا موسڵمانانی هیندیستانی هاندەدا بۆ شۆڕش لە دژی (بەریتانیا)ی داگیرکەرو وتاری بە جۆش و خرۆشی بۆ دەدان.

بەریتانیاش لەساڵی (١٩٢٢)دا ئەم پیاوەی لەسەر شۆڕشگێری و بانگەواز بۆ بەرەنگاری و مانگرتنی مەدەنیانە دادگایی کرد، کاتێك برایە بەردەم دادگاش وتارێکی هێندە بەجۆشی لەبەردەم ئامادەبوان و پارێزەران و شاهێدان و دادوەران خوێندەوە لە لوتکەی ڕەوانبێژی و دانایی و ژیرییژیدا بوو[2].

کاتێك لە هیندیستان دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنرا، ناوبراو وەزیری (مەعاریف) بوو تییایدا، لەساڵی (١٩٥٥)ع کۆچی دوایی کرد.

---

(١) ذوالقرنین، محمد خیر، لا ٩١-٩٥.

(٢) ذوالقرنین، محمد خیر، (لا ٩١-٩٥).

(ئەبو الکلام ازاد) بیریارێکی ئیسلامی و تەفسیر نووسێکی قورئان و لەپێشەنگانی نووسەرە ئیسلامیەکانی هیندیستان بووە، وەك توێژەرەوەیەکیش لە ژیانی (ذوالقرنین)ی کۆڵیوەتەوە، بۆ ئەم مەبەستە چووە بۆ ئێران و ناوچەی بەربەستەکەی (یەئجوج و مەئجوج)ی بینیوە، پاشان پوختەی گەشتەکەی و توێژینەوەکەشی لە گۆڤاری (ترجمان القرآن)دا نووسیوە، کە (ئەبو ئەعلای مەودودی) لە هیندیستان دەری دەکردو دواتریش لە پاکستان، ساڵی (١٣٩٢.ك / ١٩٧٢.ز)یش شێخ (أحمد حسن الباقوری) ئەو توێژینەوەیەی مامۆستا (ازاد)ی لەو گۆڤارەوە هێناوە پێشەکیەکی درێژی بۆ نووسیوە، کەبەشێکی زۆری تەرخان کردووە بۆ لێدوان دەربارەی خودی (مامۆستا ئازاد) و پەیوەندی بە (جمال عبدالناصر)ەوە، سەردانی پاکستان و هیندو ئەندەنوسیاو چینی کردووە. کتێبەکەشی لە دەزگای (دار الشعب) لە (میسر) بەناونیشانی (ويسألونك عن ذي القرنين) دەرچووە.

بەڕاستی ووتەو بیروڕایی مامۆستا (ئازاد) لەو کتێبەدا زۆر بەپێزو چاك و بەنرخە لایەنە باشەکەی ئەو وتانەی ئەوەیە، کە چەندین بەڵگەی لەسەر بیروڕایی خۆی هێناوەتەوەبەڵگە هەمە جۆرو لێك جوداکانیشی پێکەوە بەستونەتەوەو چەندین زانیاری بەڵگەکاری لە مێژوو و جوگرافیا و ئاسەوارە دەرخراوەکانەوە خستۆتە ڕوو، لێرەشدا پوختەی بەڵگەکان لەو کتێبە بەهادارو بەپێزەوە دیاری دەکەین:

کورتکردنەوەی وتەکانی ئەو ساتەی، کە دەربارەی دیاریکردنی کەسێتی (ذوالقرنین) درکاندویەتی (أبو لكلام آزاد) سەرەتا، کە بەو سیفاتانە (ذوالقرنین) دەستی پێکردووە، کە لە قورئان دیاری کراون، کە هەشت سیفەتن، پاشان هەندێك وتەی نوسەرانی تەفسیری لەسەر دەستنیشانکردنی کەسێتیی (ذوالقرنین) هێناوەو بەم جۆرە:

هەندێك گوتویانە: (وشەی (قرن) بەمەبەستی شتێکی دیار نیە، بەڵکو گوزارشت لە زەمان دەکات، بۆیەش بە (ذوالقرنین) ناوبراوە، چونکە لە حوکمەکەی داودو سەردەمی گەورەی خایاندوە[١].

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٤٤).

هەندێکی تریشیان گوتویانە: (ئەو هاوچەرخی ئیبراهیم بووە) - سەلامی خوای لێ بێ - هەروەها هەندێك لە نوسەرانی تری تەفسیر گوتوویانە: ئەو پادشایەك بووە لە پادشاکانی حیمیەر).

هەندێکی تریشیان گوتوویانە: ئەو (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووە.

پاشان هەموو ئەو ووتانەی ڕەتکردنەوەو بە پوچەڵیشی داناو، ئەمەش بە پێوەری ئەوەی کە ئەو سیفەتانەی لە قورئاندا لەسەری هاتوون و ئەو کارنەشی باسی لێ کراون لەگەڵ هیچ وتەیەکی ئەو کەسانەدا ناگونجێت.

مامۆستا سەعید نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەسەر بناغەی ئەو ئەنجامەی کە زانایانی لێکۆڵەر ڕوونیان کردووەتەوەو، بەپێی دەست پێ کردنی ناوی چەند پادشایەکی یەمەن بە وشەی «ذي» وکو ذي يزن - و بەگوێرەی ئەوەش کەناونیشانی:(ذی القرنین) ئاماژەی بۆ دەکات، ئەم زولقەرنەینە (ئەسکەندەری ڕۆمی مەقدۆنی) نیە، بەڵکو یەکێکە لە پادشاکانی یەمەن کە هاوچەرخی پێغەمبەر ئیبراهیم بووەو دەرسی لە خزمەتی خضردا خوێندووە، کەچی ئەسکەندەری ڕۆمی نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش زایین هاتووەو بەلای ئەرستۆ خوێندوویەتی.

ئەو مێژووەکەی کە ئادەمیزاد نووسیویەتی ڕووداوەکانی تا سێ هەزار ساڵ (پێش ئێستا) تۆمار دەکات، لەبەر ئەوە ڕوانینی کەمو کورتی ئەم مێژووە هەرگیز ناتوانێت حوکمی ڕاست و دروست بەسەر ڕووداوەکانی پێش سەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیمدا دەربکات.. خۆ ئەگەر باسیشی بکات ئەوا یان ئەفسانەی تێکەڵ دەکات، یان ئینکاری دەکات، یان بە کورتی لێی دەدوێت.

هۆی ناوبانگ دەرکردنی ئەم زولقەرنەینە یەمەنیەش لەناو تەفسیرەکاندا بە ئەسکەندەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە:

یەکێك لە ناوەکانی زولقەرنەین بریتیە لە ئەسکەندەر . کەواتە ئەسکەندەری گەورە یان ئەسکەندەری کۆن بریتیە لە زولقەرنەین[1].

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٤٥).

یان کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ڕووداوێکی جوزئی دەدوێت لەبەر ئەوەیە کە: ئەو ڕووداوە جوزئیە چەمکی چەند ڕووداوێکی گشتیە.

جا بەم پێیە، هەروەك ئەسکەندەری گەورە کە زولقەرنەینە، بە ڕێنماییە نەبەوییەکانی (سەدد)ی بەناوبانگی چینی لەنێوان نەتەوە ستەمکارو ستەملێکراوەکاندا دامەزراند، تاکو ستەم لێکراوان لەهێرش و تالآن و بڕۆی ستەمکاران بپارێزێت.

بەهەمان جۆر، چەند سەرکردەیەکی گەورەی تریش وەك ئەسکەندەری ڕۆمی و چەند پادشایەکی بەهێز لە ڕووی ماددیەوە شوێن پێی زولقەرنەینیان هەڵگرت و.. هەندێکیش لە پێغەمبەران و ئەقتابی ئەولیا، کە پادشای مەعنەویی گرۆی مرۆڤن، لە ڕووی مەعنەوی و ئیرشادەوە بەشوێن پێی زولقەرنەیندا ڕۆشتن و هەنگاویان نا..

جا هەموو ئەوانە گەلێ بەربەستیان لەنێوان چیاکاندا بنیات ناوە کە چەند هۆکارێکی گرنگن بۆ ڕزگارکردنی ستەم لێکراوان لەشەڕو زیانی ستەمکاران و، پاشان لەسەر لوتکەی چیاکانیشدا قەڵاکانیان دروست کرد. هەموو یەکێك لەوانە، چ بەهێزو توانای ماددی و زاتیی خۆیان و چ بەڕێنمایی و تەکبیرو ڕاو سەرپەرشتی کردنیان، ئەو بەربەستانەیان بنیات ناوە، تەنانەت شورایان بە دەورەی شارەکاندا گێڕاوە قەڵاشیان لەناوەڕاستی شارەکاندا دروست کردووە، تا لە ئەنجامدا گەیشتنە ئەوەی هۆکارێکی تر بەکار بهێنن کە تۆپە قورسە دوور هاوێژەکان و ئەو زرێ پۆشانەیە کە وەك قەڵای گەڕۆك وان[1]!

جا ئەو سەددەی کە زولقەرنەین دروستی کردووەو بەناوبانگترین بەربەستە لە جیهانداو چەند ڕۆژە ڕێیەك درێژە، بۆ ئەوەی بنیاتی نا تاکو ڕێ لە هێرش و پەلاماری چەند قەومێکی خراپەکار بگرێت کە قورئانی پیرۆز ناوی (یەئجووج و مەئجووج)ی لێ ناون و لەمێژووشدا بەهۆزەکانی مانجۆرو مەغۆل ناویان هاتووە، لەوانەی کە چەندین جار شارستانێتی مرۆڤیان ڕووخاندووەو لە پشتی چیاکانی هیمالایاوە سەریان هەڵداوەو خەڵکیان لەناو بردووەو خۆرهەڵات

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٤٦).

و خۆرئاوای وڵاتانیشیان وێران کردووە. جا ئەو بەربەستەی کە لەنێوان دوو چیای نزیکی زنجیرە چیاکانی هیمالایا بنیات نرا، بوو بە بەربەست لە بەردەم ئەو نەتەوە نەفام و دوور لە شارستانیانەو ڕێگرێك لەبەردەم هێرش و پەلامارە زۆرەکانیان بۆ سەر ستەم لێ کراوانی چین و هیند.

جا قورئانی پیرۆز لەبەر ئەوەی ڕووی گوفتاری ئاڕاستەی هەموو گرۆی مرۆڤ دەکات، ئەوا بە ڕواڵەت یەك ڕووداوی جوزئی باس دەکات، کەچی بەم ڕووداوە جوزئیە چەندەها ڕووداوی وەك ئەوە دەخاتەوە یاد[1].

پێشەوا موحەمەد ئەمین شەنقیتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوای گەورە جێگای یەئجووج و مەئجووجی وون کردووە هەتا دەگاتە کاتی دیاری کراوی خۆی و دەردەچێت، وەئەوەی خوا بیەوێت دەبێت[2].

بەڕاستی ئەمەش باشترین بەڵگەیە لە ژێر دەستمان، کە کەس جێگاکەی پێ نازانێت تەنها خوا نەبێ.



---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، (٣/ ٢١٣ ـ ٢١٦).

(٢) أضواء البيان (٢/ ٤٣٢).

## (ذوالقرنين) هەر ئەو (کۆرشی فارس)ەیە

(أبو الكلام آزاد) ڕای وایە کە (ذوالقرنين) هەر ئەو (کۆرشی فارس)ەیە کە باسی لێوەدەکات، ناوبراو لەمبارەیەوە گوتویەتی: ئەم پیاوە فارسەکان بە (کۆرش) ناویان بردوە، جولەکەکانیش بە (خورش) ناویان بردووە.. عەرەبەکانیش بە (قورش) یان (کەیخەسرەو) ناویان بردووە.. هەروەها یۆنانیەکانیش ناوی (سائیریس)یان لێ ناوە.

(کۆرش) لەیەکەمین دەورانی مێژووی ئێرانی و فارسدا، حوکمی (وڵاتی فارس)ی کردووە، ئەمەش لەو دەورانەی پێش سەردەمی هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ سەر وڵاتی فارسدا بووە، کە (دارا)ی پادشایانی کوشتووە.

ئێرانیش لە پێش حوکمی (کۆرش)دا، بۆ دوو مەملەکەت دابەش کرا بوو، یەکێکیان (مەملەکەتی فارس)و، دووەمیان (مەملەکەتی میدیا) لە باکوور.

لە ساڵی (٥٥٩)دا (کۆرش) حوکمی ئێرانی گرتۆتە دەست و هەردوو مەملەکەتی (فارس و میدیا)ی لەیەك دەوڵەتدا یەکخستووە، هەموو میرو کاربەدەستەکانی ئەو سەردەمە، لە حوکمەکەی ڕازی بوون و گەلیش پەیڕەوی و گوێڕایەڵیی کردووە.

(کۆرش) سوپایەکی لە فارسەکان پێك هێناوە، جەنگ و کوشتاری مەملەکەت و دەوڵەتانی تری پێ کردووە، فەتحی کردوون و خستونیە ژێر حوکمی خۆیەوە

مەبەستی فەتحی ئەو وڵاتانەش بۆ چەسپاندنی دادپەروەری و یەکسانی و یارمەتیدانی ستەم لێ کراوان بووە، سێ جەنگی بەناوبانگیشی هەبووە، کە لەنێو هەموو جەنگەکانی تریدا دیاربوون[1].

---

(١) ذوالقرنين، محمد خير، (٢/ ٣٧٨).

جەنگی یەکەمی (کۆرش) لەگەڵ ڕۆمەکان دا :

(یۆنان) مەملەکەتێکی هەبوو کە هاوسێ ی مەملەکەتی فارسەکان بوو، ناوی مەملەکەتی (لیدیا) بوو و دەکەوێتە بەشی سەرووی ئاسیای بچووکەوە، واتە: بەرزاییەکانی (ئەنادۆڵ) هەتا دەگاتە (دەریای ڕەش) و (دەریای ئێجە).

جەنگەکانیش لەنێوان مەملەکەتی (لیدیای یۆنانی) و (میدیای فارس) دا بەردەوام هەبوو، لە سەردەمی (کۆرش)دا پادشایەکی (یۆنانی) حوکمی (لیدیا)ی دەکرد کە ناوی (کرۆسیس) بوو.. جا کاتێك (کۆرش) حوکمی گرتە دەست، (کرۆسیس) جەنگێکی لەدژ ڕاگەیاندو هەر خۆیشی دەستی بەهێرش و دوژمنکاری کرد، دیارە (کۆرش)یش هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەبوو تەنها ڕوویەڕووبوونەوە نەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتیی سوپایەکی فارسەکانی کردو بەرەو (لیدیا) لەخۆرئاوادا ڕۆیشت و ڕووی کردە پایتەختی (لیدیا) و دوو جەنگی دژواری کت و پڕی لە نێوان هەردوو لادا ڕوویدا، کە بەجەنگەکانی (بتریا) و (ساردیز) ناسراون.

(کۆرش) بەو پەڕی دادپەرەوەری و سۆزو ویژدانەوە مامەڵەی لەگەڵ یۆنانیە بەزیوەکاندا دەکرد، تەنانەت لەوەدا زێدە ڕۆییشی کردووە، بۆ نموونە پادشا دیلەکە (کرۆسیس)ی هێناوەو داوای کردووە، کە پڕ باوەشێکی گەورە لە تەختەی بۆ بێنن و ئەو پادشا دیلەی لەسەر دابنیشێنن و، ئینجا ئاگر بەدارو تەختەکەی ژێریەوە بنێن.

ئەوانیش ئەو فەرمانەیان جێبەجێ کردووە، کەچی (کۆرش) ئەو پادشا دیلە (واتە: کرۆسیس) وادەبینێت، کە نەدەترسێت و نەدەشڵەژێت، بۆیە خێرا فەرمانەکەی هەڵوەشاندۆتەوە لێی خۆش بووەو، ئیدی تەواوی ڕۆژو ساڵانی تری بەسەر بەرزی و ڕێزەوە لەلای (کۆرش) بەسەر بردووە، ئەمەش ئەو گەشتەی یەکەمە، کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووەو، کە ئەوەیە (کۆرش) ڕۆیشتووە تا

گەیشتۆتە بەشی خۆرئاوای زەوی‌و لە کاتێکدا بووەو کەوتۆتە سەر دەریای (ئێجە) لەنزیك مەوقیعی ئێستای شاری (ئیزمیر)ی تورکیا[1].

ئەم ناوچەیەش کە بەشێکە لە دەریای (ئێجە) گرژی و نائارامی زۆر تێدا بووە.

دکتور (عبدالعليم خضر)یش سروشتی خاکەکەو جوگرافیای ئەم ناوچەیەی لە کتێبەکەیدا ڕوون کردۆتەوە، واتە: لە کتێبی (مفاهيم جغرافية في القصص القرآنية: قصة ذي القرنين) هەروەها ڕوونیشی کردۆتەوە کە چۆن خۆر لەوێوە دەرکەوتووەو وەکو ئەوە بووە، کە لەکانیاوێکی تێکەڵ لە قوڕی ڕەشدا ئاوا بوویێت، لەمبارەیەوە گوتوویەتی: (کاتێك (کۆرش) لەسەر کەنارەکانی دەریای (ئێجە) ڕاوەستاوە (کە بەشێکە لە سنووری دەریایی تورکیا لەسەر دەریای ناوەڕاست) کەنارەکانی وەها بینیوە، کە ڕێچکەی ئاوی زۆری تێدایە، واتە: بەزۆری توولەڕێ یەکانی دەریا تێکەڵی وشکانی دەبن، یەکێك لە نموونەکانی ئەم توولەڕێ یە دەریایی یانەش کەنداوی (هرمس) و (مندرێسی گەورە) و (مندریسی بچووك)ە.

کەنداوی (ئیزیمر)یش بە قوڵایی سەدو بیست (١٢٠) کیلۆمەتر چۆتە نێو دەریاکەوەو ئەم چیایانەش لەخۆرئاواو خۆرهەڵاتەوە دەوریان لێ داوە، ڕوباری (غديس)یش دەڕژێتە ناوی کە ئاوێکی لێڵ و تێکەڵ لە قوڕی گرکان و خۆڵی سووری هەیەو لەسەر بەرزایی ئەنادۆڵەوە دەڕژێنە نێو ئەم دەریایەوە، بەرزاییەکەشی لێژاییەکی درێژو هێواشی بەرەو خۆرئاوا هەیە پێش ئەوەی بگاتە بەشی خۆرئاوا.. هەر بۆیەش خێرایی ڕۆیشتنی ئاوی ڕووباری (غديس) بە ڕێڕەوی دەشتە پچڕ پچڕەکەی کەناردا بە شێوەی چەندین جۆرە لەرزین و پێچاوپێچی دابەزیوو لە کاتی تاریکیشدا لە زیادبووندایە تا دەگاتە ئاستی بنکەی دەریای (ئێجە) و لەوێشەوە دەڕژێتە کەنداوی (ئیزمیر)ەوە ئەم کەنداوەش لە نێوانی لوتکەی چیاکانی چوار دەوریدا نغرۆ بووە، کە بەرزایی لوتکەکانیشیان لە نێوان (١٠٠٠ ـ ٢٠٠٠) مەتر دایە[2].

---

(١) ذوالقرنين، محمد خير، (٢/ ٣٧٨).

(٢) ذوالقرنين، محمد خير، (٢/ ٣٧٨).

جا کاتێك کۆرش (واتە: ذوالقرنین) لەبەردەم چەقی قووڵایی (ساردیز) لە نزیك (ئیزمیر)دا وەستاوە سەرنجی لە گۆی بازنەیی خۆر داوە کە لەکاتی خۆرئاوابووندا دەکەوێتە نێو ئەم کەنداوەوە کە بەتەواوەتی لە ئەو دەچێت و سورایی تارمایی یە سوورەکەش تێکەڵی ئەو قوڕە ڕەشە بووە کە ڕووباری (غدیس) هەڵی دەداتە نێو چەقی (چاو)ی کەنداوی ئیزمیرەوە، هەر بۆیەش بە پێی ڕاوبۆچوونی ڕاست و دەرهاوێژراو پێ دەچێت ئەم دیاردەیەی (العین الحمئة / کانیاوی تێکەڵ لەو قوڕی ڕەشە) بێت کە قورئانیش باسی لێکردووە[1].

ئەو بەربەستەی کە (ذوالقرنین) واتە: (کۆرش) بنیاتی ناوە هەر ئەوەیە کەلەسەر تەنگەی (داریال) لەناوەڕاستی چیاکانی (قەفقاز)دا دروست کراوەو ڕاگیراوە.

قاسمی لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی ئەو بەربەستە ، گوتویەتی:

(ڕای ڕاست ئەوەیە ئەم بەربەستە لە هەرێمی (داغستان)ی سەر بە وڵاتی ڕووسیاو، لەنێوان هەردوو شاری (دەربەند) و (خوزار) دا بێت، چونکە لەدێر زەمانەوە تەنگەیەکی بەناوبانگ لەنێوانیاندا هەبووەو، لەلای زۆربەی نەتەوە دێرین و تازەکانیش بە (بەربەست) ناوبراوەو، جێگەیەکی بەناوی (دەرگای ئاسن)ەوە تیادایەو، ئەمەش شوێنەواری بەربەستێکی کۆنی نێوان دوو چیا لە چیاکانی (قەفقاز)[2] ە، کە لەلای عەرەبەکان بە (کێوی قاف) ناسراوەو ئەمانیش وەك

-----

(١) قصص السابقين في القرآن، دكتور صلاح عبدالفتاح الخالدي، (٢/ ٣٧٩ ـ ٣٨١).

(٢) چیاکانی قەفقاز چەند زنجیرە شاخێکی درێژبۆوەی گەورەن و، زۆر بەرزن و، بەسەختی مرۆڤ پیایدا دەڕوات و هیچ ڕاڕەوێکیان نییە، تەنها یەك ڕاڕەو نەبێت، کە ئەویش (تەنگەی داریال)ە، لەناوەڕاستداو هەر بەو ڕاڕەوەشدا لقێك لە لقەکانی ڕووبارە بەرزەکەی (ترك) دەڕوات، شاخەکانیش هێندە درێژ دەبنەوە، تا دەگەنە ئەوەی خەریکە بەر شەپۆڵەکانی دەریای (قەزوێن) لە ڕۆژهەڵاتدا بکەون و، لەخۆرئاواشدا بەر ئاوی (دەریای ڕەش) کەوتوون، ماوەی درێژبوونەوەکەشیان دەگاتە (١٢٠٠)کم. هەر بۆیەش بە بەرزترینی هەموو چیاکانی ئەوروپا لەکەرتی خۆرهەڵاتەوە دادەنرێن، بە هیچ شێوەیەك تێپەڕبوونیش پیایاندا مسۆگەر نیە، تەنها لە ڕاڕەوی (داریال)ەوە نەبێت. مفاهيم جغرافية، عبدالعليم خضر، لا ٢٩٦.

گەلانی تر گوتوویانە بەربەستێکی تێدایە و، لەو بڕوایەشدابوون، کە لە کۆتایی سەر زەوییە ئەمەش بەپێی ئەو زانیارییەی، کە پێیان گەیشتووە، کە لە پشت ئەو ناوچەیەوە هەردوو هۆزی (یەئجووج و یەجووج) هەیە)[1].

قورئان ئاماژەی بۆ ئەو ماددەیەش کردووە، کە بەربەستەکەی لێ دروست کراوە، کەوا (ذوالقرنین) بێگومان ئەم بەربەستەی لەچەند پارچەیەکی ئاسنی تواوە بنیات ناوە، لەهەمان کاتدا مسی تواوەشی بەسەردا کردووە، ئیدی ئاسن و مسەکە هێندە بەرزبوونەتەوە تا گەیشتوونەتە ئاستی بەرزایی نێوان هەردوو لووتکەی چیاکان.

باشە.. (ذوالقرنین/ کۆرش) ئەم بڕە هەرە زۆرو گەورەیەی لە ئاسن و لەمس لەکوێ بوویێت؟ (دکتۆر/ عبدالعلیم خضر) لەبارەی ئەو ناوچەیەوە گووتویەتی: (کەرەسەی خاوی ئاسن لەو ناوچەیەدا هەیە و، زەوی و زاری (ئازەربایجان) یش بڕێکی لە ئاسن و کانزا ئاسنیەکەی تێدایە. بەڵگەی ئەوەش پەیدابوونی پیشەسازی ئاسن و پۆڵایە لەمڕۆدا لە شاری (باکۆ)ی پایتەختی کۆماری (ئازەربایجان)، جا ئەگەر ئەمڕۆ ئەم هەرێمە بە ئاسن دەوڵەمەند بێت، ئەوە بێ هیچ گومانێك لە ڕابردوودا دەوڵەمەندتر بووە[2].

(ئەرمەنستان)یش بە کانزاکانیەوە دەوڵەمەندە، بەتایبەتی بە بڕێکی زۆر کەرەسەی خاوی ئاسن و مس و ڕەساس و زەرنیخ و بەردی (زاخ)و گۆگردو ئاڵتونی تێدایە. لەم بارەیەوە مێژوونووسی ئەرمەنی (لیۆنتیۆس) ئەوەی بەدیار خستووەکەوا چەند نیشانەو هێمایەکی خاکەکەیان بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی چەندین ناوچەی هەڵکەندراو لە چیاکاندا هەبوون و، ئاماژە بۆ ئەو حاڵەتەی دانیشتوانە کۆنەکان دەکەن کە لەبەر ئەوەی بڕێکی زۆریان لە ئاسن و کانزاکانی دەشتەکان بەبێ ماندووبوونێکی زۆر دەرهێناوە هیچیان تێدا نەهیشتووە، ئینجا پەنایان بردۆتە بەر قەدپاڵی چیاکان و دۆزینەوەی کانزاکان تیایداو چاڵی گەورە گەورەیان لێ هەڵکەندوون، پێکهاتە جیۆلۆجی (زەمین ناسی) یەکانیش

---

(١) تەفسیري القاسمي (١١/ ٤١١٣ ـ ٤١١٤).

(٢) قصص السابقين في القرآن، د. صلاح عبدالفتاح الخالدي (٢/ ٢٨٥).

ئاماژە بۆ ناوچەکانی (بابرت ئەرغەنی) دەکەن کە بەکەرەسەی خاوی ئاسن دەوڵەمەندەو بڕێکی زۆریشی تێدایە، هەروەك لە (گورجستان)یش بڕێکی فرە لە ئاسن هەیە، تورکیاش لە سنووری ناوچەیەکی هاوسێ ئەرمەنستانەوە هەرێمێکی بەناوبانگی ئاستی هەیە کە بڕی یەدەك(احتیاطي)ەکەشی بە نزیکەی بیست و پێنج ملیۆن تەن مەزەندە دەکرێت. سەبارەت بەبوونی ئەو خەڵووزو تەختەیەش کە بۆ تواندنەوەی ئاسن پێویستن ناوچەی (کلاکنیت)ی ئەرمەنستان بڕێکی یەدەکی گەورەی تێدایە، لە کەنارەکانی (دەریای ڕەش)یشدا کانەکانی (زونهەڵداك) بە ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندی کەرەسەی خاوی خەڵووز دادەنرێت.

ئیبن حوقل لەمبارەیەوە باسی هەرێمی (ئەردەبیل) باخ و بێستان و ڕووبارو ئاوێکی زۆرو داروتەخت و میوەیەکی هێجگار زۆرو فرەی هەیە. لەڕووی زانستی و مێژووییشەوە سەلمێنراوە کەوا کەرەسە خاوەکانی (مس) لەو هەرێمەدا زۆرە، لەم بارەیەوە توێژینەوە زەمینناسیە نوێیەکان سەلماندویانە کە (مس) بەشێوەیەکی زۆرو فرە لە پێکهاتە خاکی یەکانی (زەنجان) و (ئاناراك) و (باکوری ئەسفەهان)دا هەیە و لە باشووری (ئازەربایجان)دا بە بڕێکی هێجگار زۆر هەیە..

بەم ڕەنگە بۆمان دەردەکەوێت، کە ناوچەی بەربەستەکە بۆ بنیات نانی ئەو بەربەستە لەسەری شیاوو گونجاو بووەو، توانراویشە، کە هەر لەو ناوچەیەدا هەموو جۆرە پێداویستیەکی خۆراك و خواردنەوەو هۆیەکانی گواستنەوەو، کەرەسەی خاوی پێوست لەتەختەو خەڵوزو مس و ئاسن و کانزاکانی تر بۆ ئەو کەسانە دابین بکرێت، کە بەربەستەکەیان دروست کردووە. هەروەها بۆمان دەردەکەوێت، کە تەنگەی (داریال) یش شوێنێکی گونجاو بووە بۆ بنیاتنانی بەربەستەکە لەسەری، ئەمەش لەبەر تەنگیەکەی و بەندبوونی لە نێوان دوو چیاداو بەرزایی هەردوو چیاکانیش لەسەر هەردوو لایەکەی، هەر بۆیەش زۆربەی زانا پێشینەکان ڕای یەکلاکەرەوەو هەرە ڕاستیان ئەوەیە، کە (ذوالقرنین) بەربەستەکەی لەسەر تەنگەی (داریال) لە چیاکانی (قەفقاز)دا بنیات ناوە[١].

---

(١) قصص السابقین في القرآن (٢/ ٢٨٨).

## بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج

(ذوالقرنین) ئەم بەربەستەی دروست کرد لەبەردەم یەئجوج و مەئجوج، تاکو ببێتە ڕێگریەك لە نێوان ئەوان و دراوسێکەیان کەوا هاواریان بردبووە بەر (ذوالقرنین).

خوای گەورە لە قورئان باسی ئەم بەر بەستە دەکات و دەفەرموێ: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾].

واتە: تا گەیشتە نێوان دوو بەربەستەکە، ئا لەوێ گەلێکی دۆزییەوە کە لە هیچ قسەیەك نەدەگەیشتن.

هەروەها دەفەرموێ: [قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾].

واتە: (ئەوانیش) گوتیان: ئەی (ذوالقرنین)! بەڕاستی یەئجوج و مەئجوج فەساد لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوە، ئایا سەرانەت بۆ کۆبکەینەوە تا بەربەستێك لە نێوان ئێمە و ئەواندا دروست بکەیت؟

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەچەند تایبەتمەندیەکی گرنگی یەئجوج و مەئجوج دراوە، یەکەمین تایبەتمەندیی ئەم گەلانە ئەوەیە کە لە هیچ شتێك ناگەن، واتە: گەلێکی سەرەڕۆو لە قسە نەگەیشتوون، ئەم دەستەواژەی «سەر زەوی»یە، خراپەکاری لەسەرتاپای جیهان دەگەیەنێت، ئەمەش بۆ نانەوەی خراپەکاری لە شوێنێکدا پێویستە ڕەگ و ڕیشەیەکی فەلسەفی و بیروباوەڕێکی گومڕاکەر بوونی هەبێت، ئینجا بۆ هێنانە جێی ئەم سیستەمە خراپەکاریە لەسەرتاپای جیهاندا، دەبێت واتایەکی فەلسەفی گومڕای مەزن هەبێت، کە کاریگەریی لەسەر سەراپای جیهان هەبێت و سەرجەمی مرۆڤەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە[1].

---

(١) ذوالقرنين، محمد خير، (٢/ ٣٧٨).

بەرگی سێیەم

خوای گەورە دەفەرموێت: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ].. [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ].. پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە خوای گەورە دەفەرموێت [إِذَا بَلَغَ] واتە: گەیشتۆتە ئەو جێگایە: مەبەستیشمان پێی ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەر شوێنێکی زەویدا بوەستێت دەتوانێت خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون ببینێت، بۆیە (ذي القرنين) تەنها ئەوەندە نیە خۆر هەڵاتن و خۆرئاوابوونی بینیبێت، بەڵکو خوای گەورە پێمان دەفەرموێت: کە گەیشتۆتە ئەو جێگایەی کە بەڕاستی کە خۆری تێدا ئاوا و وون دەبێت پاشان ئەو جێگایەی کە خۆری تێدا هەڵدێت و دەردەکەوێت چونکە [مَغۡرِبَ..و..مَطۡلِعَ] دوو (اسم مكان)ن واتە: ناوی شوێنن، پاشان کاتێك سورەتەکە باس لەوە دەکات کە لە شوێنی هەڵاتنی خۆرەکەدا (ذي القرنين) کۆمەڵە خەڵکانێك دەبینێت [وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾]. واتە: هیچ شتێك نیە کە تیشکی خۆرەکەیان لەسەر لابدات و دایان پۆشێت.



### پرسیارێك دەربارەی ئەو بەربەستە؟

خەڵکانێك پرسیار دەکەن و دەڵێن: بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج دەکەوێتە کوێ؟

بۆ هەتا ئێستا هیچ کەس نەیبینوە، هەر چەندە ئەمڕۆ تەیارەو گەیەنەرەکان زۆر ئاسان بونەو چەکی پێشکەوتوش هەیە؟

وەڵام: پێشەوا شەنقیتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەو وتەیەی کە دەڵێن ئەگەر ئێستا بونیان هەبێت ئەوا بۆ خەڵکی دەردەچن، ئەو وەڵامە ڕاست نیە.

چونکە ئێستا یەئجوج و مەئجوج بوونیان هەیە، بەڵام خوای گەورە شوێنەکەیانی بزر کردووە هەتا کاتی دەرچوونیان دێت، ئەوەی زیاتر پاڵپشتی ئەوەش بێت ئەو ئایەتە قورئانیەیە کە خوای گەورە دەربارەی بەنی ئیسرائیل

دەفەرمویٚ: [ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ][1].

وە زانستی خوای گەورە زۆر فراوانترە هەتا وەکو تەکنەلۆژیای سەردەم بیبینێتەوەو بە دوایدا بگەڕێت، وە بە درێژایی مرۆڤایەتی هەر ڕۆژێك بابەتێکی نویٚ دۆزرابێتەوە پێویستی بە کاتێکی درێژ خایەن هەبووە[2].

## ئایا کەس ئەو بەربەستەی بینیووە کە (ذو القرنین) دروستی کردووە؟

بەڵێ... ئەم بەربەستە ئەمڕۆ بوونی هەیەو دەکەوێتە نێوان دوو شاخی گەورەوە، کە ناسراوە بە (داریال)، ئەوەش نوسراوە لە هەموو نەخشەکانی ئیسلامی و ڕووسی لە کۆماری جۆرجیا، ئەم بەربەستەش توندو تۆڵ کراوە بە پارچە ئاسنی گەورەو مسی تواوە هەروەکو قورئان ڕاشکاوانە باس لەم بابەتە دەکات کە ئەمەش بوونی هەیە لە چیای قەوقاز[3] لە چیاکانی مەنتیقەی (داریال)، ئەوەش ڕاستیەکە بۆ هەر کەسێك بیەوێت ئەم بەربەستە ببینێت.. چیایەکی بەرزە درێژ دەبێتەوە لە دەریای ڕەش هەتا دەریای قەزوین، کە نێوانی هەردوو دەریاکە (١٢٠٠) کم[4].

هەرچەندە لە نێو زانایان جیاڕایی هەیە کە دەکەوێتە کویٚ ؟

هەندێك دەڵێن: لە ئەرمینیایە..

هەندێکی تر دەڵێن: لە چیاکانی قەوقازە لە (شیشان و ئەنجۆش و کەرەج)..

سەید قوتب(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: بەربەستێك دۆزرایەوە لە نزیك شاری ترمذ کە بەناویانگە بە دەرگای ئاسنین، کەوا سەرەتاکانی چەرخی

---

(١) أضواء البيان، (٤/ ٢٠٢ ـ ٢٠٣).

(٢) المسيح الدجال ويأجوج ومأجوج، د. حامد البسيوني، لا ٩٢.

(٣) بە گەورەترین چیای ئەوروپا هەژمار دەکرێت، کە درێژیەکەی دەگاتە (٥٦٣٠) مەتر،وە بە بەردەوامی بەفری لیٚ دەبارێت.

(٤) يأجوج ومأجوج، عبدالعزيز بن عبدالرحمن المسند، (لا ٩٤ ـ ٩٥).

پانزەهەمینی عیسایی زانای ئەڵمانی (سیلد برجر) بەلایدا ڕۆیشتووەو لە پەرتوکەکەی خۆیدا تۆماری کردووە.

مێژوونووسی ئیسپانی (کلا فیجو) لە گەشتەکەیدا لە ساڵی ١٤٠٣ عیسایی دەڵێ: بەربەستی دەرگای ئاسنین لەسەر ڕێگای سەمەرقەندو هیندیستانە.. وە لەوانەیە ئەوە ئەو بەربەستە بێ کە (ذوالقرنین) دروستی کردبێت[١].

بەڵام ئەوەندەی من بۆی بچم ئەوەیە کە ئەم بەربەستە ئەو بەرزاییە بێ کە دەورەی شاری ترمذی داوە هەروەکو یاقوت الحموی لە پەرتوکی (معجم البلدان) باسی دەکات.

گومان لەوەدا نیە کە لە ڕۆژگاری ئێستاماندا گەڕان و هاتوچۆی شوێنە دورەکان گەلێك ئاسانە، و هۆکاری زۆر هەیە لە بەرژەوەندی ئەم کارەدایە وەکو هۆیەکانی هاتوچۆی زەمین، و دەریایی و ئاسمان و بەکارهێنانی هۆی پەیوەندی و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ لە کیشوەرێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ چەندین کیشوەر و قوڵایی دەریاو زەریاکان پشکنینی خۆ وڵاتە زلهێزەکانی سەردەم پێشبڕکێ دەکەن لە دۆزینەوەی جێ و شوێنی نوێ لە هەسارەکان، بەڵام ئەم کارە لە کۆندا زۆر ترسناك و گران بووە، بەهۆی نەبوونی هۆکاری گواستنەوەو هۆی پەیوەندی نێوان لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانەکان لە سەدەی یانزە هەڵسان بەم کارەو لە بواری گەڕان و دۆزینەوەی شوێنی نوێ لەسەر زەوی و دەستێکی باڵایان هەبووە پێش هەموو گەلان هەڵساون بەم کارە و گەلێك زانای هەڵکەوتویان لێ پەیدابووە کە چەندین جار ژیانیان خستۆتە مەترسیەوە، زۆریان گیانیان لە دەست داوە بۆ ئەم کارە هەموو هاندەر بوون و موسڵمانەکان ویستویانە ئەو ڕاستیانە بە کردار بسەلمێنن[٢].

بۆ نمونە: لە سەدەی دووهەمی کۆچیدا خەلیفەی عەبباسی (واثق بالله) لە خەودا بینی ئەو بەستنەی کە ئەسکەندەر دروستی کردوە ناوی لە قورئاندا

---

(١) في ظلال القرآن (٤/ ٢٢٩٣).

(٢) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٤).

هاتووە لە سورەی کەهفدا باوەڕداران و بێ باوەڕانی لێك جیاکردۆتەوە، ژەنگ دای ڕزاندووەو خەریکە دەڕوخێ، کاتێ ئەم خەوەی بۆ دەوروبەری گێڕایەوە سەلامی ڕاوێژکاری داوای لێکرد کە ماوەی بدات لەگەڵ چەند کەسێکدا هەستن بە گەشتێك بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو بەستەی لێیە، ئەویش ماوەی پێداو هەموو پێویستیەکی بۆ ئامادە کردووە، لەگەڵ کۆمەڵێك لە شارەزایانی ئەو بوارەدا سەلام ڕووی کردە ڕۆژهەڵات و بەرەو دەریای قەزوین کەوتنە ڕێ دوای مانگێك گەیشتنە شوێنێك کە زەویەکەی بۆنێکی ناخۆشی گرتبۆوە و ئەوانیش دەستیان کرد بە ڕژاندنی سرکە بەسەر ئەو شوێنەدا بەم هۆیە لەو بۆنە ڕزگاریان بوو بەو ڕەنگ ویۆنەدا بەشی یەکەمی ئایەتەکەیان بۆ ڕوون بوەوە کە دەفەرموێ: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا].

واتە: تا گەیشتە نێوان دوو بەربەستەکە، ئا لەوێ گەلێکی دۆزییەوە کە لە هیچ قسەیەك نەدەگەیشتن.

دوای دە ڕۆژ ڕۆیشتن لەو شوێنەوە گەیشتنە وڵاتێکی وێرانە بۆ ماوەی (٢٧) ڕۆژ بەو چۆلەوانیەدا ڕۆریشتن بۆیان دەرکەوت کە ئەم شوێنە ئەو جێگایە بووە کە ئەو دوو گەلە بێباوەڕە (یەئجوج و مەئجوج) وێرانیان کردووە بۆ پشتی ئەو کێوەی کە بەستەکەی لە نێوان دروست کراوە، جا دوای ئەو (٢٧) ڕۆژە ئەو خەڵکە ڕوتانەیان بەدی کرد کە لەبەشی دووەمی ئایەتەکەدا باسیان هاتووە کە دەفەرموێ: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾].

واتە: ئەسکەندەرو کۆمەڵەکەی بەردەوام بوون لە ڕۆیشتنەکەیاندا تا گەیشتنە ناو ئەو هۆزە رووت و قوت و بێ مەئەواو بێ خانوبەرە. پاشان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتنەکەیاندا تا گەیشتن بە نشێوێکی نێوان دوو کێو کە دیاربوو سنوری نێوان ئەو دوو هۆزە بوو (هۆزە باوەڕدارەکان و بێباوەڕەکان لەوێ پابەستەکیان بینی کە بریتی بوو لە دەرگایەکی گەورەی ئاسن ئەم بەرو ئەو بەری کێوەکەی

گرتبووه له ئاسنی تێکەڵە بە مس دروست کرابوو ڕووبەرەکەی زیاتر لە (٤٠) مەتر بوو[١]، واتە: درێژی بەستن کە ئەمەیان بینی بەشی کۆتایی ئایەتەکەیان لا ئاشکرا بوو و زانیان ئەمە ئەو دیوارەیە کە ئەسکەندەر دروستی کردووە، و لە قورئاندا ناوی هاتووە کە دەفەرموێ: [قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾].

واتە: یەئجوج و مەئجوج خراپەکاری و فەسادیەکی زۆر دەکەن لەسەر زەویدا، جا ئەگەر قبوڵت بێت پارەو سەرانەیەکت بۆ کۆبکەینەوە هەتا لە نێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێك دروست بکەیت.

بۆ ڕۆژی دووەم پاش گەیشتنی تیمەکە بەسەرۆکایەتی سەلامی ڕاوێژکار ڕێکەوتی ڕۆژی هەینی بوو لەو ڕۆژەدا بینیان کەوا (١٠) سوار ڕوویانکردە بەستەکەو هەریەکەیان گورزێکی دارینی بەدەستەوەیە دەستیان کرد بە لێدانی بەستەکە، سەلام و هاوڕێکانی بۆیان دەرکەوت کە هەموو ڕۆژانێکی هەینی ئەم دەستە سوارە دێن و، لەو بەستە ئەدەن، تاوەکو ئاگاداری ئەوانە بکەنەوە لە پشتی بەستەکەن کەوا بەستەکە ساغەو هیچ درزێکی تێدا نیە، ئەوسا خەوەکەی موفەقەدینیان بۆ لێکدایەوە کە ئەو بەستە نەڕوخاوە و خاوەن باوەڕەکان ترسیان لە ڕووخانی نیە، ئەمەش بەشی کۆتایی فەرمودەکە دێنیتە دی کە دەفەرموێ: [فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾].

واتە: ئەو گەلە ستەمکارە نەیانتوانی بەو بەستەدا هەڵگەڕێن و نەیانتوانی کونی بکەن، و بیڕوخێنن.. لە گەڕانەوەیاندا بۆ بەغدا ئەوەی بینیان بۆ خەلیفەیان گێڕایەوە[٢].

گەڕانی ئەو زانایانە بۆ دۆزینەوەی شوێنە نەزانراوەکان زۆر جار بەهۆی لەناوچونی بە کۆمەڵ بۆ نمونە: لەسەدەی حەوتی کۆچی فەرمان ڕەوای

---

(١) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٥).

(٢) قصص السابقين في القرآن (٢/ ٤٢٦).

مالی لە ڕۆژئاوای سودان محەممەدی کوڕی قوو کە زانایەکی پایەدار بوو لە بواری جوگرافیادا، دەستەیەك لە شارەزایان ئامادە کردو ناردنی بۆ گەشتێکی ئاوی بەناو دەریای سوردا تاکو بزانن ئەو بەری دەریاکە چی تیایە، بۆ ئەم مەبەستە زیاتر لە سەد کەشتی و هەزار کەسێکی ناردو هەموو پێویستیەکانی بۆ دابین کردن، ئینجا دەستیان کرد بە گەشتەکەیان و زۆریان پیٚ دەچیٚ و ناگەڕێنەوەو خەڵکی دەستیان لەچ ئەشیاو بەهیوای ئەوە نابن کە هیچکام لەوانە بگەڕێتەوە، بەڵادوای ماوەیەك سەیر دەکەن تەنها بەلەمێك دەگەڕێتەوە سەرۆکی ئەم بەلەمە دەڵیٚ دوای ڕۆیشتنمان بەناو ئاودا و پاش سیٚ ڕۆژ تێپەڕبوون توشی گیاندارێك بوین هەموو خەڵکەکەی سەر بەلەمەکانی خوارد، ئێمە دوا بەلەم بوین و توانیمان بگەڕێنەوە دواوە، و پاشەکشە بکەین و لەو شوێنە ڕزگارمان بیٚ، ئەو سەفەرەمان بەوەوە نەوەستا تیمێکی تری پێکهێنا بەسەرۆکایەتی خۆی و ڕووی کردە دەریاو ئیتر هیچ کام لەو تیمە نەگەڕانەوە، دەربارەی بەجێهێنانی ئەم کارە زانایان زۆر کاری ناهەمواریان بەسەردا هات، بەڵام کۆڵیان نەدا، ئەوە (ئەبو عەبدوڵلای بەشاری مەقدیسی) لە پێشەکی پەڕاوەکەیدا کە لەژێر دێری (أحسن التقاسيم في مصرفة الأقاليم) دایناوە و دەڵیٚ: بووم بە پسپۆڕو لە بورای داڕشتن و زمانەوانی خواناس، بە هەموو واتایەك بووم بە ئەدیب و خواناسێکی بێهاوتا، چەندین وتاری جۆراو جۆرم گەیاندە خەڵك بە هەموو جیهان، ئینجا زانیم ڕووبەری هەر وڵاتێك چەند ڕۆژە ڕێگایە[١].

هەندێك لە مێژوونووسەکان هەوڵیان داوە کەوا شوێنی ئەم بەربەستە بزانن، پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: یەکیٚ لەوان خەلیفە (الواثق) بوو کە هەندێك لە سەرکردەکانی نارد لەگەڵ هەندیٚ سوپا تا ئەم بەربەستە بدۆزنەوە، تاکو پێی نیشان بدەن، جا وڵات بە وڵات و شوێن بە شوێن گەڕان تاکو پێی گەیشتن کە بینیان ئەم بەربەستە بە ئاسن و مس داڕێژراوە، وە باسیان کرد کەوا دەرگایەکی گەورەیان بینیوە کە چەندین قوفڵی گەورەی لێدرابوو، وە پاشماوەی شیرو هەنگوینیان بینی لە تەلارێك کە چەندین پاسەوانی

---

(١) المسلمون والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل، لا ٣٤.

مەلیکی گەورەی لە دیارە، وە ئەو بەربەستە زۆر بڵندەو لە نێوان دوو چیای زۆر بەرزە، پاشان گەڕانەوە شوێنی خۆیان کە سەفەرەکەیان زیاتر لە دوو ساڵی خایاند[١].

تەنانەت یەکێك لە هاوەڵان ئەم بەربەستەی بینیووە، پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئەو بەربەستەم بینی وەکو ڕێگای سورو ڕەش وایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بێگومان بینیوتە[٢].

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: فەرموودەکە بە یەك گەیەنراوە لەلایەن (ئیبنو ئەبی عومەر) لە ڕێگەی (سەعدی کوری ئەبی عروبە) لە (قەتادە)وە، لە پیاوێکی خەڵکی مەدینەوە کە بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) فەرمووە: ئەی پێغەمبەری خوا من بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوجم بینیووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: چۆنت بینی؟ وتی: وەکو پۆشاکی خەت خەت، خەتێك سوورو خەتێك ڕەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو ڕازی بوون فەرمووی: تۆ بینیوتە[٣].

---

(١) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، (٥/ ١٩٣).

(٢) فتح الباري (٦/ ٣٨١).

(٣) فتح الباري (٦/ ٤٧٦) وعلقه البخاري ووصله ابن ابي عمر.

# هاتنی یەئجوج و مەئجوج

پاش ئەوەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ژێر سایەی ئیسلامدا خۆشی و هێمنی و ئاسودەیی بۆ سەر زەوی دەگەڕێتەوەو شەڕو کوشتارو خوێن ڕشتن بە تەواویی لەسەر زەوی هەڵدەگیرێت و نامێنێت ویست و ئیرادەی خوا وادەبێت کە مرۆڤایەتی دووچاری تاقیکردنەوەیەکی نوێ بێت لە جۆرێکی تازە کە پێشتر مرۆڤایەتی شتی لەو جۆرەی بەخۆیەوە نەبینیوە کە ئەویش بریتیە لە دەرچونی یەئجوج و مەئجوج بۆ سەر زەوی، جا پێش ئەوەی باسی یەئجوج و مەئجوج بکەین، هەندێ ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەن کە باسی یەئجوج و مەئجوج دەکەن:

## یەکەم: یەئجوج و مەئجوج لە قورئان:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ

أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾].

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! پرسیات دەربارەی (ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) لێ دەکەن.. بڵێ هەندێك لەسەر بوردەی ئەوتان بۆ باس دەکەم.. ئێمە دەسەڵاتمان لەسەر زەویدا بۆ ڕەخساندو هەموو هۆکارێکی پێویستی ئەو سەردەمەشمان بۆ دابین کرد، ئەویش دوای هۆکارەکان کەوت و سوودی لێیان بینی.. خۆی و سوپاکەی کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشتنە شوێنی خۆرئاوابوون لەناوچەکەدا، وادەهاتە بەرچاو، کە گۆمێکی قوڕو لیتاوی بێت، لەوێدا ڕۆژ ئاوا دەبێت و ڕێیان دەکەوێتە گەلێکی بێباوەڕ.. لەو شوێنەدا ئێمەش پێمان گوت: (ئەی (ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) یان بە سزا لەناویان بەرە (گەر بەدەم بانگەوازەوە نەیەن) یان چاکەیان لەگەڵدا بکە، (ئەگەر بەدەم بانگەوازی باوەڕو خواناسییەوە هاتن). (ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) یش گوتی: (بێگومان ئەوەی ستەمکار بێت، سزای دەدەین، و دوایش کاتێك بۆ لای خوای پەروەردگاری دەگەڕێنرێتەوە، خودا سزایەکی سەخت و گەورەی دەدات. هەر کەسێکیش لەوان بەدەم بانگەوازی باوەڕەوە بێت و باوەڕ بهێنێت و کاری چاکە بکات، ئەوە پاداشتی چاکی هەیەو ئێمەش لەمەولا بە وتەی خۆش و ئەرکی سووکی ئاڕاستە دەکەین. دوای ئەوە(ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) گەشتی دووەمی بەرەو خۆرهەڵات دەست پێکردو بەشوێن هۆکاردا ڕۆشتەوە، هەتاکو گەیشتە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دوورو، لەوێشەوە هەر سەرقاڵی گرتنە بەری هۆکارەکان بوو و بەدوایاندا دەگەڕا.. تاکو لەکاتێکدا گەیشتە نێوان هەردوو بەربەستەکە، کە دوو چیای بەرزبوون و کە لەنێوانیاندا گەلێکی ناحاڵی و دواکەوتوو دەژیان، کە هیچ تێگەیشتن و پەی بردنێکیان نەبوو (مەگەر بە کەمی و بەدەگمەن).. جا ئەوان کە توانای (ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) یان زانی، داواکاریەکیان لێی هەبوو، کە پێیان گوت: (ئەی (ذِی ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ) دوو هۆزی دڕندەی وەك (یەئجوج و مەئجوج) بەدکارو تێکدەرن لەسەر زەوی و (بۆ ئێمەش ترسناکن) بۆیە داوات لێ دەکەین

بەرگی سێیەم

بەربەستێکی پتەو لەنێوان ئێمەو ئەواندا دروستکەیت، کە ئێمەش پاداشتێکی داراییت لەبەرامبەر ئەو کارەتدا پێ بدەین).. (ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ) یش لە وەڵامیاندا گوتی: (ئەو تواناو زانستەی، کە خودای پەروەردگارم بۆی ڕەخساندووم زۆر لەو سامانە چاکترە، کە بەپاداشت دەیدەن بەمن، بەڵام من داواکەتان بۆ بەجێ دێنم، بۆ ئەم کارەش ئێوە بەهێزو بازووەکانی خۆتان یارمەتیدەرو هاوکارم بن، تاکو بەربەستێکی تۆکمەو پتەوتان لەنێوان ئێوەو ئەو دوو هۆزە ترسناکەدا بۆ دروست بکەم.. بۆ ئەم کارەش پارچە ئاسنی گەورەم بۆ بهێنن و لەسەر یەك داینێن، تاکو ئەمسەرو ئەو سەری کێوەکە دابگرێت و هەردوو لوتکەکەشیان داپۆشێت). ئینجا فەرمانی پێدان بە (موشەدەفە) فوو بکەن لەو ئاگرەی، کە لەژێر ئاسنەکەدا هەڵی گیرساندبوو، تا ڕادەیەکی وا کە هەمووی کردە ئاگر، پاشان (ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ) پێی گوتن: (مسی تواوەم بۆ بهێنن، تا بیکەم بەسەر پارچە ئاسنەکاندا و (ئیدی گەر مس و ئاسنیش تێکەڵ بکرێن ئاوێتەیەکی پتەوی لێ دروست دەبێت).. ئینجا هەردوو هۆزەکەی یەئجوج) و (مەئجوج) یش، نەیانتوانی سەرکەون بەسەر بەربەستەکانداو نەیانتوانی لێی ببڕن و کەلەبەرو کونی تێبخەن، دوای ئەمەش (ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ) گوتی: (بەڕاستی بنیات نانی ئەم بەربەستە ڕەحمەتێکە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆ ئێوە، کە بە فەرمانی خۆی (یەئجوج و مەئجوج)ی لێ شاردنەوە، خۆ هەرکاتێك خواستی خوا وابێت کە ئەم بەربەستە تێك بدات، ئەوا کەلەبەری گەورەی تێدەخات و دەیڕوخێنێت و لەگەڵ زەوی تەختی دەکاتەوە.. بێگومان بەڵێنی پەروەردگاریشم ڕاست و حەقە).

(تەفسیری چەند وشەیەکی نێو ئەم ئایەتە)

[سَأَتْلُواْ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا]: دەربارەی ئەوە بەچەند ئایەتێکی قورئان هەواڵتان پێ دەدەم.

[مَكَّنَّا لَهُۥ]: دەسەڵاتێکی گەورەمان پێدابوو.

[وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا]: چەند هۆکارو ئامرازێکی حوکمڕانی و فەتحکردنمان بۆ ساناو بەردەست کردبوو.

[فَأَتۡبَعَ سَبَبًا]: سودی لەو هۆکارانە وەرگرت و ڕێگەیەکی وای گرتە بەر، کە بەرەو خۆرئاوای دەبرد.

[تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ]: وەك چۆن بینەرێك لە دوورەوە بۆ ناوچەکە بڕوانێت بە (عَيۡنٍ حَمِئَةٖ) واتە: بە کانیەکی لیلی تێکەڵ بە قوڕی ڕەشی) دەهاتە بەرچاو..

[قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ]: گوتمان ئەی (ئی ئی بج) ئەمەیان بە سرووش لەخوداوە بووە، یان لەڕێی پێغەمبەرێکەوە بووە، کەلە سوپاکەشیدا لەگەڵیا بووە.. ڕای یەکەم (کە بە سورشێك خوا پێی فەرمووە) ڕاستترە..

[مَن ظَلَمَ]: هەر کەسێك ستەم بکات، ستەم لێرەدا واتای کوفرو بێباوەڕی دەگەیەنێت.

[وَقَدۡ أَحَطۡنَا]: سزایەکی سەخت و دژواری وا کەلەبەرچاوی خەڵکی دیارە.

[ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا]: گەشتی دووەمی بەرەو ڕۆژهەڵات دەست پێکرد.

[لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا]: هیچ بەربەستێکی وەك گردێك، یان چیایەك، یان شتێکی ترمان بۆ دانەنابون کە بیانپارێزێت.

[أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ]: لە زانست و زانیاری ئاگادارمان کردبوو.

[ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا] پاشان گەشتی سێیەمی بەرەو لای باکوور ئەنجام دا.

[بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ]: لەنێوان هەردوو چیا بەرزەکەدا.

[قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا]: لەبەر دواکەوتوویيان تێگەیشتن و تێگەیاندنیان کارێکی قورس بوو.

[يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ]: دوو ناوی دوو هۆزن، کەلەناوچەکانی ناوەڕاستی ئاسیادا نیشتەجێ بوون.

[نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا]: پارەو ماڵێکی دیاریکراوت پێ بدەین.

[بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا]: بەربەستێکی پتەو لەنێوان ئێمەو ئەوان تاکو نەگەنە سەرمان.

[فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ]: بەدەستەکانی خۆتان و بەهێزی بازووەکانتان یارمەتیم بدەن.

[بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا]: بەربەستێکی، یان دیوارێکی تۆکمەو داڕێژاروی پتەو.

[ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ]: پارچە ئاسنی گەورەم بۆ بێنن.

[سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ]: بەئاسن هەتا لووتکەی هەردوو چیاکەی پڕکردەوەو تەختی کرد.

[قَالَ ٱنفُخُوا۟]: ئاگر لەژێر ئاسنەکەدا بکەنەوەو فووی پێداکەن.

[أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا]: مسی تواوە بەسەر ئاسنە سوورکراوەکەدا دەکەم تاکو تێکەڵی بێت و هەردوو کانزاکە یەکگرن.

[فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ]: نەیانتوانی بەسەر ڕووی بەربەستەکەدا سەرکەون.

[وَمَا ٱسْتَطَـٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا]: دەستەوسان بوون لەبڕین و کون و کەلەبەر تێکردنی.

[هَـٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى]: خودا بەڕەحمەتی خۆی و بەفەرمانی خۆی ئەم دوو هۆزەتان لێ بەند دەکات.

[فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى]: هەرکاتێك خواستی خودا هاتە سەر وێرانکردنی بەربەستەکە، ئەوا:

[جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ]: تێکی دەدات و وردو خاشی دەکات و لەگەڵ زەویدا تەختی دەکات.

دەربارەی (ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ) پرسیارت لێ دەکەن، ئەم پرسیارانەش جولەکەکان فێری کافرەکانی مەککەیان کرد، کە سێ پرسیار لە (ﷺ) بکەن لەبارەی هاوەڵانی ئەشکەوت و ڕۆح و (ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ)، ئەگەر توانی وەڵام بداتەوە ئەوا پێغەمبەرە، جا ئەم ئایەتانە کە وەڵامە بۆ ئەوان، وەڵامە بۆ نەتەوەکانی سەردەمیش کە ئەو ڕووداوە مێژووییە کە قورئان باسی دەکات بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو، چونکە کە بۆی باسکردن کەس نەیتوانی بڵێ وانیە!

کەواتە ﴿ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ﴾ گەیشتۆتە ناوچەیەك کە خۆری بینیوە هەروەك ئەوەی لەناو ئاوی کانیەکی لێڵدا ئاوا ببێت.

یان لە تەفسیرێکی تردا ئاوی کانیەکی گەرم، لە یەکێ لە کۆنفراسەکانی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت دا لەم ساڵانەی دواییدا ئافرەتێکی لێکۆڵەری زانا دیراسەی گەشتەکەی ﴿ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ﴾ ی کردبوو کە ئەبێ لە کوێوە بۆ کوێ چووبێ، ئەو رای بەلای کانیە گەرمەکەدا بوو، وەئەو ناوچەیەشی دەست نیشان کردبوو کە کانی گەرمی زۆر لێیە.

بەڵام ئێمە پێمان باشە بێینە سەر لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەو ئایەت و فەرمودانەی کە باس لە (یەئجوج و مەئجوج) دەکەن و هەوڵیش دەدەین لە ڕوانگەی ئەوانەوە چەمکێك لە ڕاستیەکانمان بۆ ڕوون ببێتەوە.

## لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئایەت و فەرموودەکان:



**یەکەم:** لە ئایەتەکانی سورەتی (الکهف)دا ئەم چەند ڕاستیەمان بەرچاو دەکەوێت:

خوای گەورە تواناو زانست و دەسەڵاتێکی وای بە (ذي القرنين) بەخشیوە کە بۆ هەر کارێك مەبەستی بێت هۆکاری پێویستی بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە بەخشیوە [إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾][1].

ئایەتی [فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾] کە واتای بەکارهێنانی یەکێك لەو هۆکارو (وەسیلە)تایبەتانە دەگرێتەوە کە خوا پێی بەخشیوە سێ جار دووبارە بۆتەوە، وە هەر جارێکیان لە دوای هاتنی ئەو ئایەتە (واتە: بەبەکارهێنانی ئەو هۆکارە) (ذي القرنين) توانیویەتی سەفەرێکی دوورو درێژ ئەنجام بدات و پانتاییەکی زۆر گەورە ببڕێت، جاری یەکەم بەهۆی ئەو هۆکارەوە توانیویەتی بگاتە خۆرو جاری دووەم پێی گەیشتۆتە خۆر هەڵاتی خۆر وە جاری سێیەم پێی گەیشتۆتە نێوان دوو بەربەستەکە، بۆیە پێویستە بزانین ئەو هۆکارە [سَبَبًا] مەبەستی پێی

---

(١) سورة الكهف، الآية: (٨٣-٩٨).

چیەو چی دەگەیەنێت، وە پێمان باشە قورئانی پیرۆز خۆی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە چونکە (القرآن يفسِّرُ بعضهُ بعضا). واتە: قورئان هەندێکی هەندەکەی تری ڕوون دەکاتەوە.

بەچاو خشاندنەوەیەکی سورەتەکانی قورئان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم وشەیە لە چوار سورەت دا هاتووە:

أـ لە سورەتی (غافر) کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا][1].

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە واتاو مەبەستی [أَسْبَٰبَ] دا دەڵێت: (الطرق) واتە: ڕێگاکان، بەڵام پێشەوایان (قەتادە) و (الزهری) و (السدی) و (الأخفش) دەڵێن: بە واتای (الأبواب) واتە: دەرگاکان[2].. کەواتە: [أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ] مەبەست پێی دەرگاکانی ئاسمان یان ڕێگاکانی ئاسمان.

ب- [أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾][3]. واتە: پێیان وایە زەوی‌و ئاسمانەکان و ئەوەی لە نێوانیان دایە موڵکی ئەوانە، دەبا بتوانن سەرکەون بەڕێگاکانی ئاسماندا.

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (فليصعدوا في الأسباب التي توصلهم إلى السماء)[4].

واتە: بە واتای (دەبا سەرکەون بەو ڕێگایەنەدا یان بەو دەرگایەنەدا کە دەیان گەیەنێتە ئاسمان.

---

(١) سورة الكهف، الآية: (٨٤).

(٢) سورة غافر، الآية: (٣٦-٣٧).

(٣) فتح القدير، للإمام الشوكاني، تحقيق:د.عبدالرحمن عبيدة، (٦٤٦/٤).

(٤) سورة ص، الآية: (١٠).

ج. لە سوڕەتی (الحج) دەفەرموێت: [مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾].

واتە: هەر کەسێ گومانی وایە کە خوای گەورە سەری ناخات لە دونیاو لە قیامەتدا با پەتێك درێژکاتەوە بۆ ئاسمان و پیایدا سەرکەوێت پاشان بیپچڕێنێت، ئینجا با سەیر بکات بزانێت بەم فێڵە داخی دڵی دادەمرکێتەوە.

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (أي يطلب حيلة يصل بها إلى السماء)[1].

واتە: با هەوڵ بدات فێڵێك یان ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە پێی بگاتە ئاسمان.

پێشەوا عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: (أي ليتوصل إلى بلوغ السماء)[2].

واتە: با هەوڵ بدات خۆی بگەیەنێتە ئاسمان.

د ـ لە سورەتی (البقره) دەفەرموێت: [إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾][3].

واتە: لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کە خەڵك شوێنیان کەوتبوو حاشا دەکەن لەوانەی کە شوێنیان کەوتبون وە سزای سەختی خوایان بینی، وە هەموو هۆکارەکانیان لێ پچڕا. واتە: هەموو ئەو دەرگایانەی کە دەیان گەیەنێتە ڕەزامەندی خوا لێیان داخراوەو ڕێگەیان لێ پچڕاوە.

کەواتە پاش ئەو گەڕانە بە دوای وشەی [سَبَبًا] یان [أَسْبَٰبَ] لە سورەتەکانی قورئاندا زۆر بە ڕوونی بۆمان ئاشکرا دەبێت کە ئەم وشەیە لە قورئاندا پەیوەستە بە ئاسمانەوەو مەبەست پێی ڕێگاکانی ئاسمان یان دەرگاکانی ئاسمان یان هەر

---

(١) فتح القدير، للإمام الشوكاني، تحقيق:د.عبدالرحمن عبيدة،(٤/ ٥٥٥).

(٢) فتح القدير، للإمام الشوكاني، تحقيق:د.عبدالرحمن عبيدة،(٣/ ٦٠١).

(٣) تفسير القرآن العظيم (٥/ ٢٣٦).

بەرگی سێیەم

هۆکارێك کە بتوانێت پێی بگەیتە ئاسمان، جا (مامۆستا هاوڕێ) دەڵێت: پێم وایە ئێمەش شتێکی تازە بابەت ناهێنین ئەگەر بڵێین [فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾] مەبەست پێی هۆکارێکە کە (ذي القرنين) بەکاری هێناوە بۆ هات و چۆکردن لە ئاسماندا و بەهۆشیەوە توانیویەتی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بکات.

کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ].. [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ].. پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە خوای گەورە دەفەرموێت [إِذَا بَلَغَ] واتە: گەیشتۆتە ئەو جێگایە: مەبەستیشمان پێی ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەر شوێنێکی زەویدا بوەستێت دەتوانێت خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون ببینێت، بۆیە (ذي القرنين) تەنها ئەوەندە نیە خۆر هەڵاتن و خۆرئاوابوونی بینیبێت، بەڵکو خوای گەورە پێمان دەفەرموێت: کە گەیشتۆتە ئەو جێگایەی کە بەڕاستی خۆری تێدا ئاوا و وون دەبێت پاشان ئەو جێگایەی کە خۆری تێدا هەڵدێت و دەردەکەوێت چونکە [مَغْرِبَ..و..مَطْلِعَ] دوو (اسم مكان)ن واتە: ناوی شوێنن، پاشان کاتێك سورەتەکە باس لەوە دەکات کە لە شوێنی هەڵاتنی خۆرەکەدا (ذي القرنين) کۆمەڵە خەڵکانێك دەبینێت [وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾]. واتە: هیچ شتێك نیە کە تیشکی خۆرەکەیان لەسەر لابدات و دایان پۆشێت.

هەندێك لە زاناکان دەڵێن: مەبەست پێی ئەوەیە کە هیچ جل و بەرگێکیان لەبەردا نیە دایان پۆشێت لە تیشکی خۆر، وە هەندێکی تریان دەڵێن واتە: شوێنەکەیان دەشتێکی تەخت بووەو شاخ و دار و بەردی تێدا نەبووە سێبەریان بۆ بکات و هەندێکی تریان دەڵێن واتە: خانوو ماڵیان نەبوە بچنە ناوی، بەڵام زانای پایەبەرز شێخ محەممەد متوەلی شەعراوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆچونێکی جیاوازی هەیە کە پێ دەچێت لە هەموو بۆ چونەکانی تر زیاتر نزیك بێت لە ڕاستیەوە ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: ئەو شتەی کە دەبێت بە پۆشاك و بەربەست لەبەردەم خۆردا نە جل و بەرگەو نەخانوو بەرەیەو نەشاخ و داریشە بەڵکو ئەو پۆشەرە تەنها تاریکاییە[1].

---

(١) سورة البقرة، الآية: (١٦٦).

بەڵێ... ئەو شوێنەی كە خوای گەورە بە [مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ] ی ناو دەبات و (ذي القرنين) ئەو كۆمەڵە خەڵكەی تێدا بینیوە شوێنێك بووە كە شەو تاریكایی نەبووە بەڵكو بەردەوام ڕۆژ بووەو تیشكی خۆر لێی داون، هەر چەندە زانای پایە بەرز موحەممەد متوەلی الشعراوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وای بۆ دەچێت كە شوێنێكە یەكێك لە دوو جەمسەرەكەی باكور یان باشوری زەوی بێت، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ كام لە دوو جەمسەرەكەی باكورو باشوری زەوی ئەم سیفەتەی تێدا نیە كە بەردەوام ڕۆژ بێت و تاریكی بەسەردا نایەت، بەڵكو بە پێچەوانەوە لەو دوو جەمسەرەدا تەنانەت لەو كاتانەشدا كە ڕۆژە بەهۆی هەورو بەفر بارینەوە زۆر بەكەمی تیشكی خۆر لە زەوی دەدات، بۆیە پێمان وایە نە ئەو شوێنەی كە ئەو كۆمەڵە خەڵكەی تێدا دەژین و بەردەوام ڕۆژەو شەوی تێدا نیە لەسەر زەوی بێت، وە نەمەبەستیش بە [مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ..مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ]یش سەر زەویە، بەڵكو (ذي القرنين) لە كاتی گەشتە ئاسمانیەكەیدا ئەو شوێنانەی دیوەو بەو خەڵكانە گەیشتووە، بەڵێ... لەوانەیە ئەم بۆچونە تا ڕادەیەك سەیرو تازە بێت و خەڵكانێكی زۆریش باوەڕی پێ نەكەن بەڵام پێویستە ئەوەشمان لە یاد نەچێت كە هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەگەر كەسێك باسی ئەوەی بكردایە كە لەماوەی چەند سەعاتێكی كەمدا بەهۆی فڕۆكەیەكەوە دەتوانیت بەدەوری زەویدا بخولێتەوە یان لە ماوەی چەند ڕۆژێكدا دەتوانێت بچێتە سەر مانگ گاڵتەیان پێ دەكرد و عەقڵیان قبوڵی نەدەكرد بەڵام لای خەڵكی ئەمڕۆ كارێكی زۆر ئاساییەو هەموو كەس باوەڕی پێیەتی بۆیە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵە نزیكەكانی قسەیەكیان بۆ خەڵك نەكردووە كە لە ڕادەی تێگەیشتنی عەقڵیان بەدەر بێت بەڵكو بە شێوازێك بۆیان ڕوون كردونەتەوە كە لێی تێبگەن، ئەوەتا پێشەوا عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) كاتێك كە پیاوێك پرسیاری دەربارەی (ذي القرنين) لێ دەكات: چۆن توانیویەتی بگاتە خۆرهەڵاتەكان و خۆرئاواكان؟ پێشەوا عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پاك و بێگەردی بۆ خوا هەوری بۆ موسەخەر كرابوو، وە هۆكاری بۆ ئاسان كرابوو، وە دەسەڵاتیشی پێ بەخشرا بوو[1].

---

(١) نیشانەكانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەكانی پێش هاتنی، هاورێ محمد ئەمین، لا

ئایەتەکە دەفەرموێت: [حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾].

واتە: کاتێك کە گەیشتە نێوان دوو بەر بەستەکە بینی لە پێش دوو بەربەستەکەدا کۆمەڵە خەڵکێك هەن.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێبینیە داواکاریی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە لە (ذي القرنين) کە پێی دەڵێن: [قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾].

واتە: یەئجوج و مەئجوج خراپەکاری و فەسادیەکی زۆر دەکەن لەسەر زەوی، جا ئەگەر قبوڵت بێت پارەو سەرانەیەکت بۆ کۆبکەینەوە هەتا لە نێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێك دروست بکەیت.

دیارە ئەو کۆمەڵە خەڵکە لەسەر زەوی بوون و تواناو دەسەڵاتی (ذي القرنين) یشیان بینیوە بۆیە لێی ڕادەبینن کە بتوانێت ئەو کارەیان بۆ ئەنجام بدات، بەڵام داواکاریەکەیان لە (ذي القرنين) بۆ دروست کردنی بەربەستێك ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئاگادارنەبوون کە لە نێوان ئەوان و یەئجوج و مەئجوجدا دوو بەربەست هەیە چونکە ئەگەر بیانزانیبوایە کە لە نێوان ئەوان و یەئجوج و مەئجوج دوو بەربەست هەیە داوای دروستکردنی بەربەستێکیان لێ نەدەکرد، بەڵام (ذي القرنين) لەبەر ئەوەی کە خۆی لە نێوان دوو بەربەستەکەوە هاتوە بۆ لایان دەزانێت پێویست بە دروست کردنی بەربەستی تر ناکات بەڵکو پێویستە کەلێنی نێوان دوو بەربەستەکە پڕ بکرێتەوە چونکە لەو کەلێنەوە یأجوج و مأجوج دەپەڕنەوەو زیان بە خەڵکی دەگەیەنن بۆیە پێیان دەڵێت: [أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا] واتە: ئەو نێوانە پڕ دەکەمەوەو دەیگرم، لێرەدا دەڵێین ئەگەر ئەو دوو بەربەستە مەبەست پێی دوو چیای گەورە بێت ماقوڵ نیەو ناگونجێت کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئەو دوو چیا بەرزەیان لە نێوان خۆیان و یەئجوج و مەئجوج دا نەبینیبێت و هەستیان بە بونی نەکردبێت بۆیە ئەو دوو بەربەستە مەبەست پێی دوو چیا نیە، هەروەکو (ئیبنو الأعرابي) دەڵێت:



بەرگی سێیەم

(کل ما قابلك فسد ما وراءه فهو سد)[١]. واتە: هەر شتێك بێتە بەر دەمت و دوای خۆیت لێ بگرێت ئەوا پێی دەوترێت بەربەست.

هەروەها ئەگەر ئەو بەربەستە تەنها مەبەست پێی پڕکردنەوەی نێوان دوو چیا بوایە، ماقوڵ نیە قەومێکی بە توانای وەك (یەئجوج و مەئجوج) نەتوانن بەسەریدا سەربکەون، یاخود نەتوانن بەسەر چیاکاندا سەربکەون و بپەڕنەوە، یاخود هیچ ڕێگایەکی تریان دەست نەکەوێت کە پێی بپەڕنەوە بۆ ئەو دیوی چیاکە.

دووەم: لە ئایەتەکانی سورەتی (الأنبياء) تێبینی ئەم خاڵانە دەکەین:

خوای گەورە دەفەرموێت: [حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾]. واتە: لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکەی یأجوج و مأجوج دا ئیتر لە هەموو بەرزاییەکەوە بە خێرایی شۆڕ دەبنەوە، چونکە وشەی [حَدَبٖ] بە واتای بەرزایی دێت یا خود بە زەویەك دەگوترێت کە بەرز بێت، ئەمەش بەڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە (یەئجوج و مەئجوج) لە بەرزاییەوە شۆڕ دەبنەوەو دادەبەزن کە ئەمەش بۆچونی هەندێك کەس ڕەت دەکاتەوە کە پێیان وایە یەئجوج و مەئجوج لە ژێر زەویدا یان لە دۆڵێکی قوڵدا گەمارۆ درابن.

لەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کە لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکەدا (یەئجوج و مەئجوج) تەنها لە یەك لاوە نایەن بەڵکو لەگەڵ کردنەوەی بەربەستەکە لە هەموو بەرزاییەکەوە دێنە سەر زەوی و بڵاودەبنەوە.

پاش ئەوەی کە خوای گەورە باسی کردنەوەی بەربەستەکەو دابەزینی یأجوج و مأجوج دەکات بە دواییدا دەفەرموێت: [وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ]. واتە: ئیتر بەڵێنە ڕاستەکەی خوا کە ڕۆژی دواییە نزیك دەبێتەوەو، هاوکاتیش چاوی بێ باوەڕان بەرەو سەرەوە ئەبڵەق دەبێت.

هەندێکیش لە زانایان پێیان وایە کە ئەم ئایەتە باس لە ڕۆژی دوایی دەکات، بەڵام خوای گەورە نەیفەرمووە : [وَجَآءَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ] یان [وَوَقَعَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ]

---

(١) فتح القدير، للإمام الشوكاني، تحقيق:د.عبدالرحمن عبيدة، (٣/ ٤٢٩).

بەڵکو فەرمویەتی [وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ] واتە: لەو کاتەدا قیامەت نزیك دەبێتەوە نەك قیامەت دێت، کەواتە ئایەتەکە باس لە کاتێك دەکات کە قیامەت نزیك بۆتەوە بەڵام هێشتا نەهاتووە، مەبەستیشمان لەو ڕوونکردنەوەیە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: [فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ] ئەو [فَإِذَا] یە لەو جێگەیەدا لە زمانی عەرەبی پێی دەگوترێ (إذا الفجائية) واتە: کت و پڕ لەو کاتەدا یان هاوکات لەگەڵ ئەوەدا، چاوی بێ باوەڕان بەرەو سەرەوە یان بەرەو ئاسمان ئەبلەق دەبێت، واتە: کە بەربەست کرایەوەو یەئجوج و مەئجوج لە هەموو بەرزاییەك هاتنە خوارەوەو ڕۆژی دوایی نزیك بۆوە، ئا لەو کاتەدا چاوی کافرو بێ باوەڕەکان بەرەو ئاسمان ئەبلەق دەبێت.

ئێمەش لێرەدا دەپرسین باشە لە کاتی هاتنی یەئجوج و مەئجوج بۆچی کافرەکان بەرەو سەرەوە ئەبلەق دەبێت و دەڵێن قوڕ بەسەرمان ئێمە بێ ئاگا بوین لەم بەڵێنە خواییە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش هەر دەبێ ئەوە بێت کە (یەئجوج و مەئجوج) لە بەرزاییەکانی ئاسمانەوە دادەبەزنە خوارەوە بۆیە چاوی بێباوەڕەکان بەرەو ئاسمان ئەبلەق دەبێت، ئەگەر کەسێکیش پرسیار بکات و بڵێت (ئەی باشە بۆ خوای گەورە تەنها باسی بێباوەڕەکان دەکات کە بەو دیمەنە چاویان بەرەو ئاسمان ئەبلەق دەبێت؟)

لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە پێشتر خوای گەورە لە ڕێگەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئیماندارەکان ئاگادار دەکاتەوە کە یەئجوج و مەئجوج دادەبەزێنێتە سەر زەوی، هەروەکو پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (..ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ..)[1].

واتە: پاشان کۆمەڵە خەڵکێك دێن بۆ لای عیسای کوڕی مەریەم کە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلە و پایەیان

(١) صحيح مسلم (٢٢٥٤/٤) باب: ذكر الدجال، رقم الحديث (٢٩٣٧).

بەرگی سێیەم

بۆ دەکات لە بەهەشتدا، ئا لەو کات و حاڵەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)، کە کۆمەڵە بەندەیەکی خۆمم هێناوەتە دەر، کەس تواناو دەسەڵاتی کوشتار و شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا...

جا بۆ بینینی ئەو دیمەنە وکاریگەریی ڕوداوەکە لەسەر ئیمانداران کە پێشتر باوەڕیان پێی هەبووەو لێی ئاگاداربوون زۆر کەمتر دەبێت لەو کاریگەریەی کە لەسەر ئەو کافرو بێ باوەڕانە دروستی دەکات کە هەتا ڕوودانی ڕووداوەکە هەر گاڵتەیان پێ هاتووەو باوەڕیان نەکردوە شتی وا ڕوویدات هەر بۆیەش دەڵێن: [يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ].

سێیەم: لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم چەند ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەمانەن:

١) سیفەتەکانی یەئجوج و مەئجوج، وەکو لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە دەم و چاویان پانەو چاویان بچوکەو تەپڵەی سەریان سپیە.

٢) هەموو ئەو چەم و دەریاچانەی کە دێتە ڕێیان ئاوەکەی دەخۆنەوەو هیچی تێدا ناهێڵن و وشکی دەکەن، بەجۆرێك ئەوانەی کە لە دواوە دێن دەڵێن: ئا لەم شوێنەدا ئاو هەبووە.

٣) هیچ کام لە یەئجوج و مەئجوج نامرێت هەتا لانی کەم هەزار کەس لەوەچەی خۆی بەجێ دەهێڵێت.

٤) هەموویان بەیەکجار دەمرن ئەمەش بەهۆی کرمێکەوە کە خوای گەورە لە پشت ملیاندا دروستی دەکات پێی دەوترێت (النغف).

٥) پاش مردنیان ئاژەڵ و مەڕو ماڵات گۆشتەکانیان دەخۆن بە ڕاددەیەك کە پێی قەڵەو دەبن و هەڵدەئاوسێن.

٦) خوای گەورە بە بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) جۆرە باڵندەیەك دەنێرێت کە لە ملی حوشتر دەچێت لاشەکانیان هەڵدەگرێت و فرێی دەداتە شوێنێك کە خوای گەورە خۆی دەزانێت.

بەرگی سێیەم

ئێمەش لێرەدا پرسیار دەکەین و دەڵێین: ئایا هیچ کام لەم سیفەتانە سیفەتی ئادەمیزادن؟

ئەم هەموو مرۆڤە لەسەر زەوی دەژین ئایا کەس بیستویەتی ئاوی دەریاچەیەك یا ئاوی ڕووبارێك بە خواردنەوە وشك بکات؟

ئایا لە سیفەتی مرۆڤدا هەیە کە هیچ کامیان نەمرێت هەتا هەزار لەوەچەی خۆی نەبینێت؟

ئایا قەت بینراوە مەڕو ماڵات و ئاژەڵ گۆشتی مرۆڤی مردوو بخوات و پێی قەڵەو بێت؟

ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە (یەئجوج و مەئجوج) پێکهاتەی لەشیان جیاوازە لە مرۆڤی سەر زەویو سیفات و تایبەت مەندێتی خۆی هەیە، ئەم سیفەتانەی (یەئجوج و مەئجوج) زیاتر ئەو بۆچونەمان دەسەلمێنێت کە ئەمانە کۆمەڵە دروستکراوێکن دانیشتوی سەر زەوی نین بەڵکو دێنە سەر زەوی وە پێدەچێت کە پێکهاتەی جەستەشیان زۆر لەگەڵ کەش و هەواو ژینگەی زەویدا نەگونجێت و نەتوانن بە بەردەوامی لەسەر زەویدا بمێننەوە هەر بۆیەش هەموویان تووشی یەك دەرد دەبن و بە یەکجار دەمرن، هەروەها پێ دەچێت کە شێوازی بەکارهێنانی ئەوانیش بۆ ئاو جیاواز بێت لە شێوازی ئێمە، هەر بۆیەش لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر ڕووبارو دەریاچە وشك دەکەن.

٧) ئەو بەربەستەی کە کاتی خۆی (ذي القرنين) لەبەردەم يأجوج و مأجوج دا دروستی کردووە هەتا ئەمڕۆ هەر ماوەو هەتا ئەو ڕۆژەش کە خوا مەبەستێتی دەربچن هەر دەمێنێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو ڕۆژ خەریکی هەڵکەندنن بەڵام وەك خۆی لێ دێتەوە تا ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە ڕێگە بە دەرچونیان دەدات لە کۆتایی بونەوەر.

هەروەها لەم فەرمودانەی پێشوو بۆمان بەدەردەکەوێت کە ئەو بەربەستە نەك تەنها ڕێگەی لە (یەئجوج و مەئجوج) گرتوە کە بەرەو زەوی بێن بەڵکو بەری

تیشکی خۆریشی لێ گرتوون، بە جۆرێك کە ناهێڵێت تیشکی خۆر ببینن (حتى إذا كادوا يرون شعاع الشمس) کەواتە ئەم فەرموودە پیرۆزە زۆر بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە ئێستا يأجوج و مأجوج بەردەوام هەموو ڕۆژ سەرگەرمی هەڵکەندنی بەربەستەکەن، بۆیە دەڵێین بەڕاستی ناچێتە عەقڵەوە کە میللەتێکی بێ شومارو لە ئەندازە بەدەری وەکو یەئجوج و مەئجوج لەم سەر زەویەدا بمێنن و هەموو ڕۆژێك سەرقاڵی هەڵکەندنی بەربەستێك بن بەڵام نەهیچ کەسێك و نە هیچ ئامێرێکی پێشکەوتووی ئەمڕۆش ناتوانێت نە ئەو میللەتە زۆرو بێ ئەندازەیەو نە ئەو بەربەستەش کە بەردەوام سەر قاڵی هەڵکەندنین ببینێت.

(یەئجوج و مەئجوج) دوو نەتەوەی ژمارە زۆرن، پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى يَا آدَمُ . فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، فَيَقُولُ أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ وَمَا بَعْثُ النَّارِ قَالَ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَعِنْدَهُ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى ، وَمَا هُمْ بِسُكَارَى ، وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَيُّنَا ذَلِكَ الْوَاحِدُ قَالَ أَبْشِرُوا فَإِنَّ مِنْكُمْ رَجُلٌ، وَمِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفٌ..)[١].

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێ: بەڵێ بۆ فەرمانت ئەی خوای گەورە خێریش هەر لە دەست تۆدایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوانەی کە دەنێردرێن بۆ ئاگر جیایان بکەرەوە، ئەویش دەڵێت: نێردراوەکانی ئاگر کێن، دەفەرموێ: لە هەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ، ئا لەو کاتەدا منداڵ سەری سپی دەبێت و هەموو ئافرەتێکی سك پڕ سکەکەی دادەنێت[٢]،

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ١٣٨) باب: قصة يأجوج ومأجوج، برقم: (٣٣٤٨).

(٢) ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتە دوپات دەکاتەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ۝١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ۝٢]. واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن، چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی ڕۆژی دوایی کارەساتێکی زۆر گەورەیەو ڕووداوێکی سامناکە، لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە

خەڵکی دەبینیت سەرخۆشن و هیچیشیان سەرخۆشی مەی نین، بەڵام ئازارو تۆڵەی خوا ئێجگار توندە، گوتیان: جا باشە کام لە ئێمە ئەو نەفەر دەبێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: موژدە بێت بۆ ئێوە، لە ئێوە یەك پیاو و لە یەئجوج مەئجوج هەزار.

خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین، ئەو بەربەستەی (ذوالقرنین) سازیدا، ڕێی دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوجی گرتوە: [فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾]. واتە: نەتوانیان پێی هەڵگەڕێن و نەتوانیان کونیکەن.

هەروەها هەواڵی پێداوین تا کۆتایی بونەوەر داهاتنی وادەی خوا هەروا دەمێنێتەوە. ئینجا ڕێی دەرچونیان دەدرێ و ئەو کاتە بەربەستەکە بەسەریەکدا دەڕوخێ و ئەوانیش لە خەڵکی وەدەردەکەون.

---

شیرە خۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەروەها هەموو سکپڕ و دوو گیانێکیش کۆرپەلەی لەبار دەچێت، خەڵکی لەو ڕۆژە سامناکە وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستی دا سەر خۆش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکەو سەری لێشێواندوون.

هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەفەر بوو، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو بە هاوەڵەکانی فەرموو: دەزانن ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، گوتیان: خواو پێغەمبەرکەی دەزانن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :ئەمرۆ ئەم ڕۆژەیە کە خوا دەفەرمونێت بە ئادەم هەر لە (١٠٠٠)کەس (٩٩٩) کەس بۆ ئاگرە یەکیان بۆ بەهەشتە، لەو کاتە هاوەڵەکان دەستیان کرد بە گریان پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی دانێ.

ئیعجاز لەم فەرمودەیەدا:

کۆمەڵێك زاناو لێکۆڵەری ئەمریکی لە ئەنجامی دیراسەی زەمین لەرزەی (لۆس ئەنجەلۆس) لە ساڵی (١٩٩٤) کە پلەکەی (٧،٦) پلەی ڕێختەر بوو، کە بووە مایەی زەرەر و زیانی (٤٠) ملیار دۆلار ، جا بۆیان دەرکەوت ئەو زەمین لەرزەیە بووەتە هۆی خێراکردنی منالبوون، چونکە وێلاش هەر بە تەنها ڕێڕەوێك نی یە بۆ گواستنەوەی مەواد لە دایکەوە بۆ کۆرپەلە، بەڵکو وێلاش هۆکاری دەرەکی کاری تێدەکات و هەندێ هۆرمۆنات دەر ئەدات و کار دەکاتە سەر کاتی منال بوون.

باشە زەمین لەرزەیەکی دونیا ئەم کارە بکات دەی ئەبێ زەمین لەرزەی ڕۆژی دوایی چۆن بێت بەو هەموو سامناکی و بەهێزیەوە، دیارە بێگومان دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرچی ئافرەتێك منالی لە سك دا بێت لەباری بچێ و پێش وەخت بیبێت.

بەرگی سێیەم

خوای گەورە دەفەرموێت: [ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾].

واتە: هەتا ئەو کاتەی، کە بەربەستەکەی (ذوالقرنین) لەبەردەم (یەئجووج ومەئجووج)دا دەکرێتەوەو ئینجا لەهەموو کون و کەلەبەرێکەوە بەشێوەیەکی زۆرو بێ شومار پەیدا دەبن و دێنە دەرەوە، ئیدی بەڵێنی ڕاست و هەقی خوداش نزیك دەبێتەوەو سزاو لێپرسینەوەی خودا دەست پێ دەکات.

ئایەتەکانی سورەتی (کەهف)یش کە لەم بڕگانەی پێشوودا دیاری کراون، دەربارەی (یەئجووج و مەئجووج) هاتوون و هەواڵی خراپەو شێواندنیان لە زەویدا بە ئێمە دەگەیەنن و، باسی دروستکردنی بەربەستەکە لەبەردەمیاندا لەلایەن (ذوالقرنین)ەوە دەکەن کە لەسەردەمی ئەوداو چەند سەردەمێکی دوای ئەویشدا نەیانتوانیوە لەبەربەرستەکەوە بێنە دەرەوە یان کونی تێ بکەن، بەڵام ئایەتەکانی سورەتی ئەنبیاء [ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ] دەربارەی بەسەرهاتی (یەئجوج و مەئجوج)ن لە ئایندەدا کە پێش هاتنی قیامەت بەشێوەیەکی زۆرو بە کۆمەڵێکی گەورە دەردەچن، هەواڵی نێو ئەو ئایەتانەش بە وشەی (إِذَا)یە کە ئاوەڵناوی داهاتووی زەمانە. هەروەها ئایەتەکانی سورەتی (أنبیاء) هەواڵی کردنەوەی ڕێگە بۆ (یەئجوج و مەئجوج)، دەگەیەنێت، هەندێك لە زانایانیش کرانەوەی بەربەستەکەو کردنەوەی ڕێگەکە بەشێوازێکی ماددی و واقعیانەی هەست پێکراو دادەنێن کە گوایە ئەوان واتە: (یەئجووج و مەئجووج) بەربەستەکەی (ذوالقرنین) دەبەزێنن و لێوەی دەردەچن، ئەو زانایانە دان بەوە دادەنێن کە ئەمە تەنها لەکاتی پێش هاتنی قیامەت دەبێت و، بەربەستەکەش تا ئەمڕۆ هەیەو لە ئارادایە، بەڵام لێرەدا من ڕام وایە کە ئەم ڕێگا کرانەوەیە بۆ (یەئجووج و مەئجووج) کرانەوەیەکی مەعنەوییە، نەك ماددی و بەرچاو کەوا بەربەستەکە بە فیعلی ببەزێنرێت و کونی تێ بکرێت.. واتە: کاتێك خودا ڕێی دەرچوونیان لە شوێنی خۆیانەوە پێ دەدات و، کە ئەوانیش دێن و هەموو سەر زەوی و وڵاتەکان داگیر دەکەن، ئەوە بەدەرچوونە دیارو گەورەکەیان لە پێش هاتنی قیامەتدا دادەنێن.

بەرگی سێیەم

تا ئەو دەمی ڕێگە بۆ (یەئجوج و مەئجوج) دەکرێتەوەو، ئەوانە لەهەر بەرزاییەکەوە بە کۆمەڵ دێنە دەرەوە، ئەمەش لە کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات، چونکە خوا دەفەرمویٚ: [وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ].

وشەی [حَدَبٍ] بەهەر بەرزاییەك دەوترێت کە لەسەر ڕووی زەویەوە وەك گردو گردۆڵکەو چیا بەرزو بڵند بوویێتەوە.. وشەی [يَنسِلُونَ] واتە: لە ڕۆیشتن دا زۆر خێراو بە پەلە دەڕۆن و بەدوای یەکتردا دێن و نزیك دەبنەوەو ژمارەشیان هێندە زۆرە، کە هەموو ڕووی ئەو خاکەی داگیر دەکەن، دادەپۆشن.. مەبەستی ئەوەیە بەخێرایی زەوی پیس دەکەن و ئەگەر دەریش بکەون ڕەوش و سیفەتیان وایە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێداوین کەلەسەردەمی ئەودا کونێکی بچوکی هێندەی بازنەی نێوان هەردوو پەنجەی دۆشاومژەو ئەسپیٚ کوژەی تێکەوتوە، لەوانە:

١) ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان لە زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکیان بە ترسەوە هاتە ژوورەوە بۆ لای و دەیفەرموو: (وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذَا، وَحَلَّقَ إِبْهَامَهُ بِالَّتِي تَلِيهَا، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ)[1]. واتە: هیچ خوایەك نیە تەنها (الله) نەبێت، خاك بەسەر عەرەب لەو ڕوداوە خراپەی کە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج هێندەی ئەمە کراوەتەوە(بەسەر هەردوو پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمانی بازنەیەکی دروست کرد، زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا لەناو دەچین لە کاتێکدا کە پیاوانی چاکمان لەناو دابێت، فەرموی: بەڵیٚ ئەگەر داوێن پیسی زۆر بوو.

٢) ئیبنو حەرمەلە لە پوریەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: (خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ عَاصِبٌ إِصْبَعَهُ مِنْ لَدْغَةِ عَقْرَبٍ فَقَالَ: إِنَّكُمْ تَقُولُونَ لَا عَدُوَّ وَإِنَّكُمْ

---

(١) صحيح البخاري (١٣/ ١٠٦) كتاب الفتن، باب يأجوج ومأجوج، برقم: (٣٥٩٧).

بەرگی سێیەم

لَا تَزَالُونَ تُقَاتِلُونَ عَدُوًّا حَتَّى يَأْتِيَ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ عِرَاضُ الْوُجُوهِ، صِغَارُ الْعُيُونِ، صُهْبُ الشِّعَافِ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ)[1].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتاری دەداو پەنجەی بەستبوو لە پێوەدانی دوو پشکێك فەرمووی: ئێوە دەڵێن دوژمن تەواو بوو نەما، بەڵام لە ڕاستی ئێوە بەردەوام دوژمنێكتان دەبێت كە شەڕی لەگەڵ دەكەن هەتا (یەئجوج و مەئجوج) دێت، دەم و چاو پان و چاو بچوك، قژی تەپڵەو سەریان سپیەو لە هەموو بەرزاییەكەوە دێنە خوارو شۆڕ دەبنەوە دەم و چاویان هەر دەڵێی قەڵغانە.

٣) پێشەوا نەواسی كوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ وَيَبْعَثُ اللهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ، وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لِأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لِأَحَدِكُمُ الْيَوْمَ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، فَيُرْسِلُ اللهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ، فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الْأَرْضِ، فَلَا يَجِدُونَ فِي الْأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلَّا مَلَأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللهِ، فَيُرْسِلُ اللهُ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ الْبُخْتِ فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ مَطَرًا لَا يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلَا وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الْأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ..)[2].

واتە: پاشان كۆمەڵە خەڵكێك دێن بۆ لای عیسای كوڕی مەریەم كە خوای گەورە پاراستونی لە دەجال، ئەویش دەم و چاویان دەسڕێت و باسی پلەو پایەیان بۆ دەكات لە بەهەشتدا، تا لەو كات و حاڵەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر عیسا، كە كۆمەڵە بەندەیەكی خۆمم هێناوەتە دەر، كەس تواناو دەسەڵاتی كوشتار

(١) ضعيف: مسند الإمام أحمد (٣٧/ ١٩) برقم: (٢٢٣٣١). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده ضعيف.

(٢) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب: ذكر الدجال: (٢٢٥٤/٤)، ورقمه: (٢٩٣٧).

و شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا، بۆیە هەتا زووە بەندەکانم سەرخە بۆ کێوی (طور)، خوای گەورەش (یەئجوج و مەئجوج) دەنێرێت، ئەوانیش لە هەموو بەرزاییەکەوە شۆڕ دەبنەوە، سەرەتاکانیان بەلای دەریاچەی (طبریە)[1]دا تێدەپەڕێت هەرچیەکی تێدایە دەی خۆنەوە، وە کۆتاییەکەیان تێ دەپەڕێت دەڵێت: کەڕەتێکیان ئا لێرەدا ئاوی تێدا بوو، ئینجا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) و هاوڕێکانی گەمارۆ دەدرێن، تا وای لێ دێت یەك سەر گا بۆ یەکێکیان باشترە لە سەد دینار بۆ یەکێکتان لەم ڕۆژەدا، ئیتر پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) و هاوڕێکانی داوای یارمەتی و کۆمەکی لە خوای گەورە دەکەن، خوای گەورەش کرمێك دەنێرێت بۆ ملیان، هەر هەمویان بە جارێك وەك مردنی یەك کەس قڕ دەکەن، پاشان پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت)و هاوڕێکانی دادەبەزنەوە بۆ سەر زەوی، کە سەیر دەکەن یەك بستە خاك نەماوە لەسەر زەویدا کە بەچەوری و بۆگەنیان پڕنەبوبێت، ئینجا پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) و هاوڕێکانی لە خوا دەپاڕێنەوە، ئەویش جۆرە باڵندەیەك دەنێرێت کە وەك ملی حوشتر درێژن، هەڵیان دەگرێت و فڕێیان دەدات بۆ ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێت، پاشان خوای گەورە بارانێك دەنێرێت کە هیچ خانویەکی دروست کراو نەلەبەرد نە لەمووی ئاژەڵ (خێوەت) ناتوانێت بەری بگرێت، ئیتر بە جۆرێك زەوی دەشوات هەتا وەك ئاوێنەی لێ دەکات..

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر(ﷺ) دەڵێت: (یەئجوج و مەئجوج) یەکەم ڕوویار کە بەسەری دەڕۆن و، ئاوەکەی تیایدا ناهێڵن ڕووباری دیجلەیە، هیچ پیاوێکیان نامرێت هەتا هەزار یان زیاتر لە نەوەکانی خۆی دەبینێت، وە ئەوانیش سێ نەتەوەن: (تادیس ـ تاویل ـ ناسك)[2].

---

(١) دەریاچەی (تەبەریە): پێشی دەوترێت (بحر الجليل) یان (بحيره الجليل) دەریاچەیەکی بچووکە، دەکەوێتە باکووری فەلەستینی داگیرکراوەوە، ئاوی ڕووباری ئوردن دەڕژێتە ناوی و بە بەردەوامی لێی دەردەچێت لە ناوەڕاستی (غور الاردن)دا قەبارەی درێژی ئەو دەریاچە دەگاتە (٢٣)کم و فراوانترین پانایی دەگاتە (١٣)کم، قوڵیشی لە (٤٤)م تێناپەڕێت و بە (٢١٠)م بەرزترە لە ئاستی دەریا.

(٢) رواه الحاكم في (المستدرك) (٤٩٠ / ٤) كتاب: الملاحم والفتن. وقال: هذا حديث صحيح على

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: من کۆمەڵە بەندەیەکی خۆم دابەزاندوە کەس دەسەڵات و توانای شەڕ کردنی نیە لەگەڵیاندا[1].

٤) پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ يَحْفِرُونَ كُلَّ يَوْمٍ، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَدًا، فَيُعِيدُهُ اللَّهُ أَشَدَّ مَا كَانَ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ مُدَّتُهُمْ، وَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ، حَفَرُوا، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا، فَسَتَحْفِرُونَهُ غَدًا، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى، وَاسْتَثْنَوْا، فَيَعُودُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ، فَيَحْفِرُونَهُ وَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ فَيُنْشِفُونَ الْمَاءَ، وَيَتَحَصَّنُ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ عَلَيْهَا الدَّمُ الَّذِي اجْفَظَّ، فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا أَهْلَ الْأَرْضِ، وَعَلَوْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ، فَيَبْعَثُ اللَّهُ نَغَفًا فِي أَقْفَائِهِمْ، فَيَقْتُلُهُمْ بِهَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ دَوَابَّ الْأَرْضِ لَتَسْمَنُ، وَتَشْكَرُ شَكَرًا، مِنْ لُحُومِهِمْ)[2].

واتە: یەئجوج و مەئجوج هەموو ڕۆژێك خەریکی هەڵکەندنن (مەبەست پێی بەربەستەکەیە)، هەتا کاتێ کە نزیك دەبێت تیشکی خۆر ببینن، ئەوەی بەسەریانەوەیە بۆ کارەکە دەڵێت بگەڕێنەوە بەیانی هەڵی دەکەنین، ئینجا خوای گەورە لە جاران توندو پتەوتری دەکاتەوە، هەتا بەم شێوەیە دەگەنە ئەو کاتەی بۆیان دیاریکراوە، وە خوای گەورە ویستی وابوو بیان نێرێتە سەر خەڵکی دەست دەکەن بە هەڵکەندن، هەتا کاتێك کە نزیك دەبێت تیشکی خۆر ببینن، ئەوەی بەسەریانەوەیە دەڵێت بگەڕێنەوە سبەی هەڵی دەکەنین ئەگەر خوا ڕازی لەسەر بێت و ئەگەری تێ دەخات، ئینجا هەڵی دەکەنن و دێنە دەرەوە بۆ سەر خەڵکی، ئیتر ئاو وشك دەکەن و خەڵکی بۆ خۆپاراستن لێیان لە قەڵاکانیاندا خۆیان قایم دەکەن، ئەوانیش تیرەکانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن و تیرەکانیان بە پڕ لە خوێنی دەگەڕێنەوە خوارەوە، ئینجا دەڵێن: خەڵکی سەر زەویمان بەزاندو سەرکەوتین

شرط البخاري ومسلم.

(١) صحيح مسلم (٤/٢٢٥٥) كتاب: الفتن، باب: ذكر الدجال، رقم الحديث (٢٩٣٧).

(٢) سنن ابن ماجة (٥/ ٢٠٧) باب: فتنة الدجال، برقم: (٤٠٨٠).

بەسەر خەڵکی ئاسماندا، ئینجا خوای گەورە کرمێکیان بۆ دەنێرێت لە پشت ملیاندا، هەمویان بەوە دەمرن، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئاژەڵ و گیان لەبەری سەر زەوی لە گۆشتەکەیان قەڵەو و پڕو تێرو هەڵئەوساو دەبێت.

٥) پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَقَلُّ مَا يَتْرُكُ أَحَدُهُمْ لِصُلْبِهِ أَلْفًا مِنَ الذُّرِّيَّةِ)[١].

واتە: هەر یەك لە یەئجوج و مەئجوج کەمترینی نەوەی کە لە دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت هەزار وەچەیە لە پشتی خۆی.

٦) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (سَيُوقِدُ الْمُسْلِمُونَ مِنْ قِسِيِّ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ، وَنُشَّابِهِمْ، وَأَتْرِسَتِهِمْ سَبْعَ سِنِينَ)[٢].

واتە: موسڵمانان حەوت ساڵان ئاگر بە خوترەو تیرو چەك و قەڵغانی یەئجوج و مەئجوج هەڵدەکەن.

٧) پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يُفْتَحُ يَأْجُوجُ وَمأْجُوجُ ، يَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ، كَمَا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ}، فَيَغْشَوْنَ الأَرْضَ ، وَيَنْحَازُ الْمُسْلِمُونَ عَنْهُمْ إِلَى مَدَائِنِهِمْ وَحُصُونِهِمْ ، وَيَضُمُّونَ إِلَيْهِمْ مَوَاشِيَهُمْ ، وَيَشْرَبُونَ مِيَاهَ الأَرْضِ، حَتَّى إِنَّ بَعْضَهُمْ لَيَمُرُّ بِالنَّهَرِ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهِ، حَتَّى يَتْرُكُوهُ يَبَسًا ، حَتَّى إِنَّ مَنْ بَعْدَهُمْ لَيَمُرُّ بِذَلِكَ النَّهَرِ فَيَقُولُ: قَدْ كَانَ هَاهُنَا مَاءٌ مَرَّةً، حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ مِنَ النَّاسِ إِلاَّ أَحَدٌ فِي حِصْنٍ أَوْ مَدِينَةٍ قَالَ قَائِلُهُمْ : هَؤُلاَءِ أَهْلُ الأَرْضِ، قَدْ فَرَغْنَا مِنْهُمْ ، بَقِيَ أَهْلُ السَّمَاءِ ، قَالَ : ثُمَّ يَهُزُّ أَحَدُهُمْ حَرْبَتَهُ ثُمَّ يَرْمِي بِهَا إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ إِلَيْهِ مُخْتَضِبَةً دَمًا ، لِلْبَلاَءِ وَالْفِتْنَةِ ، فَبَيْنَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ ، إِذْ بَعَثَ اللَّهُ دُودًا فِي أَعْنَاقِهِمْ، كَنَغَفِ الْجَرَادِ الَّذِي يَخْرُجُ فِي أَعْنَاقِهِمْ ، فَيُصْبِحُونَ مَوْتَى لاَ يُسْمَعُ

-----

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ٢٤١) برقم: (٦٨٢٨). حديث صحيح.

(٢) سنن ابن ماجة (٢/ ١٣٥٩) باب: فتنة الدجال، برقم: (٤٠٧٦) قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

لَهُمْ حِسًّا، فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ : أَلاَ رَجُلٌ يَشْرِي لَنَا نَفْسَهُ فَيَنْظُرَ مَا فَعَلَ هَذَا الْعَدُوُّ . قَالَ : فَيَتَجَرَّدُ رَجُلٌ مِنْهُمْ لِذَلِكَ مُحْتَسِبًا لِنَفْسِهِ قَدْ أَظَنَّهَا عَلَى أَنَّهُ مَقْتُولٌ ، فَيَنْزِلُ ، فَيَجِدُهُمْ مَوْتَى بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ ، فَيُنَادِي : يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ ، أَلاَ أَبْشِرُوا ، فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ كَفَاكُمْ عَدُوَّكُمْ، فَيَخْرُجُونَ مِنْ مَدَائِنِهِمْ ، وَحُصُونِهِمْ ، وَيُسَرِّحُونَ مَوَاشِيَهُمْ ، فَمَا يَكُونُ لَهَا رَعْيٌ إِلاَّ لُحُومُهُمْ ، فَتَشْكَرُ عَنْهُ كَأَحْسَنِ مَا تَشْكَرُ عَنْ شَيْءٍ مِنَ النَّبَاتِ أَصَابَتْهُ قَطُّ)[١].

واتە: (یەئجوج و مەئجوج) ڕێ دەکەونەوەو لە خەڵکی بەدەردەکەون، هەروەکو خوای مەزن دەفەرموێ: [وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ] واتە: لەبەرزاییانەوە بە کۆمەڵ دێنە دەرێ، جا زەوی دادەپۆشن و موسڵمانان لە شارو قەڵاکانیان خۆ حەشار دەدەن و ماڵاتەکانیان دەبەنە لای خۆیان و، ئەوانیش ئاوی زەوی دەخۆنەوە، تەنانەت هەندێکیان بەلای ڕوباردا تێدەپەڕن، هەرچی تێدایە دەیخۆنەوەو وشکی دەکەن، تاکو وای لێدێ ئەوانی لە پاش ئەوان بەلای ئەو ڕوبارەدا ڕەت دەبن، دەڵێن: جارێکیان ئاو لێرە هەبوو، تاکوو هیچ کەسێك لە خەڵکی نامێنێ مەگەر یەکێك لە قەڵات یان لەشاردا. یەکێکیان دەڵێ: ئەوە زەوینیشمن بون لێیان بوینەوە، ئاسمانیش ماون، دەڵێ: جا یەکێکیان نێزەکەی هەڵدەشەقێنێ و هەڵیدەداتە ئاسمان، بۆ تاقیکردنەوە بەتیر خوێنی دەگەڕێتەوە، جا کە خەریکی ئەوەن، خودا کرمیان داوێتە گەردەن و ملیان کرمی دەکات، بۆ بەیانی هەمو دەمرن و هەستیان دەبڕێ، جا موسڵمانان دەڵێن: پیاوێك نیە سەری خۆی بکڕێتەوەو، بزانێ ئەو دوژمنە چی کردوە، دەڵێ: جا یەکێکیان بۆ خێری خۆی لێدەبڕێ و، وا گومان دەبا هەر دەکوژرێ، کە دادەبەزی دەبینێ هەمو مردون و، لاشەیان لەسەر یەك کەوتووە، جا بانگ دەکا ئەی موسڵمانان موژدەتان لێ بێ خودا دوژمنەکەتانی لەکۆڵ کردنەوە، ئینجا لەنێو قەڵات و شارەکانیان دێنە دەرێ و، ماڵاتەکانیان بەرەڵا دەکەن، جا لە گۆشتی ئەوان بترازێ چ ڕەوەڵگەیەکی دیکەیان چەنگ ناکەوێ، بەو خواردنە لە خواردنی هەمو ڕوەکێك زیاتر شیریان دەگوانی داگەڕێ.

---

(١) المستدرك (٤/ ٥٣٥) برقم: (٨٥٠٤). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

جا ئەم فەرمودانەو فەرموده گەلێکی هاوشێوەش بەڵگەی ئەوەن کە ئەم ژیاره مەزنەی، ئەو هەموو هێزە گەورەیەی داهێناوه لە بۆمب و موشەك، تێکڕای لەنێو دەچیٚ و نامێنیٚ، واش پیٚ دەچیٚ هەر خۆی خۆی بڕوخێنیٚ، جا مرۆڤایەتی دیسان دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی سەرپشتی وڵاخان و بە ڕم و خوتره و چەکی دەست لەم بابەتە دەجەنگیٚ، خوای گەورەش لەهەموومان زاناتره.

پێشەوا بوخاری لە پێشەکی بەندی چیرۆکی (یەئجوج و مەئجوج) لەبەشی (کتاب (الأنبياء) دا بە پلەی راگیراو (تعلق) فەرمودەیەکی هێناوه کەوا پیاوێك بە پێغەمبەری (ﷺ) گوتوه (رَأَيْتُ السَّدَّ مِثْلَ الْبُرْدِ الْمُحَبَّرِ قَالَ رَأَيْتَهُ)[1] .

واتە: من بەربەستەکەم لە خەونمدا وەك کەوایەکی خەت خەت بینیوه (واتە: بەدرزو کەلەبەرەوه بینیوه) پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموه هەروایە بەڕاست بینیوتە.

دەشێت لەکۆی هەر حەوت گێڕانەوه (ڕیوایەتەکان) بگەینە ئەو دەرنجامەی کەوا:

١) بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) لەلای هاوسەرەکەی خۆی (زەینەبی کچی جەحش) ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ نووستوەو لەکاتی نوستنەکەدا خەونێکی بینوه کە ترساندویەتی (دیاره خەونی پێغەمبەرانیش ڕاست و واقیعیه) بۆیە بەترسەوه لەخەونەکەی بێداربۆتەوەو لەو ژوورەی تێیدا نووستووه، چۆتە دەرەوەو دەم و چاویشی سوور هەڵگەڕاوەو چۆتە لای زەینەبی خێزانی و ئاسەواری ترس و بیم بە ڕوخساریەوه دیاربووەو، ئەو قسەو باسەی پیٚ گەیاندووه کە لەفەرموودەکەدا هاتبوو.

٢) هۆکاری ترسانەکەشی ئەوەیە کە لەخەونەکەیدا دیویەتی کە بەربەستەکەی (یەئجوج و مەئجووج) کەلەبەرێکی تیٚ کەوتووه، دیتنی ئەم بەربەستەش لەخەونی نووستندا بووه نەك لە دیتنی کاتی بێداریدا.

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ١٣٧) كتاب :الفتن، باب: قصة يأجوج ومأجوج، برقم: (٣٣٤٦).

بەرگی سێیەم

٣) خەونەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دیویەتی کەلەبەر کراوەتە بەربەستەکە، بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی (یەئجوج و مەئجووج) دەستیان بە ڕووخاندنی بەربەستەکە کردووەو لەسەرەتاوەش کارەکەیان سەری گرتووە، ئەمەش سروشتی ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ڕووخاندن و کردنەوەی بەربەستەکەو پیایدا تێپەڕبوونی، لەپێش هاتنی ڕۆژی دوایی دەبێت، ئیدی مەرج نیە بەربەستەکە بەڕێکی وەك خۆی تا کاتی دەرچوونی (یەئجوج و مەئجووج) لەپێش هاتنی ڕۆژی دوایی بمینێت.

٤) لە فەرموودەکاندا مانای دیارو دەرکەوتوو لە (کرانەوەی دیوارە پتەوەکەی (یەئجوج و مەئجووج) کرانەوەی ئەو بەربەستەیە کەلەوێدا دروست کراوە، مەبەست لەو شەڕو خراپەیەی کە نزیکیش بۆتەوە، دەرچوونی هۆزی (یەئجوج و مەئجووج)ە کە لەوێوە دەردەچن و شاڵاو دێننە سەر وڵاتانی موسڵمانان.

هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن گوایە مەبەست لەم فەرمودەیە ڕوودانی فیتنەو ئاژاوەیە، کرانەوەی بەربەستەکەش لەم فەرمودەیەدا گوزارشتێکە لە کرانەوەی دەرگای فیتنەو پشێوی لەسەر موسڵمانان، بۆ نمونە: ئیبنو حەجەر ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە (عەرب)ی بەتایبەتی وریا کردۆتەوە، چونکە لەو سەردەمەدا گەلی عەرەب زۆربەیان موسڵمان ببوون، مەبەست لەشەڕو خراپەکەش ئەو ئاژاوەیە بوو، کە لەدوای خۆی بەهۆی کوژرانی (عثمان)ەوە ڕوویداو تا لەئاکام عەرەب لەنێو نەتەوەکاندا وەك تەشتێکی گەورەو پڕ لە خۆراکی بەردەمی بخۆرانی لێهات[1].

مانایەکی ئاماژە بۆ کراوی تری فەرموودەکە ئەوەیە کە سزای خودا لە دونیادا سزایەکی گشتیەو هەموو کۆمەڵگە دەگرێتەوە، سوونەت و ڕێبازی خوداش وایە کەلەکاتی بڵاوبوونەوەی بەدکاری و سەرپێچی و خراپەدا هەموو نەتەوەی پێ لەناوبەرێت تەنانەت گەر کەسانی چاك و خواپەرستیشیان تێدا مابێت (زەینەب) لە پێغەمبەری پرسیوە: (ئایا ئێمە بەسزای خودا لەناو دەچین

---

(١) فتح الباري: (١٣/ ١٠٧).

تەنانەت گەر پیاوچاکانیشمان تێدا مابێت)؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ ئەگەر گەندەڵی و بەدڕەفتاری زۆر ببێت.

مامۆستا (هاوڕێ) لە کتێبەکەی بەناوی (نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی) دەڵێت: پێم باشە دوو ڕاستی بخەمە ڕوو، ئەویش ئەوەیە:

**یەکەم:** نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ئەو ڕووداوانەی کە لە پێش هاتنی ئەو ڕۆژەدا ڕوو دەدەن هەتا هاتنی دەجال دەتوانین بڵێین ڕووداوی سروشتی و ئاسایین و پێچەوانەی ئەو یاساو سوننەتانەی خوای گەورە نین لەم بونەوەرەدا کە مرۆڤ پێیان ئاشنا بووە، بەڵام لەگەڵ هاتنی دەجال و ئەو ڕووداوانەی کە بەدوایدا دێن، (هەر لە دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئاسمان و هاتنی (یەئجوج و مەئجوج) و هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوەو هاتنی (دابە)و ئەو بایەی ڕوحی ئیمانداران دەکێشێت... هتد)، دەتوانین بڵێین ڕووداوی ئاسایی نین و بەدەرن لەو یاساو سوننەتە خواییانەی کە مرۆڤایەتی لە مێژووی درێژی ژیانیدا پێیان ئاشنا بووە، وە ئەم نیشانە گەورانە وەکوو زۆربەی زانایان دەفەرموون جاڕی کۆتایی هاتنی تەمەنی ئەم بونەوەرە بە گوێی مرۆڤایەتیدا دەچڕن و هەواڵی تێکچونی شیرازەی ئاسمان و زەوی و گشت بونەوەر دەگەیەنن، بۆیە دەڵێین بەڕاستی لێرە بە دواوە دەبێت خۆمان بۆ جۆرێکی تر لەو نیشانەو ڕوداوانە ئامادە بکەین کە زۆر نامۆو سەرسوڕهێنەرن و جیاوازن لەو نیشانەو ڕووداوانەی کە پێشتر پێیان ئاشنا بوین، وەباوەڕمان وایەو دڵنیاشین کە هەمویان ڕاستن و ، بەو شێوەیەش کە خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسیان کردوون ئاوا دێنە دی.

**دووەم:** ئەو هەواڵ و سەرگوزەشتانەی کە خوای گەورە لە سورەتی (الكهف) دا بۆی باس کردوین هەر هەمووی هەواڵ و بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەرن هەر لەباسی ئەو کۆمەڵە لاوەی کە بۆ ماوەی (٣٠٩) ساڵ لە ئەشکەوتێکدا خەویان لێ دەکەوێت و پاشان زیندوو دەبنەوەو لە خەو هەڵدەستن هەروەکوو ئەوەی تەنها

شەوێك خەویان لێ کەوتبێت، هەروەها بەسەرهاتی ئەو پیاوەی کە ماموٚستایەتی پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەکو پێغەمبەر موسا دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئاستیدا جۆشی دادەمێنێت و لە حیکمەتەکەی تێ ناگات تا لە کۆتاییدا خۆی بۆی ڕوون دەکاتەوە، هەروەها بەسەرهاتی پادشایەکی دێرینی وەك (ذي القرنين) کە لەو چەرخە دێرینانەی مرۆڤ تیایدا زۆر دواکەوتوو و کەم زانست بووە کەچی ئەو زۆر بە ئاسانی خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەوی دەگەڕێت و کاری وا ئەنجام دەدات کە هێشتا مرۆڤی زانای ئەمڕۆش لەتوانایدا نیە، بۆیە دەڵێین: سەرگوزەشتەی (یەئجوج و مەئجوج) کە لە کۆتایی ئەو سورەتە پیرۆزەدا هاتووە، ئەگەر وەك ڕوداوێکی نامۆو سەرسوڕهێنەر هاتە بەرچاومان دەبێت لامان ئاسایی بێت و، هەوڵ بدەین بە مێشکێکی کراوەو زانستیانەو لە ڕوانگەی ئایەت و فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ڕاددەیەکی زۆر نزیك ببینەوە لە ڕاستی.

## لەناوچوونی یەئجووج و مەئجووج

خوای گەورە هەر لەسەرتاوە لە ڕێی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئاگاداریان دەکاتەوە کە هیچ مرۆڤێك توانای ڕووبەڕووبونەوەی یەئجوج و مەئجوجی نیە، وە داوای لێ دەکات کە موسڵمانەکان بەرەو کێوی (طور) بەرێت و لەوێ خۆیان مەڵاس بدەن وە خەڵکی تریش لە قەڵاو تەلارو چیا بەرزەکان خۆیان حەشار دەدەن تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە لەناویان دەبات و ئەم ئاشوبە دەرەوێنێتەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەئجوج و مەئجوج خەڵکێك نین وەکوو خەڵکانی سەر زەوی کە شەڕکردن لە گەڵیاندا جیهاد بێت و موسڵمانان بتوانن ڕوو بەڕوویان ببنەوە، چونکە ئەگەر وەکوو خەڵکی ئاسایی بونایە مانای نیە ئەو لەشکرە ئیسلامیە بەهێزو توانایەی کە تاکە هێزی سەر زەویەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو جیهاندا کێشاوە پێغەمبەرێکی وەکو عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕابەرایەتیان دەکات کە بەدەستی خۆی دەجال دەکوژێت تەنانەت بیر لە ڕووبەڕووبونەوەش نەکەن لە گەڵیاندا.

پێشەوا قەیسی کوڕی حازم(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يُقوَّم رأس البقرة بالأوقية)[1].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا سەری مانگا بە ئۆقیەیەك[2] دەقرسێندرێت.

### لە پاش یەئجوج و مەئجوج جەنگ نامێنێت و حەجکردن بەردەوام دەبێت :

پاش ئەوەی خوای گەورە (یەئجوج و مەئجوج) لە نێو دەبات، تەنها باوەڕدار دەمێنێتەوەو خۆشی و شادی بڵاو دەبێتەوە، دڵەکان بێگەرد دەبنەوەو هیچ شەڕوشۆڕ نامێنێت.

---

(١) المصنف، لابن ابي شيبة (٢٣/ ٩٦٤) برقم: (٣٧٥٥١).

(٢) زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن: کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا لە مەککە یەك ئۆقیە بەرامبەر بە (٤٠) دیرهەم بوو. سەرچاوە: ویکیبیدیا موسوعة الحرة/ أوقية .

پێشەوا سەلەمەی کوری نفیل (ﷺ) دەڵێت: لە کاتێکدا لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبووم پیاوێك هاتە لای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەسپەکان وازیان لێهێنراوەو چەکەکان فڕێدراون و خەڵکانێك بانگەشەی ئەوە دەکەن ئیتر شەڕ تەواو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕاست ناکەن، ئێستا شەڕ دەست پێدەکات و بەردەوام کۆمەڵانێك لە ئوممەتم هەر لە پێناو خوادا شەڕ دەکەن و نەیارەکانیان زیانیان پێ ناگەیەنن، خوای گەورە دڵی کەسانێك لە خشتە دەبات و ڕۆزیان دەخاتە سەر ئەوان، جەنگ دەکەن تاکو هاتنی ڕۆژی دوایی و جەنگیش هەرگیز نابڕێتەوە تاکوو دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج[1].

وە لە پاش (یەئجوج و مەئجوج) حەجکردن هەر دەمێنێت، پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيُحَجَّنَّ الْبَيْتُ ، وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ)[2].

واتە: لە پاش دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج حەجکردن هەر دەمێنێ

## سەرنج : ئایا پێویستە لەسەر موسڵمانان جەنگ لەگەڵ یەئجوج و مەئجوج بکەن؟

**وەڵام:** نەخێر، چونکە لە فەرموودەکان زانیمان کە خوای گەورە بە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموو:

من بەندە گەلێکم ناردووە کەس توانای ڕووبەڕووبوونەوەیانی نییە، بۆیە بەندەکانم کۆکەرەوەو بیانپارێزە لە کێوی (طور).

(١) صحيح: رواه النسائي في السنن الكبرى، برقم: (١٩٣٥) وصححه الألباني.

(٢) صحيح البخاري (٢/ ١٤٩) كتاب: باب: قوله تعالى: جعل الله الكعبة، برقم: (١٥٩٣).

# ڕوودانی سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر زەوی

لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنی زەوی سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر ڕووی زەوی ڕوو دەدات، ئەو سێ ڕۆچونەش زۆر جیاوازن لەو ڕۆچونە ئاساییانەی کە ناوبەناو لە شوێنی جیاوازی زەویدا بەهۆی بومەلەرزەو لافاو و گڕکانەوە ڕودەدات، ئەویش لەوەدا کە ئەم سێ ڕۆچونە هێندە گەورەن کە پێشتر نمونەیان نەبینراوەو پانتاییەکی گەلێك فراوان لە وشکایی سەر زەوی لەسەر نەخشە دەسڕێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر یەکە لەم سێ ڕۆچونەی بە یەکێك لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی داناوە هەروەکو پێشەوا حوزیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری (ﷺ) دەڵێت: (اطَّلَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: مَا تَذَاكَرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ - فَذَكَرَ - الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ)[1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێمان دەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین، فەرمووی: ئەوە باسی چی دەکەن؟ گوتمان: باسی ڕۆژی دوایی، فەرمووی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنیدا نەبینن، پاشان فەرمووی: دوکەڵ و دەجال و داببەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێت) و یەئجوج و مەئجوج و سێ ڕۆچوون ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاو دەنێت بەرەو شوێنی حەشر کردنیان.

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب الآيات التي تكون قبل الساعة، (٤/٢٢٢٥) ورقمه (٢٩٠١).

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَكُونُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَالدُّخَانُ وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ، وَيَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قُعْرَةِ عَدَنٍ تَرْحَلُ النَّاسَ) وفي رواية (والْعَاشِرَة: نُزُولُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە ڕوو دەدات: ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچونێك لە دوورگەی عەرەب و دووکەڵ و دەجال و دابەو یەئجوج و مەئجوج و هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواو ئاگرێك کە لەناوچەی عەدەن دەردەچێت و خەڵکی کۆچ پێ دەکات، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێت: دەیەمینیان دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لێبێت).

ئەمەو سەبارەت بە کاتی ڕوودانی ئەو ڕۆچونانە یان هۆکارەکەی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باسیان لێوە نەکراوە تەنها ئەوەندە نەبێت کە یەکێکە لە دە نیشانە گەورەکانی کۆتایی بونەوەر، بەڵام پێمان وایە کە ئەو سێ ڕۆچونە گەورەیە نیشانەی تێك چوونی شیرازەی زەوی‌و لێکترازانی کیشوەرەکان دەبێت لە یەکتر، وە لەدوای ئەم نیشانەیە تەنها یەك نیشانەی تر دەمێنێت ئەویش دەرچوونی ئاگرێکی گەورەیە لە یەمەن خەڵکی ڕاپێچ دەکات.

**ئەگەر وردببینەوە لەم فەرموودەیە چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێت، لەوانە:**

**• ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵاتەوە دەبێت لە یەك لەم دەوڵەتانە (خوراسان ـ ئەفغانسان ـ پاکستان ـ هیندستان ـ ئێران ـ عێراق).**

سەبارەت بە ڕۆچوونی ڕۆژهەڵات پێشەوا (ابو الفرج) دەڵێت: ئەم ڕووداوە لە خاکی عێراق ڕوودەدات بە هۆی زیلزالەوە دەبێت و خەڵکێکی ئێجگار زۆر دەبنە قوربانی[2].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب: في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٨/ ١٧٨) برقم: (٧٤٦٧).

(٢) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ١٠.

بەرگی سێیەم

• ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاوا دەبێت لە یەك لەم وولاَتانە (مەغریب ـ ئەمریکا ـ .. هتد)، هەر چەندە لە گوندێکی جەزائیر لە ساڵی ١٩٨٨ ع ڕوویدا، بەڵام لە نیشانە بچوکەکان بوو.

• ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەبی.

ئەم ڕۆچوونەش ڕوونادات مەگەر پیسی لە نێو خەڵکی زۆر بێت و حەرامەکان حەڵاڵ بکرێت.

ئەمەش بە بەڵگەی ئەو فەرمودانە کە دایکی باوەڕداران عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: (عَبَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي مَنَامِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ(ﷺ) صَنَعْتَ شَيْئًا فِي مَنَامِكَ لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُهُ، فَقَالَ: الْعَجَبُ إِنَّ نَاسًا مِنْ أُمَّتِي يَؤُمُّونَ بِالْبَيْتِ بِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ، قَدْ لَجَأَ بِالْبَيْتِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ خُسِفَ بِهِمْ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ الطَّرِيقَ قَدْ يَجْمَعُ النَّاسَ، قَالَ: نَعَمْ، فِيهِمُ الْمُسْتَبْصِرُ وَالْمَجْبُورُ وَابْنُ السَّبِيلِ، يَهْلِكُونَ مَهْلَكًا وَاحِدًا، وَيَصْدُرُونَ مَصَادِرَ شَتَّى، يَبْعَثُهُمُ اللهُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ)[1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی نووستندا دەست و لەشی دەجولاَیەوە، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتی نووستندا شتێکت کرد پێشتر کاری وات نەکردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: جێی سەرسوڕمانە کەسانێك لە ئوممەتەکەم ڕوویان کردۆتە ماڵی بەیت بۆ پیاوێکی قوڕەیشی کە پەنای بردۆتە بەر کەعبە، هەتا کاتێك کە گەیشتنە بیابانەکە ڕۆچوون بەزەویدا، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگە جاری وا هەیە خەڵکی جۆراو جۆر کۆدەکاتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ تیایاندایە بەچاو ڕۆشنی هاتووەو تیایاندایە بەزۆر هێنراوەو تیاشیاندایە ڕێبوارە، هەموویان بە یەك تیاچوون تیا دەچن، وە هەریەکیان بە ڕێیەکی جیاواز دەڕوات و خوا هەر یەکەیان لەسەر نیەتی خۆی زیندووی دەکاتەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٠) كتاب: الفتن، باب الخسف بالجيش الذي يؤم البيت، برقم: (٢٨٨٤).

جا ئایا ئەوەی دێتە دەرو پەنا دەباتە بەر ماڵی خوداو خودا بەسەرخستنی خۆی پاڵپشتی دەکاو ئەوکەسانە لە نێو دەبا کە دەیانەوێ ئازاری بدەن، ئایا ئەمە ئەو مەهدیەیە کە لە فەرمودەکان باس کراوە؟ بەڵگەیەکی ڕاشکاومان نیە بۆ ئەمە.

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: کۆمەڵێك پەنا دەبەنە بەر ئەم ماڵی بەیتە نەپارێزەرو نەپاڵپشتیان هەیەو نەژمارەو نە تفاق، سوپایەکیان ڕەوانە دەکرێتە سەر، کاتێك کە سوپاکە دەگەنە ناوچەیەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن[1].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لیٰ بیٰ) لە شەرحی ئەو فەرموودەیە دەفەرموێ: مەبەست لەوەیە کە ئەو مەهدیەی ستایش کراوەو موژدە بە هاتنی دراوە لە کۆتایی بونەوەر، سەرەتای دەرکەوتن و سەرهەڵدانی لە ڕووی خۆر هەڵاتەوە دەبێت، لە پاشاندا لای ماڵی بەیت بەیعەتی دەدرێتی، هەروەك چەند فەرموودەیەك ئاماژە بەوە دەکەن[2].

سەبارەت بە ڕۆچوونی ڕۆژئاوا پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لیٰ بیٰ) دەڵێت: ئەوەش لە ڕۆژهەڵاتی ئەندەنوس لە نزیك گوندێك کە پیٰ دەگوترێت (قطر ظنارة)[3].

پێشەوا قینوجی (ڕەحمەتی خوای لیٰ بیٰ) دەڵیٰ: ئەم ڕۆچوونانە لەسەردەمی خیلافەتی (سولەیمانی کوری عەبدولمەلیك) ڕوویاندا لە بوخارا و ڕەی و دەوروبەری[4].

هەر چەندە ئەمە ڕوویداوە بەڵام لە کۆتایی بونەوەریش دووبارە دەبێتەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٠٨) كتاب: الفتن، باب: الخسف بالجيش الذي يؤم بالبيت، برقم: (٢٨٨٢).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم، ابن كثير (١/ ٢٩ ــ ٣٠).

(٣) التذكرة، ٧٤٠ .

(٤) الإذاعة، لا (١٠٤).

دایکمان ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ، فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ..)[1].

واتە: کەسێك پەنا دەباتە بەر ماڵی بەیت (واتە: کەعبە) پاشان کۆمەڵێك ڕەوانە دەکرێنە سەری، کاتێك کە دەگەنە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆدەچن بە ناخی زەویدا.

سەبارەت بە ڕۆچوونی جەزیرەی عەرەبیش: ئەمەش لەسەردەمی محەممەدی مەهدی دەبێت. (إن شاءالله)[2].

### ئایا ئەم زەوی ڕۆچوونانە ڕوویانداوە؟

ئەم سێ ڕۆچوونانە ڕوویان نەداوە، هەر چەندە هەندێك لە زانایان وا دەزانن کە ئەم زەوی ڕووچوونانە ڕوویان داوە، هەروەکو پێشەوا بەرزنجی وای بۆ دەچێ، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم سێ ڕۆچوونە زەویانە ڕوویان نەداوە، بەڵکو تەنیا هەندێ ڕۆچوونی بچوك لە چەند شوێنێکی جیاواز ڕووی داوە کە ئەمەش چەند نیشانەیەکی بچوکی ڕۆژی دواییین.

بەڵام ئەم سێ زەوی ڕۆچوونە کە ڕوو دەدەن زۆر گەورەن و گشت شوێنێ دەگرنەوە لە زۆربەی شوێنی زەوی لە خۆر هەڵات و خۆر ئاوا و دوورگەی عەرەبی.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بێگومان هەندێ ڕووچوونی زەوی ڕووی داوە لە هەندێ شوێندا، بەڵام لەوانەیە مەبەست بەم سێ ڕۆچوونە ئەندازەیەکی زۆر زیاترو گەورەتر بێ لەوەی کە بینراوە کە لەوانەیە زۆر لەوان گشتگیرترو کاریگەرتر بێت[3].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٠٨) كتاب: الفتن، باب: الخسف بالجيش الذي يؤم بالبيت، برقم: (٢٨٨٢).

(٢) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ١٠.

(٣) فتح الباري (١٣/ ٨٤).

وە ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات ئەوەیە کە هاتووە لە فەرموودەکەدا کەوا ئەم سێ ڕۆچوونە لەو کاتە ڕوودەدات کە پیسی و تاوان زۆر دەبێ لە نێو خەڵکیدا.

بەندە دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەم سێ ڕۆچوونە هیچیان ڕوویان نەداوە، چونکە ئەم ڕووداوانە لە دوای هاتنی یەئجوج و مەئجوج دێت، لە کاتێکدا دەجال هێشتا دەرنەچووە چ جای ئەوەی یەئجوج و مەئجوج بێت (خوای گەورە لە هەموومان زاناترە).

## هاتنی دەسەڵاتدارێک بەناوی (القحطاني)

لە کۆتایی بوونەوەر کاتێك کە دونیا بەرەو تێکچوون و کۆتایی دەڕوات، پیاوێك لەناو (قحطاني)ەکاندا پەیدا دەبێت کە دەسەڵات دارێکی بە توانا دەبێت و خەڵکی ملی بۆ کەچ دەکەن و لە ژێر سایەیدا کۆدەبنەوە، مەبەستیش لە (قحطان) عەرەبەکانی وڵاتی یەمەنە کە بەرەچەڵەکی ڕەسەنی عەرەب ناسراون و عەرەبی وڵاتەکانی تر لەوانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ)[1].

واتە: قیامەت هەڵناسێت هەتا پیاوێك لە قحطان دەردەچێت بە گۆپاڵەکەی خەڵکی دەداتە پێش خۆی.

ئەم فەرمودە ئاماژەیە بۆ ئەوەی وەکو چۆن شوان مەڕو ماڵات دەداتە پێش خۆی ئەویش بە هەمان شێوە دەکات، وە خەڵکیش گوێڕایەڵی دەکەن و ملی بۆ کەچ دەکەن.

پێشەوا قورطبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ) ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکی لەسەردەمی ئەودا ڕێك و ڕاست دەبن و لە دەوریدا کۆدەبنەوە، مەبەستیش بە (عصاه) خودی گۆپاڵەکەی دەستی نیە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەوەی خەڵکی گوێڕایەڵی دەکەن ئەویش دەسەڵاتی دەبێت بەسەریاندا، هەر چەندە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە ڕەقی و توندیشیان لەگەڵ بەکار دەهێنێت[2].

---

(١) صحيح البخاري (١٢/ ٢٤٥) باب: ذكر قحطان، برقم: (٣٥١٧).

(٢) التذكرة ، للإمام القرطبي، لا ٦٣٥.

پێشەوا نوعیمی کوڕی حەمماد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پێشەوا ئیبنو عەبباسەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (وَرَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ، كُلُّهُمْ صَالِحٌ لَا يُرَى مِثْلُهُ)[1].

واتە: پیاوێکیش لە(قەحطان) دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەوانە هەمویان پیاو چاکن.

بەڵام ئەوەندەی من بۆی بچم ئەوەیە: کە خەڵك ڕاپێچکردنی بە گۆچانێك پێناسەیە بۆ گوێڕایەڵی خەڵك بۆی، وە مل کەچیان بۆ فەرمانەکانی، بەڵام ئەوەی کە پێشەوا (قوڕتبی) ئاماژەی پێکردووە بەڵگەیە لەسەر توندو تیژی و دڵ ڕەقی لەسەریان بەرامبەر هەموو خەڵکی، ئەم پیاوە دڵ ڕەق و توندە دەبێ بەسەر خەڵکی خراپەکارو تاوانکەر بەسەر خەڵکی خراپەکار، چونکە ئەم پیاوە (قەحطان)یە پیاوێکی چاکە، بەدادپەروەری حوکم دەکات، بەڵگەشمان ئەوەیە کە پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە لە پێشەوا نوعەیمی کوری حەمماد(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە بە ڕێگایەکی زۆر ڕاست و دروست و بەهێز دەگێڕێتەوە لە پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر(ﷺ) کە باسی کردووە لە خەلیفەکان لە پاشان گوتویەتی: یەکێ لە خەلیفەکان پیاوێکە لە قحطان.

هەر چەندە لە هیچ فەرمودەیەکی (صحیح) کات و سەردەمی دەسەڵات دارێتی ئەم پیاوە دیاری نەکراوە بەڵام بەشێك لە زانایان پێیان وایە کە لەدوای وەفاتی پێشەوا (محەممەدی مەهدی) و سەردەمی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت) پەیدا دەبێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي رَجُلٌ يَمْلَأُ الْأَرْضَ عَدْلًا كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا، ثُمَّ مِنْ بَعْدِهِ الْقَحْطَانِيُّ، وَالَّذِي بَعَثَنِي بِالْحَقِّ مَا هُوَ دُونَهُ)[2]

---

(١) الفتن، نعيم بن حماد، (١/ ١١٥) برقم: (٢٦٤). وأخرجه بإسناد جيد.

(٢) الفتن، نعيم بن حماد (١/ ٣٨٣) برقم: (١١٤٦).

واتە: لە ئال و بەیتی من پیاوێك پەیدا دەبێت زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری وەکوو چۆن پڕ ببوو لە ستەم کاری، لە پاش ئەویش (قەحطان)ی دێت ، سوێند بەوەی کە منی بە هەق ناردووە قیامەت لەو تێناپەڕێت.

پێشەوا ئەرطاتی کوری مونذیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە یەکێکە لە تابیعینیەکانی خەڵکی شام دەفەرمویَ: (بَلَغَنِي أَنَّ الْمَهْدِيَّ، يَعِيشُ أَرْبَعِينَ عَامًا، ثُمَّ يَمُوتُ عَلَى فِرَاشِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ مَثْقُوبُ الْأُذُنَيْنِ، عَلَى سِيرَةِ الْمَهْدِيِّ، بَقَاؤُهُ عِشْرِينَ سَنَةً، ثُمَّ يَمُوتُ قَتْلًا بِالسِّلَاحِ..)[1].

واتە: هەواڵم پیَ گەیشتووە کە مەهدی چل ساڵ دەژی، پاشان لەسەر جێگە دەمرێت، پاشان پیاوێك لە (قەحطان) دێت هەردوو گوێی سمراوە (کون کراوە) لەسەر ڕیَ و شوێنی مەهدی حوکم دەکات، بیست ساڵ دەمێنێتەوە، پاشان بە کوشتن دەمرێت.

پێشەوا ئیبنو حەجەر(ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵێت: هەر چەندە فەرمودەکە بەرز کراوەتەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵام سەندەکەی (ضعیف)ە، بەڵام قسەکەی (أرطاة) هەر چەندە (موقوف)ە بەڵام سەنەدەکەی فەرمودەکە ڕاسترە[2].

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئایا (قەحطان)ی کەسێکی دادپەروەرە یان ستەمکارە ؟

**زانایان دوو بۆچوونیان هەیە :**

**یەکەم:** دەڵێن: پیاوێکی چاکە، وەکو پێشەوا ئیبنو حەجەر فەرموودەکە ڕیوایەت دەکات، کە بەڕاستی ئەوەشیان بەهێزترو پەسندترە.

**دووەم:** پیاوێکی ستەمکارو کەللەڕەقە، وەکو پێشەوا قورتوبی(ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) هێناویەتی لە کتێبی (التذكرة) کە ئەمەشیان بیَ هێزە .

---

(١) الفتن (١/ ٤٠٢) برقم: (١٢١٤).

(٢) فتح الباري بشرح صحيح البخاري (٥٤٦/٦).

## دەرچوونی پیاوێک بەناوی جەهجاهـ

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس لە هاتنی دەسەڵاتدارێکی تر دەکات بەناوی (جهجاه)، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْمَوَالِي يُقَالُ لَهُ : جَهْجَاهُ)[1].

واتە: شەو و ڕۆژ کۆتاییان نایەت هەتا پیاوێك لە (مەوالی) دەبێتە خاوەن موڵك و دەسەڵات پێی دەگوترێت (جەهجاه).

(مەوالی) کاتی خۆی بەو کەسانە دەگوترا کە لەڕەچەڵەکدا عەرەب نەبوون و لە قەومەکانی ترن بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی عەرەبدا بوون بە موسڵمان.

**(جهجاهـ)** بە کەسێك دەگوترێت کە دەنگی گەڕو بەرز بێت و زۆر هاوار بکات... هەر چەندە هەندێگ لە زاناکان وەکوو پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وایە کە (جهجاهـ) و (قەحطانی) هەردووکیان یەك کەس بن، بەڵام لە فەرمودەکەدا ئاشکرا دەردەکەوێت کە دوو کەسی جیان چونکە (قەحطانی) پیاوێکی عەرەبە بەڵام (جهجاه) عەرەب نیە بەڵکو پیاوێکە لەو (مەوال)یانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی عەرەبەکاندا موسڵمان بوون.

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٥٦/١٦) رقم الحديث (٨٣٤٦).

# سەرهەڵدانی دوکەڵێکی گەورە (الدخان)

یەکێکی تر لە نیشانە گەورەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی دوکەڵێکی گەورەیە کە سەرتاپای خەڵکی لەسەر زەوی دەگرێتەوە، سەبارەت بەو دووکەڵە خوای گەورە دەفەرموێت: [فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾].

واتە: چاوەڕێ بە ڕۆژێك دێت ئاسمان دوکەڵێکی دیارو ئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت، خەڵکی دەگرێتەوەو دایان دەپۆشێت، ئەو دوکەڵە سزایەکی بە ئازارە.

{يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ} ئەو دوکەڵە لەناوچەکانی یەمەنەوە دێت کە هەموو دونیا دەگرێتەوە، هەموو شارو گوندێك دەگرێتەوە.

ئەو دوکەڵە هەموو دونیا تاریك دەکات، هەموو جیهان دادەگرێت بەسەر کەسی باوەڕداردا وەکو هەڵامەتێکی ئاسایی دەردەکەوێت بەڵام بۆ سەر بێباوەڕان وەکو ئاگرێك دەبێت بەسەر سەریەوە.. هەروەکو لە داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەین.

پێشەوا حوزیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری (ﷺ) دەڵێت: (اطَّلَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: مَا تَذَاكَرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ - فَذَكَرَ - الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَيَأَجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ)[1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێمان دەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین، فەرمووی: ئەوە باسی چی دەکەن؟ گوتمان: باسی

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب الآيات التي تكون قبل الساعة، (٤/٢٢٢٥) ورقمه (٢٩٠١).

بەرگی سێیەم

ڕۆژی دوایی، فەرموی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنیدا نەبینن، پاشان فەرموی: دوکەڵ و دەجال و دابەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) و یەئجوج و مەئجوج و سێ ڕۆچوون ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاو دەنێت بەرەو شوێنی حەشر کردنیان.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَكُونُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَالدُّخَانُ وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ، وَيَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قُعْرَةِ عَدَنٍ تَرْحَلُ النَّاسَ) وفي رواية (والْعَاشِرَة: نُزُولُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە ڕوو دەدات: ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچونێك لە دوورگەی عەرەب و دووکەڵ و دەجال و دابەو یەئجوج و مەئجوج و هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواو ئاگرێك کە لەناوچەی عەدەن دەردەچێت و خەڵکی کۆچ پێ دەکات، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێت: دەیەمینیان دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لێ بێت).

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرەکەیدا لە(ئەثەر) ێکی (صحيح) لە پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە(ﷺ) دەڵێت: پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مولەیکە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (غَدَوْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: مَا نِمْتُ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ. قُلْتُ: لِمَ؟ قَالَ: قَالُوا طَلَعَ الْكَوْكَبُ ذُو الذَّنَبِ، فَخَشِيتُ أَنْ يَكُونَ الدُّخَانُ قَدْ طَرَقَ، فَمَا نِمْتُ حَتَّى أَصْبَحْتُ)[٢].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب: في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٨/ ١٧٨) برقم: (٧٤٦٧).

(٢) تفسير القرآن العظيم (٧/ ٢٤٩). قال ابن كثير: وَهَذَا إِسْنَادٌ صَحِيحٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ حَبْرِ الْأُمَّةِ وَتُرْجُمَانِ الْقُرْآنِ.

واتە: ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی سەردانی ئیبن و عەباسم(ﷺ) کرد گوتی: ئەم شەو تا بەیانی نەخەوتووم، گوتم بۆ؟

گوتی: گوتیان ئەستێرە کلك دارەکە دەرکەوتووە، منیش ترسام دووکەڵەکە سەری هەڵدابێت، ئیتر تا بەیانی خەوم لێنەکەوت.

بەڵگەش لەم هەواڵە ترسی پێشەوا ئیبنو عەبباس(ﷺ) بوو لەو دووکەڵە، کە یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر.

لەم ئایەت و فەرمودە پیرۆزانە بۆمان دەردەکەوێت کە هاتنی ئەو دوکەڵە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، وە زیان و ئازارێکی گەورە بە بێ باوەڕان دەگەیەنێت بەڵام زیانێکی ئەو تۆی بۆ باوەڕداران نابێت، ئەمەو لە فەرمودەکاندا بە تەواوی کاتی هاتنی ئەو دوکەڵەی دەست نیشان نەکردوە هەروەها هۆکارەکەشی ڕوون نەکردۆتەوە، بەڵام شێخ (محەمەد ڕەسول بەرزنجی) پێی وایە کە ئەو دووکەڵە لە دوای هاتنی (یەئجوج و مەئجوج) ڕوو دەدات وە سێ ڕۆژ دەخایەنێت[١].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێت: چل ڕۆژ دەخایەنێت بەڵام هیچ کام لەم ڕیوایەتانە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت، هەر چەندە ئەگەر ڕیوایەتی چل ڕۆژەکە ڕاستر بێت ڕێی تێدەچێت کە ئەو دوکەڵە هەمان ئەو دوکەڵە بێت کە پێشتر باسمان لێوەی کرد کەلە ئاکامی جەنگی جیهانی سێهەمدا چوار دەوری زەوی دەگرێت و تیشکی زۆر لە زەوی دەبڕێت و ئەو چل ڕۆژە دەخایەنێت کە فیتنەی دەجالی تێدا بەرپا دەبێت[٢].

پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم دووکەڵە لە پاشماوەی ئاگری دۆزەخە[٣].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، شيخ محمد البرزنجي، لا ٢٦٨.

(٢) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی، هاورێ محمد ئەمین، لا ٢٥٨-٢٥٩، چاپی پێنجەم ٢٠٠٥.

(٣) التذكرة، (لا ٧٤٠).

مامۆستا (هاوڕیّ) دەڵیّت: من زیاتر وای بۆ دەچم کە ئەو دوکەڵەی کۆتایی بونەوەر پەیوەندی بە هیچ کاریّکی سەر زەویەوە نەبیّت وە جیاواز بیّت لەو دوکەڵەی کە لە ئاکامی جەنگی جیهانی سیّهەمدا پەیدا دەبیّت بە بەڵگەی ئایەتەکەی سورەتی (الدخان) کە خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: [فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾].

واتە: چاوەڕیّ بە ڕۆژیّك دیّت ئاسمان دوکەڵیّکی دیارو ئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهیّنیّت، خەڵکی دەگریّتەوەو دایان دەپۆشیّت، ئەو دوکەڵە سزایەکی بە ئازارە.

واتە: دوکەڵەکە لە ئاسمانەوە دیّت و زەوی دەگریّت نەك لەسەر زەوی پەیدا ببیّت کە پیّ دەچیّت هۆکارەکەی تیّپەڕبوونی زەوی بیّت بەناو یان لە نزیك پەڵە هەوریّکی گازیی چڕ لە پاشماوەی ماددەی کەونی کە لە زۆر شویّنی بۆشاییەکانی ئاسماندا ئەو پەڵە هەورانە بەدی دەکریّت، هەروەها ئەو ئەستیّرە کلکدارانەی کە بە بۆشاییەکانی ئاسماندا دەسوڕیّنەوە بەدوای خۆیاندا تەم و خومار و دوکەڵیّکی زۆر بەجیّ دەهیّڵن کە بە شیّوەی کلك بە دوایانەوە دەبینریّت.. جاریّك لە جاران یەکیّك لەو ئەستیّرە کلکدارانە بەشیّوەیەکی وا لە زەوی نزیك بیّتەوەو کە تەم و خومارو دوکەڵی بگاتە زەویو ببیّتە هۆی ڕوودانی ئەو دیاردەی دوکەڵەی کە بەیەکیّك لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مەزندە کراوە، ئەوەشی زیاتر ئەو بۆچونە لە قەناعەتمان نزیك دەکاتەوە فەرمودەکەی پیّشەوا ئیبنو عەبباسە (ﷺ) کە سەرهەڵدانی دوکەڵەکە پەیوەست دەکات بە دەرکەوتنی ئەستیّرەیەکی کلکدارەوە، بەڵام ئەمانە هەمووی هەر لە چوار چیّوەی بۆچون و هەوڵی تایبەتی خۆمان بۆ لیّکدانەوەی ڕوداوەکە دەمیّنیّتەوە نەك وەك ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر، خوای گەورەش لە هەمو کەس زاناترە.

وە پیّویستە ئەوەش بزانین کە ئەو دووکەڵە جیاوازە لەو بایەی کە لە ئاخر زەماندا ڕۆحی ئیمانداران دەکیّشیّت، بە پشتیوانی خوا لە داهاتوودا باسیان دەکەین، چونکە لە دوای ئەو بایە هیچ باوەڕداریّك لەسەر زەوی نامیّنیّت، بەڵام

بەرگی سێیەم

لە کاتی دووکەڵەکە باوەڕدار و بێباوەڕ لەسەر زەویدا هەن و دوکەڵەکە کارێکی ئەو تۆ لەسەر موسڵمانان ناکات[1].

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) ڕای وایە ئەم نیشانەیە بەسەرچووەو تێپەڕیوە، پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە صەحیحەکەیدا لە مەسروق دەگێڕتەوە دەڵێ: لەلای (عەبدوڵلا) دانیشتبووین، ئەویش لە نێوانماندا ڕاکشابوو، پیاوێك هاتە لای و گوتی: ئەی (ئەبو عەبدوڕەحمان) حیکایەت خوانێك لەبەر دەرگەکانی کیندە دانیشتووەو باسی هاتنی نیشانەی دوکەڵەکە دەکات کە گیانی کافرەکان دەکێشێ و، بڕوادارانیش تووشی پەسیو (هەڵامەت) یێك دەکا، (عەبدوڵلا) بە تووڕەیی دانیشت و گوتی: ئەی خەڵکینە لە خوا بترسێن و پارێزگاربن، هەریەك لە ئێوە شتێکی زانی با بیڵێ، ئەوەی نەیزانی با بڵێ: خودا زاناترە، زانایی هەر یەکێکتان لەوەدایە کە شتێکی نەزانی بڵێ: خودا زانترە، چونکە خودا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمووە: [قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾][2].

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ: لەبەرامبەر ڕاگەیاندنی قورئان و دینی خوا شتێك لە ئێوە ناخوازم و لەوکەسانەش نیم کە بەدرۆ شتێك بەخۆیانەوە دەنێن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دیتی خەڵك پشتی تێدەکەن فەرمووی: خودایە تووشی (٧)ساڵی وەك (٧) ساڵەکەی یوسفیان بکەی..دەڵێ: جا تووشی قات و قڕیەکی واهاتن هەموو شتێکی بنبڕکرد، تا وایان لێ هات لە برسان پێستەی مرداریان دەخوارد، کە یەکیشیان لە ئاسمان دەڕوانی، شتێکی وەك دوکەڵی دەهاتە بەرچاو، جا (ئەبو سوفیان) هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوتی: ئەی محەممەد (ﷺ) تۆ فەرمان بەتاعەتی خودا و پەیوەندی خزمایەتی دەکەی، وا هۆزەکەت فەوتان، دە لەخوا بۆیان بپاڕێوە، خوای گەورەش فەرموی: [فَٱرْتَقِبْ

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، لا ٢٥٩-٢٦٠.

(٢) سورة ص، الآية: (٨٦).

یَوۡمَ تَأۡتِی ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِینٖ ﴿١٠﴾ یَغۡشَی ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِیمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّیٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَیٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِینٞ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِیلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾].

واتە: چاوەڕوانی ڕۆژێك بن كە ئاسمان دوكەڵێكی ئاشكرا دێنیٚ، هەمو خەڵكی دادەگریٚ و سزایەكی پڕ ژان و دەردە. پەروەردگارا سزامان لیٚ لادەی ئێمە بڕوادارین. بە چ شێوەیەك پەند وەردەگرن لە كاتێكدا پێغەمبەرێكی ڕونكەرەوەیان بۆ هاتوە، پاشان ڕوویان لیٚ وەرسوڕاندو وتیان: شێتێكەو ئەم شتانەی لیٚ فێركراوە. ئێمە كە ئازارێك هەڵدەگرین و ئێوەش دەگەڕێنەوە سەر ئاینەكەتان.

گوتی: ئایا سزای دوایین هەڵدەستیٚ؟! [یَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَیٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾].

واتە: ڕۆژێك ئەوان بە ئەشكەنجەی سەخت دەگرین، بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەستێنین[١].

پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) ڕای وایە تێپەڕیوەو ڕویداوە، بەڵگەشی ئەوەیە كە ئەو سزایەی لە ڕۆژی دواییدا كافران دووچاری دەبن لەسەریان هەڵناستیٚ، دەقی ئایەتەكەش ئەوە دەگەیەنیٚ خودا كەمێك ئەشكەنجەی لیٚ بەرزكردنەوە، كۆمەڵێك لە پێشینانیش هەمان ڕاوبۆچوونی ئیبنو مەسعودیان هەیە، وەكو پێشەوایان موجاهیدو ئەبولعالیەو ئیبراهیمی نەخەعی و ضەححاك و عەطیەی عەوفی و ئیبنو جەریر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ)[٢].

پێشەوا ئیبنو كەثیر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: هێشتا نیشانەی دوكەڵەكە نەهاتووە، هەروەكو پێشەوا ئەبو مالیكی ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

---

(١) صحیح مسلم: (٢١٥٧/٤)، برقم: (٢٧٩٨). مةبةستیش لةم رِؤذة رِؤذي بةدرة، نیشانةي دوكةلَ و سزاي سةخت و ئایةتي (لیزام) و ئایةتي (رِوم)ة بةسةر ضوون.

(٢) تفسیر القرآن العظیم، ابن كثیر (٢٤٧/٦).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إنَّ ربَّكُمْ أنذَرَكُمْ ثلاثاً: الدُخان يأخُذُ المؤمنَ كالزَكْمةِ ويأخُذُ الكافِرَ فَيَنْتَفِخُ حتى يَخْرُجَ منْ كلِ مَسْمَعٍ منهُ، والثانية الدَّابة، والثالة الدَّجّال)[1].

واتە: پەروەردگارتان لە سێ شت ئاگاداری کردونەتەوە: دوکەڵێك کە وەکو هەڵامەت ئیماندار دەگرێت و کاری لێ دەکات، وە کافریش بەجۆرێك دەگرێت کە هەڵی دەئاوسێنێت تا وای لێ دێت لە هەموو دەرچەیەکی لەشیەوە دێتە دەر، وە دووهەمیشیان دابەو سێیەمیشیان دەجال.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باسی ئەوەی کردووە کە ئەو ڕایەی دەڵێ: هێشتا دوکەڵەکە نەهاتووە، وتەی پێشەوایان عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئەبو سەعیدی خودری و ئیبنو عەبباس و حەسەنی بەصریە (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) کە ئەمەش بەڵگەیانە:

ئەو فەرمودە صەحیح و حەسەنانەی کە لەم بابەتەوە هاتوون و بەڵگەی ئەوەن کە نیشانەکە هێشتا نەهاتوە.

٢- کە خوای گەورە دەفەرموێ: [فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾].

واتە: چاوەڕێ بە ڕۆژێك دێت ئاسمان دوکەڵێکی دیارو ئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت.. واتە: دوکەڵەکە دیارو ئاشکرایەو ئەندێشەو خەیاڵ نیە، وەکو ئیبنو مەسعود بۆی چوە.

٣- خوای مەزن دەفەرموێ: [يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾]. مەبەست هەموو خەڵکە.. جا ئەگەر مەسەلەکە خەیاڵی بوایەو تایبەت بایە بە موشریکەکانی مەککە، نەیدەفەرموو [يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەبارەی ئەم فەرمودەیە (إنَّهَا لَنْ تَقُومَ حتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آياتٍ ، فَذَكَرَ ، الدُّخانَ...) دەڵێت: ئەم فەرمودەیە

---

(١) جامع البيان (١١٤/٢٠) وتفسير ابن كثير (٢٣٥/٧) وقال ابن كثير اسناده جيد.

قسەی پاڵپشتی ئەوانەیە کە دەڵێن: دوکەڵەکە گیانی بێبڕوایان دەستێنێ، و بڕواداران توشی شتێکی وەك هەڵامەت دەکات و هێشتاکە نەهاتووە، بەڵکو لە نزیك کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات، پێشتریش باسی ئەوە کراوە کە ئیبنو مەسعود ڕەتی کردۆتەوە، ئەوەی ڕویداوە بریتیە لەو قات و قڕیەی کە توشی قورەیش بووە، تا وایان لێهاتووە لەنێوان خۆیان و ئاسماندا شتێکی وەکو دوکەڵێکیان هاتۆتە بەرچاوان، کۆمەڵێکیش هەمان ڕای ئیبنو مەسعودیان هەبوو.. ڕایەکەی تریش وتەی پێشەوایان (حوزەیفەو ئیبنو عومەرو حەسەن) بووە، حوذەیفەش لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە چل ڕۆژان لە زەویدا دەمێنێ، جا بۆ کۆکردنەوەی ئەم دوو شوێنەوارە، ئەوە هەڵدەگرێ کە دوو دوکەڵ بن[1].

ماوەیەکیش پێش ئێستا دووکەڵێکی زۆر گەورە لە ئایسلەندا سەری هەڵداو خەڵکی باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەم دووکەلە یەکێ لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی بێت، هەڵبەتە ئەم دەنگۆیەش هیچ بنچینەیەکی نەبوو.

کورتەیەك لە دووکەڵەکەی ئایسلەندا:

ئەو کاتەی مرۆڤ دەستەوسانە بەامبەر کارەساتەکەی ئایسلەندا کە زیانە گیانیەکانی هیچ نەبوون و نەبووە کارەساتێك کە هەڕەشە لە مرۆڤ بکات لە جیهاندا، بەڵام تا قەدەرێك مرۆڤ هێندە دەستەوسان مایەوە کە فرۆکەخانەکانی ئەوروپا هەمووومانی سەرسام کرد.

لە هەندێك فرۆکەخانە خەم و دڵتەنگی گەشتیاران بێدەسەڵاتی ئینسانەکانی ئەم سەدەی بیست و یەکەی تووشی شۆك دەکرد، لەکاتێکدا هێشتا ئەو هەڕەشەیە هێندە بڵاو نەبوو کە تەواوی جیهان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هەر بۆیە ئەو پرسیارەی لەبەردەم مرۆڤایەتیدا جێگە بە هەموو پرسیارەکان لێژدەکات ئەوەیە تۆ بڵێی مرۆڤ هێندە بێ دەسەڵات ڕامێنێت بەرامبەر کارەساتە سروشتییەکان و لەگەڵ پێشکەوتنی ئەو تەکنەلۆژیایەدا ئەو ترس و دڵە ڕاوکێ یە ڕامالێت.

---

(١) شرح النووي على مسلم: (٢٧/١٨).

کارەساتی بورکان و تەقینەوەکانی بورکانی ئایسلەندا ئەوەی سەلماند کە چۆن بە ڕوداوێکی سروشتی سادە و تەنیا یەك بورکان هاتوچۆی ئاسمانی لە مرۆڤ پەکخست و تەنانەت مرۆڤایەتی ئەوەندەی دڵەڕاوکێی بەرامبەر کارەساتەکە پێوە دیاربوو هێندە زیانە ماددەیەکانی نەخوێندەوە کە بەر ئەو کۆمپانیا فڕۆکەوانیانە کەوتن، تەنانەت حاڵەتی ترس گەیشتە ئەوەی ئەو دوکەڵە درێژە بکێشێت و تەقینەوەکان کارەساتی سەرسوڕهێنەری دیکە بەدوای خۆیدا بهێنێت.

ئەو گڕکانانە کە لەناوچەی (ئیڤجافجا لاگوکوڵ)ی خۆرهەڵاتی پایتەختی ئایسلەندا بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٨٢١م ڕوویداوە و دوای سەدان ساڵ چالاك بوەوە و لە ٢٠١٠/٤/١٤ ع دا کاریگەرییەکی بەتەواوی دەرکەوتوو و دوو هەفتە تەقینەوەکانی بەردەوام بوو، بۆیە مرۆڤ هەقی خۆیەتی بیربکاتەوە کە پێدەچێت لە ساڵی ١٨٢١م دا مرۆڤەکانی ئەم هەسارەیە هێندەی ئێستا لە دڵەڕاوکێدا نەژیابن بەرامبەر بەم جۆرە کارەسات و ڕووداوانە، چونکە نەتەکنەلۆجیا هێندە پێشکەوتوو بووە تا مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە فریای دەکەوێت، نە ژینگەش بەو پلەیەی ئێستا لەژێر مەترسیدا بووە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ بە ڕووداوێکی سادەو پەککەوتنی ڕێگەی ئاسمانی تووشی تێڕامان بێت، ئەی ئەگەر سبەی ڕێگای وشکانی و ئاویشی کەوتە مەترسیەوە چۆن بەرامبەر سروشت دەستەوسان دەبێت.

# هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە

یەکێکی تر لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر کە گەورەو بچوك دەیبینن لە گۆڕانکارییەکانی کتوپڕ لە سیستەمی گەردووندا.

ڕۆژێك خەڵکی لە خەو هەڵدەستن خۆر هەڵنایەت، خەڵی بە درێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕێ دەکەن خۆر هەڵ بێت بەڵام هەڵنایەت بۆیە لە تاریکیەکی نوتەکدا ئەو ڕۆژە دەبەنە سەر، لە ڕۆژی دووەمیشدا هەڵنایەت هەروەها لە ڕۆژی سێیەمیشدا بە هەمان شێوە، تیەنها ئەو کەسانە بەو حاڵەتە دەزاننکە شەو هەڵدەستن.. بەڵام ئەوانەی کە شەو هەڵناسن هەرگیز هەستی پێناکەن یاخود هەستی پێ دەکەن بەڵام وەك ماندوبوون و تێکشکاندنێك تەماشای دەکەن و خەڵکی لە تاریەکی نوکەتدا ژیان دەبەنە سەر، بۆیە پێش هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە سێ ڕۆژان خەڵکی چاوەڕێی هەڵاتنی ڕۆژ دەکەن بەڵام هەڵنایەت!!

ئەم ڕۆژە بۆ هەڵنایەت خەڵکی نازانن!! پاشان لە ڕۆژی چوارەم لەناکاو تیشکی خۆر لە خۆرئاواوە سەرهەڵدێنێت[1]!

ئەمەش بارودۆخێکی ترسناك بۆ خەڵکی دێنێتە پێش و ماوەی ساڵێك دەخایەنێت...

هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی و تێکچوونی شیرازەی زەوی و گەردوون، ڕاستی ڕووداوی ئەم دیاردەیەش لە کۆتاییەکانی تەمەنی زەویدا بە دەقی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلمێنراوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووی: [يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا].

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ٢٨٨).

واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەندێك لە نیشانەو بەڵگەکانی خوای پەروەردگارت دێن و دەردەکەون، هیچ کەسێك دوای ئەوە باوەڕ هێنان سوودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنابێت یان لەباوەڕ هێنانەکەیدا خێروچاکەی نەکردبێت.

پێشەوا تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (وأولى الأقوال بالصواب في ذلك ما تظاهرت بة الأخبارُ عن رسول الله(ﷺ) أنه قال: ذلك حين تطلعُ الشمسُ من مغربها)[١].

واتە: ئەوەی لە پێشترو ڕاستریێت لە واتای ئەم ئایەتە ئەو هەواڵە ئاشکراو زۆرانەیە کە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: ئەوە کاتێك دەبێت کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ مِنْ مَغْرِبِهَا آمَنَ النَّاسُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ، فَيَوْمَئِذٍ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْل..)[٢].

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، کە هەڵهات و خەڵك بینیان هەر هەمویان باوەڕی پێ دەهێنن، بەڵام ئەوە کاتێکە کە هیچ نەفسێك باوەڕهێنانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنا بێت.

حیکمەتیش لە داخستنی دەرگای تەوبەکردن: باوەڕ لە زۆربەی لایەنەکانیدا لەسەر باوەڕبوون بە غەیب و نەزانراو دامەزراوە، جا کاتێك خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێت باوەڕ بە چاو تێبینی دەکرێت و نەزانراوو غەیب نیە، ئیتر باوەڕ هێنان لەو کاتە وەکو باوەڕی فیرعەونی لێ دێت لە پێش ئەوەی نگرۆی نیل ببێت و بخنکێت[٣].

---

(١) جامع البيان (٨/ ١٠٣).

(٢) صحيح مسلم (١/ ١٣٧) باب: بيان الزمن الذي لا يقبل فيه، برقم: (١٥٧).

(٣) صحيح علامات الساعة الكبرى، مصطفى مراد، لا ٧.

لە فەرمودەیەکی تر دەفەرموێ: (بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ سِتًّا: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا..)[1].

واتە: دەست پێشخەری بکەن بۆ کاری چاکە پێش ئەوەی شەش شت ڕوبدات: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ ضُحًى فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالْأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا ..)[2].

واتە: یەکەمی نیشانەکان هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوەو دەرچونی (دابە) یە لە چێشتەنگاودا بۆ سەر خەڵکی، وە هەر کامێك لەم دوو نیشانەیە لە پێش ئەوی تریاندا ڕوویدا ئەوا ئەوەی دیکەش دوای ئەو پەیدا دەبێت.

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەوەی کە دەردەکەوێ ئەوەیە کە نیشانە گەورەکان دوو جۆرن:

بەشێکیان نیشانەی سەر زەوین و پەیوەندییان بەسەر زەوییەوە هەیە..

بەشێکیشیان پەیوەندییان بە ئاسمانەوە هەیە، واتە: بەشێکیان (سفلی)ن، وە بەشێکیشیان (عەلوی)ن، دواتر دەفەرموێ: لە نیشانە زەمیینیەکان دیارە دەجال لە پێش هەموویانەوە پەیدا دەبێت، وە لە نیشانە ئاسمانییەکانیش خۆر لە پێش هەموویانەوە لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت[3].

کەواتە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (یەکەمین نیشانە خۆرە کە لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ، تازە خەڵك هەمووی ئیمان دێنێت بەڵام سودی نییە.. کەواتە: حەتمەن پێش ئەوەی کە خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵبێ).

---

(١) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٦٧) كتاب: الفتن باب: في بقية من أحاديث الدجال، برقم: (٧٢٤٠).

(٢) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٤٧) برقم: (٨٦٤٣). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٣) فتح الباري (١١/ ٣٥٣).

دیاره دەجالیش هاتووەو (عیسا)ش هاتۆته خوارێ و یەئجوج و مەئجوج هاتوون و ئەو شتانە هەموویان ڕوویان داوه ئینجا خۆر لە ڕۆژئاوا هەڵدێ و ئیمان هێنان سوودی نابێ، چونکە ئەو کاتە کۆتایی بونەوەرەو نیشانەکانی خوا هێندە ئاشکران خەڵك ئیمانێکی ناچاری دێنن نەك ئیختیاری و هیچ هونەرو ئازایەتی تێدا نییە.

ئەمەش کورتەیەك بوو سەبارەت بە چۆنیەتی پەیدابوونی نیشانە دوورەکان..

جا لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ئیتر دەرگای تەوبەکردن دادەخرێت، هەر کەسێك لە پێش ئەو ڕووداوە باوەڕی نەهێنا بێت و تەوبەی نەکردبێت ئیتر لە دوای ئەو ڕووداوە باوەڕهێنان و تەوبەکردن قبوڵ ناکرێت.

هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ڕووداوێکی هێندە گەورەو سامناکە بە جۆرێك کە هەرچی خەڵکی سەر زەوی هەیە هەر هەمویان بە جارێك تەوبە دەکەن و باوەڕدەهێنن، بەڵام تەوبەکردن لە دوای بینینی ئەو دیاردەیە وەکو تەوبەکردنی ئەو کەسە وایە کە لەکاتی سەرەمەرگدا دەیەوێت تەوبە بکات بەڵام لێی قەبوڵ ناکرێت.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)[1].

واتە: خوای گەورە بەشەو دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری ڕۆژ تەوبە بکات، وە بەڕۆژ دەستی دەکاتەوە هەتا خراپەکاری شەو تەوبە بکات، هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢١١٣) باب: قبول التوبة من الذنوب، برقم: (٢٧٥٩).

دیاردەی هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە تەنها یەك جار دەبێت و دواتر وەك ڕۆژانی ئاسایی لێ دێتەوە بەڵام لە دوای ئەو ڕووداوە ئیتر تەوبە لەکەس قەبوڵ ناکرێت و خەڵکی ئەو سەردەمە تا ئەو ڕۆژە هەر کارێکیان کردبێت تەنها ئەوەیان بۆ دەنوسرێت و هیچی تریان لێ قەبوڵ ناکرێت، هەروەکو دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (إِذَا خَرَجَتْ أَوَّلُ الْآيَاتِ طُرِحَتِ الْأَقْلَامُ، وَحُبِسَتِ الْحَفَظَةُ، وَشَهِدَتُ الْأَجْسَادُ عَلَى الْأَعْمَالِ)[١].

واتە: هەر کات یەکەمی نیشانەکان دەرکەوت (واتە: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە) ئیتر پێنوسەکان فڕێ دەدرێن و ئەو فریشتانەی چاکەو خراپەی مرۆڤ دەنوسن بەند دەکرێن و لاشەکانیش شایەتی لەسەر کردەوەکان دەدەن.

لە فەرمودەیەکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا تُقُبِّلَتِ التَّوْبَةُ، وَلا تَزَالُ التَّوْبَةُ مَقْبُولَةً حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنَ المَغْرِبِ، فَإِذَا طَلَعَتْ طُبِعَ عَلَى كُلِّ قَلْبٍ بِمَا فِيهِ، وَكُفِيَ النَّاسُ الْعَمَلَ)[٢].

واتە: کۆچکردن لە پێناوی خوا پچڕاندنی نیە مادەم تەوبە قەبوڵ بکرێت، تەوبەکردنیش بەردەوام قەبوڵە هەتا ئەو کاتەی کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت، هەر کاتێك هەڵهات، ئیتر هەموو دڵێك بەوەی کە تێی دایە مۆری لێ دەدرێت، ئیتر خەڵکی پێویستیان بەکار نامێنێت.

لە فەرمودەیەکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووی: (أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ جَعَلَ بِالمَغْرِبِ بَابًا عَرْضُهُ مَسِيرَةُ سَبْعِينَ عَامًا لِلتَّوْبَةِ لاَ يُغْلَقُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ قِبَلِهِ)[٣].

واتە: خوای گەورە دەرگایەکی لە خۆرئاواوە داناوە بۆ تەوبەکردن، پانتاییەکەی (٧٠) ساڵ ڕێگایە، داناخرێت هەتا ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە هەڵنەیەت.

---

(١) الفتن، (٢/ ٦٤٣) برقم: (١٧٩٨).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (١/ ١٩٢) برقم: (١٦٧١) وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٣) صحيح: سنن الترمذي (٥/ ٤٣٧) باب: في فضل التوبة والإستغفار، برقم: (٣٥٣٦) وقال الإمام الترمذي: هذ حديث حسن صحيح.

لەم فەرمودانە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆژێك دێت خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت ئەویش کاتێك دەبێت کە هەموو ئەو نیشانانەی پێشتر باسمان کرد ڕوو دەدەن.

لەم فەرموودانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند سوودێکمان دەست دەکەوێت، لەوانە:

• خوای گەورە تەوبەی هەموو گوناهبارێك قەبوڵ دەکات و لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت، وە باوەڕی هەموو بێبڕوایەك قەبوڵ دەکات پێش ئەوەی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵبێت.

• هەموو خەڵکێك بە موسڵمان و کافرەوە لەسەرتاسەری بونەوەر بە چاوانی خۆیان دەیانبینن.

• خوای گەورە کە ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدەهێنێت بۆ بەدەرخستنی توانای دروستکراوەکانی خۆیەتی، هەتا ئەوانەی کە لەسەر ئایینی صابیئەن بزانن کە لە چ هەڵەیەکی کوشندەن و تەحەددایەکیشە بۆ شوێنکەوتووانی نەمروود.

• لە کۆتاییدا هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاوا و کەرتبوونی مانگ و گەورەبوونی و بڵاوبوونەوەی ئەستێرەکان بەڵگەیەکە لەسەر گەورەیی و توانایی خوای گەورە.

پێشەوا ئەبو ذەر (ﷺ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَخِرُّ سَاجِدَةً، فَلَا تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا، ثُمَّ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَخِرُّ سَاجِدَةً، وَلَا تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا، ثُمَّ تَجْرِي لَا يَسْتَنْكِرُ النَّاسَ مِنْهَا شَيْئًا حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ تَحْتَ الْعَرْشِ، فَيُقَالُ لَهَا: ارْتَفِعِي أَصْبِحِي طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِكِ، فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ؟ ذَاكَ حِينَ {لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا})[1].

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١٣٨) باب: بيان الزمن الذي لا يقبل فيه، برقم: (١٥٩).

واتە: ئایا دەزانن ئەو خۆرە بۆ کوێ دەچێت؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن؟ فەرمووی: ئەو دەسوڕێتەوە تاکو دەگاتە جێگای خۆی لە ژێر عەرشی خوداو کڕنوش دەبات، ئیتر هەروا دەمێنێتەوە تاکو پێی دەوترێت: بەرزبەرەوەو بگەڕێوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتوی، ئەویش دەگەڕێتەوە جێگەی خۆی، ئینجا ڕێ دەکات تاکو دەگاتە جێگای خۆی لە ژێر عەرشداو دەچێتە کڕنوش، هەروایش دەمێنێتەوە تاکو پێی دەوترێت: بەرز بەوەو بگەڕێوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتوی، ئەویش دەگەڕێتەوەو لە شوێنی هەڵاتنی خۆیەوە دەردەچێت و دەڕوات، خەڵکی نکۆڵی لە هیچ شتێکی ناکەن تاکو دەگاتە شوێنی خۆی لە ژێر عەرش و پێی دەوترێت: بەرزبەوە لە خۆرئاواوە هەڵبێ و ئەویش لە خۆرئاواوە هەڵدێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن ئەوە کەی ڕوودەدات؟ ئەوە کاتێکە هیچ باوەڕەکەی بە کەڵکی نایەت ئەگەر پێشتر باوەڕی نەهێنابێت یان سودێکی لە باوەڕەکەی وەرنەگرتبێت.

لەوانەیە گرفت لەلای هەندێك دروست بێت چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە یەکەمین نیشانەکان دەرکەوتنی خۆرە لە خۆرئاواو دەرچوونی ئاژەڵەکەیە لە کاتێکدا لە فەرموودەی تردا هاتووە کە یەکەمین نیشانەکان دەجالە، یان مەهدی.

چۆن ئەوە بگونجێنین؟

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە سەرجەم هەواڵەکان ئەوە پەسند دەکرێت کە: دەرچوونی دەجال یەکەمینی نیشانە مەزنەکانە کە سەرەتای گۆڕانکاری بارودۆخە گشتیەکانە لە زۆربەی شوێنەکانی سەر زەوی، ئەوەش بە مردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) کۆتایی پێ دێت، هەڵاتنی خۆریش لە خۆرئاواوە یەکەمین نیشانە گەورەکانە کە سەرەتای گۆڕانکاری بارودۆخی جیهانی سەرەوەیەو هەڵسانی کۆتایی بونەوەر تەواو دەبێت، لەوانەشە دەرچوونی ئاژەڵەکە هەر لەو خۆرەدا بێت کە خۆر تێیدا لە خۆرئاواوە هەڵدێت، پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پێشەوا

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە(ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرمویەتی: یەکەمین نیشانەکان هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، هەروەها پەیدابوونی ئاژەڵە لەسەر خەڵکی لە چێشتەنگاودا، هەر کامیان پێش ئەوی تر دەرکەوت، دووەم بە دوایدا پەیدا دەبێت[1].

ئەمەو سەبارەت بەهۆکاری ڕوودانی ئەم دیاردەیە لە ئایەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هیچمان بۆ باس نەکراوە، خوای گەورەش هەر کات ئیرادەی لەسەر شتێك بوو بە (كن فيكون)ێك ئەنجامی دەدات، بەڵام هەر وەك لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆ ئەو ڕووداوە، مامۆستا (هاوڕێ) لە پەرتوکەکەی بەناوی (نیشانەکانی ڕۆژی دوایی) دەڵێت: ماوەیەك لەمەوبەر هەواڵێکم بیست کە گوایە کۆمەڵێکك لە زاناکانی گەردونناسی تەنێکیان لە ئاسماندا بەدی کردووەکە پێ دەچێت ئەستێرەیەکی کلکداربێت و دوای چاودێریو لێکۆڵینەوەی وورد بۆیان دەرکەوتووە کە ڕێڕەوی ڕۆیشتنەکەی بەرەو زەوی دێت، وە دەڵێن: ئەگەر لەسەر ئەو ئاراستە ڕۆشتنەی ئێستای بەردەوام بێت ئەوا بە تەنیشت زەوی تێدەپەڕێت و بە ڕاددەیەکی زۆر ترسناك لە زەوی نزیك دەبێتەوەو دەبێتە هۆی ڕوودانی هەندێك گۆڕانکاریی لەسەر زەوی، یەکێك لە گرنگترینی ئەو گۆڕانکاریانە ئەوەیە کە ئاڕاستەی ڕۆشتنی ئەستێرەکە بە پێچەوانەی ئاراستەی خولاندنەوەی زەویەوەیە، وە لە کاتی نزیك بوونەوەو تێپەڕبوونی بە تەنیشت زەوی، بەهۆی هێزی ڕاکێشانی (جاذبیە)و خێرایی ڕۆشتنەکەیەوە لەوانەیە خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا بۆ ماوەیەکی کەم تا تێدەپەڕێت ڕابگرێت و تەنانەت فەرمیەك یان نیو فەرەش گۆی زەوی بە پێچەوانەوە بخولێنێتەوە کە ئەمەش لە کاتی ڕوودانی دەبێتە هۆی ئەوەی کە خۆر بە پێچەوانەوە لە خۆرئاواوە هەڵبێت، وە دوای تێپەڕبوونی ئەستێرەکە زەوی دەست دەکاتەوە بە خولانەوەی ئاسایی خۆی، ئەو زانایانە پێیان وایە کە ئەو ئەستێرە کلکدارە بۆ دەوروبەری ساڵ (٢٠٢٩)ع دەگاتە زەوی، جا ئەگەر ئەم هەواڵە ڕاست بێت ئەوا لێکدانەوەی زانستیانەی گونجاوە بۆ ئەو دیاردەیە، دوور نیە کە ئەو ئەستێرە کلکدارە هەر

---

(١) الفتح (١١/ ٣٥٣).

هەمان هۆکاری هاتنی ئەو دوکەڵە گەورەیە بێت کە پێشتر باسمان لێوەی کرد، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە پەرتوکە بە نرخەکەی (الصواعق المحرقه)دا دەڵێت: یەکێ لە کەراماتەکانی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) خۆری بۆ گەڕاوەتەوە، ئەمەش کاتێك سەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ڕانی بووە، سروشی بۆ دابەزیوە، پێشەوا عەلی (ﷺ) هێشتا نوێژی ئێوارەی نەکردووەو خۆری سەری نایە سوێو ئاوابوو، کاتێ سروش تەواو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (اللهم إن عليا في طاعتك وطاعة نبيك، فاردد عليه الشمس، فطلعت بعدما غربت)[2].

بۆیە لەسەردەمی موحەممەدی مهدی جارەکی تر خۆر دەگەڕێتەوە؟!

بێگومان لە ئاخر زەمان جارەکی تر زۆر کاری نائاسایی ڕوودەدەنەوە، ئەمەش وەکو موعجیزەیەك بۆ مرۆڤی سەردەم و بۆ گەڕانەوە بەرەو ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ).

کاتێ ڕۆژی دوایی نزیك دەبێتەوە سیستەمی خۆر دەگۆڕێ و کاری نا ئاسایی ڕوودەدات، لەوانەیە بە پێچەوانەوە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

بەو پێیە جارێکی تر زەوی دەوەستێ و تیراسای خۆر وەکو جارانی لێ دێتەوەو خۆر لە خۆرهەڵاتەوە وەکو میلی سەعات دێت و ئاوا دەبێت.

(ئەنومائیل فکیکوسکی) لە کتێبەکەیدا (عالم فی تصادم) دا بڕوای وایە کە سیستەمی خۆری بەرەو ڕووی زۆر تێکچوون بۆتەوە، بڕوای وایە کلکدارەکی گەورە بەر مەریخ دەکەوێ و لە ئاکامدا زوهرەی لێ پاشەکەوت دەبێت، بۆیە زوهرە وەکو میلی سەعات دەخولێتەوە پێچەوانەی هەسارەکانی تر.

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لا ٢٦٤-٢٦٥.

(٢) الصواعق المحرقة، (القاضي) لة (الشفاء) بة (صحيح)ي داناوة.

بەرگی سێیەم

ئەندازیاری نەمساوی (هانز هۆربیگر) لە ساڵی (١٩٢٠)ع ڕایگەیاند کە ڕابردوو زەوی سێ مانگی هەبووە، هەریەکە لەوانە هێزی کێشکردن کاری تێکردوون و بەهێلکەیی خولانەوە، لە دواییدا بەشێوەیەکی لەناوبەر بەریەك کەوتوونی هەموویان لەناوچون.

زانای ئەمریکی پسپۆر لە بینین لە دورەوەدا (ئەدگارکیس) دەڵێ: لێرەدا سێ کارەساتی گەورە زەوی گرتۆتەوەو، بە وردی دیاریان دەکات: بەر لە (١٠) هەزار ساڵ و (٢٨) هەزار و (١٢٥) هەزار بەدوای یەکتردا ڕوویان داوە، لێرەدا کارەساتی تریش هەیە کە هەڕەشە لە زەوی دەکات، لێرە ئاماژە هەیە کە شارستانی مرۆیی لە حیسابی گەردوون ودا کاتیە.

زانایانی گەردونناسی ماوەیەك لەمەوبەر ڕایانگەیاند کە هەسارەی مەریخ خێراییەکەی کەم بۆتەوە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات، تا گەیشتۆتە ئەو بارەی کە لەرەلەر بکات لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە ڕۆژی چوارشەمی (٣٠) یۆلیۆ جولەی هەسارەی مەریخ بۆ ئاراستەی ڕۆژهەڵات وەستا!! دوای ئەوە لە مانگی (اغسطس) و (سیبتمبر) ئاراستەی هەسارەی مەریخ گۆڕاو پێچەوانە بویەوە بەرەو ئاراستەی ڕۆژئاوا، ئەم دیاردەیە سەر سوڕهێنەرە پێی دەگوترێ جووڵەی پێچەوانە (الحركة العكسية Retrograda motion) زانایان دەڵێن : ئەو دیاردەیە لە هەموو هەسارەیەك جارێك ڕوودەدات، بێگومان ئەو دیاردەیە لەسەر هەسارەی زەوی ڕوودەدات!!

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکێ لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی داناوە، بۆیە لەکاتی ئەم دیاردەیە پاڕانەوەی هیچ کەسێك قەبوڵ نابێت، پێغەمبەریش (ﷺ) (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا باسی ئەم دیاردە ترسناکەی کردووە.

ترسناکی ئەم هەواڵە دەرگایەکی بانگەوازی تری واڵاکرد بۆ گەڕانەوەی موسڵمانە بێ ئاگاکان و بێباوەڕان[١].

---

(١) http://www.space.com.

زانایان دەڵێن: زەوی لەسەرەتای دروست بونیدا زۆر بە خێرایی دەسوڕایەوە کە شەوێك دوو سەعات و ڕۆژێکیش دوو سەعات بووەو ساڵێکیش (٢٢٠٠) ڕۆژ بووە، وورده وورده خاوبۆتەوە، تاوەکو ئێستا کە ساڵێك (٣٦٥) ڕۆژە! جا دەڵێن بەردەوامیش خاو دەبێتەوە بە بڕێکی کەم کە لە سەد ساڵدا چرکەیەك کەمترە کە لە ملیۆنەهاو ملیارەها ساڵی تردا دەکاتە بڕێکی زۆر خاوبوونەوە، کە ئەگەر کار وا بڕوات ئەوا ملیارەها ساڵی تر زەوی دەوەستێ و بە پێچەوانەوە دەخولێتەوە، ئەو کاتەش خۆر لە خۆرئاواوە دەبینرێ کە هەڵدێ، کەواتە ئەم نیشانەیەی ڕۆژی دوایی لەعەقڵی زانستیدا قبوڵەو دەگونجێ ببێ! ئەوان ملیارەها ساڵیان بۆ داناوە! ئیسلامیش دەڵێ: هەرکاتێ خوا ویستی دەیهێنێ (لا تأتیکم إلا بغتە) خوای گەورە لە پڕ ڕۆژی دوایی دەهێنێ.. لە فەرمودەشدا لە باسی هاتنی دەجال پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە کردووە کە دەجال (٤٠) ڕۆژ دەمێنێتەوەو ڕۆژێکی بە هێندەی ساڵێکەو ڕۆژێکی بە هێندەی مانگێکەو ڕۆژێکی بە هێندەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریش ئاساییە! ڕەنگە ئەوەش هەر بەهۆی خاوبوونەوەی زەویەوە بێت، زانایان ئەمڕۆ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیانەوە ئەم قسەیەیان قبوڵە.

دووبارە بە پێویستی دەزانم کە چیرۆکی قوتابیەکی دکتۆرا بهێنمەوە، چونکە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە:

موسڵمانان لە بنکەی ئیسلامی لە ( کییف) لە ئۆکرانیا ڕاهاتوون لە سەر ئەوەی کە هەرچەند ڕۆژێك و یەکێك لە ئۆکرانیەکان دێت لە مزگەوتدا موسڵمان دەبێ.. بەڵام ئەمجارە هەروا ئاسایی و سادە نەبووە، گەنجێکی ئۆکرانی کە ناوی (دیمیتری بولیاکوف) ەو قوتابی دکتۆرایە لە بواری فیزیا، هاتە مزگەوت و لە تەنیشت ئیمامەوە دانیشت دوای نوێژ، یەکێ لە لاوە چالاکەکانی مەکتەبی ناساندنی ئیسلامی مەرکەزەکەشی لەگەڵدا بوو، ئیمام هەندێ قسەی کرد وەك پێشەکیەك و پاش ماوەیەکی کەم (دیمیتری) بە دوایدا شایەتمانی هێناو گوتی:

(أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)[1].. بەڵێ .. دیمیتری باسی موسڵمان بوونەکەی بۆ ئامادەبووان کرد، کە لە ڕێی زانستی فیزیاوە موسڵمان بووە.. ناوبراو دەڵێت: لەگەڵ تیمێکی لێکۆڵینەوەی زانستی کاردەکەم لە بواری فیزیای بۆشایی (الفیزیاء الفراغیة)، بەسەر پەرشتی پرۆفیسۆر (نیکۆلای کوسینیکوف)، کە یەکێکە لە گەورە زاناکانی بواری فیزیا، لە لێکۆڵینەوەکەیاندا چەند نمونەیەکیان وەك زەوی دروستکردو تاقیکردنەوەیان لەسەر کرد، تاوەکو دیراسەی بیردۆزی تازەی خولانەوەی زەوی بکەن بەدەوری تەوەرەکەیدا، بیردۆزەکەی پرۆفیسۆر (کوسینیکوف) دادەنریٚ بە تازەترین و بە جورئەترین بیردۆز لە تەفسیری دیاردەی خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا.

تیمەکەی هەستان بە دروستکردنی چەند تۆپێکی تایبەتی وەك زەوی کە ناوەوەی پڕ بوو لە کانزایەکی تواوە، کە لە بوارێکی موگناتیسی تایبەتدا دەخولانەوە..هەروەك زەوی کە بەهۆی بواری موگناتیسی خۆرەوە (کە پەیوەندی هەیە بە چڕی وزەی خۆرەوە) دەخولێتەوە .. کە ئاڕاستەی (قوتبی شیمالی) دەوەستێتە سەر ئەو بوارە.

تێبینی کراوە کە خێرایی قوتبی موگناتیسی زەوی تا ساڵی ١٩٧٠ع بە خێرایی ١٠کم لە ساڵێکدا دەجولاٚ، لەم ساڵانەی دواییدا ئەو خێراییەی گەیشتۆتە ٤٠ کم لە ساڵێکدا .. تەنانەت لە ژێر ئەو بوارە موگناتیسیەدا بەیەکجار لە ساڵی ٢٠٠١ع قوتبی موگناتیسی زەوی ٢٠٠کم خزاوە.. ئەمەش وا دەکات کە لە داهاتوودا هەردوو قوتبە موگناتیسیەکەی زەوی جێگۆڕکیٚ بکەن و بەمەش زەوی بە پێچەوانەوە بخولێتەوە، ئەمەش یانی هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە..

بەڵیٚ.. دیمیتری ئەم تاقیکردنەوانەی بە چاوی خۆی بینی، وە کە زانی پێغەمبەر (ﷺ) باس لە ڕووداوی وا دەکات کە دەفەرمویٚ: هەرکەس پێش هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە تەوبە بکات خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێت.. یان کە دەفەرموێت: لە کۆتایی بونەوەر دەجال دێت و چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، درێژی یەکیٚ لە ڕۆژەکانی ساڵێك دەبێت و ڕۆژێکیشی درێژیەکەی مانگێك دەبێت

---

(١) سەرچاوە/ http://www.arraid.org/index.php?r=1&lang=ar.

و ڕۆژێکیشی درێژیەکەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریشی وەك ڕۆژی ئێستای لێدێتەوە[(١)].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی هاتنی دەجالی کرد بۆ هاوەڵان ئەوانیش پرسیان چەند دەمێنێتەوە؟

فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بەقەدەر ساڵێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر مانگێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر هەفتەیەکەو باقی ڕۆژەکانیشی وەك ڕۆژی ئاساییە، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژەی کە بەقەدەر ساڵێکە هەر نوێژی ڕۆژێکی تێدا بکەین؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر لەسەر ڕۆژی ئاسایی حسابی بۆ بکەن، واتە: (هەر بیست و چوار سەعات پێنج فەرز نوێژی تێدا بکەن)، دیارە ئەمەش پەیوەندی بە خاوبونەوەی زەوی یەوە هەیە، چونکە زانایان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە بۆیان دەرکەوت کە زەوی لە سەرەتاوە ئەوەندە خێرا سوڕاوەتەوە کە شەو و ڕۆژێك چوار سەعات بووە هەتا وردە وردە خاوبۆتەوە بە ملیار ساڵ تا گەیشتۆتە ئێستا کە شەو و ڕۆژێك بیست و چوار سەعاتەو بەردەوامیش لە خاوبوونەوەدایە، هەر چەند بڕەکەی زۆر کەمە ساڵانە، ئەگەر لە چوار سەعاتەوە بوویێت بە بیست و چوار سەعات ئاساییە کە ببێ بە حەوت بیست و چواری و ببێ بە سی بیست و چواری و ببێ بە سێ سەدو شەست و پێنج بیست و چواری، ئینجا بە پێچەوانەشەوە بخولێتەوەو خۆر لە خۆر ئاواوە ببینین کە هەڵدێت، بەڵام کەی و چۆن؟؟ ئەوە خوا دەزانێت ..

ئەمانە وای کرد کە دیمیتری بێتە بنکەی ئیسلامی کییف و لە مزگەوتەکەیدا لە ئۆکرانیا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیەنێت.. ئێستاش کە بەردەوام دەبێت لە سەر ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەی، بە گوڕوتین و بیروبۆچونێکی ترەوە کاردەکات، کە گوڕو تینی زانایەکی فیزیایی خواناسی موسڵمانە کە لە کارەکانیدا دەسەڵاتی خوای پەروەردگاری باڵادەست دەبینێت[(٢)].

---

(١) سەرچاوە/ lang=ar&http://www.arraid.org/index.php?r=1.

(٢) سەرچاوە/ lang=ar&http://www.arraid.org/index.php?r=1.

ڕەنگە چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەم ڕاستیە بەلای زۆرێك لە خەڵکیەوە سەیر بوبێت و جێی گومان و پرسیار بووبیّ، بەڵام ئەمڕۆ زانستی سەردەم بە دونیای ڕاگەیاند.

بەڵیّ .. هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە کە لەسەر زەوی ئاوا دەبینرێت ڕاستییەکی زانستیەو عەقڵی زانستی سەردەم دانی پیا دەنێت و تەصدیقی دەکات.. ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە چواردە سەدە لەمەوبەر باسی کردووە.

لە مەوقیعی (شیخ سعید عبدالعظیم ) و (www.space.com)دا هاتووە کە دەڵێت: زانایانی فەلەك دەڵێن کە ئەستێرەی مەریخ وردە وردە خێرایی کەم بۆتەوە بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات، تا گەیشتە پلەیەك کە لە ڕۆژی ٣٠ یۆلیۆ وەستا لە جووڵە بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات و لە مانگی ئوغسطس و سێپتەمبەردا بە پێچەوانەوە کەوتەوە جووڵە بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا.. ئەمەش بووە هۆی هەڵهاتنی خۆر لە سەر مەریخ لە خۆرئاواوە، ئەم دیاردە سەیرەش پێی دەڵێن جووڵەی پێچەوانە.. زانایان دەڵێن: هەموو ئەستێرەکان و زەویش ئاوایان لیّ دیّ..

بەڵیّ.. ژیان لەسەر ئەم ڕووی زەویە فرسەتە، تەمەن فرسەتە، بۆ کارو کردەوەی چاکە، بە ڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاکی فەرمووە کە دەفەرموێت: فرسەت بێنن لە پێنج شت: گەنجی پێش پیری، دەوڵەمەندی پێش هەژاری، لەش ساغی پێش نەخۆشی، ژیان پێش مردن ، دەست بەتاڵی پێش سەرقاڵی.

تەنانەت ماوەیەك پێش ئێستا هەواڵێك سەرانسەری میدیا جیهانیەکانی گرتەوەو لە بناغەدا بۆ هەواڵێکی ئاژانسی ئەمریکی (ناسا) دەگەڕێتەوە، یەکێك لە ڕۆژنامە زانستیە ئەمریکیەکان هەواڵەکەی بڵاوکردەوە گوایە بە پێی یەکێك لە تلیسکۆبەکانی سەر ئاژانسی (ناسا) هەسارەیەکی دیکە دەرکەوتووە قەبارەکەی هاوتای خۆرەو ناوی (نیبرۆ)یە بۆ یەکەمجار لە (٣٠) ی دیسەمبەری (١٩٨٣)ع دەرکەوت و لە دوای لێکۆڵینەوە ئاشکرابووە کە هێزێکی موگناتیسی زۆری هەیە کە نزیکی هێزی موگناتیسی خۆرەو ئەگەر لە خولگەی زەوی نزیك بێتەوە مەترسی و کارەساتی گەورە بۆ زەوی دروست

دەکات، هێزی موگناتیسی ئەو هەسارەیە جەمسەری زەوی پێچەوانە دەکاتەوە، واتە: جەمسەری موگناتیسی باکوری زەوی کە دەکەوێتە باشوری گۆی زەوی، دەبێتە جەمسەری موگناتیسی باشورو بەپێچەوانەشەوە، بەمشێوەیە زەوی لە خولانەوەکەی خۆی بەردەوام دەبێت بەڵام بە پێچەوانەی ئاراستەی سوڕانەوەی ئێستای تا ئەو هەسارەیە لە زەوی دوور دەکەوێتەوەو خولی سووڕانەوەی بەدەوری خۆر تەواو دەکات کە (٤١٠٠) ساڵ دەخایەنێت و بەر لە ئێستاش واتە: ٤١٠٠ ساڵ لەمەوبەر خولێکی تەواو کردووە.

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: لە دوای هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە خەڵکی ١٢٠ ساڵ دەمێننەوە لەسەر زەوی[١].. بە بەڵگەی فەرموودەی پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا تقوم الساعة حتى يلتقي الشيخان الكبيران فيقول أحدهما لصاحبه: متى ولدت؟ فيقول زمن طلعت الشمس من مغربها)[٢].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا دوو کەسی گەورەو بە تەمەن بە یەکتری دەگەن، یەکیان بە ئەوەکەی تر دەڵێت: لە چ کاتێك لە دایك بوویت؟ ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: سەردەمی هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە..

پێشەوا ئەبی عالیە (ﷺ) دەڵێت: ئەم نیشانانە هەمووی لە ماوەی شەش مانگدا دێنە دی[٣].

---

(١) رواه ابن ابي شيبة ، برقم: (٣٧٥٩٥).

(٢) موسوعة أطراف الحديث النبوي الشريف(٧/ ٢٠١)، برقم: (١٧٨٧) .

(٣) رواه ابن ابي شيبة، برقم: (٣٧٦١١).

# دەرچـوونی ( الدابــة )

لە نیشانە گەورەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی بونەوەر، دەرچوونی گیاندارێكە پێی دەڵێن: (دابە).

وشەی (دابە) لە زمانی عەرەبیدا بە هەموو گیاندارێك دەوترێت كە بەسەر زەویدا بڕوات و تەپەی پێیان دەنگی ڕۆشتنەكەی ببیسترێت.

بەڵام ئەو (دابە)یەی كە لە كۆتایی بونەوەر دەردەچێت و خوای گەورە كردویەتی بە یەكێك لە نیشانە گەورەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی گیاندارێكی تایبەتە و جیاوازە لە گیاندارەكانی تری سەر زەوی، ئەویش بەوەی كە ئەم گیاندارە قسە لەگەڵ خەڵكیدا دەكات و كافرو موسڵمانیش لە ڕێی نیشانە كردنەوە لە یەكتر جیا دەكاتەوە، هەروەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: [ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ ][١].

واتە: هەر كاتێك خەڵكی شیاوی ئەوە بوون كە بەڵێن و سزای خوایان بەسەردا جێ بەجێ بێت، گیاندارێكیان بۆ لە زەوی دەهێنینە دەرەوە، قسەیان لەگەڵ دەكات چونكە بەڕاستی ئەو خەڵكە باوەڕ ناهێنن بە بەڵگەو نیشانەكانی خوای گەورە.

ئەو ژیانلەبەرە قسە لەگەڵ خەڵكی دەكات بە هەموو زمانێك، خوای گەورە دەفەرمویٚ: {تُكَلِّمُهُمْ} واتە: قسەیان لەگەڵدا دەكات، دەشڵێن: برینداریان دەكات، لەسەر خوێندنەوەی (سەعیدی كوڕی جوبەیرو عاصم الجحدری و ئەبو رجاء العطاردي) پێیان دەڵیٚ: بەڕاستی زۆربەی ئەو خەڵكە باوەڕیان بە ئایەتەكانی خوا ناهێنن و سەرزەنشتیان دەكات، ئەوەندە قسە لەگەڵ خەڵك

---

(١) سورة النمل، الآية: (٨٢).

دەکات هەتا بێزارو بێتاقەتیان دەکات، هەتا وای لێدێ دەڵێن: وەختێ کە یەکێك مامەڵەی شتێك دەکات حوشترێکی پێیبە دەڵێ: کاکە ئەوەت لە کێت کڕیوە؟ دەڵێ: لەلوت بە مۆرەکەم کڕیوە! ئەو گیاندارە گیانداری زەویە کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی لەکاتی چێشتنگاودا پەیدا دەبێ.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت کە ئەو گیاندارە بە پێچەوانەی هەموو گیاندارەکانی تری سەر زەویەوە توانای قسەو گفتوگۆی هەیە لەگەڵ مرۆڤدا، وە هاتنی ئایەتەکەش لە سوڕەتی (النمل)دا خۆی بۆخۆی دوو پات کردنەوەی ئەو ڕاستیەیە چونکە لەو سوڕەتەدا باس لە قسە کردنی مێروولەو پەپو سولەیمان دەکات، وە هەر لە ئایەتە پیرۆزەکەشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو گیاندارە کاتێك دەردەچێت کە خەڵکی تێهەڵکێشی فەسادو خراپەکاری دەبن و پشت لە فەرمانەکانی خوای گەورە هەڵدەکەن و لە ڕێبازی هەق لا دەدەن و گومڕاو سەر لێ شێواو دەبن بە شێوازێك کە بانگەواز و ئامۆژگاری کردنیان هیچ سودێکی نابێت، لەو کاتەدا ئەو گیاندارە وەکو نیشانەو بەڵگەیەك دێتە ناو خەڵکی و گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات، ئەم ڕووداوەش هاوکات دەبێت لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ ضُحًى فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالْأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا ..)[1].

واتە: یەکەمی نیشانەکان هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوەو دەرچونی (دابە) یە لە چێشتەنگاودا بۆ سەر خەڵکی، وە هەر کامێك لەم دوو نیشانەیە لە پێش ئەوی تریاندا ڕوویدا ئەوا ئەوی تریان بە زوویی بە دوایدا دێت.

جا سەبارەت بە شێوازو ڕوخساری ئەو گیاندارەش زاناکان لە نێوان خۆیاندا بیرو ڕای جیاوازیان هەیە و قسەی زۆریان لەسەر کردووە، بەڵام هیچ کامیان

---

(١) المستدرك (٤/ ٥٤٧) برقم: (٨٦٤٣). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

بەرگی سێیەم

بەڵگەی ڕاست و متمانەداریان پیٚ نیە لە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆیە ئێمەش خۆمانی لیٚ لادەدەین و باسیان ناکەین.

پێشەوایان ماوەردی و ثعلبی (ڕەحمەتی خوایان لیٚ بێت) شتی سەیریان دەربارەی چۆنیەتی باسکردووە، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، وەکو ئەوەی دەڵێن سەری سەری گایەو گوێی گوێی فیلەو... هتد.

بەڵام ئەوەی دەیزانین دەربارەی:

- ئاژەڵێکی ڕاستەقینەیە.
- لەگەڵ خەڵکی قسە دەکات.
- لە زەویەوە دەردەچێت.

## ڕاستی ئەو ئاژەڵە چیە؟

پێشەوا ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (تَخْرُجُ الدَّابَّةُ فَتَسِمُ النَّاسَ عَلَى خَرَاطِيمِهِمْ، ثُمَّ يَغْمُرُونَ فِيكُمْ حَتَّى يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الْبَعِيرَ فَيَقُولُ: مِمَّنْ اشْتَرَيْتَهُ؟ فَيَقُولُ: اشْتَرَيْتُهُ مِنْ أَحَدِ الْمُخَطَّمِينَ)[١].

واتە: (دابة) دەدەچێت نیشانە لە لوتی خەڵکی دەدات و دەیسمێت، پاشان ژمارەی لووت سمراوەکان زۆر دەبن لەناوتاندا تا وای لیٚ دێت پیاو بارگیرێك دەکرێت، پێی دەڵێن لە کێت کڕیوە؟ ئەویش دەڵێت: لە یەکێك لە لوت سمراوەکان.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (تَخْرُجُ الدَّابةُ ومعها عصا موسى عليه السلام وخاتَمُ سليمان عليه السلام فتختمُ الكافرَ بالخاتَمِ وتجلوا وجهَ المؤمنِ بالعصا حتَّى إنَّ أهل الخِوانِ لَيَجْتَمِعونَ على خِوانِهِمْ فيقولُ هذا يا مؤمنُ ويقولُ هذا يا كافر)[٢].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٣٦/ ٦٤٧) برقم: (٢٢٣٠٩). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٢) صحيح: رواه الإمام أحمد في مسنده، (١٥/٧٩-٨٢) (٧٩٢٤) تحقيق: أحمد شاكر وقال (إسناده صحيح). والحاكم في المستدرك (٤/ ٤٨٥).

واتە: دابە دەردەچێت دارەکەی پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) و ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر سلیمان (سەلامی خوای لیّ بێت) پێیەتی، سەری لوتی کافر بە ئەنگوستیلەکە دەسمێت و، دەم و چاوی ئیمانداریش بە دارەکە ڕوون و گەشاوە دەکات، هەتا وای لیّ دێت خەڵکی سەر سفرەیەك لەسەر سفرەکەیان کۆدەبنەوە ئەویان دەڵێت: ئەی ئیماندار و ئەویشیان بەوەی تر دەڵێت ئەی کافر.

خەڵکی سەردەمانێك لەسەر ئەو دۆخە دەمێننەوە، تەنانەت خەڵکی بانگی یەکتر دەکەن، ئەی باوەڕدار ئەی بێباوەڕ.. تا ئەو کاتەی خوای گەورە دەیەوێت کۆتایی بونەوەر هەڵسێت.

هەروەها وتراوە:

- پیاوێکە مشتومڕ لەگەڵ خەڵکی دەکات.. ئەم بۆچوونەش پوچەڵە.
- یان وشترەکەی صالح پێغەمبەرە (سەلامی خوای لیّ بێت).
- یان لە شیر بڕاوەی (بەچکەی) وشترەکەی صاڵحە (سەلامی خوای لیّ بێت) کە ئەمەش ڕای پەسندە لای پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ)[1]. بە بەڵگەی فەرموودەیەك کە پێشەوا ئەبو داوودی طەیالیسی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە لە پێشەوا حوزەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیففاری (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی ئەو (دابە)یە فەرموویەتی: (لم يرعهم إلا وهي ترغو بين الركن والمقام..)[2]. ئەگەر سەرنج بدەینە وشەی (ترغو) ئەوە بە واتای: حوشتر یان بەچکە حوشتر دێت[3].

هەر چەندە ئەگەر هەندێك لە زانایانی فەرموودە ناس ئەم فەرمودەیان بە مەتروك دانابێت، بەڵام پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) ئەو ڕایە

---

(١) تفسير جامع لأحكام القرآن، للقرطبي، (١٣/ ٢٣٥).

(٢) رواه الطياليسي في (مسنده) (لا ١٤٤)، برقم: (١٠٦٩).

(٣) الدار الآخرة، لا ٣٤٨ .

پەسند دەکات، چونکە لە فەرموودەی پێشەوا حاکم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وشەی (تدنو وتربو)[١] هاتووە لە جیاتی (ترغو).

• یان هەندێکی تر دەڵێن: ئەو ژیانلەبەرە جەساسەیە، هەروەکو لە فەرموودەی پێشەوا تەمیمی داری (ﷺ) باسمان لێوەی کرد.. ئەو وتەیەش پاڵ دەدرێتە لای پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمڕی کوری عاص (ﷺ)[٢].. هەر چەندە ئەم وتەیە بێهێزە.. چونکە جەساسەو داببە دوو شتی لە یەکتری جیاوازن.

• یان ئەو داببەیە مرۆڤێکە موناقەشە لەگەڵ ئەهلی بیدەع و بێبڕواکان دەکات هەتا هیچ دەلیلێکیان پێ نامێنێت[٣].

• یان داببە ئیسمی جنسە، هەر شتێك لەسەر زەوی بڕوات پێی دەوترێ: داببە، مەرج نییە مرۆڤ یان ژیان لەبەر بێت، بەڵکو لەوانەیە ڤایرۆسێکی مەترسیدار بێت بۆ سەر مرۆڤ.. تووشی برینی بکات و پاشان بیکوژێت، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریەك بێت بۆ مرۆڤی عاقڵ و زیندوو، ئەمەش ڕەئی ئەبو عبیەیە لەسەر کتێبی (النهاية في الفتن)ی ئیبنو کەثیر..

بەڵام ڕەئی ئەبو عبیە دوورە لە ڕاستیەوە، لەبەر چەند هۆکارێك:

**یەکەم:** ڤایرۆس و میکرۆب لە دێر زەمانەوە بوونی هەبووە، وە داببەش نیشانەیەکی گەورەیەو هێشتا سەری هەڵنەداوە.

**دووەم:** ڤایرۆس و میکرۆب بە چاو نابینرێن، بەڵام داببە بە چاو دەبینرێت، هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە کە دار عەصای پێغەمبەر موسای پێیە لەگەڵ ئەنگوستیلەی پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوایان لەسەر بێت)[٤].

---

(١) رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٣٠) وقال: حديث صحيح الإسناد.

(٢) شرح النووي لمسلم (١٨/ ٢٨).

(٣) تفسير جامع لأحكام القرآن (١٣/ ٢٣٦).

(٤) الدار الآخرة، لا ٣٥٠ .

**سێیەم:** ئەو دابەیە دەم و چاوی ئەهلی ئیمان و کوفر دیاری دەکات بەڵام ڤایرۆس میکرۆب وانییە..

**چوارەم:** ئەو داببەیە کۆمەڵێك سیفاتی تیایە کە زۆر ڕاشکاوانە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، بەڵام ئەو ڤایرۆس و میکرۆبە هیچ سیفاتی تیا نییە[1].

ئەوەی لەسەر ئێمە واجبە ئەوەیە کە باوەڕمان پێی هەبێت کە خوای پەروەردگار لە کۆتایی بوونەوەر دەریدەخات لە ژێر زەویدا و قسە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات کە ئایەتەکانی خوای گەورە بە درۆ دەخەنەوە کە شایەنی سزای خوای پەروەردگارن..

شێخ ئەحمەد شاکر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: ئایەتە قورئانیەکە زۆر ڕاشکاوانە باسی دابە دەکات، بۆیە پێویست بە تەئویل کردن ناکات[2].. چونکە چەندین فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەن سەبارەت بە دەرچوونی دابە.. بۆیە شورەییە مرۆڤ ئایەتی قورئانی و فەرموودەی هەبێت ڕەتی بکاتەوە... بەداخەوە..

## لە کویٚ پەیدا دەبێت و دەردەچێت ؟

ئەمەو سەبارەت بە دەرچوونی ئەو (دابە)یە، پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (تخْرُجُ الدَّابةُ منْ أعظم المساجد فبينما هُم كذلك إذ رنَّتِ الأرض، فبينما هُمْ كذلك إذ تصدَّعت)[3].

واتە: (دابە) لە گەورەترینی مزگەوتەکانەوە دەردەچێت (مەبەستی مسجد الحرام)ە، خەڵکەکە هەر ئەوەندە دەزانن کە زەوی دەلەرێتەوە، پاشان هەر ئەوەندە دەزانن کە زەویەکە رزی تیٚ دەبێت و شەق دەبێت.

---

(١) الدار الآخرة، لا ٣٥٠ .

(٢) مسند الإمام أحمد شرح الشيخ أحمد شاكر (١٥/ ٨٢).

(٣) رواه الطبراني في (المعجم الأوسط) وقال الهيثمي رجاله ثقات (٨/ ٨).

لەم فەرمودانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە (دابە) گیاندارێکی تایبەتە وەکو مرۆڤ عەقڵی هەیەو توانای قسەو گفتوگۆی هەیە و لە ئاخر زەماندا هاوکات لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە لە مزگەوتی (بیت الحرام)ەوە دەردەچێت و لە ڕێگەی نیشانە کردنەوە کافرو ئیماندار لێك جیادەکاتەوە، ئەمەش کاتێك دەبێت کە دەرگای تەوبە داخراوەو تەوبە لە کەس وەرناگیرێت و خوای گەورە دەیکاتە بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرا بۆ کۆتایی هاتنی تەمەنی زەوی.

هەروەها دەڵێن:

- لە مەککەی موککەڕەمە دەردەچێت[1]، کە ئەمە وتەی بەهێزە.
- لە کێوی سەفا یان مەڕوە.
- لە ژێر کەعبەوە.
- لە دەشتێکی بیابانەوە.
- لە شاری قەومی لوط[2].
- لە چیایەکانی توهامەی دەرەوەی مەککە[3].
- لە خاکی جیاد دەردەچێت[4].
- دەرچوونی لە حەرەمی مەککەیە[5].
- سێ جار دەردەچێت و ون دەبێت، جاری یەکەم لە هەندێك بیابانی حیجاز دەردەچێت و پاشان ون دەبێت، بۆ جاری دووەم لە هەندێك گوندنشینەکانەوە بەدیار دەکەوێتەوەو پاشان ون دەبێت، بۆ جاری سێیەم: لە مزگەوتی حەڕام بە یەکجاری دەردەکەوێت[6].

---

(١) رواه الطبراني في (الكبير) (٣/ ١٧٣)، برقم: (٣٠٢٥).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة لا ٣٠٤.

(٣) الإذاعة، لا ١٧٥.

(٤) عقد الدرر في أخبار المنتظر، لا ٢١٥.

(٥) أشراط الساعة، لا ٣٢٣ .

(٦) الدار الآخرة، لا ٣٥٢ .

بەڵام دوای گەڕانێکی زۆرو توێژینەوەیەکی چڕوپڕ گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی لە کێوی سەفا دەردەچێت.. خوای گەورەش زاناترە.

لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ کۆمەڵە کەسێکی نەخوێندەوار پەیدابوونەو دەڵێن: داببە بوونی نیەو هەڵدەستن تەئویلاتی جۆراو جۆری بۆ دەکەن، ئەوە چیە لەگەڵ عەقڵە بچوکەکەیان تێك ناکاتەوە... خوای گەورە لەو جۆرە کەسانە پەنامان بدات.

ئەو زانایانەی زۆر جەخت لەسەر ئەو داببەیە دەکەن و ئاماژەیان پێکردووە لە پەرتوکەکانیان، ئەوانەن:

- پێشەوا ئیبنو کەسیر لە هەردوو پەرتوکی (النهاية في الفتن والملاحم) و (تفسير القرآن الكريم).
- پێشەوا قورتوبی لە هەردوو پەرتوکی (التذكرة) و (الجامع لأحكام القرآن).
- پێشەوا ئالوسی لە تەفسیری (الآلوسي).
- پێشەوا ئەبو عەمری دانی لە (سونەنەکەی).
- پێشەوا ئیبنو قوتەیبە لە پەرتوکی (عيون الأخبار).
- پێشەوا قنوجی لە پەرتوکی (الإذاعة لما كان وما يكون بين يدي الساعة).
- پێشەوا بەرزنجی لە پەرتوکی (الإشاعة لأشراط الساعة).
- پێشەوا حاکم لە پەرتوکی (المستدرك).
- پێشەوا ئیبنو ماجە لە پەرتوکی (سونەنەکەی).

# دارِنینی ئیسلام و هەڵگیرانی قورئان

پاش ئەوەی ئایینی ئیسلام لەسەردەمی موحەممەدی مەهدی و عیسای کوری مەریەم (سەلامی خوایان لێ بێت) زیندوو دەبێتەوەو دەسەڵات بەسەر تەواوی جیهاندا دەچەسپێت و دادپەروەریو ئارامی و کامەرانی باڵ بەسەر خەڵکیدا دەکشێت و تا ماوەیەکی باش ئەم خۆشیە بەردەوام دەبێت، بەڵام پاش ئەوە سەر لە نوێ ئیسلامەتی و دینداری بەرەو کزبوون و لاوازبوون دەروات و بێ باوەڕی و خراپەکاریی سەر لە نوێ لە دڵەکاندا چەکەرە دەکات و خەڵکی بەرەو گومڕایی دەڕۆن، تا وای لێ دێت موسڵمان و ئیسلامەتی غەریب دەبێتەوە، پاش ئەو بڵاوبونەوەیە مەزنی ئیسلام کە هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەگرێ، دووبارە ئیسلام لاواز دەبێتەوەو تۆوی شەڕو خراپە چەکەرە دەکاو، ئەم دینە مەزنەو قورئانی پیرۆز هەڵدەگیرێن و زانست نامێنێ و خودا گیانی هەموو ئەو کەسانە دەکێشێ کە برە بڕوایەکیان لەناخدا ماوە، پاش ئەوە بێجگە لە خەڵکانی خراپەکار کەس نامێنێ و ڕۆژی دوایی لەسەر ئەوان هەڵدەستێ، پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَدَقَةٌ وَلَا نُسُكٌ، وَيُسَرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى فِي لَيْلَةٍ فَلَا يُتْرَكُ فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ فِيهِمُ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْعَجُوزُ الْكَبِيرَةُ، يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا..)[1].

واتە: ئیسلام دەپوکێتەوە وەکوو چۆن نەخشی جل و بەرگ کاڵ دەبێتەوەو دەپوکێتەوە هەتا وای لێ دێت نازانرێت ڕۆژو چیەو قوربانی چیەو پارە بەخشین چیە، لە شەوێکدا شەو ڕۆیی بە کتێبەکەی خوا (قورئان) دەکرێت، ئیتر تەنها

---

(١) أخرجه الحاكم في (المستدرك على الصحيحين) (٤/ ٥٢٠) برقم: (٨٤٦٠) وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

یەك ئایەتی ئەو قورئانە لەسەر زەوی نامێنێت، وە کۆمەڵێك لە خەڵك دەمێننەوە، پیرەمێردی گەورەو بە تەمەن دەڵێن: باو و باپیرانمان کە پێیان گەیشتوین لەسەر (لا إله إلا الله) بوون، ئێمەش وەکوو ئەوان دەیڵێینەوە.

ئەو پاشماوەیەش کە لەواژەی یەکخواناسی بترازێ چیتر لە ئیسلام نازانن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ)[1].

واتە: قیامەت تەنیا لەسەر خراپترینی خەڵکی هەڵدەستێ.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری مەسعود (رضي الله عنه) دەڵێت: (وَلَيُنْتَزَعَنَّ الْقُرْآنُ مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِكُمْ.. يُسْرَى عَلَى الْقُرْآنِ لَيْلًا فَيُذْهَبُ بِهِ مِنْ أَجْوَافِ الرِّجَالِ فَلَا يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ شَيْءٌ)[2].

واتە: بەڕاستی کاتێك دێت قورئانتان لەناودا هەڵدەگیرێت و شەورۆیی پێ دەکرێت، ئیتر لەناو پیاواندا نامێنێت، وە لەسەر زەوی هیچ شتێك لە قورئان نامێنێت.

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە کۆتایی دونیا شەوێك دێت بەسەر قورئان و ئەوەی کە لەبەر کراوە کە هیچ وشەیەك لە نێو سینەکان و قورئان نامێنێ[3].

بەڵێ... لە شەوێکدا خوای گەورە قورئانی پیرۆز هەڵدەکێشێتەوە بۆ ئاسمان، ئەو لاپەڕانەی قورئانیان تێدا نووسرابوو سپی دەبن و ئەو دڵانەش قورئانیان تێدابوو لێی دەسڕێتەوە، بەجۆرێك وەکو لە فەرموودەکەدا هاتووە تەنها یەك ئایەتیشی لەسەر زەوی نامێنێت و خەڵکی هیچ کام لە دروشمەکانی ئیسلامەتیان لا نامێنێت و بە ساڵاچووەکانیش بە دەگمەن ئەو (لا إله إلا الله)یەیان لە بیر دەمێنێت کە لە باب و باپیرانیانەوە بیستووە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/٢٢٦٨) كتاب الفتن، باب قرب الساعة، برقم: (٢٩٤٩).

(٢) المعجم الكبير (٩/ ١٤١) برقم: (٨٧٠٠).

(٣) مجموع الفتاوى، (٣/ ١٩٨ ــ ١٩٩).

بەرگی سێیەم

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ : اللَّهُ اللَّهُ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی هەڵناسێت هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەویدا ناگوترێت (الله الله).

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: لە واتای ئەم فەرموودەدا دوو شەرحی هەیە:

**یەکەم:** واتای وایە کەسیٚ نیە قەدەغە لە خراپە بکات، وە کەسیٚ ناترسێنیٚ کاتیٚ دەبینیٚ بۆ خراپەکاری دەچیٚ و خەریکیەتی کە بەوە پێناسەی کردووە کە دەڵیٚ تاکو ناگوتریٚ (الله الله).

**دووەم:** ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنیٚ کەوا زەوی وای لیٚدیٚ کە یادی خوای لیٚ نایەت و ناوی خوا نازانێت کە ئەوەش لەکاتی خراپی زەمان و لاچوون و خراپ بوونی مرۆڤ ڕوودەدات بەهۆی زۆربوونی بێبڕوایی و تاوانکاری و سەرکێشی[2].

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەڵێت: (إن الله تعالى يرفع القرآن من صدور الرجال..)[3].

واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو قورئانە هەڵدەگرێت لە سینەی مۆڤەکان و پیاوەکان.

لەو سەردەم بێبڕواکان نە ژن و ژن خوازی دەزانن ئەنجام بدەن، نە منالٚیشیان لە ڕێگای هاوسەرگیریەوە دەبێت، بۆیە ئەوانە دەبنە ژیانلەبەر لە وێنەی مرۆڤ.

---

(١) صحيح مسلم (١/ ٩١) كتاب الإيمان، باب: ذهاب الإيمان آخر الزمان، برقم: (٣٩٢).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم، تحقيق: دكتور طه زيني (١/ ١٨٦).

(٣) صحيح: رواه الأزرقي، برقم: (٤٧٤) وهذا سند قوي إذا توبع أو كان له شواهد، فالحديث حسن.

بەرگی سێیەم

## کاولکردنی
## شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

ئەم نیشانەیە یەکێکی ترە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەرو تەواوکەرە بۆ هەواڵی چۆڵبوونی لە نیشتەجێبووانی.

مەدینە ئاوەدان کرایەوەو گەشەی کرد لە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی بۆ کرد، ساڵ دوای ساڵیش دانیشتوانی لە زیادبووندا بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێ ڕاگەیاندووین کە یەکێك لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر ڕازی نەبوونی خەڵکە بە نیشتەجێ بوونی ئەو شارە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر هاندەر بووە لەسەر نیشتەجێ بوون لە مەدینەدا، وە هەواڵی داوە کەوا هەر کەسێك کە لەم شارەدا بە ویستی خۆی دەربچێ، ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر جێگیر دەکاتەوە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إِلَّا أَخْلَفَ اللهُ فِيهَا خَيْرًا مِنْهُ، أَلَا إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ، تُخْرِجُ الْخَبِيثَ، لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ) [1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵكی كە پیاو بانگی كوڕە مامی دەكات وە نزیكانی كە وەرن بۆ خۆشگوزەرانی بچینە شاری مەدینە، بەڵام مەدینە زۆر بۆیان چاكترە ئەگەر بزانن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ كەسێك نیە كە بە ئارەزووی خۆی لێی دەرچێت ئیلا خوای گەورە لەو چاكتر

---

(١) صحيح مسلم (٢/ ١٠٠٥) كتاب: الحج، باب: المدينة تنفي شرارها، برقم: (١٣٨١).

دەکات بە جێنشین تیایدا، ئاگادارین کەوا مەدینە وەکو ئاسنی دەست ئاسن گەرە پیسایەتی دەردەکات لە خۆی، وە کۆتایی بونەوەر نایەت تاکو شاری مەدینە پیاو خراپەکانی لە خۆی دەردەخات، هەروەك کە ئاسنی ئاگراوی دەست ئاسنگەر پیسی ئاسن لا دەبات.

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە واتای ئەم فەرموودەیە دەڵێت: مەدینە مرۆڤە پیسەکان لە خۆی دوور دەخاتەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر ئەوەی ناتوانێ ئارام بگرێ لەسەر کۆچکردن و مانەوە لە مەدینەدا تەنیا ئەو کەسە نەبێت کە بڕواکەی پتەوە، بەڵام دووڕووەکان نەزانەکانی عەرەب ئارام ناگرن لەسەر ناخۆشیەکاندا لە مەدینە، وە دڵ ئارام نین بەو پاداشتەی کە لەم ناخۆشیەدا بۆیان هەیە.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەمە لەسەردەمی دەجالە، وە قسەکەی (قازی عیاز) بە دوور زانیووە، وە باس دەکات کە لەوانەیە ئەمە لە چەند کاتێکی جیاوازدا ڕوویدات[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەوانەیە مەبەستی هەردووکات بێت:

کات و سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەڵگەی چیرۆکی دەشتەکیەکە، هەروەك هاتووە لە صەحیحی بوخاری لە جابرەوە کە دەڵێت: دەشتەکیەك هاتە لای پێغەمبەرو(ﷺ) بەیعەتی پێدا لەسەر ئیسلام، وە بەیانی هاتەوە تای لێ بوو، گوتی: ڕێگەم پێبدە دەگەڕێمەوە سێ جار، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی نەبوو، بەڵام لە جاری سێیەم ڕێگەی پێداو فەرمووی: شاری مەدینە وەکو ئاسنی دەستی ئاسنگەر وایە پیسایەتی لە ئاسن لا دەبات وە پاکەکەی لە خۆ دەگرێ[2].

---

(١) صحيح مسلم (٩/ ١٥٤) مع شرح النووي.

(٢) صحيح البخاري (٤/ ٩٦) مع الفتح.

کاتی دووەم: سەردەمی دەجالە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی دەجالی کرد لە پاشان فەرمووی: شاری مەدینە خۆی داتەکێنێ و خەڵکەکەی سێ جار لە بێژنگ دەدات جا خوای گەورە ئەوەی کافرو دوو ڕووە لێی دەردەکات.

بەڵام لە نێوان ئەم دووکاتەدا نەخێر، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە گەورە هاوەڵان دەرچوون لە مەدینەدا لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو پێشەوایان موعاذی کوری جەبەل و ئەبو عوبەیدەو ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) جگە لەوانیش دەرچوون تیایدا[1].

پێشەوا جابری کوری عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) پێی وتم گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە دەیفەرموو: (لَيَسرنَّ الراكبُ بِجَنَباتِ المدينةِ ثُمَّ لَيَقولَنَّ لقد كان في هذا حاضرُ من المسلمين كثير)[2].

واتە: وای لێ دێت وڵاخ سوار بە تەنیشت مەدینەدا تێ دەپەڕێت، پاشان دەڵێت: کاتی خۆی ئالێرەدا موسڵمانان شارو ئاوەدانیەکی زۆریان هەبووە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: لە پێغەمبەری خودام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لَا يَغْشَاهَا إِلَّا الْعَوَافِي - يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ - ثُمَّ يَخْرُجُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ، يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا، فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا)[3].

واتە: شاری مەدینە بەجێ دەهێڵن لە خۆشترین و باشترین حاڵیدا، تەنها گیاندار و باڵندە نەبێت تێی ناچێت، وە کۆتا کەسیش کە حەشر دەکرێن و هەڵدێن دوو شوانن لە خێڵی (مزینە) بەرەو مەدینە دەچن، هاوار لە مەڕ و ماڵاتەکەیان دەکەن، کە دەبینن شارەکە چۆڵە، هەتا کاتێك کە دەگەنە (ثنية الوداع) ئەوانیش بەدەمدا دەکەون.

---

(١) فتح الباري (٤/ ٨٨).

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (١٢٤/١) رقم الحديث: (١٢٤) قال: أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

(٣) صحيح مسلم (٢/ ١٠١٠) باب: في المدينة حين يتركها، برقم: (١٣٨٩).

به واتایەکی تر: خەڵکی واز له مەدینه دەهێنن و لێی دەردەچن سەرەڕای ئەوەی مەدینه گونجاوه بۆ نیشتەجیَ بوون، چونکه بەروبومی چاکەو گوزەرانی خۆشه بەڵام ئەوەنده ئاژاوەو سەختی پەیدا دەبێت که خەڵکی بەجێی بهێڵن و بچنه شوێنەکانی تر، تاکو له دوایيدا کەسی تیادا نامێنێتەوه، بەڵکو دەبێته کۆمەڵێك ماڵ و ڕێگەویان و مزگەوتی چۆڵ و سامناك، باڵندەو دڕندەش دەگەڕێن بەناو شارەکەداو میزو پیسی پیا دەکەن، چونکه کەسی تیا نییه ڕێگریان بێت.

پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەگێڕێتەوه له پێشەوا ئەبو هورەیره (ﷺ) که پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویَ: شاری مەدینه بەجیَ دەهێڵن لەسەر چاکترین ڕەوش تاکو سەگ یان گورگ دێنه ناوی و لەلای هەندێك دینگەکانی مزگەوت یان لەسەر مینبەرەکەی میز دەکەن، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی باشه بەرو بوومی ئەو سەردەم بۆ کێیه؟ فەرمووی: بۆ باڵندەو دڕندەکانه[1].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ) دەڵێت: مەبەست ئەوەیه که شاری مەدینه دەمێنیَ به ئاوەدانی لەسەردەمی دەجالدا، پاشان هەروا دەبیَ لەسەردەمی عیسای کوری مەریەم تاکو وەفات دەکات و تیایدا دەنێژریَ پاشان له دوای ئەمه کاول دەکریَ[2].

پێشەوا ئیبنو حەجەر دەڵیَ: عەوفی کوری مالیك دەڵیَ: پێغەمبەر(ﷺ) هاته ناو مزگەوت پاشان سەیری ئێمەی کردو فەرمووی: سوێند بەخوا خەڵکی ئەم شاره به ملکەچی چڵ ساڵ ئێره جیَ دەهێڵن بۆ باڵندەو دڕندەکان.

ئەمەش بەڵگەیه کەوا دەرچوونی خەڵك به گشتی له شاری مەدینه له کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات، ئەمەش له دوای دەرچوونی دەجال و هاتنه خوارەوەی پێغەمبەر عیسا.

---

(١) الموطأ (٢/ ٨٨٨).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٥٨).

بەرگی سێیەم

بەم شێوەیە دوای نەمانی باوەڕداران لەسەر زەویدا شاری مەدینە کاول و خاپوور دەکرێت و کەسیش نابێت دڵی پێیان تەنگ بێت یان خەمیان لیٚ بخوات.

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: شاری مەدینە وێران دەکرێت پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بە چل ساڵ[1].

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: کۆتایی گوندو شاری ئیسلام کە وێران بێت شاری مەدینەیە[2].

---

(١) رواه الديلمي، برقم: (٨٩٤٥).

(٢) صحيح: سنن الترمذي برقم: (٣٩١٩) وقال: هذا حديث حسن غريب.

# هەڵکردنی بایەک ڕۆحی ئیمانداران دەکێشێت

پاش ئەوەی خوای گەورە قورئانەکەی خۆی هەڵدەکێشێتەوە بۆ ئاسمان بە دوای ئەوەدا خوای گەورە بایەکی نەرم و بۆن خۆش دەنێرێت و ڕۆحی گشت ئیماندارانی سەر زەوی دەکێشێت، چونکە ئیماندار لە دوای هەڵکێشانی قورئان ژیانی بۆ چیەو بەبێ قورئان ئیتر چ خێرێك بە ژیاندا دەبینێت؟

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ رِيحًا مِنَ الْيَمَنِ أَلْيَنَ مِنَ الْحَرِيرِ، فَلَا تَدَعُ أَحَدًا فِي قَلْبِهِ - قَالَ أَبُو عَلْقَمَةَ مِثْقَالُ حَبَّةٍ، وَقَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: مِثْقَالُ ذَرَّةٍ - مِنْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ)[1].

واتە: خوای گەورە بایەك دەنێرێت لە یەمەنەوە، لە ئاوریشم نەرمترە، کەس ناهێڵێت کە هێندەی مسقالە زەرەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ڕۆحی دەکێشێت.

**وەڵامی ئەمە بە دوو شێوە دەدرێتەوە:**

**یەکەم:** لەوانەیە کە ئەمە دوو با بێت، یەکێك لە شام و یەکێکی تر لە یەمەن.

**دووەم:** لەوانەیە سەرەتای هەڵکردنی لە یەکێك لەم دوو شوێنە بێت، پاشان بگاتە ئەوەی ترو بڵاوبێتەوە لەلایدا.

پێشەوا نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)[2].

---

(١) صحيح مسلم (١/ ١٠٩) كتاب: الإيمان، باب: الريح التي تكون قرب القيامة، برقم: (١١٧).

(٢) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب ذكر الدجال، رقم الحديث: (٢٩٣٧).

واتە: لەو کاتەدا خوای گەورە بایەکی پاکو خۆش دەنێرێت و خەڵکیی لە بن باڵیانەوە دەگرێت و ڕۆحی هەموو ئیماندار و موسڵمانێك دەکێشێت، ئیتر تەنها خراپەکاران لە خەڵکی دەمێننەوەو ئەوانیش وەکو گوێ درێژ سواری یەکتر دەبن، قیامەت لەسەر ئەوان هەڵدەستێت.

ئەمڕۆ حاڵی خەڵکی وایە لە زۆر کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا، لەو یانانەی بە یانەی ڕوتان ناو دەبرێن و لەکەنار دەریاکان و لە نێو باخ و دارستانان بەڕاستی وەکو گوێدرێژ سواری یەکتر دەبن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَوَفَّ كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لَا خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ)[١].

واتە: ئەوە وادەبێت تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە دەیەوێت، لە پاشان خوای گەورە بایەکی پاکو خۆش دەنێرێت، هەر کەسێك بە قەد مسقالە دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا بێت ڕۆحی دەکێشێت، ئیتر تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خێریان تێدا نیە، ئەوانیش دەگەڕێنەوە بۆ ئایینی باوو باپیرانیان.

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوِ التَّمْرِ ، لاَ يُبَالِيهِمُ اللَّهُ بَالَةً)[٢].

واتە: چاکەکاران یەك لەدوای یەك لەناو دەچن و نامێنن، ئینجا کۆمەڵەکی گەندەی وەکو بن جۆخینی جۆ یان خورما دەمێنێتەوە، هەر خودایان بەخەیاڵدا نایەت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٠) باب: لا تقوم الساعة حتى تعبد، برقم: (٢٩٠٧).

(٢) صحيح البخاري (٢١/ ٢٩٢) باب: ذهاب الصالحين، برقم: (٦٤٣٤).

بەرگی سێیەم

# گەڕانەوەی مرۆڤایەتی بۆ جاهیلیەت و بت پەرستی



پاش ئەوەی کە ئیسلام داڕنراو، قورئان هەڵگیراو، سروە با گیانی هەموو ئەوانەی کێشا کە تۆزقاڵە بڕوایەکیان لە دڵیدا هەیە، مرۆڤایەتی بۆ جاهیلیەتی سەرەتا دەگەڕێتەوە، جا گوێڕایەڵی شەیتان دەکاو بت دەپەرستێ.

پێشەوا عەبدوڵلای کوری عەمر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّامِ، فَلَا يَبْقَى أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ، حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ كَانَ فِي كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْ عَلَيْه..)[1].

واتە: پاشان خوای پەروەردگار کزە بایەکی فێنك لە لای شامەوە دەنێرێ، گیانی هەموو یەکێکی سەر ڕووی زەوی دەکێشێ کە تۆز قاڵێك خێر یان بڕوایی لە دڵدا هەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێکتان بچێتە نێو جەرگەی کێوێك، هەر لێی دەچێتە ژوور و دەیگاتێ و گیانی دەکێشێ.

لەو بتانەی کە دەپەرسترێن (ذوالخلصة)ی تاغوتی دەوس و لات و عوززان، چونکە پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلْيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ حَوْلَ ذِي الْخَلَصَةِ..)[2].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کەفەڵی ژنانی دەوس بە دەوری ذوالخلیصەدا هەڵتەك هەڵتەك دەکا.

**ذوالخلیصە:** ئەو بتەیە کە خێڵی دەوس لەکاتی جاهیلیەتدا دەیانپەرست.

---

(١) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٥٨) كتاب: الفتن، باب: خروج الدجال، برقم: (٢٩٤٠).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٣٠) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، برقم: (٢٩٠٦).

دایكمان عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: گوێم له پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (لَا يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللَّاتُ وَالْعُزَّى)[1].

واته: شەو و ڕۆژ كۆتاییان نایەت هەتا جارێكی تر (لات و عوزا) دەپەرستریتەوە) دەڵێت: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من وام دەزانی كه خوای گەوره له قورئاندا دەفەرموێت:[هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ] واته: (خوا خۆی پێغەمبەرەكەی ناردوه به ڕێنمایی و ئایینی ڕاست، بۆ ئەوەی بەسەر هەموو ئاینەكاندا سەری بخات هەر چەندە بێباوەڕەكانیش پێیان ناخۆش بێت) وام دەزانی ئیتر ئەوه تەواوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لَا خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ)[2].

واته: ئەوه وا دەبێت تا ئەو كاتەی كه خوای گەوره دەیەوێت، له پاشان خوای گەوره بایەكی پاكو خۆش دەنێرێت، هەر كەسێك به قەد تۆزقاڵێك دەنكه خەرتەلەیەك باوەڕ له دڵیدا هەبێت ڕۆحی دەكێشێت، ئیتر تەنها ئەوانه دەمێننەوه كه خێریان تێدا نیه، ئەوانیش دەگەڕێنەوه بۆ ئایینی باب و باپیرانیان.

پاڵپشتێكی تریش هەیه له فەرمودەی پێشەوا نەواسی كوڕی سەمعان (ﷺ) دەربارەی دەجال و یەئجوج و مەئجوج له كۆتاییەكەیدا دەفەرموێ: (فَبَيْنَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً تَأْخُذُ تَحْتَ آبَاطِهِمْ , فَتَقْبِضُ رَوْحَ كُلِّ مُسْلِمٍ، أَوْ قَالَ مُؤْمِنٍ، فَتَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ تَهَارُجَ الْحُمُرِ وَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)[3].

واته: كاتێك لەو بارەی دان خوای گەوره سروه بایەك دەنێرێ و بەبن هەنگڵیان تێپەڕ دەبێ و گیانی هەر بڕوادارو موسڵمانێك دەكێشێ و تەنیا بەدكارترینی

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ، (٤/٢٢٣٠)، برقم: (٢٩٠٦).

(٢) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب لا تقوم الساعة حتى تعبد دوس ذا الخلصة، (٤/٢٢٣٠)، برقم: (٢٩٠٦).

(٣) مسند الشاميين (١/ ٣٥٤) برقم: (٦١٤).

خەڵکی دەمێنن، وەکو گوێدرێژ لە نێوەندی ڕێگادا سواری یەك دەبن، جا ڕۆژی دوایی لەسەر ئەوان هەڵدەستێ.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِي خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلَامِ السِّبَاعِ، لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا، فَيَتَمَثَّلُ لَهُمُ الشَّيْطَانُ، فَيَقُولُ: أَلَا تَسْتَجِيبُونَ؟ فَيَقُولُونَ: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الْأَوْثَانِ، وَهُمْ فِي ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ، حَسَنٌ عَيْشُهُمْ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ..)[1].

واتە: جا خراپترینی خەڵکی لە سوکی باڵندەو خەونی دڕندانداا دەمێنن، نە چاکەیەك ئەنجام دەدەن و نە ڕێ لە خراپەیەك دەگرن، ئینجا شەیتان خۆیان بۆ ڕادەنوێنێ و دەڵێ: ئەی وەڵامی من نادەنەوە؟ دەڵێن: چ فەرمانێکمان پێ دەدەی؟ جا فەرمانی بتپەرستیان پێ دەدا لەگەڵ ئەوەشدا بژێوییان دەگەڕێ و ژیانیان چاکە، پاشان فوو بە شەیپوردا دەکرێ..

پێشەوا قەیسی کوری میرداس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يذْهَبُ الصَّالِحُونَ الْأَوَّلُ فَالْأَوَّلُ وَتَبْقَى حُثَالَةٌ كَحُثَالَةِ الشَّعِيرِ لَا يُبَالِي اللَّهُ تَعَالَى بِهِمْ)[2].

واتە: چاکەکاران یەك لەدوای یەك لەناو دەچن و نامێنن، ئینجا کۆمەڵێکی گەندەڵ وەکو بن جۆخینی جۆ یان خورما دەمێنێتەوە، هەر خودایان بەخەیاڵدا نایەت.

بەڵێ.. لە دوای هەڵکردنی ئەو بایەو مردنی هەموو باوەڕدارانی سەر زەوی، ئیتر سەر زەوی تەنها بێ باوەڕو خراپەکاری تێدا دەمێنێت و ئەوانیش دەست دەکەنەوە بە بت پەرستیو خراپەکاری، خوای گەورەش هەتا یەك کەس لەسەر زەوی مابێت بڵێت (یاالله) زەوی بۆ ڕادەگیرێت بەڵام لە دوای ئەوە زەوی بۆ بێ باوەڕان ڕاناگیرێت.

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب خروج الدجال، (٤/٢٢٥٨)، برقم: (٢٩٤٠).

(٢) صحيح: سنن الدارمي (٣/ ١٧٨٨) برقم: (٢٧٦١) وقال حسين سليم أسد الداراني: إسناده صحيح.

# ڕوخاندنی کەعبەی ماڵی خوا

کەسێك ماڵی خوا بە حەڵاڵ نازانێ واتە: ڕێ پێدراو نیە کە شەڕ یان کاری خراپی تێدا بکرێ تەنیا خەڵکەکەی خۆی نەبێ، واتە: حەرەم دەشکێنن بەشەڕ لەگەڵ یەکتری کردن، وە خەڵکەکەشی بریتیە لە موسڵمانان[1]، جا کاتێك ئەم حەرەمەیان شکاند ئەوا بە هیلاك دەچن، پاشان پیاوێك پەیدا دەبێ لە خەڵکی حەبەشە یان سودان[2] کە پێی دەگوترێ (ذو السُوَيْقَتين) واتە: دوو قاچ باریکەکە کەعبە دەڕوخێنێ، وە کەرپوچ کەرپوچ و بەرد بەرد هەڵی دەوەشێنێتەوە، وە کراسەکەی لێ دادەڕنێ و ڕووتی دەکاتەوە لە بەرگەکە، کە ئەوەش لە کۆتایی بونەوەر ڕوودەدات، لەو کاتەی کە هیچ کەسێك نامێنێ لەسەر زەوی بڵێ: الله الله، جا لەبەر ئەوە لە دوای ڕووخاندنی جارێکی تر دروست ناکرێتەوە.

پاش ئەوەی کە هیچ بڕوادارێك لەسەر زەوی نامێنێت و هەموو دەمرن ئیتر کەعبەی ماڵی خوا لە لای بێ باوەڕان و بت پەرستان ڕێزی نابێت، هەر بۆیە کەعبە لەلایەن کابرایەکی ڕەش پێستی حەبەشیەوە دەڕوخێنرێت و تەخت دەکرێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فِي آخِرِ الزَّمَانِ يَظْهَرُ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ عَلَى الْكَعْبَةِ قَالَ : حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ : فَيَهْدِمُهَا)[3].

واتە: لە کۆتایی بونەوەر کەسێکی لاق باریك دەست دەگرێت بەسەر کەعبەدا، (ئەبو ئەبو هورەیرە دەڵێت: وای لێ تێگەیشتم کە فەرمووی: دەیڕوخێنێت.

---

(١) فتح الباري (٣/ ٤٦٢).

(٢) رواه ابن ابي شيبة (٣٧٢٢٨).

(٣) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢٢٧/١٥) برقم: (٨٠٨٠) قال: الشيخ أحمد شاكر إسناده صحيح.

پێشەوا عەبدوڵلای كوری عەبباس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ أَسْوَدَ أَفْحَجَ ، يَنْقُضُهَا حَجَرًا حَجَرًا يَعْنِي الْكَعْبَةَ)[1].

واتە: هەر دەڵێی وا لەبەر چاوم سەیری دەكەم، ڕەشێكی لاق خوار بەرد بەرد دەیڕوخێنێت (مەبەستی پێ كەعبە بوو).

پێشەوا عەبدوڵلای كوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ، وَيَسْلُبُهَا حِلْيَتَهَا، وَيُجَرِّدُهَا مِنْ كِسْوَتِهَا، وَلَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ أُصَيْلِعَ ومعوله)[2].

واتە: كەعبە لاق باریكێك لە حەبەشە دەیڕوخێنێت، ئەو شتانەی كە پێ ڕازاوەتەوە لێی دەكاتەوەو بەرگ و پۆشاكەكەی دادەماڵێت، هەر دەڵێی وا لەبەر چاوم سەیری دەكەم، كەچەڵێكی جومگە خوارو دەربەڕیوە، بە پاچ و خاكەنازەكەی لێی دەدات[3] .

بۆیەش بە (ذو السُوَيْقَتين) ناوبراوە چونكە قاچی باریكە، زۆربەی ڕەش پێستەكانی حەبەشەش ئاوان[4].

## هۆكاری ڕووخاندنی كەعبە:

پێشەوا عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: گوێم لێ بوو پێشەوا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) بۆ (ئەبو قەتادە)ی دەگێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يُبَايَعُ لِرَجُلٍ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ وَلَنْ يَسْتَحِلَّ الْبَيْتَ إِلَّا أَهْلُهُ، وَإِذَا اسْتَحَلُّوهُ فَلَا تَسْأَلْ عَنْ هَلَكَةِ الْعَرَبِ، ثُمَّ تَأْتِي الْحَبَشَةَ فَيُخَرِّبُونَهُ خَرَابًا لَا يَعْمُرُ بَعْدَهُ أَبَدًا، وَهُمُ الَّذِينَ يَسْتَخْرِجُونَ كَنْزَهُ)[5].

---

(١) صحيح: رواه أحمد في المسند (١/ ٢٢٨) برقم: (٦٧٥٢). قال الشيخ أحمد شاكر: إسناده صحيح.

(٢) صحيح: رواه أحمد في المسند (١/ ٢٢٨).. وقال الشيخ أحمد شاكر: إسناده صحيح.

(٣) النهاية لإبن الأثير (٣/ ٤٧).

(٤) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٢٨١.

(٥) صحيح: أخرجه الإمام أحمد (٣٥/١٥) برقم: (٨٠٩٩) وصحح إسناده الشيخ أحمد شاكر وكذلك

واتە: پیاوێك لە نێوان ڕوكن و مەقامدا بەیعەتی پێ دەدرێت، ماڵی بەیتیش کەس حورمەتی ناشکێنێت خەڵکەکەی خۆی نەبێت، هەر کاتێکیش حورمەتیان شکاند ئیتر مەپرسە عەرەب چۆن لەناو دەچن، پاشان حەبەشی دێن، ڕوخانێك دەیڕوخێنن کە هەرگیز لە دوای ئەوە ئاوەدان ناکرێتەوە، هەر ئەوانیش زێڕ و کەنزەکەی ناوی دەردەهێنن.

کەنزەکەی کەعبە کۆمەڵێك دیارین کە لەسەردەمی نەفامی پێشکەشیان بە کەعبە دەکرد، بەڵام دوای هاتنی ئیسلام هەندێك لەو کەنزانەیان بەخشی بە سەرۆك و وەزیرەکان و بازرگانەکان.. وە هەندێکیش لەو کەنزانە ماوە لەناو بیری ناوەوەی کەعبە، ئەو بیرەی کە پێغەمبەر ئیبراهیم لێی دابوو (سەلامی خوای لێ بێ)[1].

بەهەمان شێوەش لە ئاخر زەماندا مەدینەی شاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاول دەبێت وەکو پێشتر باسمان لێوەی کرد لەسەردەمی پێشەوا (محەممەدی مەهدی) دا بۆ ماوەیەك خەڵکی شاری مەدینە شارەکە بەجێ دەهێڵن و چۆلی دەکەن بەڵام لە کۆتایی بونەوەر بە تەواوی چۆڵی دەکەن و شارەکە کاول دەبێت.

ئەم فەرموودەیە دژایەتی ناکات لەگەڵ فەرموودەکەی دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرمووی: (يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنْ الْأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ)[2].

واتە: سوپایەك کەعبە داگیر دەکات، کاتێك دەگەنە دەشتێکی بەرفراوانی زەوی، ئەوەڵ و ئاخیریان ڕۆدەچن.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبەکەی (فتح الباری - باب هدم الكعبه) دەڵێت: ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە داگیرکردنی کەعبە ڕوودەدات، جارێکیان پێش ئەوەی بیگەنێ، خوا لەناویان دەبات، دواتر دەتوانن و دەیڕوخێنن، وا

الشيخ الألباني في الصحيحة (٢/ ١١٩) برقم: (٥٧٩) وقال: وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين، غير سعيد بن سمعان وهو ثقة.

(١) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، لا ٢٣٧ .

(٢) صحيح البخاري (٣/ ٦٦) باب: ما ذكر في الأسواق، برقم: (٢١١٨).

دەردەکەوێت ئەوانەی کە دێن و وێرانی دەکەن دوا دەکەون لە جاری یەکەم.

جاری یەکەم مەبەست لێی ئەوەیە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی قبتیەوە(ﷺ) دەڵێت: من و (حارث)ی کوڕی ئەبو ڕەبیعەو عوبەیدوڵڵای کوڕی صەفوان چوین بۆ سەردانی (ئوم سەلەمە)ی دایکی بڕواداران (خوایان لێ ڕازی بێ) هەردووکیان لێیان پرسی دەربارەی ئەو سوپایەی کە ڕۆدەچێت بەزەویدا؟ ئەمەش لەسەردەمی (ئیبنو زوبەیر)دا بوو، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: پەنا هێندەیەك پەنا دەبات بۆ کەعبە، سوپایەکی بۆ ڕەوانە دەکرێت، کاتێك دەگەنە دەشت و خاکێکی بەرفرەوان ڕۆدەچن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەوەی بە زۆر بردویانە چی بەسەر دێت؟ فەرمووی: ئەویش لەگەڵیاندا ڕۆدەچێت، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت دا لەسەر نیاز و نیەتی خۆی زیندوو دەکرێتەوە. پێشەوا ئەبو جەعفەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەو دەشتە دەشتی مەدینەیە[١].

بێگومان ئەم فەرمودەیەو یەك دوو فەرمودەی تر هاتوون لەم بارەوە، هەر چەندە لە فەرمودەکاندا بە ڕاشکاوی نەهاتووە کە مەبەست لە (مەهدی)ە، بەڵام لە ئەبو داودەوە هاتووە کە ئەمە مەبەست پێی مەهدیە.

جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرمایشتانە دڵنیایی دەدات کە کەعبە لە کۆتایی بونەوەر وێران دەبێت.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لَا يُحَجَّ الْبَيْتُ)[٢].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا وای لێدێت کەس ناچێت بۆ ماڵی خوا واتە: هەندێك لە دەست دزێژەکان ماڵی خودا لە خەڵکی قەدەغە دەکەن.

گومانیش لەوەدا نیە پاش هەڵکردنی بایەکە و کێشانی گیانی چاکەکاران حەج کردن نامێنێ، دەنا پێشتر ئەو پەرستشە هەر بەردەوامە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَيُحَجَّنَّ الْبَيْتُ ، وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ)[٣].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب: الفتن: (٢١٣/١٨) برقم: (٧١٦٩).

(٢) صحيح البخاري (٦/ ١٧٣) باب: جعل الكعبة البيت الحرام، برقم: (١٥٩٣).

(٣) صحيح البخاري (٦/ ١٧٣) باب: جعل الكعبة البيت الحرام، برقم: (١٥٩٣).

واتە: بەڕاستی پاش دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوج حەج و عەمرەی ئەم ماڵی خوایە دەکرێ.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (ﷺ) دەڵێت: تەوافی ئەم بەیتە بکەن تا دەتوانن پێش ئەوەی گۆڕانکاری بێت بەسەر ئێوەو ئەودا، وەکو لەبەر چاوم بێت ئەوانەی بە بێڵەکانیان دەیڕوخێنن کەسانێکی مل باریکی سەر و گوێ بچوکن[1].

پێشەوا ئیبنو عەبباس (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: وەکو ئەوە وایە چاوم لەو پیاوە ڕەش و لووت بەرزە هەنگاو بلاوەیە کە بەردی کەعبە، یەکە یەکە هەڵئەکەنێ[2].

بەڵام (ذو السُوَيْقَتين) نایڕوخێنێت پاش ئەوە نەبێ کە موسڵمانان ڕێگە دەدەن و ڕێزی لێ ناگرن و بایەخی پێ نادەن، جا لەو کاتە ئیتر خوای گەورە سەریان ناخات.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: بۆچی (ذو السُوَيْقَتين) کەعبە دەڕوخێنێت، بۆچی خوای گەورە سزایەك نانێرێت بۆ ئەوەی نەمێنێت؟

لە وەڵامدا دەڵێم: چونکە خوای گەورە خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە کە کۆتایی بونەوەر لە ماوەیەکی نزیك دەست پێ دەکات، هەروەکو چۆن قورئان هەڵگیرایەوە بەم شێوەیە ژیانیش نامێنێت لە دوای قورئان.

### نیشانەکانی ئەو پیاوەی کە کەعبە دەڕوخێنێت:

- هەردوو قاچەکانی باریکە[3].
- پێشەوەی سەری کەچەڵە[4].

---

(١) أخبار مكة، للفاكهي، (٣١٣).

(٢) صحيح البخاري (٣/٤٦٠).

(٣) فتح الباري (٣/ ٤٦٢).

(٤) صحيح: رواه عبدالرزاق، برقم: (٩١٨٧). بإسناد صحيح.

- هەردوو دەستەکانی خوارە[١].

- سەری بچوکە[٢].

- گوێچکەکانی بچوکە[٣].

- هەردوو چۆکەکانیشی لەیەکەوە دوورە[٤].

لە کۆتایی: ڕەنگە کەسانێك پرسیار بکەن و بڵێن: جا چۆن کاولی دەکات و دەیڕوخێنێ لە کاتێکدا خوا مەککەی کردۆتە حەرەمێکی پارێزراو؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە: تا نزیکی قیامەت و تێکچوونی دونیا مەککە پارێزرارو و بەر ئاساییشە.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وای گوتوە.. ئەمە ڕاستە ئەگەر ڕوخاندنەکە لەو کاتەدا ڕوویدات، ئەگەر نا ئەوە مەسەلەکە حوکمێکی شەرعیەو خودا بەندانی خۆی پێ پەیوەست کردون، جا ئەگەر یەکێك یاخی بوو حورمەتی ماڵی خوای بەزاند، ڕەنگە وەکو ئەبرەهە خودا ڕێی لێ بگرێ، ڕەنگە لەبەر بونی حیکمەتێك کە خۆی پێ ی زانا و دانایە، ڕێیان لێ نەگرێ، وەکو قەرامیتەکان کە کەعبەیان داگیر کردو ئەوی کردیان کردیان، یان وەك ئەوەی ئەو قاچ باریکە پیس و بودەڵەیە دەیکات لە پێش هاتنی قیامەت[٥].

تەنانەت چەندین جار شەڕو کوشتار لە کەعبە ڕوویداوە، گەورەترینیان ڕووداوی قەرامیتەکان بوو لە سەدەی چوارەمی کۆچی، هەروەکو لە بەرگی یەکەم ئاماژەمان پێی دا.. تەنانەت موسڵمانەکانیان لە کاتی تەواف کردن شەهید کرد، وە بەردە ڕەشەکەیان هەڵقەلاند لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر ئاڵوگۆڕی پێدەکرا.

---

(١) رواه البيهقي في (الكبرى) برقم: (٨٤٨٠)

(٢) صحيح: رواه عبدالرزاق، برقم: (٩١٨٧). بإسناد صحيح.

(٣) صحيح: رواه عبدالرزاق، برقم: (٩١٨٧). بإسناد صحيح.

(٤) رواه ابن ابي شيبة، برقم: (١٤١٠٠).

(٥) فتح الباري (٣/ ٤٦١ ـ ٤٦١).

# گڕکانی عەدەن و ئاگری حەشر

کۆتایی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەرچوونی ئاگرێك دەبێت لە خاکی یەمەنەوە دەردەکەوێ و خەڵکی بۆ حەشرگەیان کۆدەکاتەوە، گەورەیی ئەم ئاگرەش پێشتر نمونەی نەبینراوە.

## شوێنی دەرچوونی ئەم ئاگرە:

هەندێ لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتوون کە ئاماژە بەوە دەکەن کەوا ئەم ئاگرە لە یەمەن لەژێر قەڵای عەدەن دەردەچێ.

(عەدەن) شارێکی ناسراوە لەسەر کەناری دەریای (حضرموت).

پێشەوا حوذیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری (ﷺ) دەڵێت: (اطَّلَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: مَا تَذَاكَرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ - فَذَكَرَ - الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَيَأَجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ)[1].

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێمان دەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین، فەرموی: ئەوە باسی چی دەکەن؟ گوتمان: باسی ڕۆژی دوایی، فەرموی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنیدا نەبینن، پاشان فەرموی: دوکەڵ و دەجال و داببەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێت) و یەئجوج و مەئجوج و سێ ڕۆچوون ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچوونێك

---

(١) صحيح مسلم ، كتاب الفتن، باب الآيات التي تكون قبل الساعة، (٤/٢٢٢٥) ورقمه (٢٩٠١).

لە دوورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاو دەنێت بەرەو شوێنی حەشر کردنیان.

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (إِنَّ السَّاعَةَ لَا تَكُونُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَالدُّخَانُ وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ، وَيَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قُعْرَةِ عَدَنٍ تَرْحَلُ النَّاسَ) وفي رواية (والْعَاشِرَة: نُزُولُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دە نیشانە ڕوو دەدات: ڕۆچوونێك لە خۆر هەڵات و ڕۆچونێك لە خۆرئاواو ڕۆچونێك لە دوورگەی عەرەب و دووکەڵ و دەجال و دابەو یەئجوج و مەئجوج و هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواو ئاگرێك کە لەناوچەی عەدەن دەردەچێت و خەڵکی کۆچ پێ دەکات، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێت: دەیەمینیان دابەزینی عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوای لێبێت).

(عەدەن)یش شارێکی دیارە لە خاکی یەمەن.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کاتێك عەبدوڵلای کوڕی سەلام موسڵمان بوو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کە یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوایی چیە؟ ئەویش فەرمووی: (أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ فَنَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ الْمَشْرِقِ إِلَى الْمَغْرِبِ)[2].

واتە: یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوایی ئاگرێکە خەڵکی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (سَتَخْرُجُ نَارٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ أَوْ مِنْ نَحْوِ بَحْرِ حَضْرَمَوْتَ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ تَحْشُرُ النَّاسَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ)[3].

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن، باب: في الآيات التي تكون قبل الساعة، (٨/ ١٧٨) برقم: (٧٤٦٧).

(٢) صحيح البخاري، باب: خلق آدم صلوات الله عليه وذريته (١١/ ٤٨٧) برقم: (٣٣٢٩).

(٣) صحيح: سنن الترمذي، باب: ما جاء لا تقوم الساعة حتى تخرج (٤/ ٦٨) برقم: (٢٢١٧). وقال

بەرگی سێیەم

واتە: ئاگرێك لە (حَضْرَموتَ) یا لە دەریای (حَضْرَموتَ) پێش ڕۆژی دوایی دێتە دەر، خەڵکی ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی چیمان پێ دەکەیت؟ فەرمویی: پەنا بەرنە وڵاتی شام.

ئەمەو سەبارەت بە چۆنیەتی کۆکردنەوەو ڕاپێچ کردنی ئەو ئاگرەش بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (تُبْعَثُ نَارٌ عَلَى أَهْلِ الْمَشْرِقِ فَتَحْشُرُهُمْ إِلَى الْمَغْرِبِ تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، يَكُونُ لَهَا مَا سَقَطَ مِنْهُمْ وَتَخَلَّفَ، تَسُوقُهُمْ سَوْقَ الْجَمَلِ الْكَسِيرِ)[1].

واتە: ئاگرێك دەنێردرێتە سەر خەڵکی خۆرهەڵات، کۆیان دەکاتەوەو ڕاپێچیان دەکات بەرەو خۆرئاوا، لە هەر کوێ شەویان بەسەردا هات لەگەڵیاندا دەبێت، وە لە هەر کوێ نیوەڕۆیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت، ئەوەی بکەوێت یان دوا بکەوێت بۆ ئاگرەکە دەبێت و لەناوی دەبات، وەکو حوشتری بێ هێزو لاواز ڕاپێچیان دەکات.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وَآخَرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قَعْرِ عَدَنَ، تطرد الناس إلى المحشر)[2].

واتە: لە کۆتاییدا ئاگرێك لە چاڵایی عەدەنەوە دەردەچێت و خەڵکی ڕاپێچ دەکات بەرەو مەحشەر.

لە ڕیوایەتی ئەبو داودیش دەفەرموێ: (وَآخِرُ ذَلِكَ تَخْرُجُ نَارٌ مِنَ الْيَمَنِ، مِنْ قَعْرِ عَدَنٍ، تَسُوقُ النَّاسَ إِلَى الْمَحْشَرِ)[3].

---

الترمذي: هذا حديث حسن صحيح.

(١) صحيح: المستدرك في الصحيحين (٤/ ٥٩١) برقم: (٨٦٤٧). وقال الإمام الحالكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

(٢) صحيح ابن حبان (١٥/ ٢٥٨) برقم: (٦٨٤٣) . قال شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٣) صحيح: سنن أبي داود، باب: أمارات الساعة، (٦/ ٣٦٩) برقم: (٤٣١٠). قال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

بەرگی سێیەم

واتە: کۆتایی نیشانە بریتیە لە ئاگرێك لە چاڵایی عەدەنەوە لەیەمەن دێتە دەرو خەڵك بەرەو مەحشەر ڕاپێچ دەکات.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: حەشر چوارە، دوو حەشر لە دونیا، دوو حەشریش لە ڕۆژی دوایی، ئەوەی لە دونیادایە خوای گەورە لە سورەتی (الحشر) باسی کردووە، کە حەشری جولەکەکانە بەرەو شام، دووەم: ئەو حەشرەی ڕۆژی دواییە[1].

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمر(ﷺ) دەڵێت: یەکەمین نیشانەکان هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، ئینجا دەرچوونی ئاژەڵەکە لەسەر خەڵکی لە چێشتەنگاودا، هەر کامیان پێش ئەوی تریان دەرکەوێت، دووەمیان بەدوایدا دێت.. چۆن گونجاندن بکەین لە نێوان ئەم فەرموودەو ئەو فەرموودانەی کە دەجال و مەهدی دەکەنە یەکەمین نیشانەکان؟

وەڵام: لێرەدا مەبەست لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر هاتنی کۆتایی بونەوەرە، نەك نزیکبوونەوەی قیامەت کە تێیدا هاتووە، یەکەمین مەسەلەکانی هەڵسانی قیامەت.

جا بۆ نزیك کردنەوەی واتای ئەم فەرموودانە لە یەکێ دەڵێ: لەیەمەن دەردەچێ، یەکێکی تر دەڵێ: لە (حضرموت)، ئەویتر دەڵێ: لە خۆرهەڵاتەوە ئەوا چەند ڕاڤەیەکی هەیە کە ئەمانەن:

١) لەوانەیە ئەم ئاگرە سەرەتا لەژێر شاری عەدەن دەربچێ و لەوێوە دەست پێبکات بۆ گشت زەوی، وە مەبەستی بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆر ئاوا ئەوەیە کە گشت خەڵکی ئەم دوو جەمسەرە دەگرێتەوە بە گشتی واتە هەموو خەڵك، وە ئەم ئاگرەش کە باس کراوە ئەوا ئاگرێکی هەقیقیە نەك شتێکی تر[2].

---

(١) فتح الباري (١١/ ٣٧٨).

(٢) فتح الباري (١١/ ٣٧٨ـ ٣٧٩).

٢) لەوانەیە مەبەست بەم ئاگرە ئاگری شەڕی شەڕو فیتنە بێ و سەرەتای لە خۆرهەڵات بێ و خەڵك ڕاپێچ بکات و کۆیان بکاتەوە بۆ لای شام و میسر.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ، رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ تَبِيتُ مَعَهُمْ، حَيْثُ بَاتُوا وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا)[١].

واتە: خەڵکی لەسەر سێ شێواز ڕاپێچ دەکرێن و کۆدەکرێنەوە: بە ئارەزووی خۆیان و لە ترسانداو دوان لەسەر وڵاخێك و سێیان لەسەر وڵاخێك و چوار لەسەر وڵاخێك دەیان لەسەر وڵاخێك، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە ئاگرێکە ڕاپێچیان دەکات و کۆیان دەکاتەوە، لە هەر کوێ نیوەڕۆیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت و لەهەر کوێ شەویان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت، وە لەهەر کوێ بەیانیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت و لە هەر کوێ ئێوارەیان بەسەردا هات لەگەڵیان دەبێت.

واتە: ئەو ئاگرە مەبەست لێی سوتاندنی خەڵکی نییە، بەڵکو لەبەریان دەدات بەرەو خاکی حەشرگە لە شام، جا ئەگەر خەڵکی ڕێ بکەن و ماندووبن و دابەزن بۆ خەوی چێشتەنگاو ئەو ئاگرە لەگەڵیاندا دەبێت، کاتێك ئاگاداربینەوە ئاگرەکە بەرەو لایان دێت و بەرێیان دەخات، بە هەمان شێوە لە کاتی مانەوەیان لە شەوو هەڵسانیان بۆ بەیانی، هەر لەگەڵیاندایە تاکو دەیانگەیەنێتە شام.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی ئوسەیدی غەفاری (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أَنَّ النَّاسَ يُحْشَرُونَ ثَلَاثَةَ أَفْوَاجٍ فَوْجٌ رَاكِبِينَ طَاعِمِينَ كَاسِينَ وَفَوْجٌ تَسْحَبُهُمْ الْمَلَائِكَةُ عَلَى وُجُوهِهِمْ وَتَحْشُرُهُمْ النَّارُ وَفَوْجٌ يَمْشُونَ وَيَسْعَوْنَ يُلْقِي اللَّهُ الْآفَةَ عَلَى الظَّهْرِ فَلَا يَبْقَى حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَتَكُونُ لَهُ الْحَدِيقَةُ يُعْطِيهَا بِذَاتِ الْقَتَبِ لَا يَقْدِرُ عَلَيْهَا)[٢].

---

(١) صحيح مسلم، باب: فناء الدنيا وبيان الحشر، (٤/ ٢١٩٥) برقم: (٢٨٦١).

(٢) سنن النسائي (٤/ ٤٢٢) برقم: (٢٠٨٥).

واتە: خەڵکی بە سێ دەستەو تاقم ڕاپێچ دەکرێن و کۆدەکرێنەوە، دەستەیەك بە سواری و بە تێریی و پۆشتەیی، وە دەستەیەك بە پێ دەڕۆن و هەوڵ دەدەن، وە دەستەیەك فریشتەکان لەسەر دەم و چاو ڕایاندەکێشن و ڕاپێچیان دەکەن بۆ ئاگرەکە، قسەکەرێك پرسیاری کردو گوتی: ئەو دوانەیانمان زانی، ئەی مەبەست لەوانە چیە کە بەپێ دەڕۆن و هەوڵ دەدەن فەرمووی: خوای گەورە قڕ دەخاتە وڵاخی بار هەڵگر تا وای لێ دێت وڵاخ نامێنێت، تەنانەت پیاویان تیا دەبێت کە باخچەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە، دەیدات بە پیرە حوشترێك کە کورتانی پێوە بێت، کەچی هێشتا پێی ناکرڕدرێت.

پێشەوا موعاویەی کوری حیدە (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ رِجَالاً وَرُكْبَانًا، وَتُجَرُّونَ عَلَى وُجُوهِكُمْ)[1].

واتە: ئێوە بە پیادەیی و بەسواری حەشر دەکرێن و، ئا لێرەدا بەسەر ڕوتان ڕادەکێشرێن، بەدەستیشی ئاماژەی بۆ شام کرد.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ لَا يَغْشَاهَا إِلَّا الْعَوَافِ يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ وَآخِرُ مَنْ يُحْشَرُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا)[2].

واتە: شاری مەدینە لە باشترین باریدا جێ دێڵن، لە باڵندەو گیانداران بترازێ چی دی هاموشۆی ناکا، دواهەمین ئەوانەی حەشر دەکرێن و دوو شوانی مەزینەن، لە مەڕەکانیان ڕادەخوڕن، دەبینن دڕندەنە، تا دەگەنە (ثنية الوداع) لەوێ بەسەر ڕویاندا دەکەون.

---

(١) صحيح: سنن الترمذي (٤/ ١٩٤) باب: ما جاء في شأن الحشر، برقم: (٢٤٢٤). قال الإمام الترمذي: حديث حسن.

(٢) صحيح البخاري (٣/ ٢١) باب: رغب عن المدينة، برقم: (١٨٧٤).

ئەو خاكەی خەڵكیشی تێدا كۆدەكرێتەوە وڵاتی شامە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الشَّامُ أَرْضُ الْمَحْشَرِ وَالْمَنْشَرِ)[1].

واتە: شام خاكی حەشرو بڵاوبونەوەیە.

## بۆچی شام خاكی حەشرە؟

شام خاكێكی بە بەرەكەتە وەكو یەمەن، پێشەوا ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا وَفِي نَجْدِنَا، قَالَ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَفِي نَجْدِنَا فَأَظُنُّهُ قَالَ فِي الثَّالِثَةَ هُنَاكَ الزَّلاَزِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)[2].

واتە: خوایە بەرەكەتمان بۆ بخەیتە شامەوە خوایە بەرەكەتمان بۆ بخەیتە یەمەنەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ نەجدیش؟ پێم وایە لە سێهەمدا فەرموی: بومەلەرزەو ئاشوب لەوێ ڕوودەدات و لەوێوە قۆچی شەیتان هەڵدێت.



- قوببەی ئیسلام و عەمودی كیتاب لە شام بوو.
- خاكی شام خاكی سەركەوتنە بەسەر دوژمنەكانی خوا و جێگای دابەزینی پێغەمبەر عیسایە (سەلامی خوای لێ بێ).
- لە كۆتایی بونەوەر كە ئاشوب سەرهەڵدەدات باوەرو ئاساییش لە شام دەبێ.

لەم فەرمودانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە بە ماوەیەكی كەم لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم ئاگرە گەورەیە لە خاكی یەمەنەوە لەناوچەی (عەدەن) و (حَضْرَموتَ) دێتە دەرەوەو خەڵكێكی زۆر لەناو دەبات بە تایبەتی ئەوانەی كەدوا دەكەون و زوو فریا ناكەون، وە ئەوانەی كە فریا دەكەون بەرەو خۆرئاوا هەڵدێن،

---

(١) مسند البزار (٢/ ٩١) برقم: (٣٩٦٥). قال الإمام البزار: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَا نَعْلَمُهُ يُرْوَى عَنْ أَبِي ذَرّ إِلاَّ بِهَذَا الإِسْنَادِ .

(٢) صحيح البخاري (٩/ ٥٤) باب: قول الفتنة قبل المشرق، برقم: (٧٠٩٤).

هەروەکو لە فەرموودەکەی پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ﷺ) هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمان دەکات کە ڕوو بکەنە وڵاتی شام، چونکە ئەویٚ پارێزراو دەبێت لەو گڕکانە گەورەیە کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ئاگرە پانتاییەکی زۆر گەورە لەسەر زەوی دەگرێتەوە.

ئەمەو هەندێك لە زاناکان وەکو پێشەوایان غەزالی و حلیمی (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) پێیان وایە ئەو حەشرەی لە فەرموودەکاندا باس کراوە مەبەستی پێی حەشری ڕۆژی دواییە، بەڵام ئەم بۆچونەیان نەپێکاوە، چونکە فەرموودەکان زۆر بە ڕونی و ئاشکرا ئەو ڕاستیە ڕون دەکەنەوە کە ئەو حەشر کردنە لە پێش ڕۆژی دواییدا دەبێت و جیاوازە لەگەڵ ئەو حەشرەی لە قیامەتدا ڕوودەدات بەبەڵگەی ئەوەی کە لەکاتی دەرچوونی ئاگرەکەو حەشرکردنی خەڵکەکەدا هەیانە خۆی زوو ڕزگار دەکات و بە سواری وڵاخ و بە تێری و بە پۆشتەیی ڕزگاری دەبێت و هەشیانە هەوڵی کڕینی وڵاخ دەدات، کە هەموو دەزانین ئەو شتانە لە ڕۆژی دواییدا نیە، بەڵکو لە حەشری ڕۆژی دواییدا خەڵکیی هەموو ڕووت و بێ پۆشاکن و کڕین و فرۆشتنیش لەو ڕۆژەدا نیە[1].

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە بارەی ئەم فەرموودەیەوە دەڵێت: (قال العلماء: وهذا الحشر في آخر النيا قبل يوم القيامة، وقُبيلَ النفخ الصور بدليل قوله(ﷺ) تحشر بقيتهم النار تبيت معهم وتقيل معهم وتصبح وتمسي)[2].

واتە: زاناکان فەرمویانە: ئەم حەشرە لە کۆتایی بونەوەر دەبێت پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، وە لەپێش ئەوەی فوو بکرێت بە (صور)دا بە بەڵگەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: ئاگرەکە پاشماوەی خەڵکەکە حەشر دەکات بە شەو و نیوەڕۆو بەیانی و ئێوارە لەگەڵیان دەبێت.

پێشەوایان (خەطابی و طیبی و قاضي عیاض و قورطوبی و ئیبنو کەثیرو ئیبنو حەجەر) وای بۆ دەچن کە ئەم کۆکردنەوەیە لە کۆتا تەمەنی بونەوەردا دەبیٚ،

---

(١) فتح الباري بشرح صحيح البخاري: (٣٧٩/١٤).

(٢) شرح النووي لمسلم (١٩٤/١٧-١٩٥).

بەرگی سێیەم

کە ئاگر لە قولایی عەدەن دەکەوێتەوەو، خەڵکی بەرەو وڵاتی شام ڕاپێچ دەکاو کۆیان دەکاتەوە[(١)].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەم بابەتانە بەڵگەن کە ئەم حەشرە کۆکردنەوەی ئەوانەیە کە لە دواپین دونیادا ماون لە شوێنی حەشردا کە خاکی شامە. ئەوانەشی سێ پۆلن: بەشێك بەتێری و پۆشتەیی و سواری حەشر دەکرێن و، بەشێك دەمێك سوارو دەمێك پیادەن و، بەنۆرە حوشترێك ئاڵوگۆڕ دەکەن، ئەوانەی دەشمێننەوە ئاگر کۆیان دەکاتەوە، ئەو ئاگرەی لە قولایی عەدەن دەکەوێتەوە، لە پشتەوە بەری خەڵکی دەگرێ و لە هەمو لایەکەوە بۆ خاکی مەحشەریان دەبات ئەوەی لێشیان بەجێ بمێنێ ئاگرەکە هەڵی دەلوشێ[(٢)].

ئەمانەش هەموو بەڵگەن کە ئەوە لە کۆتایی دونیادا دەبێ کە خواردن و خواردنەوە هەن و سواری و شتی تریش هەن و بە جێش بمێنن بە ئاگری تێدەچن.

جا ئەگەر ئەم ڕووداوە پاش شەیپوری زیندوبونەوە بوایە، ئەوا مردن نەدەما و نە گیاندارێك سواری پشتی بن، نە خواردن دەما و نەخواردنەوە، نە پۆشین لە گۆڕەپانەکان.

یەکجار سەیریشە کە پێشەوا ئەبوبەکری بەیهەقی حافیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، پاش ئەوەی زۆربەی ئەو فەرمودانە دەگێڕێتەوە، ئینجا ئەم سوارییەی بە ڕوداوێکی ڕۆژی دوایی داناوە، ئەمەی بە صحیح داناوەو، ئەوەشی بەلاواز داناوە کە ئێمە وتمان، بەبەڵگەش ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: [يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾].

واتە: لەو ڕۆژەی کە خۆپارێزەران بە تێکرایی بۆ لای خوای میهرەبان کۆدەکەینەوە، تاوانبارانیش بە تینویەتی بەرەو دۆزەخ لێ دەخوڕین.

---

(١) فتح الباري بشرح صحيح البخاري: (١١/٣٨٠-٣٨٩).

(٢) القيامة الصغرى، د.عمر سليمان الأشقر، لا ٢٥٦.

جا چۆن گریمانەکەی خۆی لە ڕاڤەی ئایەتەکەدا بە فەرموده ڕاست دەکاتەوە، لە کاتێکدا لە فەرموده باسی ئەوە هاتووە کە دوان لەسەر حوشترێکن و دە کەس لەسەر حوشترێکن و بەڕاشکاوی کەمی ئاژەڵی سواریی تێدا هاتوە؟ ئەمە لەگەڵ ئەو کۆك نین، خواش زاناترە.

ئەوەی مەبەستمانە لەم فەرمودەیەدا ئەوەیە کە بورکانێك لە (قەعر)ی عەدەن (بنی عەدەن) دەرئەچێت و خەڵکی دەبات بەرەو مەحشەر، شاری (عەدەن) زۆربەی بە ئاوی دەریا دەورە دراوەو لە بنەڕەتدا زەویەکەی بەهۆی بورکانێکی گەورەوە دروست بووە کە لەو دەریایەدا بووە، ئەم بورکانە پاش هێوربونەوەو ساردبوونەوەی دەمێکی چاڵی بۆ دروست بووە زۆر زۆر گەورەو فرەوانە.کەس لە ڕابردوودا نەیزانیوە کە شاری (عەدەن) لەسەردەمی بورکان دروست بووە، تا ئەو کاتەی ئینگلیز داگیری کردو فڕۆکە پەیدابوو، کاتێك بەفڕۆکە لە بەرزاییەکی زۆرەوە سەیری عەدەنیان کرد بینیان شارێکە ڕووەکەی چاڵەو دەمێکی بورکانی گەورەشی هەیە، بۆیە ئینگلیزەکان ناوی (Kraytar) واتە: (دەرچەی گڕکان) یان لێناو، ئەو ناوەش لەناویاندا باو بوو بەکاریان دەهێنا نەك (عەدەن).

## شوێنی جوگرافی شاری (عەدەن):

عەدەن دووەم گەورەترین شاری یەمەنە، بەسەر کەنداوی عەدەندا دەڕوانێت و (١٧٠)کم لە ڕۆژهەڵاتی گەرووی (باب المندب)ەوە دوورە[1].

زۆرینەی شاری عەدەن دەکەوێتە ناو ئۆقیانوسەوە، ئەم شارە لە گڕکانێکی زۆر گەورە پەیدابووە، کە لەلایەکی زەریاکەدا تەقیوەتەوەو بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بووە، ئەنجا دوای سستبوون و ساردبوونەوەی وەکو هەموو گڕکانێکی تر دەرچەیەکی بۆ دروست بووە، بەڵام دەرچەیەکی یەکجار گەورەو فرەوان، دواتر بۆتە ئەو شارە مێژووییە، ئەوەی باسمان کرد زۆر بەڕوونی بە وێنەی مانگە دەستکردەکان دەبینرێت.

---

(١) مقالات من السي أن أن ومن جوجل أريس ومقال من جريدة المدينة للدكتور محمد علي البار العدد ١٦٦١٣ يوم ١٨ شوال ١٤٢٩هجرية.

ئاشکرایە هیچ کەسێك لە کۆندا نەیزانیوە شاری (عەدەن) کەوتۆتە سەر دەرچەی گڕکانێك، هەتا ئینگلیزەکان خستیانە ژێر دەستی خۆیانەوەو، لەگەڵ سەرەتای چاخی فڕینداو وێنەگرتنی شارەکان لەبەرزاییە زۆرەکانەوە، ئەو کات شاری (عەدەن) وەك شاخێکی ڕوچاڵ و دەرچەیەکی گەورەی گڕکانێکی زەبەلاحی دامرکاوە دەرکەوت، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمودەکەی سەرەتادا فەرمویەتی، بۆیە ئینگلیزەکان ناوی (Kraytar) واتە: (دەرچەی گڕکان)یان لێناو، ئەو ناوەش لەناویاندا باو بوو بەکاریان دەهێنا نەك (عەدەن)[1].

شاندێکی پاشایەتی بەریتانی بۆ زانستی گڕکانەکان ساڵی (١٩٦٤) ع بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر I.G.Gass هەستان بە توێژینەوە لە گڕکانی عەدەن کە توێژینەوە زانستیەکەی بەم دەستەواژەیە دەست پێ دەکات (هەموو گڕکانەکانی تری زەوی لە بەرانبەر گڕکانی عەدەندا وەك ساریە ئاگرینە (ألعاب النارية)ن و هیچی تر ئەوەش لە ڕێگەی بەراوردکردنی پێکهاتە بنیاتیەکانی ئەو گڕکانانەو گڕکانی عەدەن.

لە گۆڤاری (Readers Digest ١٩٧٩)دا وتارێکی زانستی دەخوێنینەوەکە دەڵێت: گڕکانی کاڕاکاتی لە ئەندەنوسیا (Karakati volcano) کە ساڵی (١٨٨٣) ع تەقیوەتەوەو زانایان بەبەهێزترین گڕکانی تۆمارکراوی یادەوەری مرۆڤایەتیان مەزەندە کردووە، ئەمەش بۆتە هۆی گیان لەدەستدانی چل هەزار (٤٠٠٠٠) کەس و دەنگی ئەم گڕکانە لە دووری (٥٠٠٠) کیلۆمەترەوە بیستراوەو، خۆڵەمێش و دوکەڵەکەی بۆ ماوەی هەفتەیەك بەری خۆری لە تەواوی گۆی زەوی گرتوەو ئەو گڕکانە بووە هۆی هەڵوەشان و لەناودانی زۆربەی ئەو دوورگەیەی کە تێیدا تەقیوەتەوە، زانایان هێزی ئەو گڕکانەیان بە سەد (١٠٠) بۆمبی هایدرۆجینی خەمڵاندووە!!

دواتر دەڵێت: ئەم گڕکانەی باسکرا زۆر گەورەیە، بەبەراورد لەگەڵ گڕکانی (عەدەن)دا وەك یاریە ئاگرینە وایە.

---

(١) مقالات من السي أن أن ومن جوجل أريس ومقال من جريدة المدينة للدكتور محمد علي البار العدد ١٦٦١٣ يوم ١٨ شوال ١٤٢٩هجرية.

